


## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **هەزار ئەشکەوت (ڕۆمان)**
- نووسینی: عومەر مەولوودی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠١٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: خانی (دهۆك)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٨)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.

زنجیرەی کتێب (٦٥٠)

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی

ڕۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە

www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێشەکی نووسەر:

لوێچێک ئاوی کانی زولاڵ و مشتێک خاکی کوردەواری تێکوەردرا و پاش خۆش بوون بە تەتەڵەی وەستای هەوڕگەر راستەوپاستە کرا بە ئۆف و ژانەوە گیان کرایە بەر پەیکەرەی هەرگیز نەسرەوتووم و خرایە چاوگەی کڵی رۆژگارەوە. جا راست و دروست، یان لارووێر لە کڵ دەرهاتبێتم، نازانم، ئەوە بە ئەستۆی ئێوەیە.

لە تاریکە شەوی ئەنگوستە چاوی ئەو سەردەمە کە سێبەری نگریسی دەرەبەگایەتی باڵی بەسەر ولاتا کێشا بوو خۆیان بە سێبەری خوا دەزانی، لەو تاریکە شەوە ئەنگوستە چاوەدا، لە گوندی (یاسی کەند)ی، سەر بە شاری (بۆکان) چاوم بەرووی ماڵە وەرزێرێکی رەشی قورم گرتوو کرایەوە. وەک دەڵێن ساڵی لە دایک بوونم هەزار و سێسەت و سی بووە، بەلام خۆم ئەوەم پێ راست نییە، چونکە خۆم ساڵی هەزار و سێسەت و سی و یەکم لە بیرە! بەوەیدا دەڵێم راست نییە، وەک خەو لە بیرمە بشێونی بوو کە پاشان باسیان دەکرد، ئەو بشێونییە خولی دەسەلاتداری دکتۆر موسەدیق بووە.

بەر لە وەروێرکە بوونم لە یاسیکەندەوە ماڵمان چووە تیکانتەپەی فەیزوڵابەگی و لەوێ کەوتمە سەر پێ و وەرزێرکە بووم. ئەودەم بوو بە بشێونی و ئاغا کەوتە تالان و برۆی رەعیەت. ئەوانەی سەر بزێو و دژی ئاغا جوولابوونە تالان و لە دێ دەرکران. بنەماڵەی ئێمە کە لەو بزێوانە بوون، دەرکراین و بە ماڵەوە چووینە بۆکان. ئەو دەم تەمەنم شەش ساڵ دەبوو. لەو سەردەمەدا خوێندن زۆر باو نەبوو، سەنعەت بە برەو بوو. بابم ناردمیە بەر خەیاتی و بووم بە شاگردی خەییات.

هەر لە منداڵییەوە بزۆز و نەحەواوە و هاروهاج بووم و لە هیچ شوێنێک حەجمینم نەبوو و خەتی کەسم نەدەخوێندەوە. دەڵێن کاسە کە پڕ بێ، دەڕژێ، کاسەی سەبری باوکم پڕ بوو رژا. ماڵی مامێکم لە گوندی «هەوارە بەرزە»ی سەر بە شاری بۆکان بوو و کاری وەرزێری دەکرد. باوکم بە نهێنی پێیگوتبوو بە هەر لەونێک بێ رامم کا و بمکێشێتە ژێر کار. مامە بە زمان گرتمی و کێشامیە ژێر کاری وەرزێری. مامە فێلاوی

و من ساکار، قورسترین و ناخۆشترین کاری ڕۆژانەی مامە و دڵسۆزی و چیرۆکی شەوانەی نەنکم بەرئاوەژوویان کردمەوە و بووم بە ماستی مەیو و مێشکم زاخاو درایەوە و وەک شۆرە دایڕشتم. پاییز کە گەڕامەوە، لە بۆکان بەند نەبووم، چوومە سەقز، دوو ساڵ لەوێ مامەوە و بووم بە وەستا، وەستایەکی دەسکورت و ڕەبەن. ئاسمان دوور و زەوی سەخت! نە دەمتوانی دووکان بگرم، نە کەرەستەی خەییاتیم پێ دەکڕدرا. ناچار هانام بردەوە بەر دێ و لە تیکانتەپە دەس بەکاربووم.

لەو کاتەدا تەمەنم هەژدە ساڵ بوو. چیرۆکەکانی نەنکمم هەر لە بیرمابوو و لە ناخەوە دەیان هەژاندم. بە چەشنێک لە ناخم هاڵا بوون لێ دابڕینیان زۆر ئەستەم بوو. ئەو سەردەمە باو باوی حەکایەت و حەکایەت خوانی بوو. دەستە دەستە پیاو ماقووڵان لە ماڵان کۆ دەبوونەوە و حەکایەتخوان بانگهێشت دەکرانەوە و لە دەوری کورسی کۆ دەبوونەوە و تا شەو دەزرینگاوە کۆڕی حەکایەت و چیرۆک و دیرۆکە گەرم بوو. لە هەر ماڵێک زانیبام حەکایەت خوانی لێیە، خۆم دەگەیاندێ و وشە بە وشە لە بەرم دەکرد و دواتر بۆ جەماوەرم دەگێڕاوە. پتر لە دووسەت حەکایەت و چیرۆکی کورت و درێژم لە بەر بوو. زۆر جار کە تەنیا دەکەوتم لەگەڵ پاڵەوانی چیرۆکەکان ڕاز و نیازم دەکرد، دەمدواندن و ببوونە ئامرازی ژیانم و هاندەری وەر و وەزەم و فێریان دەکردم چۆن لەگەڵ تەنگ و چەڵەمەی ژیان بەر بەرەکانی بکەم و بەڕەی خۆم لە ئاو دەربێنم.

بە بیرەوەری خۆم حەزم لە فێر بوون بووە، بەڵام هیچ کات بۆم نەلوا بخوێنم. حەزم دەکرد لەگەڵ گەورە پیاوان و زانایان هاودەم بم. ساڵی چل و شەش چل و حەوت بە سۆنگەی تاقمێک لە ڕۆشنبیران و مامۆستایانی قوتابخانەی ئاواییەکەمان و کوڕانی خوێندکاری دێ ڕێم بە کاری سیاسی و بزووتنەوەی نەتەوایەتی برد. هاوڕێ لەگەڵ ئەوان خۆمان بۆ هاوکاری لەگەڵ ڕاپەڕینی چەکدارانەی سیاکەلی چریکە فیداییەکان و بزووتنەوەی چەکدارانەی کاک سمایل شەریفزادە ئامادە کرد، بەڵام بەداخەوە قەت شەوی بە سەردا نەهات، ساواک هەڵیکوتایە سەرمان و دوان سیانێک لە مامۆستا و خوێندکاری قۆڵبەست کرد و تا توانیان ئێمەشیان جەزرەبەدا، چونکە هیچ بەڵگەیەکیان بەر دەست نەهات، بەو بڕە لێدان و پشکنین و هەڕەشەیە ئەو شەوە وازیان لێ هێنایین. بەڵام هەر بەین نا بەین، شەوانە بە دزی سەرکێشی دێیان دەکرد و بەهۆی سیخوڕانی خۆیانەوە ئێمەیان دەخستە ژێر چاوەدێری. ئێمە تا ماوەیەک کۆ بوونەوەمان قەپاتکرد.

سالی پەنجاو سێ لەگەڵ کیژێکی نێــو دێ کــە یــەکترمــان زۆر خــۆش دەویــست زەماوەندمان کرد. لە نیوەی سالی پەنجاوپێنجدا، لە کاتێکدا کە تازە کوڕێکمــان بــوو، ساواک هەڵەسوونی هێناوە و زۆر جار شەوانە تەپیدەدا سەرمان. پاش جەزرەبە و ئازار و پشکنینی ماڵ، هیچیان گیر نەدەکەوت، دەڕۆیشتن، ناچار لەوێ هــەڵــکەنــدراین و بــە ماڵەوە چووینە سەقز.

پاییزی سالی پەنجاوشەش کە گەلانی ئێران دژ بە رژێمی دیکتاتۆری شا راپەڕین لــە هەموو رێپێوان و خۆ نیشاندانی سەقز، بۆکان و مهاباد چالاکانە بەشداریم هــەبــوو و لــە یەکەم رێپێوانی سەقزدا بە توندی سەرم شکا، واتە یەکەم خوێن من دام. پاش رووخــانی دەسەلاتی پاشایەتی بە ماڵەوە گەڕاینەوە تێکانتەپە و بووم بــە پێــشمەرگــە و ئــەنــدامی رێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەلکی ئێران و لە بەشی کۆمیتەی جووتیاران (کومیتــە دیهقانی) و چالاکانە تێوە چووم. لە سالی هەزار و سێسەت و یەکی هــەتــاوی کەوتمــە بەندیخانە و شەش سالی و نیو لە زیندانی سنە مامەوە.

هەر لە سەرەتاوە فیکەی خۆم ناسی و زانیم ئەگەر بە ساخ و سەلامەتــیش دەرچــم و نەکوژرێم لانیکەم ماوەیەکی زۆر میوانم. جا هەر لەبەر ئەوە هەلم قۆستەوە و بە هێــوری و بنەوەش خۆم لە خوێندن هەلکرد. پــاش ســێ مانــگ حــاکم بــڕیاری کوشــتنی بــۆ دەرکردم. هاوڕێ بەندییەکانم بە لۆمەوە دەیانگوت:

ـ تۆ کە حوکمی سێدارەت لە سەرە، بۆ خۆت ماندوو دەکەی؟! خوێندن بە کەلــکی چی تۆ دێ؟! لە دیرۆکەکاندا زۆرم بیستبوو «کەسێک حوکمی کوشتنی درابووێ، لێیان پرسی: چ داوایەکت هەیە؟ گوتی: لەم دارەوە بمبــەنــە ئــەو دارەی دیکــە! تــا بردیانــە دارەکەی دیکە حاکم بڕیاری گۆڕی و لە تاوانەکەی خۆش بوو». گوێم بەو قسانە نەدا و بەردەوام درێژەم بە خوێندندا و لێبڕاوانە تێوەچووم. بە رۆژ سەرقالی خوێندن و نووسین، شەوانە بە چیرۆک گێرانەوە دلی تەنگی هاوبەندییەکانم شــاد دەکــرد، وەر و وەزم پــێ دەبەخشین.

پاش بیست و نۆ مانگ چارەنووسی نا دیار تێپەڕی و بڕیاری لە سێداردانەکەم گۆڕا و بوو و بە دە سال بەند. لە ماوەی چوار سالدا پۆلی سەرەتــایم تــەواو کــرد و هــەروەهــا درێژەم پێدا و ناوەندی و دواناوەندیشم تەواو کرد، بەلام بێ بڕوانامە. ئاخر مامۆستاکانم، هاوبەندییەکانم بوون و زۆر دلسۆزانە خۆیان بــە منــەوە مانــدوو دەکــرد و منــیش زۆر

گوێڕایەڵی ئەوان بووم. لە ڕاستیدا بەندیخانە بۆ من بوو بە زانکۆ و ئـاواتی لـە مێژینـەوم لەوێ بە هۆی ئەو کوڕەباشانەوە وەدیهات. دوای فێر بوونی فارسی کەوتمە چالاکی بـۆ فێر بوونی زمانی زگماکی. بێ سەر چاوە، هەروا ڕەمەکـی، بـێ ڕێنـووس و ڕێزمـانی کوردی دەستم بە نووسینی هێندێک لە دیرۆکە کورتەکان کرد. هەتا ڕۆژێک یەکێـک لە هاوبەندییەکانم کە چوو بووە مەرەخەسی، هاتەوە و گۆڤارێکی کوردی کـە ژمـارە-یەکی گۆڤاری (سروە) تازە دەرچوو بوو، بە دیاری بـۆ مـنی هێنـا بـوو. بـەو گۆڤـارە ئەوەندە شاد بووم لام وابوو لایەک لە سنەی پێ بەخشیوم. ژمارە-یەکی گۆڤاری سـروە کە بە قەڵەمە جوانەکەی مامۆستا هێمن و لە ژێر چاودێـری دڵـسۆزانەی ئـەو جـەنابـە دەرچوو بوو، پڕ بوو لە شتی جوان و بەکەڵک، ئیتر هەر ئەوە بوو بە مامۆستام و زۆر بە زوویی و بە باشی فێری ڕێنووس و ڕێزمانی کوردی کردم و هێور هێـور بـە سـەریـدا زاڵبوم و تەنانەت مامۆستاکانم کـە فێـرە خوێنـدن و نووسـینیان کـرد بـووم، بـوو بـە مامۆستایان و فێری خوێندن و نوسینی کوردی بوون. زۆر لە مێژ بوو ئاواتە خـواز بـووم ئەوەی کە لە مێشکمدا بوو و وەک خۆرە ناخمی دەخوارد، بیاننووسمەوە، نووسـینەوەی ئەوانم وەکو ئەرکێکی نەتەوایەتی بەلامەوە گرنگ بوو و لە نووسینەوەکەشیان زۆر بـە پەلە بووم، چونکە هاتنە دەرەوەم بەلامەوە ببوو بە گریمانە و زۆر بە تەمای ئەوە نـەبووم ڕۆژێک لە ڕۆژان ئـازاد دەبم. ڕاسـتە کـە حـوکم درابـووم، بـەلام کـێ دەیـزانی چ ئالوگۆڕێکی دیکە بە سەردا دێ؟! کورد گوتەنی: ورچ دەعبایەکـی ناجـسنە، هێلکـەی کرد، کردا چی لەگەڵ دەکەی؟! زۆر کەسمان بینی پـاش حـوکمی گـرتن بردیـان و هەرگیز نەگەڕایەوە، ئەو چوونە کە چوو، هەر چوو. لـە بـەر ئـەو ئـەگـەر و گریمانـە کەوتمە بیری نووسینەوەی بزووتنەوەی نەتـەوایـەتی سالـی چـل و حـەوت کـە لـەو سەردەمەدا زۆر هۆگری بووم و کاک سمایلی شەریف زادەم لە دوورەوە خۆشدەویست و ڕێبازەکەیم بە دڵ بوو، ئەگەرچی ماوەیەک لە ڕێبازی نەتەوایەتی لامداوە و بە تـاوانی لایەنگری لە ڕێکخراوەیەکی چەپی سەرانسەری شەش ساڵ و نیو تەمەنم لـە بـەندیخانـە تێپەڕاند ووە، بەلام پاش بە خۆدا چوونەوەیەکی زۆر تێگەیشتم لە هەڵـەدا بـووم. وەک کۆمۆنیستە شیعەکان کە دەگاتە مانگی موحەرم با دەدەنەوە و کراسی ڕەش لەبەردەکەن و دەست بە ماتەم گرتن دەکەن، منیش بامداوە و هاتمەوە سەر بـیری نـەتـەویـەتی و دەستم بە نووسین کرد، بەلام وەک بیرەوەری. پاش ڕامان و بیرکردنەوەیەکی زۆر، ڕام

گۆڕی. له خۆم رادەدی له قالبی رۆماندا بیگونجێنم، چونکه ئەوەی پێویستی رۆمانه بریتییه له بیر و ئەندێشەی کۆمەلایەتی، سیاسی، ئابووری و زانست و بەشێکی هەره گرنگی ئەدەبیات که باس له دابونەریت و کولتوور و فەرهەنگی کۆمەلگه دەکا و دەکرێ له هەر قالب و قەوارەیەکدا به شێوەیەکی بەر بلاو سەر به خۆ پەل هاوێژێ و نووسەر خەشی دلی خۆی بڕێژێ و دەردی کۆمەلگه دەردەبڕێ. لەو پێوەندییەدا نووسەر پێویستی به بنەما، مۆژاد «سووژه»، داهێنان، تەکنیک، شێواز، فۆڕم و چۆنییەتی داڕشتن هەیه که ئەوانەی له خۆیدا بەدی کرد، مانای وایه که نووسەر دنیای خۆی و روانگه و بیرۆکەی تایبەتی خۆی هەیه. پاش خوێندنەوەی رۆمانێکی فره له خۆم رادی دەست بدەمه قەلەم و ئەو بیرەوەرییه به پێزه نەتەوایەتییه بخەمه چوارچێوه و قالبی رۆمانەوە.

ئەو هاوڕێ بەندییانەی که دارا و دەست رۆیشتوو بوون هەموو حەوتوویەک کەسوکاریان دەهاتنه سەردانیان. من هەر خێزانم دەهاته سەردانم، ئەویش دەس کورت و دوره دەست. شەش مانگ جارێک دەهات. دەمزانی کەی دێ. پێشەکی نووسراوەکانم بەش بەش له دەفتەری بچووکدا دەمنووسین. که هاوسەره لەخۆبووردووەکەم به چوار منداڵەوە، که گەورەکەیان پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو، دەهات له بەر ئەو درەنگ هاتنەیان چاو پێکەوتنەکەیان دەکرد به سەعاتێکی حوزووری، بەلام له ژێر چاوەدێری ئەواندا. له دەرفەتا که هەل دەرەخسا، دەفتەرەکانم له باخەلی دەئاخنی و بۆمی دەبردەوە.

به هۆی کەشوهەوا و کەندوکۆسپگەلێکی بەربلاو و درێژخایان که بەرەبینگی به ولاتەکەمان گرتووە وەکو دەردەباریکه ( شێرپەنجه) به نەتەوەکەمانەوە نووساوە له باری هونەرەوە نەیتوانیوە قۆناخی سەرەتایی ببڕێ و خۆ بگەیێنێته قۆناخی نوێی ئەدەبیاتی جیهان کەواته ناشتوانێ شانبەشانی ئەدەبیاتی جیهانی پیشەسازی بڕواته پێشێ. ئەوەش خۆی له خۆیدا چەند هۆکاری سەرەکی هەیه: یەکەم، نەتەوەی کورد وەک منداڵی شیرەخۆره که له مەمکی دایکی دەبڕنەوە، له نیشتمانەکەیان دابڕیوە و نەیتوانیوە خاوەنی جێ قەبرێک زەوی بێ و کیانێکی سیاسی بۆ خۆی هەبێ و دایم وەک تۆپ بەم بەروئەو بەردا دراون و بوونەته ئامێری دەستی بێگانه، ئەگەر ئاوڕێک له مێژووی کاوله نیشتمان بدەینەوە و بەوردی توێژینەوەی له سەر بکەین و کۆمەلگەی کوردەواری تاو و توێ بکەین ئاشکرا دەبیین ئەو گەله، ئەو نەتەوە، ئەو نیشتمانه له پاش جەنگی جیهانی

یەکەمەوە لەش ساخی بە خۆوە نەبینیوە و هەر دەم هەڵگری برینێکی قووڵ لە پەیکەری خۆیدا بووە و رۆژێک سەرینی ئەرخەیانی نەناوەتە ژێر سەری تا هزری وەگەڕخا و بە ئەندێشەیەکی ورد بینانەوە رامێنێتە ئەدەبیاتەکەی، کە دەڵێم بڕوانێتە ئەدەبیاتەکەی مەبەستم رۆشنبیرە رەسەنەکانی کوردە، چونکە لە هەر نەتەوە و کۆمەڵگەیەکدا باری قورسی کۆمەڵگە هەر بە شانی ئەوانەوەیە و ئەوانیش بە پێی هەلومەرجی ئەو سەردەمە، ئەوەی هێژا و خاوەن خامەی بە هێز بووە لە مەیدانی بەربەرەکانی لەگەڵ داگیرکەرانی نیشتمان تێوەتلاوە و بۆ هاندانی نەتەوەکەی دژ بە داگیرکەران بووە بە شاعیر و بە شیعری کلاسیکەوە سەرقاڵ بووە و شیر و قەڵغانی بووە و بۆی نەلواوە ئاوڕ لە ئەدەبیاتی نوێی جیهان بداتەوە و ئەوەی لە وزەیدا بووە هەر ئەوە بووە و کۆتایی نەکردووە. ئەم وەزعە هەتا پێکهێنانی کۆماری کوردستان بەردەوام درێژەی پێدراوە. پاش رووخانی کۆماری کوردستان، ئێستاشی لەگەڵ بێ، رۆشنبیرانی چەپی سیاسی کورد و چاو لە دووبوانی رەوت و بزاڤی خەبات و شۆڕشی بێگانە و رەچاوکردن و لاسایی کردنەوەی رەوتی بیگانەیان هاوردە و تێکەڵ بە ئەدەبیاتی سیاسی رەسەنی کوردی کردووە و هۆکارێکی گەلێ مەزنە بۆ ئەوە کە پشت ئەستوور بە دۆزی نەتەوایەتی نەبن و پشت لە مافی رەوای نەتەوە هەڵکەن. ئەو پشت تێهەڵکردنە بۆتە هۆی ئەوە کە ئەوەی لە باری سیاسی و گەشەی کۆمەلایەتییەوە بە دەس هاتبوو، چونکە هەڵقولاوی بیری کۆمەڵگە و نەتەوەی خۆی نەبوو و لە بێگانە وەرگیرا بوو و بە زۆر راگوازرابووە نێو ئەدەبیاتی سیاسی و فەرهەنگی نەتەوایەتی، پووچەڵ و بێ کەڵک دەرچوو و خەڵک لە روانگە و بە چاوی بێگانەوە سەیریان دەکرد، چونکە ئەو میتۆدە، ئەو پرەنسیپە، ئەو بیر و ئەندێشە گەلە، ئەو دۆزە بۆنی بێگانەی لێدەهات و بۆ گەلی کورد نامۆ و قێزەون بوو، ئەگەر تاکی نەتەوەیەک فرچکی بە ژەکی مەمکی دایکی خۆی گرتبێ و پاشان لە دایکی دابڕن و مەمکی ژنە رووسییەک، ژنە چینییەک، ژنە کووبایەک بخەنە زاری، مەگەر لە برسان بیمژێ، هەر کە تێر بوو، گاز لە گوێ مەمکی دەگرێ و شیرەکەی هێنق دەکاتەوە، چونکە بۆی نامۆیە و هەست بە بۆنی بێگانە دەکا.

ئەوەی لە بواری هونەر، بە تایبەت ئەدەبیاتدا کار دەکا بێ گومان بۆنی سیاسی لێدێ و سیاسیشە و لە ژێر کاریگەری سیاسیدا هەڵسوکەوت دەکا. ئەو هەڵسوکەوتە کاریگەری لە سەر هەناوی رەوتی ئەدەبیات بووە. نووسەرانی و چەپی رۆشنبیریشی لە

خۆ پێچاوە و پشتیان بە فەرهەنگی بێگانە بەستووە و دابونەریت و فەرهەنگ و کولتوور کەلەپووری بە بایەخ و دەولەمەندی کوردەواری و نەتەوەکەی خۆیان وەلاناوە، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە کاری نووسەرانی پێشکەوتووی ولاتە پیشەسازییەکان. ئێستاشی لەگەڵ بێ، سەرقاڵی تۆژینەوە و ئاڵەبێژی بەیت و باو و حەیرانەکانی ئێمەن و رایدەگوازنە نێو ئەدەبیاتی خۆیانەوە و بە فۆلکولۆری ئێمە خۆیان دەولەمەند دەکەن، مەگەر بەیت و باو و حەیران بە گشتی بەشێکی هەرە گرنگی فولکلۆری رەسەنی کورد نییە؟ ئەوان زۆر زیرەکانە سیری خۆمان لە سمێلی خۆمان هەڵدەسوون و چۆلەکەمان بە نرخی قەناری پێ دەفرۆشن و ئێمەش لێرەوە بۆیان دەبین بە شایەر و بە شان و باهۆ و دەست و قەلەمیاندا هەڵدەلێن و وشە بە وشە و دێر بە دێری لە بەردەکەین، مەگەر سەت ساڵ تەنیایی ( گاربرێل گارسیا مارکێز) لە جێ چادری دۆمەکان و جێ کلە ئاگری فۆلکلۆرەوە راینەگواستە نێو ئەدەبیاتی کولومبیاوە؟ لەگەڵ رێزم بۆ رۆشنبیرانی چەپی سیاسی، من دەڵێم وەدووکەوتن و پێرەوی کردن لە سیاسەت و قەڵەمی بێگانە هەڵەیە و دۆزەکەمان بەلارێدا دەبا و وەدوی کلاوی لار کەوتنە، وەرن با خۆمان بین و لە فەرهەنگ و خەلکەکەمان دوور نەکەوینەوە و نەتەوەکەمان بە جێ نەهێڵین.

رۆمانی هەزار ئەشکەوت بەرگی یەکەم و دوهەمی کە پێنجەسەت و هێندێک لاپەڕیە، ئەو دوو بەشە بە سەر یەکەوە بلاو دەبێتەوە و بەرگی سێهەم و چوارەمیشی، ئەگەر تەمەن هەبێ و مەرگ مەودا بدا و لە بەر دەستم دایە. رۆمانی هەزار ئەشکەوت لە سەر بنەمای بزووتنەوەی نەتەوایەتی ساڵی چل و حەوت رایەڵی نراوەتەوە و پۆی دابونەریت، فەرهەنگ و کولتوور و کەلەپووری رەسەنی کوردەواری تێوەدراوە و بەدوور لە مێتۆد و پرەنسیپی بێگانەیە و بزووتنەوەکەش بزووتنەوە و خەباتی چەکدارانەی نەتەوایەتی رەسەنی کوردە و بە بیچم و قەوارەیەکەوە دارێژراوە کە هەڵقولاوی نێو دڵی نەتەوەکەی خۆیەتی و لە بێگانە وەرنەگیراوە.

گرنگی رۆمان لە چیدایە؟ ئاخۆ لە نەبوونی رۆماندا چیرۆک و شیعر دەتوانن ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە؟ بە بۆچوونی من ئەوانە هەر سێ بران و کوڕی ئەدەبیاتن. رۆمان بەشێکی هەرە گرنگی ئەدەبیاتە. ئەو بەشە گرنگە بریتییە لە رەسالەتی فەرهەنگی، کولتوور و کەلەپوور، زمان، دابونەریت و زاراوە جۆراوجۆرەکانی نێو نەتەوە و دەسەبەر دەکا. هەڵبەت ئەم تایبەتمەندیانە هەر سێ بوارەکە، چیرۆک، رۆمان و شێعر دەگرێتە

خۆ و بە نەبوونی هەر یەک لەوانە بۆشاییەکی گورچوو بڕ، خەسارێکی گەورە، برینێکی قووڵ دەکەوێتە پەیکەرەی ئەدەبیاتەوە، چونکە هەر کام لەوانە کارکردێکی تایبەت بە خۆیان هەیە. وەک ئەوە وایە کە سێ منداڵت هەبێ و هەر یەکەیان ئەرکێکی تایبەتیان بە ئەستۆ بێ، جا با ئەرکی یەکیان لەوانی دیکە گرنگتر بێ، لە نەبوونی هەرکامیاندا بۆشایی دەکەوێتە ماڵەکەت و جێی ئەو دیارە. بە نەبوونی هەر کام لەوانە بۆشایی دەکەوێتە ئەدەبیاتەوە. شێعر هەستە، خەیاڵ ناسکییە، زوو تێپەڕە، هاندەرە، چەخماخەی هەورە برووسکەیە و لایەلایە بۆ دڵ دەکا و ئاگر لە هەناو بەردەدا، مێشک دەهەژێنێ و لە ناخەوە دەورووژێنێ و نووستوان وەخەبەر دێنێ.

چیرۆک بە هۆی بەرتەسکی چوارچێوەکەیەوە دەست و باڵ کورتە، بەلام بزوز و سەر بزێوە، دەس قورس و گورچووبڕە، مشتێ نێو هەمبانەیە. چیرۆک زمان شیرین و لە بنەوەبڕە، بە سەر مەڕی بە دڵ گورگە، دەشگری و لایەلایەش دەکا، لێش دەدا و دەشگری. کۆرپەی کۆشکی زۆرداران رادەژێنێ و نقورچکێشی لێ دەگرێ. بە کورتی و بە کوردی ئاوری بن کایە.

رۆمان برا گەورەیە. بەربلاوە و سینگ کراوەیە، دەستی بە هەموو شوێنێک رادەگا و سەر لە هەموو کەلێن و قوژبنێک دەردێنێ و هەموو پەنا و پەسیوێک دەپشکنێ. توورە و تۆسنە، دڕ و بێ بدزەیە، دەم شڕ و جنێو فرۆشە، شەرم لە کەس ناکا، راست و بێ پەردەیە، ئەوەی بە زمان دەیڵێ، بە کردەوەش دەیکا و چی بزانێ نایشارێتەوە. پەل هاوێژ و بەر بلاوە، بە دەسەلات و زۆر دارە. بە دڵ لایەنگری زۆر لێ کراوانە. هەر لەبەر ئەو تایبەتمەندیانە هەر کام لەوانە نەبێ بۆ شاییەکی گەورە لە ئەدەبیاتدا بە دیدێ.

رۆمانی هەزار ئەشکەوت راشکاوانە و بوێرانە دەردی کۆمەڵگە بەیاندەکا و بێ پێچوپەنا راستییەکان دەخاتە روو. بەرەی داهاتوو، واتە ئەو گەنج و لاوانە، بە کیژوکوڕەوە کەتالاوی سەردەمی دەرەبەگایەتییان بە قوڕگدا نەچووە دەسنیشان دەکا و ئەو سەردەمە یان بۆ زیندوو دەکاتەوە کە باو باپیرانی ئەوان چ مەرگەساتێکیان بینیوە.

رۆمانی هەزار ئەشکەوت لە ساڵی شەست و پێنج و شەست و شەشدا لەبەندیخانەی سنە گەلالەم گرتووە و لە ساڵی حەفتا و حەوتی هەتاوی بەیارمەتی دۆستی بەڕێزم «کاک سەعدی حیسامی» لە سەر ئەرکی خۆی لە تاران بە چاپی گەیاند و

له ۳۰۰۰ بەرگدا بلاوکرایەوە. بۆیرانە دەتوانم بلێم رۆمانی هەزار ئەشـکەوت، لـە دوای «چێشتی مجێوور»ی مامۆستا هەژار، بە برەوترین کتێبی ئەو ساڵەی کوردەواری بوو. بە نیوە و نیوەچڵی، بێ بەرگی دووهەم، لە پێشبڕکێیەکدا کە لە لایەن گۆڤاری «سـروە»وە بەرێوە برا، بە پاش قول و غەدری پارو با دەرانی پـاش خـوانی سـەرۆکان، بـە سێهەم رۆمانی کوردی ناسێندرا.

مامۆستا هێمن دەفەرمێ:

هونەرمەند و ژیانی خۆش محاڵە هونەرمەند رەنجەرۆیە و ژینی تاڵە

ئەو دەمەی لە بەندیخانە هاتمە دەرێ روخساری ئازادیم نەدی و بۆ من هـەر زینـدان بوو، بەڵام لە بازنەیەکی کراوەتردا. ئەو دەمەی کە لە زیندان بووم پتر هەستم بە ئـازادی دەکرد. لە ترسی لۆمەی خزم و کەس نەم دەوێرا راشکاوانە ئەوەی لە دڵمدایە بیـدرکێنم. ناچار هانام بردە بەر چۆڵی و چیا و بووم بە هەنگەوان. ماوەی بیست ساڵە بە رۆژ چـزوو و ژاری هەنگ دەچێژم و شەوانە لە بەر تیشکی کەم تەوژمی لامپا سەرقاڵـی نووسـین و خوێندنەوەم و زۆریش لە کارەکەم سەرخۆشم، بێجگە لەوەی لە چزوو ژاری زاری خزم و بێگانەی دوور و تەریکی کردومەتەوە، بژیوی ژیانی ماڵ و منداڵیشی لێ هەڵدەکرێنم، دەسکەوتی گەورەی بۆ من ئەوەیە کە توانیومە سێ بەرگ رۆمانی هـەزار ئـەشـکەوت بخوڵقێنم. سەرەڕای ئەوەش کتێبی ئیدئۆلۆژییە مۆدێرنە سیاسییەکان کە دەوروبەری پێنج سەت لاپەڕەی لە خۆ گرتووە و نووسـراوەی و وەگێـڕاوەی، وەرگێڕمـە سـەر زمـانی کوردی و لە دەزگای موکریانی هەولێر چاپ کراوە، مێـژووی شارسـتانییەت «تـاریخ تمدن» نووسراوەی «هێنری لوکاس» وەگێڕاوەی عەبدولحوسێن ئازرەنگ دوو بـەرگ کە پتر لە هەزار و پێنج سەت لاپەڕەیە و لە سـەر داوای دەزگـای موکریـانی هـەولێـر وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە ژێر چاپدایە هەروەها چەندین کورتە چیرۆکیشم ئامادەی چاپە. هیوادارم بەو تەمەنە کورتەی خوێندەواریمـەوە تـوانیبێتم کـەلێنێـک لـە ئەدەبیات و قوژبنێکی کتێبخانە هەژارەکەی نەتەوەکەم پڕ کردبێتەوە.

بە سپاسەوە

عومەر مەولوودی ــ جۆزەردانی ۲۷۰۸ی ک

## «روانینێک لە هەزار ئەشکەوت»

ئەوەی ئێستا لەبەردەستی خوێنەری بەڕێز دایە ، بەرگی دووەمی ڕۆمانی «هەزارئەشکەوت» لە نووسینی مامۆستای ئەدیب و ڕووناکبیر عومەرمەولوودییە. بەرگی یەکەمی ئەم ڕۆمانە حەوت سال لەمەوبەر چاپ بووە. سالی ڕابردوو کاک عومەر بە پێشکێش کردنی نوسخەیەک لەو بەرهەمە بەسەری کردمەوە. هەر زوو دەستم بەخوێندنەوەیکرد بۆ ئەوەی شتێک لە بابەت زمان و شێوەی داڕشتن و لایەنە تەکنیکییەکەی هەلکرێنم و لەدەرفەتێکی لە بارتردا بادەمەوە سەری و تەواوی بکەم. کەچی، بە پێچەوانەی هێندێ نووسین کە زۆر زوو خوێنەر جواب دەکەن وکتێبی پێ وێکدەنێن «هەزار ئەشکەوت» بەری نەدام و لەگەل خۆی بەکێشی کردم هەتا هەموو شاخ و دووندەکانی نیشاندام و مەزرا و مێرگ و چیمەنی دێهاتی کوردەواریی پێ پشکنیم سەری پێ بە مالە هەژارو کۆیلەی دەستی زۆرداری کورددا کردم، تەنانەت ئەگەر دووراور دووریش بوو قەلا و دیوەخانەی بەگ و کۆڕی بەزم و ئاهەنگی «خوا پێداو»انی پێ ناساندم .

ماوەیەک لەمەوبەر مامۆستا لە سەردانێکی کورتیدا مزگێنی ئامادە بوونی بەرگی دووەمی «هەزار ئەشکەوت»ی پێدام و لە ڕووی لوتفەوە پێشنیاری کرد لەسەری بنووسم. ڕاستییەکەی ئەوەیە هەلسەنگاندنی ئەم کارانە لە توانای خۆمدا نابینم و هەر ناشمەوێ قەرە لە قەرەی بدەم. بەو حالەش«دەستی مەرحەممەت»ی مامۆستام نەگێڕایەوە و قەولم دا، ئەگەر بۆم بنێرێ و بیخوێنمەوە قسەی خۆمی تێدا بکەم. پێموایە لەبەر ئەوە بوو کە کتێبەکە لە دواقۆناغەکانی چاپدا بوو، بۆ ڕۆژی دوایی بوو، یان دوو ڕۆژ دواتر نوسخەیەک لە بەرگی دووەمی «هەزار ئەشکەوت»ی بۆ ناردم دیسان هەزار ئەشکەوت پیلی گرتم و شاخ و دەشت و شار و گوندی پێ پشکنیم، زولمی زالم و غەدری ناهەقی

و خەیانەت بە هاوخوێنی پێ نیشاندام و لەگەڵ پاکی و ڕاستی و مێهر و وەفا و سـیدق و سەفای چەوساوەکان ئاشنای کردم . بە هەق چێژم لێ وەرگرت و کەیفم پێکرد .

ڕەنگە چیرۆکنووس و ڕۆماننووس و ڕۆمانناسان بۆچوونی جیاوازیان هەبێ، کە هـەر وەک گوتم ئەوان بە هەقداری ئەو بوارە دەزانم، بەلام بەش بـە حالـی خـۆم ڕۆمـانێکم پێخۆشە ڕووداوەکانی چەندی بکرێ لەگەڵ ڕاستییەکانی کۆمەڵی کوردەواری بێنـەوە و ئاوێنەی باڵا نوێنی ژیانی کۆمەڵ لەسەردەمـی خۆیانـدا بـن. جگـە لـەوەش، حـەزم بـە ڕۆمانێکە بە زمانی خەڵک نووسرابێ، وشە و زاراوە و ڕستەکانی نامۆ نەبن، مەبەستەکـەی خۆی بە ئاسانی بە دەستەوە بدا. هەموو ئەوانەی بۆیان نووسراوەڵێی تێ بگەن. حەوسەلـەم نییـە دیـرێک سـێ جـار و چـوار جـار بیخوێنمـەوە تـا بـزانم دەڵـێ چـی. نامـەوێ «خۆشارەوەکێن»م لەگەڵ بکا بە دوای دیتنەوەیدا زمانم پێ بکێشێ .

ڕۆمانی «هەزار ئەشکەوت» هەردوو بەرگی ڕاست ئـەوەیـە کـە ئـەمـن دەمـەوێ. ڕووداوەکانی تەنانەت زۆربەی دیمـەنـەکـانی تابـلۆیەکـن لـە ڕوخـساری کۆمـەڵـی کوردەواریی بەشی ئێران لە دەیەکانی پەنجا و شەستی سەدەی ڕابردووی زایینیدا.

زمانی«هەزارئەشکەوت»یـش کـوردییێکی ڕەوان و بـێ گرێوگۆڵـی خۆمالـییە. بـە هەزاران تەعبیر و مەسەل و مەتەڵی ڕەسەنی کوردی لە خۆیدا جێ کردوتەوە. هەرکامـە لە قارەمانەکانی قسە دەکا، بە زمانی خۆی و هاوشانەکانی دەدوێ. کەسیان لە کەس نابێتە فەیلەسووف و مەتەڵۆکەی لێدا ناهێنێ. بۆ ئەوەی لە ڕاستوێژی دوورنەکەوتبمـەوە دەبـێ بڵێم جاری وا هەیە زاراوەیەک، یان مەسەلێک پڕاوپڕ لە جێی خۆیدا نییە، بەلام ئـەوانـە هێندە کەمن کە بە ڕۆمانێکی ٦٠٠- ٧٠٠ لاپەڕەییەوە هەر دیار نین.

ماوەتەوە ئەوە کە بڵێم «هەزارئەشکەوت» بەڕادەیەکی بەرچاو لە ژێـر کاریگـەریـی «حەمەدۆک»ی یەشارکەمال دایە. ڕووداوەکانی لە ڕووداوەکانی حەمە دۆک نزیکن، بێ ئەوەی دووپاتە کردنەوە بـن، «حـەمـە» قـارەمـانی سـەرەکـی ڕۆمانـەکـە زۆر وەک «حەمەدۆک» دەچێ «کەوێ» خەجیجە و پەیدا بووەتەوە، «هەمزەبـەگ» زوڵـموزۆری عەبدی خانمان وەبیر دێنێتەوە، «عەتابەگ» کەم و زۆر«وەلی»یە «پوورەگوڵە» مـووی لە «دایەحۆری»وەر نەگێڕاوە «سەروان خودایی» «وەکیل باشی عاسم»ە و زۆری دیکـە. تەنانەت تەواوکردنی بەرگـی یـەکـەم و دووەم وێکچـوونێکی لـەگـەڵ تـەواوکردنـی بەرگەکانی «حەمەدۆک» لە لایەن یەشارکەماڵەوە هەیە. هیچ دوور نییە کاک عومـەری

ئیمەش جارێکی دیکە «حەمە» بێنێتەوە و لەبەرگێکی سێیەمی«هەزارئەشکەوت»دا ڕۆڵی قارەمانی پێ بسپێرێ. ڕەنگە هەردوو ڕۆماننووسیش مەبەستیان ئەوە بێ بەو کارەیان داستانی خەباتی ڕزگاریخوازانەی کوردمان بۆ بگێڕنەوە کە هەرچەندە زۆر جار تووشی شکان و نوشوستی بووە، بە زینی نەناسیوە و سەر لە نوێ سەری هەڵداوەتەوە .

بەلام بە بڕوای من ئەمەش لە نرخی کارەکەی نووسەری«هەزار ئەشکەوت» کەم ناکاتەوە بۆ هیچ کەس شوورەیی نیە لە قوتابخانەی یەشارکەمالی بە توانادا پێبگا، بە تایبەتی ئەگەر قوتابییەکی سەرکەوتووش بێ (کە مامۆستا عومەری مەولوودی بە ڕاستی هەیە) گرنگ ئەوەیە کە کاک عومەر قارەمانەکانی خۆمالین، ڕووداوەکان نەخوازرانەوە، بەشێک لە ژیان و بە مانایەک بەشێک لە مێژووی کۆمەڵی کوردەواریمان بۆ دەر دەخەن. هەوڵی کاک عومەر هەوڵێکی ئازادیخوازانەی نەتەوەیی و خەباتەکەی خەبات دژی زۆرداریی چینایەتی و نەتەوایەتییە. ئەگەر «حەمە دۆک»ی ڕۆمانی یەشارکەمال لە پەردەدا و زۆرتر وەک قاچاغێکی دەستی زوڵمی دەرە بەگ خۆی بە ئازادیخوازێک لە قەڵەم دەدا، «تاهیر»ی ڕۆمانی عومەر مەولوودی بە پانەوە ئامانجە نەتەوەییەکانی لە وتاری سیاسیدا بۆ گوندنشینەکان شی دەکاتەوە، تەنانەت بە جۆرێک لە جۆران خۆیمان وەک «سمایل شەریف‌زادە» پێ نیشاندەدا، چونکە سەرەنجام ئەویش بە دەستی خائینێک بە ناوی «کوێخاشەریف» شەهید دەکرێ، هەر وەک شەریف‌زادە لە «دارێنە»ی بانە بە دەهۆ و دەسکیسی بە دەستی پیسی کوێخا شەریف لە نێو چوو .

پڕ بە دڵ دەست خۆشی بە کاک عومەر دەڵێم و پیرۆزبایی لێ دەکەم. هیوادارم هەزار ئەشکەوت لەبەر دڵی خوێنەرانی دیکەش هەر وا جوان وشیرین بێ و کاک عومەریش بەردەوام بێ و بەرهەمی باشترمان بداتە دەست.

عبدالله حسن‌زادە بەهاری ٨٤

## ١

مانگی ڕەشەمەیە، تەشقی عەرز و ئاسمان شکاوە، چلەکان مردوون، خاتوو زەمهەریر شینی برایانی دەگێڕێ. خۆرەتاو ڕەش بۆتەوە، زستان دوا هەناسەی ژینی دەکێشێ.

زەو کەوتووە، گەرمەزەوە. کۆسە ماڵە و ماڵیەتی، لە دەرگاوە بانگ دەکا:

ـ مەڕ بەیەکانە، بزن بە دووانە.

ـ خوا بەرکەت بدا بەو گەوڕ و گەلەخانە.

گەزیزە سەری وەدەر ناوە، قرپاشان ژیاوەتەوە، باڵندەی کۆچەر لە گەرمێن گەڕاونەتەوە و هێلانە دۆزییانە، هێلکە لە هێلانە کراوە و بەستوویەتی، بورجی لەگلەکە. کووزەڵە و ماکووز، پنگە و ئاوەڵ گەڵایان پان بووە لەکانی و دەراوان خۆیان کێشاوەتە سەر.

کادێن فەرعانەی تێکەوتووە، دڵی ئاژاڵدار تەنگە، تفاق خۆشەویست بووە، برا بە برای نادا. سووتەمەنی لە تەواو بوونە، بەفر لە خۆ دزینەوەیە، ژنی دووگیان مەگێرانی پێوە دەکا.

سرووشت سەر لە نوێ ژیاوەتەوە، دڵی ئەویندارانی وەبزووتنەوە کەوتووە، پتر هەست بە دڵداری دەکەن.

قاوەڵتوونە، تەنوورەکە نایگرێ! کڵەکەی تێی ڕووخاوە! دووکەڵ پشووی سوارکردووە، ئاو بە چاو و لووتیدا دێتە خوارێ دەستی داوەتە کۆلەوەژ و لە کڵی وەرئەدا، بە پێچە ڕشوە پواوەکەی گوڵبێنەی تەنوورەکە باوەشێن دەکا، گڕ دەگرێ، بڵێسە وەسەرکەوت.

شەوقی تەنوور ژوورە تاریکەکەی ڕوونکردۆتەوە، ماڵەکە قەدیم دەولەمەندانەیە. چوار کۆڵەکەی سەرکۆڵدار، سێ بەرە دەستەکەی گرتووە بە کۆڵەوە.

هەرزالێکی بەرین پێخەفی لە سەرە و بەڕەیەکی حووللەیی بە روویدا کێشراوە، بنەکەی پڕە لە مەنجەڵە گەورە و بچووک، مەڕدۆش و تاوە مس و لە ژەنگدا ڕەش هەڵگەڕاون.

لە قولینچکی خوارووەوە، کەندووە ئاردێکی گەورە زاری کردۆتەوە، کەلێنی ئاخنراوە لە داس، گاسن، قایشی جووت، مەساسە، شەنەی دار و ئاسن، تەشوێ و مشار، پاچ و کەپە پێمەڕە و ...تاد

دیواری ئەمشان و ئەوشانی کەندووەکە، چەند سنگێکی داری پێدا گوتراوە، گاوس، مەشکە، مەش کۆلە، کەو، بێژنگ، شیلگیرە کۆنیان پێوە هەڵواسراوە.

لە پشتی دەرگا چەپەرەکەوە، سەوەتەیەکی دەمپەل بە لەتەگوریسەوە کراوە بەسینگدا، پڕە لە قاپە مس و کەوچکەدار.

لە لای سەرووی ماڵەکەوە، سندووقێکی گەورە، قوفڵێکی لوولەیی ڕەشی لە دەرگاکەی داروە، وەستا خەراتی لە سەر کردووە.

لە پشت سندووقەکەوە، تاقمێکی ژێرپان و سەرباریک لە دیوار دابڕدراوە، لامپایەکی دەنمرەی لە سەرە. لەو تاقە بەرەو ژوورە دووکەڵ کردوویە بە دەوار، لە خوار تاقەکەوە، گسکە سواخ و سپییە.

لەوبەری دەرگا چەپەرەکەوە، سەکۆیەک هەڵبەسراوە، نیوەی گۆزلدانە، نیوەی سەرشۆرکەیە. لەو لای سەرشۆرکەوە، دەرگای تەویلەیە، لە نێو ماڵەکەوە دەچێتە تەویلە. تەنوور بووە بە دەنووکی کەو. ئەستوێلکێ بە سەر تەنوورەکەدا ڕایەلکراوە، دیزەیەکی ڕەشی گلین لەسەر ئاور کەفوکولیەتی، بڕوێش بە دەم کەفەوە بەلێواری دیزەکەدا دێتە خوارێ.

خاوەن ماڵ، دیزەکە دەکێشێتە دواوە، کەلێنێ بە دەرخۆنەکەی سەری دەدا، جامێکی ڕەش و سەلکێ پیواز و چەقۆیەکی دەسک شاخ و دەمە کەوچکێ رۆنی زەنگ لە گوێی تەنوورەکەیە. پیواز دەجنێتە نێو جام و ڕۆن دەکا بەسەریدا، دەینێ بەلای ئاورەوە. پیواز لە ڕۆندا سوور بۆتەوە، بۆنی پیواز داخ ژوورەکەی پڕ کردووە. بە دەسگرە لێواری جام دەگرێ لە دیزەی دەکا، دەمە کەوچکێ لە ئاوی چێشتەکە هەڵدەگوێزێ لە جامەکەی وەرئەدا و تێدەکاتەوە، دەرخونە گلینەکەی وەسەر دەنێتەوە، کەلەبەرێکی ئەداتێ و هێندێ وردە لە تەنوورەکە دەماڵێ.

خاوەن ماڵ لە گوێی تەنوورەکە ئەژنۆی لە باوەش گرتووە و چاوی بڕیوەتە گڕی تەنوورەکە. پەڕە کایەک سووتا، بوو بە بەورنگ، بە دەم تینەوە شەکان وەسەر دەکەوێ، خەیاڵ سواری باڵی سووتاوی کا بووە لە کولاوکەی سەر تەنوورەوە ڕۆیشتە دەرێ.

خەیاڵ بەربلاوە! سەر لە هەموو کەلێن و قوژبنی ژیانی پڕ لە دەرد و ژانی ڕابردووی دەداتەوە. سەردەمی منداڵی هاتۆتەوە بیر، دایکی، دڵسۆزییەکانی، شەو و شەونەخوونی، کارەکەری و قەرەواشی ماڵان. سەر لە سەر ڕان و سەر دۆزینی، حەکایەتی شەوانە، حەکایەتی مووروە دەنگیلە، مەڕ و بزنە، مریشکە قوڵە و کوڕە کەچەڵ و ...تاد بەسەرهاتی باوکی، مەرگی کوتوپڕی دایکی، بێ کەسی و بێ دەرەتانی، دەرک و دووی ماڵان، چەپۆکە سەری، لارەملی، بێ نازی، چەپۆکی ژنانی بێ بەزەیی، دەست بە سەردا هێنان و دڵسۆزی ژنانی خاوەن بەزەیی، کار، کار، نەوێستانی بێ وچان، لێدان و بێ حورمەتی، ڕەنجبەری، جووتێری، گێرە و کێشە، دروێنە، دەسکەنە، ئاوداشتن، نەحەسانەوەی شەو و ڕۆژ، مانگ و ساڵ، شوانی، شوانی، تەنیایی، تەنیایی، دڵ! دڵ! دەردی دڵ! دڵ پێوە بوون! لە ڕووهەڵنەهاتن، نەداری، دەسکورتی، خۆبەکەمزانی، سەگ وەڕی حەوشە، بیری بەربلاوی کۆ کردەوە هێنایەوە سەرخۆ، کەوشەکانی خستە سەرپێ لە دەرگاوە سەری کێشا حەوشە. سێ سەگ گەماوەری دەرگای حەوشەیانداوە. تەقەی دەرگای تەنەکە و شالاوی سەگەڵ، خاوەن ماڵی کێشاوەتە حەوشە:

ـ کێیە، کێی؟ دەرگاکە مەکەوە، ئەوە هاتم چغە چغە ، کێیە؟

ـ منم ـ کوێخاکەریم، حەمەگیان! لە ماڵی؟ حەمە واق بردوویەتەوە! بە لەتوکوت جوابی داوە:

ـ بە، بە، بەڵێ، فەرموو وەرە ژووری مام کوێخا. کوێخا هاتۆتە حەوشە، هەر دووکیان بێ دەنگ وێستاون، ڕەنگیان پەڕیوە. حەمە لە شەرمان و کوێخا لە ترسان! کوێخاگوتی:

ـ باش بوو زوو دەرگاکەم پێوەدا، دەنا دەیانخواردم! ئەو سوور بەڵەکەیان لەوەدا نەبوو، زۆر دڕە! ئەوە لە جسنی کامە سەگە؟ گەلاز؟ لە جسنی دێڵە بارێکی ماڵی مام حەسەنە.

ـ زۆر جسنە، ئەگەر لە کێویش لێ بکا، سەگی چاکە. هەر خۆت لە ماڵی؟

ـ بەڵێ، دەفەرموو، جێگەت خراپە. حەمە شانبەشانی کوێخا دەڕوا، لای سەگەلی لێ گرتووە، کوێخا لە پێشەوە و حەمە بە دوویدا، چوونەتە ژووری. حەمە لبادی راخستووە دوو سەرینی بۆ داناوە، کوێخا دانیشتوو پاڵی داوەتەوە. خانە خۆی بەگەرمە بە خێرهاتن لە میوان دەکا:

ـ زۆر بە خێر بێی،ماڵی خۆتە، من خاوەن ماڵ نیم.

ـ عومرت درێژ بێ، خاوەن ماڵ خۆشبێ، ئای لەو دنیایە! لەگەڵ حاجی برایمی باپیرت چەندە لەم ماڵەدا دانیشتین، غەرقی رەحمەت بێ، چەندە مەجلیس خۆش بوو! رۆڵە لەگەڵ سەرمای ئەو زستانە چۆن بووی؟ حەمە بەرەو سەوەتەی قاپ و کەوچکەکە دەڕوا، بە شەرمەوە گوتی:

ـ لە سایەی سەری تۆ و هاوماڵەکانەوە، زۆر باش بووم.

ـ ئەی لەگەڵ پوورەگوڵە چۆنی؟ هامۆشۆت دەکا؟ حەمە جامێکی مسی بنداری لە سەوەتەکە دەرهێناوە، سەری سندووقەکەی هەڵداوەتەوە، خەریکە کاکڵە گوێز و مێوژ دەردێنێ،جوابی داوە:

ـ گیانێکم بە پوورەگوڵەیە مام کوێخا! ئەو ئەمەکی دایکێکی دڵسۆزی بە سەرمەوەیە، نان و هەویرم، شیووکوڵم، ئاوردووم، پاک و خاوێنی ماڵم، چاوەدێری کاسپی ساڵانم هەمووی بە ئەستۆی ئەوە، لەوەتی دایکم عومری داوە بە تۆ، پوورە گوڵە جێی دایکمی گرتۆتەوە، نەیهێشتووە بێ دایکیم پێوە دیاربێدا، وەک منداڵی خۆی، دایمە چاوی لە سەرم بووە، جارجاریش لێم توورە دەبێ، خۆت دەزانی ئەو هەر وایە. کوێخا پێکەنی گوتی:

ـ ئا! ئا، ئەو حاڵەتانەی هەر لەگەڵە، بەو توورە بوونەوە جوانە، کەس دڵی لە قسەی ئەو نایەشێ، لای خۆی من کوێخام، جاری وا هەیە سەد قسەی ناخۆشم پێدەڵێ! بەر حوزوور، قسە بە هەمزەبەگیش دەڵێ! حەمە، کاسە مێوژ و کاکڵە گوێزی لە بەر دەمی کوێخا دانا، گوتی:

ـ مام کوێخا! لەگەڵ تفاق چۆنن، لێتان نەبڕاوە؟ کوێخا لاوێچێ مێوژ و گوێزی لە مست کرد، گوتی:

ـ هاتۆتە کۆتایی حەمەگیان، تۆ دەزانی لە کەیەوە زستانە؟ تا کەی بەش بکا براڵە؟ ئەوە چەند ڕوژێکە وشکە دەڕوا، ئەمساڵیش کاوڕە مێوەکانم نەفرۆشتووە، شکور

بخۆرمان زۆره و زستانه‌کەشی له سالان درێژتر بوو، خەڵک بە دەست بێ تفاقییەوە سکالا یانە، حەمە سەری داخستووە هیچ ناڵێ. جاروبار بۆ خانە خوێی کوێخا، دوو سێ دەنک لە مێوژەکە دەخاتە دەمی. کوێخا چاوێ بە ماڵەکەدا دەگێڕێ، هەناسەیەکی هەڵکێشا، گوتی:

ـ دنیا تا سەر بۆ کەس نامێنێ! خاد سەلمەی دایکت، غەرقی ڕەحمەت بێ. چەندە لەم ماڵەدا هەڵسووڕا! حەیفە ئافرەت وانەبێ، کابان لەکرد و بزان، بەکەماڵ و جەماڵ، چوار پێنج ساڵ دوای کا مەحموودی باوکت، بە بێوەژنی دانیشت، خوا نەکا کەس قسەیەکی لێ بیستبێ، یاڕەبی بە حۆری بەهەشت بێ، خوا عافووی کا.

ـ خوا دایک و باوکت عافووکا مام کوێخاگیان. هەر دوو بێ دەنگ بوونەوە. ماوەیەکە بێ دەنگن کوێخا گوتی:

ـ حەمەگیان! بۆ هیچ ناڵێی؟

ـ چیت عەرز کەم؟

ـ بۆ ناڵێی بۆ هاتووی؟

ـ جا تۆ ماڵی خۆتە، من خاوەن ماڵ نیم.

ـ خاوەن ماڵ خۆشبێ کوڕم، بیستوومانە پاییز گوتووتە شوانی ناکەم! بۆ نایکەی؟

حەمە، بە شەرمەوە سەری داخست، چاوی بڕیوەتە سکڵی دامردووی تەنوورەکە بە چیلکەیەک ئەرز هەڵدەکۆڵێ، دەیەوێ بڵێ و لە ڕووی هەڵنایە، دەستی بە چیلکەکەوە دەلەرزێ، کوێخا تێگەیوە کە شەرم دەکا، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ شەرمی ناوێ کوڕم، چی لە دڵت دایە بیڵێ، تۆ شەو و شەونەخوونی دەکێشی، شوانی چاکی و خەڵکەکە لێت ڕازین، لەوەتا تۆ شوانی، گوێ بەڵێ لە نێو نەچووە، ئێستاش منیان ناردووە بزانم دەڵێی چی؟ لەگەڵ مەڕەکە دەچییەوە؟ حەمە هەروا ماتە. لە دڵی خویدا دەیگوت:

ـ ئەمساڵیش دەچم، ئەگەر شوان بم، زوو زوو کەوێ دەبینم، با منەتەکە بخەمە سەر شانی باوکی، سەری هەڵینا، گوتی: ـ گوتوویانە حەمە مەڕەکە باش ناڵەوەڕێنێ، ئەگە وایە بۆ دەمکەنەوە بە شوان؟ بێ فایدەیە با دڵمان لە یەک نەیەشێ مام کوێخا.

ـ کێ گوتوویە؟ ئەوەی وا دەڵێ، مەڕ لە مەڕ ناکا، کێ بووە؟

ـ فەیزە درێژ و فەتاحە کوێر.

ـ حەح مالتە؟ گوتم داخوا کێ گوتوویە!! جا ئەوانە چین؟! هەر بە ئاوەدانیشیان مەزانە، عەسلی خۆی هەر مالیشیان مەچۆ، لە نۆرەکەی ئەواندا وەرەوە بۆ مالی ئێمە، هەر ئەمسال دێلم شوانی دێ بێ، سالێکی دیکە بە تەنیا شوانی خۆمی، هەر ئەمسالمان زەحمەتە، ئەمسالیش کاوڕەکان نافرۆشم، هەستە با بڕۆین، خەلکەکە لە دەرگای مزگەوت چاوەڕێن. حەمە گوتی:

ـ لە ڕووی تۆ داماوم! تۆ نەهاتایەی، نەمدەکرد، ڕاوەستە با سەری تەنوورەکە بنێمەوە.

ئاسمان وەک دەریای بێ سنوور، هەتا تەیرە تیژ بالەکانی چاو هەتەر دەکەن، هەر شین دەکاتەوە، تەناتەت کاکلە هەورێ وەبەر چاو نایە. هەتاو لە سەر دێیە. سێبەر کورت بۆتەوە، نزیکەی نیوەڕۆیە، بن دیوار گەرم بووە. مەڕ دارەکانی کانی توو لە بەر بەڕۆچکەی دیواری مزگەوت خۆیان هەلخستووە، باسی بێ تفاقییە. حەسنە کەچەل گوتی:

ـ مالی کا سالە ئاوەدان بێ، ئەو نەبوایە، دەبوو بە کەر و ڕەشکەوە وەدێ بکەوتایەم، سوالی پاشا خوڕم بکردایە، باش بوو فریام کەوت، سالە شانی هەلتەکاند، گوتی:

ـ لە زووەوە گوتوویانە، کەس لە کەس ئاوس نابێ، کەلک لە کەلک ئاوسە، من سالی بەفرە زۆرەکەم هەر لە بیرە، خوا کەرەمی باوکت، خوا لێی خۆشبێ، لەو بێ دەرەتانییەدا سێ باری کا دامێ کەوتمە فەرعانە. فەیزە درێژ هەلێدایە:

ـ خوا حەز بکا، کلاو چەرخانێکی بەسە، بەهارە، لەوە بە دوا وردە مال لە خەم دەرەخسێ. حەمەی نەنەخەجێ پەڕیە نێو قسەکەی فەیزەوە:

ـ ئەوە دەلێی چی، کا فەیزوولڵا؟! ئەوە گریمان وردە و وشکە مالی ڕۆیی، ئەی مانگا و گا جووت و بێچوو چی؟ ئەوانە سەوزالفیان ناوێ؟ بە خوا خەمی دنیام لێهاتووە، ئەگەر بەشی سێ ڕۆژ سەوزالفمان مابێ، باشە. حاجی قادر بە نووکی گوچانەکەی لە ئەرزەوە دەژێنێ، گوتی:

ـ ئەوە هەر دەردی تۆ نییە حەمە، کەس هیچی نەماوە. مام ڕەسوول و سۆفی مینە دامە دەکەن، بە دەم کایەوە، مام ڕەسوول گوتی:

ـ حاجی، سالی گرانی و قاتوقریەکەمانم وەبیر دێنیتەوە، کورە خۆ وانییە، چی زۆرە تفاق براله، کێ لێی براوە، بێ لە ماڵی من تفاق بەرێ، بۆ گرانیت گرتووە بە دەمەوە حاجی؟! خۆ تۆ بە قەد تەواومانت تفاق خستبوو. سۆفی مینە چاوێکی قرتاند گوتی:

ـ کورە، حاجی بەراستی نییە! شکور زۆری ماوە! عەلی کوڕم دەیگوت، چوومە کادێنەکەی ماڵی حاجی بۆ داس، کادێنە سەروەکەیان مۆرێ نەشکاوە، حاجی هەستاوەتە سەرپێ، چاو بە خەلکەکەدا دەگێڕێ، لە خۆیدا سوور پێستە، ئەوندەی دیکە سوور بۆتەوە، ڕەگی لاملی ئەستوور بووە، دەستی بە گۆچانەکەوە دەلەرزێ، دەگوڕێنێ.

ـ ئەی ڕووی ڕەش بێ، بە مەرقەدی کاکە حەمەدی سولەیمانی درۆی کردووە، سۆفی! تۆ بە لای ناخێرت! بۆ بوختان دەکەی؟ فەتاحە کوێر قسەکە بە حاجی دەبڕێتەوە، گوتی:

ـ ئەوە کوێخا کەریم هاتەووە، حەمەشی هێناوە. هەموو هەستاون دەستیان داوەتە بەر چاویان و بێدەنگ بوون، حاجی هەر مۆڕە لە سۆفی مینە دەکا. کوێخا لە دوورەوە بانگی کرد:

ـ خزمەکان! حەمەم ڕازی کردووە ئەمسالیش لەگەڵ مەڕەکە دەچێ، ئەوەش خۆی، خۆتان قسەی لەگەڵ بکەن. هەموو چاویان لە دەمی مام حەسەنە.

مام حەسەن خەزووری کوێخا کەریمە و لە هەموویان بە تەمەنترە. لە سەر خواجە نشینەکە دانیشتووە. کیسە تووتنەکەی دەرهێناوە، پزووەکەی لە بەریەک دەرەوێنێتەوە، قەفنەکە لە باخەڵی دەردێنێ، سەر قەفنە دەکا بە نێو کیسەکەدا بە قامکە کەلەی، وردە تووتن لە قەفنە دەخنێ. چەرخ و پووشووی دەرهێناوە لێی ئەدا و ...تاد پوشوو گرتوویە، ئاوری پووشووی ناوەتە سەر تووتن مژی لێ ئەدا و لێی ...رتاد دووکەڵ بە کونە لووت و ئەملا و ئەولای باسقەنەدا دێتە دەرێ، دەموچاوی وندەکا، دوو سێ جار بە دەم مژلێدانەوە دەکۆخێ، دەمی لە باسقەنە کردەوە و گوتی:

ـ کوڕم حەمە! ئێمە وەک شوانێ چاو لە تۆ ناکەین، لە قەدیمەوە گوتوویانە دار لە لەلەدا دەشکێ، دار و لەلەی خۆت دیاریکە، ئەمساڵ چۆن لەگەڵ مەڕەکە دەچی؟

ـ مامەگیان! خۆمنیش بە چاوی بێگانە تەماشای ئێوە ناکەم، بەڵام قەرار و بڕیە ببێ باشە.

ـ دەی باشە ڕۆلە شەرم مەکە، ئەوەی لە دلتدایە بیلێ.

ـ پار جووتی سێ ربە گەنم بوو، ئەمساڵ بیکەنە چوار ربـە، دیـارە وەک سـاڵانیش کراس و دەرپێ تا بدرێ و پێڵاوم ئەدەنێ. ماڵی خورییەک و نیـو سـیە رۆن، دوو سـیە پەنیریش لە سەر بەراتە، پێویست بە گوتن ناکا بڵێم، هەر حەوتەی لە ماڵێکم، هەر وەک ساڵان، نانە سەگیش لە سەر ئێوەیە، بە مام کوێخاشم گوتووە، دوو ماڵ نـاچم، دوو مـاڵ قرتکەن، لە کوێوە دایدەمەزرێنن، کەیفی خۆتانە. حاجی قادر گوتی:

ـ ئەشهەدوو زۆرە، فەیزە درێژ و فەتاحە کوێر قسەکەی حاجی دەسەلمێنن. کوێخـا قسە دەبڕێتەوە:

ـ لەسەری مەڕۆن، چاوتان لەوەوە نەبێ، حەمە شوانی چاکە. کـوڕم حەمـە! ئـەوەی داوات کرد، ئەتدەینێ، لە نەورۆزەوە مەڕی خۆت لێخوڕە لە قسەکەی کوێخـادا کـەس قسەی نەکردەوە، بەڵام هەموو لە قسەکەی حەمە دڵ کرمۆڵن، لە یەکتر دەپرسن:

ـ بڵێی ئەو دوو ماڵە ماڵی کێ بێ، دەڵێ ناچم؟!

## ٢

ئاوری نەورۆز کراوەتەوە. خاکەلێوەیە، سەری سالە و بنی مانگ، دار و لەلە بۆ شوان و گاوان و رەنجبەر دیارییە، سەر لە نوێ گیرانەوە، کاردارو خاوەن کار سەر و دلخوش.
حەمە، گەلاز و ورچە و بۆرەی وەدووی خستووە لە ناوەراستی ئاوایی وەستاوە.

هاواری «مەڕ ڕۆیی» شوان لەم پەڕوئەوپەڕی دێوە دەنگ دەداتەوە. دەستە دەستە مەڕ بەرەو پەچە وەڕێ خراون.

کەوێ کچە کوردیکی بالا بەرز، بەژن ڕێک و بە دیمەن، شۆخ و شەنگ، قیت و لەخۆبایی، ڕەزا سووک و لە دلەوە نزیک، توندوتۆل بە رەوتی کەوان، لەنجەیەکی تایبەت بە خۆی بە دووی کەرتە مەڕەکەی کوێخا کەریمەوە بەرەو پەچە دەڕوا، خۆی دەلەنگێنێ.

پەلکە شۆڕەکانی چوار قامک لە ژێر کۆلوانەکەیەوە سەریان وەدەرناوە، بە هەوای رەوتی سەما دەکەن. لەگەل هەر هەنگاوێکی، لەرەی مەمکی کەروێشکە دەخاتە سەرسینگ و بەرۆکی، وەکو شەپۆل هەلدەستێ و دەنیشێتەوە، مەلەوانی ئەوینی گێژ دەکا و دەیخنکێنێ.

کەوێ مەڕی لە پەچە کردووە، لە گەڕانەوەدا گورگە ئاوڕێ ئەداتەوە بە سیلەی چاو دەڕوانێتە شوانە بزەیەکی سیحراوی لە سەر لێوە! گورجێ ڕوو وەردەسووڕێنێ، بەرەو مال دەبێتەوە، هەتا لە چاو وندەبێ، حەمە گێژومەنگ چاوی لێ ناتروو کێنێ.

مەڕ لە پەچەکۆ بۆتەوە. شوان یێخە لە بزنەگەل دەکا، مەڕ بە دووی بزندا بەرەو کێوە بەرداویلەی پشتی مالان وەڕێدەکەوێ.

مێگەل پەل ـ پەل، پەلی هەلخستووە. حەمە لە بەرزاییەوە، لە دوندی کێوە. گەلاز لە کەوانەوەیە، ورچە و بۆرە ئەمشان و ئەوشانیان گرتووە. گیا سەری لە خاک وەدەرناوە، مەڕ لێوە دەکا، بە خۆلەوە دەیپچڕێ و بزن بە تاشە بەردا هەلدەگەڕێن، گیا بەرزە وشکەکان دەکوڕووسێننەوە.

مێگەل خۆرەتاوی کێوە بەرداویلەی گرتۆتە بەر. حەمە لە ترووپکی کێـو، لـە سـەر بەردێ بەرانبەر بە نێو دێ دانیشتووە، بە هەوای شوانە شوانە لە شمشاڵ دەتووڕێنێ.
فووی کوورەی دەروونی دەکا بە گەرووی ساردوسڕیدا، دڵی بێ دڵی وەناڵە دەخـا. وشە بە وشە بە کونی شمشاڵدا دێنە خوارێ:

شوانــە هۆ شوانـــە! شــوانی رەنــجەڕۆ
بســـتێ منداڵ بووم قــەولم دا بـــە تــۆ
حەوت ساڵە شوانــم بــەو هـــەردانــەوە
دەتلێم شــــەو و ڕۆژ بـــەو دەردانــەوە
حەوت ساڵ شوان بووم قەدریان نەزانیم
کـــاورێکیان دامێ بــۆ شـــەرتە شــوانیم
گورگی ماڵ کاول لێم بــوو بـــە دوژمـــن
کاورەکەی خواردم، من چی بدن بە ژن؟!

لەو دەمەوە کەوێ لە بەر هەیوانەوە، گوێی بۆ دەنگی شمشاڵ ڕاگرتووە، حەمە چاوی لێیە، کەوێ ئەژنوێ شل نابێ، هەر وەستاوە! حەمە یەک بین لێوی ناوە بە شمشاڵەوە! بێ ئەوەی پشووی سوار بێ، لێی ئەدا.
مەڕ لە کێوە بەداویلە ئاوا بووە چووە بــە دیــوی هوولەکانــدا، نــەدیوە، کــەوێ بــەر هەیوانی بەرداوە، حەمە لێو لە شمشاڵ دەکاتەوە، وردە وردە وەدوویان دەکەوێ، بە دەم خەیاڵەوە لەگەڵ خۆی ئەدوێ:
ــ نۆرەیان دامەزراندووە، لەم شەوەوە لە ماڵی مام حەسەنم، حەوتەکەی دیکە لە ماڵی حاجی قادر، دوای ئەوان، ماڵی مام ڕەسووڵ و ماڵی سۆفی مینەیە لە دوای ئەوانیش، ماڵی کوێخایە. بە قامک دەیبژێرێ، چوار حەوتە دەخایەنێ، مانگێ لە بەهاردەڕوا جـا میــوانی کەوێ دەبم! قەیناکە، ماڵی مام حەسەنیش هەر بۆنی ئەوێی لێدێ هەوەڵ جاریش لــەوێ دڵم کەوێی گرت، شەوی قورشێلانەکە بوو، بڵێی ئەویش دڵی بە منەوە بێ؟ دەبێ هەر وا بێ، ئەگەر وانییە ئەو سیلەی چاو و بزەیە چییە؟ با ئەو مانگەم لێ بڕوا، دەرفەت بێ پێــی دەڵێم، یان گاڵ دێنێ، یان پەموو، مانی وا بــە کــاری چــی دێ؟ خــەو و خــوراکم لــێ

هەڵگیراوە! بە جارێ لـە زەرافـەت کـەوتووم! ئاوێنـەی دەرهێنـاوە، تەماشـای خـۆێ دەکا.دەیەوێ هێندەی بیر لێ نەکاتەوە، بە خۆی نییە! کەوێ تێکەڵی بیر و مێشکی بووە! ساتێ لێی دوور ناکەوێتەوە ماوەیەک مات دەبێ، پاشان خەیاڵ هەڵیدەگرێتەوە.

بە خەیاڵ ساڵ چۆتە سەر و شەرتی پەڕیوە! بەراتی کۆ کردۆتەوە، سی و سێ تەغارە! سی تەغار پاشەکەوتەی لە چاڵدایە! پەنجا تەغاری دەکا بە پـووڵ! بـە کـەوێی گوتـووە قەولی داوەتێ! لە باوکی ڕادەسـپێرێ، ئـەویش دەیـداتێ! چرنـە و پرنـە تێـرژاوە! ژن مارەکردنە! پوورە گوڵە دلسۆزانە قۆڵی هەڵماڵیوە، میوان بەڕێ دەکا! جـل هەڵـگیراوە، خەنە بەندانە! بووک سازکراوە، برازاوا سوار بوون! جلیتان و ڕمبازێنی سوارەیە! بـووک سوار بووە! خۆی لە سەربان وەستاوە. سێوێکی بە دەستەوەیە، بۆ بـووکی دەخـا! لـە پـڕ پۆلێ کەو لە پێش مەڕەوە دەفڕێ، مەڕ دەسلمێنەوە، گەلاز دەوەڕێ و حەمە لەو خەیاڵـە شیرینە ڕادەپەڕێ! ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە بەو خەیاڵەوە ڕایدەبوێرێ.

ئێوارەیە، مەڕ ڕژاوەتە نێو دێ، ژن و پیاو تێرژاون، مـەڕە نـەهاتوو دەبەنـەوە. ئەحمەدی مام حەسەن بە پیری حەمەوە دەڕوا، لە دوورەوە، دەم بە پێکەنین گوتی:

ـ ماندوو نەبی شوانە!

ـ سلامەت بی، کاکە ئەحمەدگیان! خۆت ماندوو نەبێ، هاتووی لە دووی من؟

ـ جا تۆ لە دوو هاتنت دەوێ؟ باوکم ناردوومی، دەیگوت نەوەک شەرم بکـا، ئـاخر ئەم حەوتەیە نۆرەی ماڵی ئێمەیە. حەمە سەری بەرداوەتەوە، لە شەرمان سوور هەڵگەڕاوە، ئەحمەد و حەمە نێوانیان زۆر خۆشە، ئەحمەد خالی کەوێیە، لـەو دەمـەوە کـە دڵـی بـە کەوێوەیە، ئەوندەی دەیبینێ ئارەقەی شەرم دەڕێژێ. بە شەرمەوە گوتی:

ـ کاکە ئەحمەدگیان! تۆ بڕۆوە، با گوێدرێژ و کەلوپەلەکەم بەرمەوە، خۆم دێم.

تاریکە، سیرە هەڵگیراوە، بەرخ تێبەر بـووە، هـاوێرکراوە، مـەڕ و بـەرخ تاسـەیان تێکشکاوە و لە کاڕە کاوتوون.

پوورە خەرامان لە سەر بەرماڵە، بە گرێی قامکەکانی ئەڵلا ئەڵلا دەکا. مـام حەسـەنی مێردی نوێژی شێوانی خوێندووە، لای سەرووی ماڵەوە پاڵیداوە بە دەستە نوێنەوە، قەنـە دەکێشێ. کوانوو لە قوژبنی ماڵەوە دەسووتێ، دیزە لە سەر کوانووە دەکوڵێ. دووکەڵـی کوانوو، هەڵم و هالاوی دیزە و دووکەڵی قەنە، ماڵەکەی تاریـک کـردووە، بـە حـاڵ سۆڵەی لامپا دەنمرەکە دێ. حەمە لە حەوشەوە بانگ دەکا.

ـ مام حەسەن! ئیزن هەیە؟ مام حەسەن دەنگی حەمە دەناسێ. جوابی ئەداتەوە:

ـ هاتی حەمەگیان؟ وەرە ژووری وەرە. ماندوو نەبی!

ـ ئیماندار بی مامەگیان خوا عافووت کا.

ـ ئەحمەدم نارد لە دووت، نەتدی؟

ـ بەڵێ دیم، نەهاتۆتەوە؟ لەو قسانەدا بوون، ئەحمەد خۆ دەکا بە ژووردا، حەمە لە بەری هەڵدەستێ، ئەحمەد بە گەرمە بە خێرهاتنی لێدەکا. پوورە خەرامان لە سەر بەرماڵ هەستاوە، ماندوو نەبینی لە حەمە دەکا، کوورە کوورێ دەڕوا بە لای شێو هێنانەوە. کوڕانی مام حەسەن و بووکەکانی لە تاقەت کردنی مەڕ و پاتاڵ تەواو بوون، یەک بە دووی یەکدا هاتوونە ژووری و ماندوو نەبینیان لە حەمە کردووە.

شێو خوراوە. بەهارە، خوێنجمانە، خەو خۆش بووە، شەوگار کورتە. حەمە هەستاوە بڕوا. مام حەسەن گوتی:

ـ حەمە؟ ئێواران خۆت وەرەوە کوڕم، خەرمان! ئافرەت! نان و پێخۆر و نانە سەگ بۆ حەمە سازکە، ئەگەر سەولە هەیە، بۆ بەشدار زۆر باشە. پوورە خەرامان نان و پێخۆر و سەولەی بۆ پێچاوەتەوە، حەمە چارەکە نانی هەڵگرت و بەرەو ماڵەکەی خۆی رۆیشتەوە.

چوار حەوتە، هەر حەوتەی لە ماڵێ بەسەرچووە. ئاخر شەوی خاکەلێوەیە. شەوگار ئاهێکی بە دەمەوە نەماوە. خەڵک ماندوون، کەس خۆ ناگرێ. حەمە ماڵ ئاوایی لە ماڵی سۆفی مینەش دەکا.

یەکەم شەوی مانگی گوڵانە. داری ئاواتی دڵی حەمە هاتۆتە بەر، لە پشکووتنە. مانگێکی رەبەقە ئەو شەوە بە ئاوات دەخوازێ. لە نێو ژوورەکەیدا دێت و دەچێ، چۆتە بەر ئاوێنە تەماشای خۆی دەکا، سەروملی چلکنە، ڕیشی هاتووە، کوانوو دەکاتەوە و ئاو وەسەر دەنێ. ئاو گەرم بووە، لەسەر سەر شۆرکە خۆی دەشوا، لەبەر لامپاکە ڕیشی دەتاشێ دەستە جلەکەی لە سندووق دەرهێناوە، لەبەر شەوقی لامپاکە دەیانکاتەوە. دەستی ڕانگوچۆخەی بووزووی شینکی کۆن، سەر چۆکی ڕانک و ئانیشکی چۆخەکەی شی بوونەتەوە. کراسی سپی سۆرانی دار، ملیوان نەخشاو بە دەزووی ڕەش، دەسکاری پوورە گوڵەیە. کەوای قەنەوزی مۆر، پشتوێنی چیتی ڕەشی گوڵ ورد، شەدەی رشوەدار،

کڵاوی سپی نەخشین، ئەمبار و ئەو باریان دەکا، لە ژووری سەری دایاندەنێ و لـە جـێ دەخزێ.

ماوەیەکە ڕاکشاوە. ئەمشان ئەوشانییەتی، خەوی لێ زڕاوە، ڕایەڵە خەیاڵی ناوەتـەوە پۆی بیری تێوە ئەدا:

ـ بەیانی مەڕ بێنێ پێی دەڵێم! بڵێی چی بڵێ؟ ڕەنگە پێی خۆش بێ! تا ئێـستا هـیچم پێ نەگوتووە، خۆ ئەو بە من ناڵێ! دەزانم ئەو پێی خۆشە. ئەگەر پێی خۆش نییـە بـۆ بـە دەممەوە پێدەکەنێ؟ تا ئێستا کەوێ بە دەم کەسەوە پێنەکـەنیوە! ئـەویش مـنی خـۆش دەوێ، دڵ ئاوێنەی دڵە، بەیانی لە ڕێوە پێی دەڵێم! مۆتەی خەو نیـشتۆتە سـەر پێلـووی چاوی، قورسی کردووە، چاو گەرمی خەوە.

کەوێ کراسێکی هاوداوێنی لەبەر دایە، پەلکە ڕەشە درێژەکانی کراوەنەتـەوە و بـە شانە کراوە، لەگەڵ داوێنی کراسەکەی لە ئەرز کێڵە دەکا.

کەوێ لەوبەری چۆمەکەوە وەستاوە و ئامێزی بۆ گرتۆتەوە. چۆم هەر دێ و زۆرتـر دەبێ، ئاوەکە ئەوندە ڕووناکە چاوی لەبەری هەڵنایە. حەمە دەیەوێ بچـێ بـۆ لای، ئـاو بوار نادا. بانگی لێدەکا، هاڕەی ئاو بەسەر دەنگی حەمەدا زاڵە، لە گیانی دەبوورێ خۆ لـە ئاو دەخا. چۆم بووە بە دەریا! هەر دەڕوا و ناگاتە ئەوبـەر! شـەپۆل هەڵـیدەگرێ بـەرەو شوێنەوارێکی نەناسراوی دەبا. حەمە لە ئاو دەپەڕێتەوە. کەوێ لە دوور وەستاوە، باوەشی بۆ گرتۆتەوە. حەمە هەنگاو هەڵدەگرێ بڕوا، لاقی یاری کار نییە! ئەژنۆی دەنووشتێتەوە! ئەرز بۆشە لە ژێر پێیدا، قووتی ئەدا! ماندوو کەلەلا خۆی دەگەیەنێتە کەوێ! نزیکبۆتەوە، دەست بۆ لای یەک درێـژ دەکـەن. سـەر پەنجـەیان لێکدەکـەوێ، گێژەڵـووکەیەک هەڵدەکاتێ، وەک بابردەڵەیەک کەوێ دەڕفێنێ! حەمە چاوی لێیە کەوێ لە سەر شـاخێ گیرساوەتەوە، وەدووی دەکەوێ. کێو ئەوندە بەرزە کەس ناتوانێ لێی وەسـەر کـەوێ! با کراس و پرچە درێژەکەی دەشەکێنێتەوە. حەمە هەست بە کەوتنی کـەوێ دەکـا بـە چنگەکرێ لە کێو وەسەر دەکەوێ، نزیک بۆتەوە، دەیەوێ دەستی بگرێ، حەمە پێی لـە سەر بەرد دەخزێ، لە تاش بەردەبێتەوە، یەک بە خۆی هاواردەکا! لە دەنگـی خـۆی بـە چەشنێ رادەپەڕێ کە چاو دەکاتەوە، لەسەر جێ بە پێوە وەستاوە! ماوەیەکە بـێ تـەکان وەستاوە، دەلەرزێ، عەبەساوە، گەرووی وشـکە، هەناسـەی سـوارە، لەشـی لـە ئارەقـدا خووساوە، چاوی لە ڕەشەوە دێ، سەری گێژ دەخوا، لە سەر جـێ دادەنیـشێ، وردەوردە

وەهۆش دێتەوە، نێوی خودا و پێغەمبەر دێنێ، گـڕی لامپاکـە هەڵدەکێشێ و بـیر لـە خەونەکە دەکاتەوە:

ـ خوایە بەخێری بگێری! ئەو خەوە چـی بـوو؟! بـە ئاوەکـە دڵخۆشـە، بـە کراسـە سپیەکەی کەوێ نیگەرانە! ئەی ئەو بایە چی بوو؟! نەکا کەوێ لە من دوور کەوێتـەوە؟! یا خوا خێر بێ، سەدەقە ڕەتی بەلایە، سەدەقەی بۆ دەکـەم. دڵخۆشـی خـۆی دەداتـەوە، دەڕواتە حەوشە، ئاو دەخواتەوە، دێتەوە ژووری دەخەوێتەوە.

بەیانییە، ولات ڕووناکە، دۆست و دوژمن لێک دەکرێتەوە، کەوێ بە دەنگـی مـەڕ ڕۆیی حەمە لە خەو رادەپەڕێ، خۆ کۆ دەکاتەوە، دێتە دەرێ. لە جیرەی دەرگا، کوێخـا وەخەبەر دێ گوتی:

ـ کەوێ ! تۆی؟

ـ بەڵێ منم، مەڕ ڕۆیی دەکا.

ـ نان و پێخۆرەکەت لە بیر نەچێ کچم، بە حەمە بڵێ ئێوارە بێتەوە بۆ ئێرە، نـورەی خۆمانە. کەوێ مەڕی لە حەوشە کردۆتە دەرێ، خۆی گەڕاوە بۆ نانەکە.

مەڕی بێ خاوەن دوور لە کولانەوە وەدەردەکەوێ، حەمە لە پەچـەوە چـاوی لێیـە. مچوڕکێ وەک هەورە برووسکە بە لەشیدا دێ، پشتی دەلەرزێنێ! بـەر چـاوی تاریـک بووە!

ـ ئەی کەوێ کوا؟! خەوەکەم بە ڕاست نەگەڕێ؟! بێ ئێختیار ڕوو دەکاتە مەڕێ بێ خاوەن. حەمە گەیوەتە نێو کۆلان، کەوێ لە سەری کۆلانەوە وەدەر دەکەوێ. حەمە هێز و گوڕ دەگرێتەوە، لە جێی خـۆی وەسـتاوە، کـەوێ بـەرەوڕووی دێ، لێـک نزیـک بوونەتەوە، چاویان لە چاوی یەک بڕیوە، چاو لە تروو کـان کـەوتووە، خۆیـان لـە نێـو گلێنەی چاوی یەکدا دەبینن! کەوێ بە شەرمەوە تەماشای دەکا، بزەی جارانی لـە سـەر لێوە، بزە تێکەلاوی لەرەی لێوە. حەمە بووە بـە پەیکـەرە! عەبەسـاوە، قـسەی لـە بـیر چۆتەوە! کەوێ دەستی بە پرێسکە نانەوە درێژ کردۆتەوە، حەمە دەستی بەرەو لای نـان دەکێشێ، چارەکە نان بە دەستی هەر دووکیانەوەیە، حەمە لە ژێرەوە پەنجـەی گرتـووە دەیگوشێ. کەوێ بە دەم بزەی لەرزۆکەوە گوتی:

ـ ئێوارە وەرەوە بۆ ماڵی ئێمە، پەنجەی لە نێو پەنجەی حەمە دەردەکێـشێ، بـە پەلـە بەرەو ماڵ دەڕواتەوە.

خۆر و بان لە هەموو لایەک کەوتووە. کەویَ مات و گێژە! دەڵێی کەوی بەفرە و پلاری ڕاوچی وەسەر کشاوە! کار کەوتووە بە سەر کاردا، دەستی ناچێتە هیچ کاریَ، حاڵەتێکی سەیر ڕووی لیَ ناوە! دەڵێی نەخۆشە! دڵە خورپەیەتی! دەلەرزیَ! بیَ هێزە! نیوی باری گرتووە، ئەژنۆی دەلەرزیَ! دەڵێی ناوکی کەوتووە! برسیەتی، ئیشتیای هیچ نابا! بیَ ئۆقرەیە، هەست بە شادی دەکا، نیگەرانە! خۆشی لە خۆی ناگا!!

بۆرەی مانگا و گوێلک کەویی هێناوە سەرخۆ. دەستی داوەتە مانگا دۆش، بەرەو تەویلە دەڕوا، گوێلک دەکاتەوە، دەیخاتە بەر مانگا و گوێلکەی دەکا، مانگا شیری داداوە، گوێلەوساری گوێلک دەگریَ. لە بەر دەمی مانگا دەیبەستێتەوە، مانگا دوشی ناوەتە بەینی هەر دوو ڕانی و لە ژێر گوانیدا رایگرتووە. خوشەی شیر و هاڕەی مانگا ڕەش کەویی خستۆتە بیری لاواندنەوەی مانگا، بە سۆزی دەردوونەوە دەڵیَ:

ئەی نایە، وەی نایە، دەنگی چووکەڵە سوارەکەی خۆم نایە،
شەرتە ئەگەر بێتەوە لەویَ کاولە حەسایە،
بۆی هەڵدەگرم کلیلی تەوقان، تەلەسمان،
گواران، کرمەکان، زەبەرجەدان، یاقووتان،
هەتا غەوسەکەی ماڵ لە بەغدایە،
بۆمان دەکا هیمەتیَ لەگەڵ ئەویَ تکایە،
هەر وەکو باخچەی کوڕە فەقێیان.
سیَ شەوان بە شەوی پاییزیَ، سیَ ڕۆژان بە ڕۆژی بەهاریَ،
بە نووکی قەڵەمیَ لێی بکاتەوە متالایە.

شیر و کەف لە مانگا دۆشەوە وەسەرکەوتووە. کەویَ مانگا دۆشی لە ژێر گوانی مانگا دەرهێناوە، گوێلەوساری گوێلکی کردۆتەوە، گوێلک تێبەر بووە. کوانووی حەوشەی کردۆتەوە، شیری وەسەر ناوە، کەوتۆتە بیری ئاو هێنان.

دوو گۆزەی دەست داوەتیَ، دەڕوا بۆ کانی. دەستەیەک ژن لە سەر کانی، بەر پلووسک چۆڵە، کەویَ سلاو دەکا، گۆزەی وەبەر پلووسک داوە، گۆزە پڕ بووە، کەویَ بیَ وێستان دەگەڕێتەوە. ژنان چاو لە یەک دەکەن، فاتمی خێزانی فەیزە درێژ بە توانجەوە گوتی:

ـ کچی قەڕاڵی فەڕەنگە! دایک خۆڕەنگ! ئەیەڕو خۆ دەعیەی نەهێنا لامان ڕاوەستێ! وا نەدڕاوە بدووردرێتەوە! کچە کوێخایە! زارای خێزانی فەتاحە کوێر دەنێتە پاڵی فاتم:

ـ جا دایکم بۆ بە دەعیە نابێ؟! هەر چاکە سلاویش دەکا! تاقە کچی کوێخایە، ئاغاو کوێخای ئەو دێیە هەر خۆیەتی، بکوژ و ببڕ هەر ئەوە، بڵێ تێژ، تیژە، بڵێ کول، کولە. مینای حاجی قادر دەستە خوشکی (کەوێ)یە، لەو قسانە قەڵس بووە، لە زارا وەجواب دێ.

ـ بۆ بوختان دەکەی خات زارا؟! ئەسقەزا کەوێ ئەوانەی نییە، داخوا چۆنە! پوورئامان گوتی:

ـ ئەوندەی لە سەر مەڕۆن! بەشەر تاو تاوە، دەنا کەوێ فیز و دەماری نییە، زۆر خۆش مەشرەفە، کەس سلاوی پێش سلاوی ناکەوێ، دادەی زارا! ئەو گۆزانە بنێ سەر شانم، ئێستا شیرەکەم هەڵچووە.

مینا کەوێی لە سەر کانی کز هاتبووە بەر چاو، بە بیانووی کارەوە چووە ماڵی کوێخا و لە گەڵ کەوێ لە حەوشە وێستان. مینا سەری قسەی وەدەر خستووە کەوێ دەدوێنێ:

ـ لە کانی کز هاتییە بەرچاوم؟! ئەوانەی لەوێ بوون، تێت گەیبوون! نەخۆشی؟

ـ نەوەڵلا.

ـ ئەی بۆ کز بووی؟ ئێستاش مات دیاری! بۆ دەنگ ناکەی من تۆم ناسیبێ، شتێک بووە! لە منی دەشارییەوە؟ خۆ من هیچ لە تۆ ناشارمەوە، تۆ خودا چی بووە کەوێ؟ کەوێ بە بزەوە گوتی:

ـ مینا گیان! ئاخری بۆم دەرکەوت ئەویش منی خۆشدەوێ! مینا چەپۆکێکی دا بە سەر (کەوێ)دا، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەی داوەشێی دێلە گەوجە! نەمگوت شەرم دەکا؟ بە قسەی منت نەکرد؟ دەنا حەوت زەمان بوو پێم ڕاگەیاندبوو، تۆ هەر دەتگوت با ئەو بڵێ، ئاخری ئەو گوتی، یان تۆ؟

ـ هیچمان! من لێبڕاوانە گوتم پێی دەڵێم، بەلام ئەو دەستی پێش خست بە بیانووی نان وەرگرتنەوە دەستی کوشیم! نازانی چیمان بە سەر هات کچەتیوە نەبێ لەوانە بوو لە شەرمان بمرین! هیچمان قسەمان بۆ نەدەهات! من دەستی خۆمم لە بیر چووبووە، قسەم لە

یر نەمابوو! ئاخری بێ قسە و باس لەیەک هەڵبڕاین، ماوەتەوە ئێواریێ، ئاخر دێتەوە بۆ ماڵی ئێمە، جا نازانم چۆنی لەگەڵ بدوێم؟ زۆر دەترسێم مینا گیان!

ـ دەڵێی من پێی بڵێم؟

ـ نا، خۆم دەمەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم، قسەم زۆرە، ئەوەی خۆم دەمەوێ، تۆ نازانی ئەی بڵێی، دەبێ زۆر بە پارێز بین، نابێ پێمان بزانن، دایمە عەتا وەک داڵ بە سەرمەوەیە! فەیزە درێژی کردووە بە گژمدا، وەک سێبەر لە گەڵمە! زارا ڕۆژ نییە بەرۆکم نەگرێ و پێیم نەڵێ! ئاغا تا ئێستا سێ جار باوکمی بانگ کردووە، داوام دەکا! دەبێ زۆر بە پارێز بین، من وەک هەنگوینی نێو پێستە سەگ وام، هەر کەس دەستم لێدا گلاو دەبێ! زۆر دەترسێم مینا گیان! خۆشم نازانم چی بکەم؟! لەگەڵ کەسێ پێوە بووم هیچی لەگەڵ ناکرێ! کەڵ بە موویەک بەندە! زۆر دەترسێم ئەو خۆشەویستییەی من و حەمە بێ ئاکام بێ، بەڵام لەگەڵ دڵ دەڵێی چی؟ بێتو بزانن دەیکوژن، نازانی لەگەڵ کێ کەلەوەکێشی دەکەین؟ لەگەڵ هەمزەبەگ!! لەبەر ئەوەیە دەڵێم خۆم دەبێ قسەی لەگەڵدا بکەم. لە بەیانییەوە ئۆقرە و هەدادانم نییە. تۆ لە لای حەمە هیچ مەدرکێنە، ئەگەر پێویست بێ، خۆم پێت دەڵێم، ئەو دەم قسەی لەگەڵ بکە. ئێستا بڕۆ بزانین چۆن دەبێ.

ئەو ڕۆژە هەتا ئێواریێ کەوێ حەجمانی نەبوو، ساتی لێ ببوو بە ڕۆژ، ڕۆژی لێ ببوو بە مانگ.

لارە سێبەری کێوە بەرداویلە وەسەر کانی توو کشاوە، دڵی گڕ گرتووی کەوێ فێنک بۆتەوە، چاوی هیوای لە ئاسۆی کێوە. پێشەنگی مێگەل لە ئاسۆگی کێوە بەرداویلەوە سەریان هەڵداوە، مەڕ گوێی لە کارەی بەرخە، دەکاڕێن، کەوێ لە بەر هەیوانەوە چاوی لێیە، مەڕ سەرەو خوار ڕەو دەکەن، دەرژێنە نێو دێ، کەوێ هەڵکێشی هەڵکێشاوە، دەرگای حەوشەی گرتووە، مەڕ بە سەر دەکاتەوە، مەڕ تەواون. دەرگای کۆز دەکاتەوە، مەڕ و بەرخ تێکەڵ دەبن.

تاریکانە، کارە لە دێوە نایە. کەوێ لە حەوشە خۆ بە کارەوە دەخافڵێنێ، کوێخا کەریم لە سەر بەرماڵە. نازەنینی خێزانی خەریکی شێو سازکردنە. تەقە لە دەرگاوە دێ، دڵی کەوێ دادەخورپێنێ! بە پەلە خۆ دەگەیەنێتە بەر دەرگا و دەیکاتەوە، بە دڵە خورپەوە گوتی:

ـ ماندوو نەبی! بۆ وا درەنگ هاتییەوە؟! ماڵی ئێمەت پێ خۆش نییە؟ حەمە بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ من له بهر ئێوه شوانم، لهبهر تۆ کهویێ گیان! جیرهی دهرگا لێکیان دوور دهخاتهوه، کوێخا ژن بوو هاته هەیوان. حهمه گهیوهته هەیوان، کوێخا ژن ماندوو نهبینی لێدهکا، حهمه جواب دهداتهوه، کوێخا گوێی له دهنگی حهمهیه، بانگی دهکا.

ـ حهمه! هاتوویهوه؟ وهره ژووریێ وهره. حهمه به شهرمهوه سلاو دهکا، کوێخا ماندوو نهبینی پێ دهڵێ، کهویێ و دایکی هاتوونه ژووریێ، کهویێ کهوڵ و کاسه و دیزه چێشتی هێناوهته بهر دهستی دایکی، کوێخا ژن چێشت تێدهکا، کوێخا به پێکهنینهوه گوتی:

ـ نازەنین! چاییمان هەیه؟

ـ بهڵێ دهمم کردووه. کوێخاڕووی کرده حهمه گوتی:

ـ حهمهگیان له کارهکهت دلخۆشی؟

ـ تۆ سهلامهت بی، دلخۆشم.

ـ وهختی مهڕه بێره نههاتووه؟ سال درهنگه!

ـ ئهمسال بهرخ کورپهیه، پاییز درهنگ بهران له مهڕ کرا، دهترسیم بهرخ تریفه بێ، لهم رۆژانهدا دهست پێدهکهین. حهمه سهری داخستووه له شهرمان سوور ههلگهڕاوه کوێخا بێ دهنگه، هیچ نالێ.

شێو کراوه، چای به مێوژهوه خوراوهتهوه. کهویێ قاپ و کهوچکی بردۆته حهوشه دهیانشوا. حهمه ههستا بڕواتهوه، کوێخا ژن نان و پێخۆری بهیانی بۆ پێچاوهتهوه، دهستی داوهته نان و دهڕواته دهریێ. کهویێ به بۆنهی دهرگا داخستنهوه به دوویدا دهڕوا. حهمه لهو دیوی دهرگای حهوشهیه، کهویێ له دیوی حهوشهوه به سرته گوتی:

ـ بڕۆ! ئێره بۆ قسه کردن نابێ، بهیانی له مێرگه گهوره چاوهڕێم به. کهویێ دهرگای پێوهدا، حهمه به دلخۆشییهوه ڕۆیشتۆتهوه.

## ٣

دوو کێوی سەر بەرز و پڕ هەڵدێر و ڕەوەز، زەرد و مای هەزار ئەشکەوت و کانییە بەردینە، شیو و دۆڵێکی بە سامیان پێکهێناوە و سالیانی ساڵە، قەڵا و پشتیوانی پیاوانی ئازا و بەجەرگی ئەو مەڵبەندەن.

داوێنی ئەو دوو کێوە، دەشتێکی پانوبەرینە، ئەو دەشتە هەموو ساڵێ لە وەرزی بەهاردا دەزێتەوە، گیای دوورین دێنێ، مێرگە گەورەی کوێخاکەریمە.

چۆمێ بە مابەینی مێرگە گەورە و ئاوایی کانی توودا دەڕوا، ئەمبەروئەوبەر بێی خۆڕەس و گزیچارە لە سەرڕا هەتا خوار تازاواوە لێکیداوە، تیری تێناچێ. لە باران بڕانـدا ئاوی چۆمەکە کەم دەکا، هەر زناوی خۆی دەمێنێ، ئەویش لە چەند لاوە بناوانی لە بەر هەڵدەبەستن، چۆڕایی لێدەبڕن.

هەتاو هێدی هێدی ترووپکی هەزار ئەشکەوتی بەرداوە. مێگەل بە لانساری کانییەبەردینەوە پەلی خستووە، گەلاز لە کەوانەیە، ورچە و بۆرەئەمشان و ئەو شانیان گرتووە. حەمە لە نزیکی مێرگە گەورە، خۆی داوەتە پەنای گابەردێ، چاوی چاوەڕوانی بڕیوەتە کوێرەڕێی ئەوبەری چۆمەکە. چاوەڕوانی گێژی کردووە، ئاو بە چاویدا دێتە خوارێ، بە لفکەی شەدەکەی دەیسڕێ. پۆلێ گوڵی زەرد سەرەنجی ڕاکێشاوە، مێش هەنگوینێ لە سەر پۆلە گوڵەکە دەنیشێتەوە، بە سەریاندا دەگەڕێ، بەپێ تیسکنە باریکەکانی هەڵالە کۆ دەکاتەوە، هەڵالە بە پێیەویە گزموولە بووە، بار تەواوە، هەنگ دەفڕێ، حەمە چاوی لێ ناترووکێنێ، مێش هەنگوین بوو بە خاڵێک و ون بوو.

مەڕ لە لووتی کێو گەڕاوەتەوە، بەرەو کانییە بەردینە سەری پێوەناوە، وەختی چێژتاوە. حەمە بێ ئۆقرە لە پەنای گابەردەوە ملە تاتکێنیەتی. ئەژنۆی سڕە، ڕانی تەزیوە، مێلوورە دەکا، خۆ لە سەر پێ ناگرێ، مەڕ گەیوەتە سەر ئاو.

ئاوی کانییە بەردینە لە ژێر گاشە بەردێکی سپی گەورەوە هەڵدەقوڵێ، ئاشگێڕێ ئاوی لەبەر دەڕوا. ئەستێرێکی گەورە و قووڵی لە بەر هەڵبەسراوە، ئەستێر پڕ بووە، پۆنگی خواردۆتەوە، جۆگە پڕومەندە، ئاوی ئەو کانی و ئەستێرە بە تەنیا هی فەیزە دریژە.

حەمە هیوای هاتنی کەوێی لە سەر دەرکردووە، لە پەنای گابەرد هەستاوە، قەڵس و توورەیە، خۆی داوە بە سەر گوچانەکەیدا و چەناگەی لە سەر پشتی دەستی داناوە، خەیالاوی چاوی بریوەتە بەر پێی. ڕۆژ درەنگە، سێبەر کورت بۆتەوە، قاوەڵتوونێکی درەنگە، بەر قەنەی نەخواردوە، برسی و تینووە، گەرووی وشکە، لێوی باری گرتووە. چاوی بێ هیوا لە ئەرز هەڵدەبڕێ و دەڕوانێتەوە کوێرەڕێ، ڕادەپەڕێ! خۆ لە سەر گۆچان راستدەکاتەوە، باری لێوی بە زمان تەڕ دەکا. دەیسڕێتەوە، گەرووی پاراو بۆتەوە، بزە دەزێتە سەر لێوی! لە پەنای گابەرد خۆ مات دەکاتەوە.

سروشت ڕەنگی گۆڕیوە! هەموو شتێک جوانە! هەموو دەنگێ خۆشە! نێرە کەوێک لەسەر تاشەبەردێ دەخوێنێ، پاش بانگ لێ ئەدا، خورۆش دەکا، هەست ڕادەگرێ، بێ ئۆقرە ئەم بەردوئەوبەرد دەفڕێ، دەخوێنێتەوە، بانگ هەڵدەدێرێ و هەست ڕادەگرێتەوە.

ماکەوێک لە داوێنی هەزار ئەشکەوتەوە جوابی داوە، پێڕەو بە خوێندنەوە تێهەڵدەگرێ. نێرە کەو گوێی لە دەنگی ماکەوە، دەفڕێ، لە نزیک ماکەو دەکەوێ و بانگێ دەخوێنێ، ماکەو جواب دەداتەوە، بە پێڕەو بۆ لای یەک دەڕون، بە جووت دەخوێنن، نێرە و مێوە پێکدەگەن، بێ دەنگ بوون.

کەوێ بە دەم گیا هەڵکەندنەوە گەیوەتە ناوەڕاستی مێرگە گەورە، بەرەو بناری کێو دێ. هەر هەنگاوێ کە نزیکتر دەبێتەوە، حەمە زیاتر هەست بە لێدانی دڵی دەکا. کەوێ لە بناری کێوە، حەمە بە بنە بەردەوە خۆ نیشانئەدا، کەوێ هاوار دەکا!

ـ دانیشە مەیە دەرێ، لە نێو دێوە دەتبینن. حەمە خۆ مات دەکاتەوە، کەوێ چاوێ بە دەوروبەردا دەگێڕێ، بەرانبەر بە حەمە لە سەر تەختە بەردێ دادەنیشێ، سێ چوار هەنگاو لە یەک دوورن.

هەر دوو بێدەنگ چاویان لێک بریوە! تاساو و عەبەساون! چاو لە یەک ناتروو کێنن، بزە لە سەر لێو دەلەرزێ، بزە زگماکە! چاو بووە بە دەریا و شەپۆلی شادی ئەدا، دڵ بووە

به ئەسپی سەرکێش، مەیدانی سینگ تەنگە بۆ رمبازێنی! دەنگی لەرزۆکی حەمـە، وەکـو دەنگی ژێی تار بێ دەنگی دەشکێنێ.

ـ بۆ درەنگ هاتی؟ گوتم تازە نایـەی. کـەوێ چـەپکێ گوڵـی سـێوەڕەی زەرد و سووری بە گیا قومامەیەک بەستووە، بە نازەوە بۆنی دەکا، گوتی:

ـ چاوەڕێ بوون ناخۆشە؟ زۆر چاوەڕێ بووی؟

ـ قەیناکە، خووم پێگرتووە، سێ ساڵە من چاوەڕێم، دەزانی لە کەنگێوە کەوێگیان؟

ـ ئا، لەو دەمەوە کە من بە هیوام! لە شەوی قوڕشێلانەکەیماڵی باپیرمەوە.

ـ باشە، من نەمدەوێرا، تۆ چی؟

ـ تا ئێستا کچ بە کوڕی گوتووە؟ جگە لەوەش، ئەوەی من دەیزانم تۆ نـازانی! مـن ملۆزمم هەیە! دایمە لە سەرم قاسیدن! حەمە بزە لە سـەری لێـوی تاسـاوە! نێـو چـاوانی وێکهێناوەتەوە، بە سەر سووڕمانەوە گوتی:

ـ کێ ملۆزمتە؟

ـ هەمزەبەگ، تا ئێستا سێ جار خوازبێنی لە باوکم کردووە، داوای من دەکـا، بۆیـە دەڵێم تۆ نازانی، هاتووم باش حاڵیتکەم، دەبێ زۆر وریا بین، نابێ کـەس پێمـان بزانـێ حەمە گەشە و نەشەی لە بیر چۆتەوە، سوورایی لە لێویدا نەماوە، بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ هەمزە بەگ داوای تۆی کردووە بۆ خۆی؟! کەوێ قاقای کێشا گوتی:

ـ نا! نا، بۆ عەتایکوڕی، عەتا زۆری بۆ هێناوە، زۆری بۆ منیش هێناوە، رۆژ نییـە زارا نەکاتە کەوڵم، خـۆ نـاوێرم، هـیچ بـڵێم! هـەر تـەفرەی ئـەدەم. حەمـە وەک شووشـە تێکچڕژاوە! لێوی بە سەر ددانییەوە وشکهەڵاتووە، سەری بـێ دەسـەڵاتی بەرداوەتـەوە. کەوێ تێگەیوە حەمە بەو قسانە تێکشکاوە، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ بۆ رەنگت گۆڕاوە؟ خۆ بەوان نییە! بە خۆمانە!

ـ چۆن بەوان نییە؟ ئێمە چیمان لە دەست دێ؟ باوکت دەڵێ چی؟

ـ ئەو بڵێ چی؟! جارێ ئەویش هەر تەفرەی لە دەست دێ، بەو بێ نامدا! بـەڵام خـۆ بەوی ناکەن!! گوتوویە با بکەوینە پاییز، خۆ ناتوانێ بڵێ نایدەم، دەتوانێ؟

ـ ئەی چی بکەین؟

ـ لەوە مەترسێ، من لە تۆ دەترسێم! بزانن دەتکوژن، نابێ بزانن.

ـ ئەی ئەگەر بە زۆر ڕایان کێشای؟ ئەو دەم چی؟

ـ مەگەر تۆ پیاو نەبی!
ـ ئاخر من چیم لە دەست دێ کەوێکیان؟!
ـ کار گەیشتە ئەو جێگایە، دەڕۆین، مەگەر تۆ نەوێری! دەنا مـن لەگەڵـت دێم، بـۆ هەر کوێ تۆ بڵێی، حەمە بەو قسانە کەیفی ساز بووە، لە لایەن کەوێوە دڵـنیایە، ڕەنگـی هاتۆتەوە سەرخۆ، سوورایی کەوتۆتەوە لێوی، پێی خۆشە لە ئامێزی بگرێ و بزەی سـەر لێوی بمژێ! بێ ئیختیار هەستاوە، هەنگاوێ دەچێتە پێشێ. کەوێ دەنگی ئەدا:
ـ لە نێو دێوە دەتبینن! ئابڕوومان دەچێ! ئێمە یـەکمان خۆشـدەوێ، خۆشـەویـستی ئابڕوو بردن نییە! ئێستا فەیزە درێژ چاوی لێیە! لە دێ وەدەرکەوتم منی دی، ئەگـەر بـۆ ئەوە منت خۆشدەوێ، من نیم، هیچمان لە هیچ! حەمە بەو قسانە مورخی دەمـرێ! پاشـەو پاش چۆوە جێی خۆی.
هەر دووکیان بێ دەنگن! حەمە وەک تۆراوێ تەماشای کەوێ ناکا! کەوێ چاوی لە سەر هەڵناگرێ، بە هیوایە تەماشای بکا و بە بزەیەک ئاشتیکاتەوە.
پەپوولەیەکی باڵ نەخشین لە مابەینیاندا، لە سەر پۆلە گوڵە زەردەکە نیشتۆتەوە، بـاڵ لێ ئەدا، حەمە چاوی لە سەر پەپوولە بە مۆلەق وەستاوە، دڵی لە شوێنێکیترە! پـەپوولـە سەرنجی کەوێشی ڕاکێشاوە، بە جووت تەماشای دەکەن، پەپوولە دەفڕێ. کەوێ خۆ بـە خەتابار دەزانێ، دڵی شکاندووە. قاقا دەکێشێ و چەپکە سێوەڕەکەی بۆ حەوا ئەدا دەڵێ.
ـ زۆر دڵ ناسکی! لە قسەکەی من قەڵسی؟ حەمە بێ ئەوەی تەماشای بکا گوتی:
ـ تۆ لە من دوو شکی؟ پێت وایە من لە سەر سووکایەتیتم؟
ـ نەوەڵلا، وام بزانیایە چۆن دەهاتم؟ ئەگەر دەنگم دای، لە بەر خۆت بوو، ئاگات لـە خۆت نەبوو! نەتدەزانی دنیا بەری بە کوێوەیە، دەوری چ پاشایەکە! تۆ نازانی لەگەڵ کێ کەڵەوەکێشی و ملە ملە دەکەی؟ دوژمنەکەت زۆردارە! کەڵ بە موویەک بەندە! سـەدی وەک تۆیان لە چینی دیوار ناوە! چەند کەسیان بێ سەر و شوێن لە نێو بـردووە! سـەدی وەک منیان بە زۆر ڕاکێشاوە! بووکی یەکشەوەیان لە باخەڵی زاوا دەرکێشاوە! بووکیان لە بەر دەرگایماڵی زاوا گێڕاوەتەوە! کێ سەرکێش بووە و سەری هەڵێنابێ، بێ سەریان کردووە، باوکت چی بە سەر هات؟ ئەوان شرتوگومیان کرد. من خەمی تۆمە، دەنـا مـن خۆم بە هی تۆ دەزانم، تۆش هی منی، هەر لە ئێستاوە خۆم دەکـەمـە نـەزرت، تـەواوی وجوودم پێشکەشی تۆ بێ، تۆش بڵێ.

ـ سەروماڵم پێشکەشت بێ کەوێگیان.
ـ بۆ دڵنیا بوون، سوێندیش دەخۆین، قورعان دوورونزیکی بۆ نییە، بەو قورعانەی لە مزگەوتی کانیتوودایە، تا تۆ بە من قایل بی و ژن نەهێنی، حەلالی دنیام لێ حەرام بێ، بە زۆر ڕامکێشن، بەر لەوە زاوا دەس نوێژی لێم بشکێ، خۆم بکوژم، دەی تۆش بڵێ.
ـ بەو قورعانەی تۆ سوێندت پێ خوارد، تا تۆ مێرد نەکەی من ژن ناهێنم، چوست و چالاک، وەک تیری ساردەکەوان بازراقە بەست، خۆی هاویشتە باوەشیکەویەوە!
دوو کۆتری سپی تەقلەباز لە ئاسمانی مێرگە گەورە تێکهالاون، بە دەم تەقلەوە دێنە خوارێ، لە رووتەنێ نیشتوونەوە، نێرە خوار و ژوور بە جووتەکەی دەکا، بە دەوریدا دەگمێنێ و دەیسووڕێنێتەوە.
حەمە لە کەوێ جوێ بۆتەوە، چۆتەوە جێی خۆی. کەوێ سەر و دەسماڵی شێواوی کۆ کردۆتەوە، نیوە شەڕ و نیوە ئاشتی گوتی:
ـ ئای لە پیاو! قەت باوەڕیان پێ نەکەی، خۆ منت خوودار کرد! تازە قەت باوەڕت پێ ناکەم. حەمە چاوی پڕ بووە لە ئاو شەپۆلی شادی ئەدا، دەم بە بزەوە گوتی:
ـ هەر ئەوەمان کەم بوو، ئەویشم تەواو کرد، بێ ئیختیار دەست دەکا بە باخەڵدا شمشاڵ دەردێنێ و لێو دەنێ بە لێویەوە:
من دەڵێم ماڵ وێران ئەمرۆ تۆ خەم مەخۆ، کار بە خەمان پێکنایە، ئەگەر بەوەی لە من قایل دەبی، کەپرە چوکەیەکت بۆ دروس دەکەم، لە دارێ، لە دار فندەقێ، هەلاشی دەخەمێ بە رەشە ریحانێ، نەوەڵلا بارنگی دەکەمەوە، بالکی، قوڕەبانی دەکەمەوە بە فرمێسکی دەچاوێ، تەمەنا دەکەم لە خودای گەورە و گران، یار لێم بەژنا بایە.
ئەمن دەڵێم ماڵ وێران ئەوە مەلایێ، پیاو چاکێ، ردێن سپێی، قسە زانێ بنێرە لای ئەو بابە ریش شینە داسینەی من ئەگەر بە ماڵی دنیا دای چاکە، ئەگەر نەیدا، عالەمی خودا بە سەنگی سیام هەڵێنێ سووکەلە کۆچێکت لەگەڵ دەکەم بۆ لای وەزیرەکەی ماڵ لە بەغدایە.

ئەگەر ئەویش مەسلەتێی بۆ نەکردین.
حەمە ئاغا لە بانە، سەیفەدین خان لە سەقز، سەردار لە بۆکان،
ئەگەر ئەوانیش مەسلەتیان بۆ نەکردین،
بە جووت لفکەی سۆرانی خۆمان ئاوێزان دەکەین.

سەبر سەبر، نەرم نەرم، خاوێر خاوێر، دەچینەوە ولاتەکەی پیرە بارزانیێ.

دوودلۆپ فرمێسک لە قوولکی بەر چاویدا قەتیس بووە، بە چەشنێ پێلووی لە سەر یەک داناوە، دەڵێی نایهەوێ لێکیان کاتەوە! بە بیرەوەری خۆی و شمشالەکەی وەبیریان نایە تا ئێستا ئاوا بە کوڵ و دڵ لێدرابێ! دەیهەوێ خەشی دڵی بە کونی شمشالدا برژێتە خوارێ، هیچی لە بیر نەماوە! ئاگای لە دنیا نییە! خۆی، تەنانەت کەوێشی لە بیر چۆتەوە! دنیا لە کونی شمشالەکەیدا دەبینێ!

گەلاز بە هێرشەوە دادەوەڕێ، حەمە وەهۆش هاتۆتەوە، چاو لێک دەکاتەوە، لێوی بە لێوی شمشالەوە بەستوویە! پەنجەی لە سەر کونی شمشال وشکبووە! دەڵێی پەیکەرەیە! کەوێ لەوێ نەماوە! چاوی بووە بە باڵندەیەکی ڕاوی بە دووی نێچیری ڕاکردوودا دەگەڕێ، بازی چاوی حەمە کەوێی هەڵاتووی لەوبەری چۆمەوە ڕاو کرد!

گەلاز هەر دەوەڕێ! حەمە سەر وەردەسووڕێنێ، لە پڕ وەکو بەرق گرتوویەک لە ناخەوە رادەتلەکێ! ماوەیەک بیری بۆ ناکرێتەوە، عەبەساوە! دەڵێی بەنگی خواردووە! بەرە بەرە دێتەوە سەرخۆ و ئاشکرا لەگەڵ خۆیدا دەدوێ:

ـ ئای ئای! ئەشا ئەو نەدامەتییە! ئەوە ئەو سەگبابە لەوێ چ دەکا! ئەوە بۆیە کەوێ رۆیوە، رەنگە ئەو سەگە درێژە ئێمەی دیبێ، جا زانیبێتی چ بکەم؟! با بچمە لای بزانم دەراوی دەمی چۆنە؟

فەیزە درێژ هەر دوو لاقی تا پشت چۆکە درێژەکانی هەڵکردووە، لەبەر گونجەی ئاوەکە دانەویوەتەوە، خەریکی تۆپەوانەی کێشی ئەستێرەکەیە، حەمە پێ پێ و بۆک و نابۆک، لە پشتەوە چووە پێشێ، فەیزە ئاگای لەو نییە، حەمە لە نەکاو گوتی:

ـ ماندوو نەبی کا فەیزوڵلا، فەیزە لە دەنگی حەمە بە چەشنێ داترووسکا، تۆپەوانەکەی لە دەست بەربۆوە، ئاو بردی، بە پەشۆکاوییەوە جوابی حەمە ئەداتەوە.

ـ خۆت ماندوو نەبی کاکە حەمە! کوڕە خۆ خوودارت کردم! سەد سالی دیکە بمرم، هەر بەوە دەمرم! ئەوە لە کوێوە وەک مووروە غەیبی پەیدا بووی؟ حەمە سنووری کەوتۆتە دڵی، دڵنیا بووە کە ئەوانی نەدیوە، بە وەرەزییەوە گوتی:

ـ دوو لە ڕووی تۆ کەمێ ناساخم، پێم وایە سەرمام بووە، لە بەر بەرۆچکەی ئەو گا بەردە راکشا بووم، لە مێژە هاتووی؟ تۆپەوانەکە بە بنە درووپەکەوە گیرسابووە. فەیزە بەرەو تۆپەوانەکە دەڕوا، بەدەم ڕێوە جواب ئەداتەوە.

ـ نەوەللا تازە هاتم، وات تۆقاندم تۆپەوانەکەم لە دەست بەربۆوە، چابوو بەو بنە دڕەوە گیری کردووە، دەنا پەکم دەکەوت، حەمە بە تەوسەوە گوتی:

ـ وەللا چاک بوو، بەز نەبوو دیتەوە! کوڕە جا هەر شڕە زۆرە.

ـ شڕەم لە کوێ بوو لەم چۆلگە، مەگەر پاتۆلەکەم! ئەویش ئەو ئاوە! خۆ بەوانە چەنەبەری ناکرێ.

ـ ئەرێ وایە، ئەمساڵ ئاو زۆرە.

ـ جا بە کاری چی دێ، ئاوی زۆر زەوی دەوێ، بە ناشکوری نەبێ، زەوی نییە.

ـ خۆ تۆ زەویت زۆرە کا فەیزوللا بۆ ناشکوری دەکەی؟

ـ حەیە حەی! زەوی؟ کامە زەوی؟ ئەوە نییە عەبە شێت داگیری کردووە! کەس ناوێرێ بە لایدا بکۆخێ، شکاتی ئاغاشم لێکردووە، جوابی ئەویش نەداتەوە! بە شێتە وەبەری داوە. حەمە لێی بە بیانووە، دەیەوێ قەلسی کا، بە دەهۆوە گوتی:

ـ کامە زەویی داگیرکردووە؟

ـ ئەوە نییە لە دێ کۆن جووت دەکا!

ـ ئەوە بۆ زەوی تۆیە؟ بە بیرەوەری من ئەوێ چۆلە و هی کەس نییە، ئەوەش بە جێی خۆی، ئەویش وەک تۆ خەرج و پیتاک و دەو دوو ئەدا، کوڕە لێی بەوە، ئەو بەستەزمانە بەو چۆلگەیە قایلە، بۆ لە کۆڵی نابیەوە؟ فەیزە بە مۆڕەوە چاوێ لە حەمە دەکا، بێ قسە و باس پێمەڕەکەی نا بە شانییەوە، بە دووی ئاوەکەدا ڕۆیشت، لە دوور ئاوڕیداوە، گوتی:

ـ دەزانم تۆش لایەنی ئەو زمانلارە شێتە دەگری، بزانە چۆنی لێ دەستێنمەوە.

## ٤

هەورێکی چلکن لە قیبلەوە سەری دەرهێناوە، وەکوو ئەژدیهایەکی حەوت سەر گەزارە دەکێشێ، دەشریخێنێ، قەف دەخوا، خۆ دەکێشێتەوە، دەلرفێنێ، هەتاو بە ئاسمانەوە هەڵدەلووشێ و لە بەر یەک دەڕەوێتەوە، هەر سەرێکی حەوت سەری دیکە لێدەڕوێ.

شریخەی قەمچی ئاور، سینگی هەور شەق دەکا و لە چاو تررووکانێکدا، هەتا چاو هەتەر دەکا، هەریمی ئاسمان دەکاتە ڕێبازی ترووسکەی هەورە برووسکە و پاشان دەبێتە ناڵەیەکی بە سام و زراوی کوێرەکانیان دەتۆقێنێ.

خۆناوکەی باران هێدی هێدی بەردە تراویلکەی شاخان دەشواتەوە، وردە خیز بە دەم ئاوەوە دەخزێنە نێو خڕ. لە هەر ئاودڕێکەوە، دەستاوێ ئاو خۆ دەکێشنە ماشیوێ، ئاوی سەدان ماشیو دەڕژێتە نێو شیو، ئاوی سەدان شیو و دۆڵ یەک دەگرن و خۆدەکێشنە نێو چۆم و دەبنە تەوژمێکی بە گوڕ، ئەوەی لە ڕێیدا بێ ڕامالی ئەدا.

لافاو لە کەندەلانەوە وەسەرکەوتووە. بناری کێوی هێلانە چەرخە و تەپی قەلای ئاغای داوەتە بەر هێرشی شەپۆل. شەپۆلی پەیتا پەیتای لافاو، کەندی خستۆتە بن کەندەلان و توێژ توێژ دەیرووخێنێ و قەڵپەزە دەبەستێ.

تایەک لە پەنجەرە دوو دەرییەکانی کۆشکی ئاغا ڕوو بە چۆم کراوەتەوە. شنەی بای چۆم، جاروبار قژە ماش و برنجییەکانی هەمزەبەگ دەشەکێنێ و تاڵ تاڵ لە ژێر کڵاوە تۆڕیە سپییەکەیەوە دەریاندێنێ و دەڕژێنە سەر برۆ پەیوەستەکانی. تەزووی تەڕی و کزەی با، موچوڕکی خستۆتە لەشی، پەنجەرەکە پێوە ئەدا، شانە چەماوەکەی بە باڵتە ماهووتە ڕەشەکەیەوە هەڵدەتەکێنێ، ڕووی کردۆتە فەیزە درێژ و لە سەرە خۆ دەڵێ.

ـ دەی دەی! دڵنیای کەوێ بوو؟ ڕەنگە ڕاست بێ! بۆیە دەڵێ مێرد بە عەتا ناکەم! ئەگەر وا بێ، کۆنە قین و شتی وا نەبێ، خەلاتت دەکەم، ئەگەر درۆ بێ چی؟ بە سەری

بەم جەریمەت دەکەم. فەیزە لای دەرگاوە چۆکی داداوە، قامکە لارووێرەکانی چەپ و چیڕ لە سەر ڕانی داناوە، بە پارێزەوە گوتی:

ـ قوربان! چەند ساڵە لە خزمەت ئاغا دام، درۆم کردووە؟! من تازە بەو ڕیشە سپییەوە بۆ درۆ دەکەم؟! ئاغا خۆیان فەرموویان چاوم لە سەر کەوێ بێ، بە چاوی خۆم دیم، دای بە ئەرزدا و سواری سەری بوو! چۆن درۆ دەکەم قوربان!

ـ ئەو هەتیوە کوڕی کێیە؟

ـ کوڕی مەحموودی حاجی برایمە قوربان، بلە جەواڵ، ناوی حەمەیە، شوانی کانی تووە.

هەمزەبەگ بە بیستنی ناوی مەحموود گرژ بووەوە! وەکوو ژنی کەوان وێک هاتۆتەوە، بەینی هەر دوو برۆی گرتووە و سەری بەرداوەتەوە، بیست و پێنج ساڵ لەمەو بەری هاتۆتەوە بیر:

ـ مەحموود! وەی بێژوو! چۆن لە دەستم دەرچووی؟ کەس نەیزانی چۆن دەرباز بوو! چی بە سەر هات ؟! بۆ کوێ چوو؟ کێ دز کۆشکە بوو؟! دەرگایان بۆ کردەوە و دەستیان تێوەنا، دەنا لە کوێوە دەیتوانی هەڵێ؟ بریا هەر ئێوارە بمکوشتایە، لە خۆڕا خستمە نیوە شەو، بڵێی وا بوو بێ و عەدلە خەیانەتی بە من کردبێ؟ هەر ئەم فەیزە درێژە بوو گوتی عەدلە خانم لەگەڵ مەحموودی حاجی برایم کەینوبەینی هەیە، هەمزەبەگ بێ ئیختیار هەستاوە و بەرەو پەنجەرەکە دەڕوا، چاوی بڕیوەتە چۆم و خەیالاوی دەڕوانێتە قەڵپەزەی سێلاو، بە ئەسپایی گوتی:

ـ فەیزە! چۆنت دیون، بێ درۆ و پێوەنان بیگێڕەوە.

ـ قوربان! ئاگام لێبوو کەوێ لە دێ چووە دەرێ، هەموو ڕۆژێ دەمەدی دەچوو بۆ گیا گوێلک، ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕۆژانی تر زۆر جیاوازی بوو، خۆی لەدار و گوڵ دابوو، دەتگوت دەچێ بۆ شایی! سەر ڕوومەتەکانی وەک گوڵالە سووریان دەکردەوە، زۆر هەڵەشە دیار بوو! بەملاو ئەولادا چاوی دەگێڕا، دەڵێن دار هەڵێنی سەگی دز دیارە، کەوتمە شک، دوورونزیک، بێ ئەوەی ئەو بزانێ، وەدووی کەوتم، ئەو لە چۆمەکە پەڕییەوە، من چوومە نێو دار و چۆم. چاوم لێبوو، وردە وردە، بە دەم گیا کردنەوە بەرەو بناری کێو ڕۆیشت، من بە نێو دار و چۆمدا پێشاو بڕم داوە، لە خوار مێرگە گەورەوە چوومە نێو بەردەکانی بەینی کانییە بەردینە و مێرگەکە و لە بن بەردێ خۆم حەشاردا.

کەوێ گەیشتە نزیک گا بەردەکەی ئەو سەری مێرگەگەورە، هێندێ بە دەوری خۆیدا قوتەی کرد، پاشان دانیشت، دیار بوو لەگەڵ کەسێکدا قسەی دەکرد! خۆم شکم لە حەمە شوان بوو، ئاخر مەڕەکەی لە سەر کانییە بەردینە پالینی دابوو و خۆشی دیار نەبوو زۆری پێ چوو، ئەوەندەی هاتوومەتە خزمەتی ئاغا، زیاتری خایاند، لە پڕ کەسێک لە بن گابەردەکە دەرپەڕی و کەوێی گرمۆلە کرد، سیغارکێشێ بە یەکەوە بوون، پاشان بەرێدا و چووە جێگاکەی خۆی و دەستی کرد بە شمشاڵ لێدان. من هەستام بڕۆم بۆ سەر ئاوەکە، ئاخر ئەستێرەکە پڕ بوو و کەلاری دەکرد، کەوێ ئاوڕی داوە، پێم وایە منی دی، هەستا و هەڵات. ئەوەی عەرزی ئاغامکرد، بێ پاش و پێش بوو. هەمزەبەگ بەرەو فەیزە گەڕاوە و گوتی:

ـ خۆ نەتداوەتە ڕوویان؟ بە لای کەسەوە باست نەکردووە؟ فەیزە بزەیەکی خستە سەر لێوە ئەستوورەکانی، ددانی وەک شوولی چەپەر وەدەرکەوت، گوتی:

ـ هەی بێ بەلا بی! چۆن کاری وا دەکەم! لە سایەی سەری ئاغاوە پارووە نانێکم هەیە، خۆت دەزانی کابرای دەولەمەند، دوو لە رووی ئاغا، وەک ژنی دووگیان، وایە، خۆ دەپارێزێ، ئەویش ئەو هەتیوە ڕووتە! حەییە حەی!! ئاغا هێندێ سەری بۆ دەلەقێنێ، بانگی ئەحمەد فەڕاش دەکا:

ـ ئەحمەد! چای بێنە، ئەحمەد دوو چای لە سەر کەشەفێ بە دوو قەندانەوە هێنایە ژووری، یەکیانی لە پێش ئاغا دانا، ئەوی دی بۆ فەیزە. هەمزەبەگ ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی:

ـ برۆ بە عەدلە خانم بڵێ ئەو دەستە کەواوپاتۆڵە ڕەشە بە کراس و پشتوێنەوە بۆ فەیزەی بنێرێ، دەی فەیزە! کارت نەماوە؟ فەیزە لەو دەمەوە هاتووە لە سەر چۆک دانیشتووە، لاقی لە ژێریدا تەزیوە، دەست دادەدا و لاقی لە ژێری دەردێنێ، چوار مێلکە دادەنیشێ، لارەملانە گوتی:

ـ گەورەیی بکەو ئەو زەویانەم بۆ لە عەبە شێت بستێنەوە، ئاخر ئەو شێتە زەویی بۆ چیە قوربان؟!

ـ باشە باشە، بۆت دەستێنمەوە، با بەرە جووت بێتە نێو، پاییز ناهێڵم دایچێنێتەوە، بەڵام ئەوەی ئەو داویە، دەبێ تۆش بیدەی، مەتلەبم دە و دووە.

ـ بەلێ قوربان، دەیدەم ئەحمەد فەڕاش بەدەستە جلەوە هاتەوە لـە بەردەسـتی ئاغـادا دێ. هەمزە بەگ هێندێ جلەکان ئەمبار و ئەوبار دەکا، گوتی:

ـ ئەوەش خەلاتی ئەمجارەت، ئەگەر چوویتەوە و بە کوێخاکەریم بلێ بێ بۆ ئێرە، تۆ ـسی هیچ نەکەی، بە لای کەسیشەوە نەیدرکێنی، با هەر خۆم و خـۆت بـزانین، دەبـڕۆ.

فەیزە هەستاوە، پشتاوپشت لە دەرگاوە دەڕواتە دەرێ، بە دەم ڕۆینەوە گوتی:

ـ خۆم نۆکەری ئاغام مەگەر گڵ لێم ببیستێ!

ئەودەمەوە فەیزە درێژ و هەمزە بەگ پێکەوەن، عەتا لە دیوەکـەی خۆیـەوە گـوێی ـوە بە کەلێنی دەرگاوە و لە تەواوی قسەکانیان حالیبووە. عـەتا وەک مـاری برینـدار گێنگڵ دەدا، لێو لە حەمە دەکرۆژێ و بەردی لـێ بـە بـا دەکـا، وەک شـێت لـە مـاڵ دەردەپەڕێ، هاتۆوتە حەوشە، باران هەر دەبارێ، ڕێژنە بارانە، ئێزنی ڕۆین بە عەتا نـادا، دەگەڕێتەوە ژووری، چاوەڕێی خۆش کردنەوەیە، ئەو ڕۆژە هەتا ئێـوارە، لـە ئێـوارەوە هەتا بەیانی ئاسمان چاوی وشکنەبووە.

بەیانییە، ئاسمان بە هەوری سپی و بۆڕ گەواڵ گەواڵە، کەوە ڕۆژە، هەتاو جاروبار لـە کەلێنی هەورەوە ملە تاتکێ دەکا، خۆ دەشارێتەوە، لە لایەکی دیکەوە سـەردەردێنێتەوە. کەژوکێو دارودەوەن ئاونگی بارانیان لە سەرە، ولات زەلیوە.

سروەی با نایە، گەڵای یەختە بییەکەی سەرکانی، کانیتوو نابزوێ، تەنانەت باریکـە دووکەڵی سەربانی ماڵان لارەکە ناکەن.

ئاوی باران لە گۆلکاو قەتیسە، کێلگە زۆنگە، بوورە قوڕە. دەشت و مەزرا چۆڵە، نێـو دێ ئاوەدانە.

دەستە دەستە و پۆل پۆل پیاوان لە بن دیواران کوزیلکەیان داوە. ژنان گۆزە بە شـان لە ڕێی کانی دێن و دەڕۆن.

فەیزە درێژ، دەستەجلەکانی هەمزەبەگی لە بەردایە، لـە بـن دیـواری حـەوز و ئـاو دەستەکان، لە نزیکی کانی ژنان بە تەنیا دێت و دەچێ. لفکـەی سـۆرانی بەرداوەتـەوە، دەستی ناوەتە بەر پشتوێنەکەی، بەردێکی وەبەر شەپ داوە و تا ئەو سەری دیوارەکـەی دەبا و دەیهێنێتەوە. جار جار دەڕوانێتە خۆی! پاتۆلەکەی بۆی قولەیە، لە پشتی قولاپـەی وەستاوە، قۆلی کەواکەش کورتە، سۆرانییەکانی بەرداوەتەوە و دیاری نادا. تەماشـایەکی

بن دیواری مزگەوت دەکا، کوێخاکەریم لە نێو دەستەیەک پیاودا وەستاوە، فەیزە بانگی دەکا:

ــ هۆی کوێخاکەریم! تا ئێرە وەرە! کوێخا تەماشایەکی مانادارى پیاوەکان دەکا! مام رەسووڵ زۆر قسە قوت و جەفەنگییە، بە تەوسەوە گوتی:

ــ برۆ بزانە هەمزەبەگ چی دەفەرمێ! ئەوەی بە دەنگێکی بەرزگوت، ژنان لە کـانی گوێیان لێ بوو، ژن و پیاو دایان لە قاقای پێکـەنین. کوێخـا گەیوەتـە لای حەوزەکـە، فەیزە گوتی:

ــ من ڕاسپێراوم، ڕاسپاردە هیچی لە سەر نییە! دوێنێ لە تازاوا بووم، ئاغا فەرمووی بـە کوێخا بڵێ لایەک لە سەری تاشیبێ، لایەکەی دیکەی بێنێتە تازاوا. کوێخـا بـێ ئـەوەی هیچی جواب بداتەوە، بەرەو دواگەڕاوە و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ.

ــ باریکە ڕێگا وەکو کوێرە مارێکی چلکن بە نێو گڕانە بەردی کێـوە بەرداویلـەدا، مـار پێچ تێهەڵگەڕاوە و لە ئاسۆگی هوولەکانەوە، ئاوای دۆڵی دزان دەبێ.

ئەم بەروئەوبەری دۆڵی دزان دوو کێوی سەربەرز و هەزار بە هەزاری چـل پـەری و حەوت کانییانە. تروپکی کێوی چل پەری دەڕوانێتە هەزار ئەشکەوت و کانییە بەردینـە و چۆم. درێژایی کێوی حەوت کانیان، هێلانە چەرخەی بەرانبەر بە تازاوای گرتۆتە بـەر، نووساوە بە کێوی حەوتەوانانەوە، ئەویش بێ پسانەوە درێژەی هـەیـە. حـەوت کانیـان حودوود و کەوشەنی کانیتـوو و تـازاو و کانییـە کوێرەیـە، ئـەو سـێ دێیـە مـڵکی هەمزەبەگن.

دۆڵی دزان قووڵ و دوورودرێژە، بـە سـام و پـڕ شـاخ و ڕەوەزە، سـەر سـەوز و بژوێنـە، ئەمبەروئەو بەری بە دار قەزوان، قەرە چاڵووک، تەرە نییە و کەما و لو داپۆشـراوە، لـە هێنـدێ شوێندا کوێرەڕێی کوێرکردۆتەوە و ڕێ بە ماینە بۆرە هەڵە دەکا.

کوێخاکەریم بە کاوەخۆیە، ڕکێف لێنادا، بۆرە گوێی فیچ و کلکی داتـەپـاو، لەشـی داهێزراوە، لەقان لەقان دۆڵی دزانی پێواوە، لە سەر چۆمە. شـەقلی لێتـەی لافـاوی ڕۆژی پێشووی شکاندووە و بە لێژی تەپی قەڵادا وەسەردەکەوێ.

قەڵای ئاغا لە سەر تەپێ بە سەر ئاوایی تازاوادا سوارە. دەوراندەوری تەپ بـە بـەرد دیـواری ڕۆیوە بە حەوادا، لە دوولاوە دەروازەی تێکراوە، ناوەڕاستی ئـەو حەوشـە گـەورە، کۆشـک و تالارێکی بەرجەوەن خۆشی لێ دروستکراوە، میوان خانە و ئەندەروونی لە نێو خۆیدایـە، تەویلـە

و بەهاربەند و عەمبار لە دووری کۆشک سازکراون، لە بەر پەنجەرە و سەر سەراکاندا، حەوزێکی گەورەیە، ئاوەکەی لە پشتی مالانەوە بە گۆنگە کێشراوە و بە کفارە لە نێوەڕاستی حەوزەکەدا هەلدەقولێ، لە چوار گۆشەوە، چوار یەختە بی سالیانی سالە دەشێنینەوە.

ماینە بۆرە لووتی ناوە بە دەروازەوە، کوێخا پێی لە ئاوزەنگی دەرهێناوە، لەغاوی کردووە بە قۆلیدا، لە دەروازە ئەدا. دەرکەوان جوابی داوە:

ـ کێیە؟

ـ منم مام عەلی، کوێخاکەریم، مام عەلی چل مێردە لە پشتی دەروازە دەکێشێتەوە، تەیەکی کردەوە:

ـ فەرموو کوێخاکەریم، ماندوو نەبی.

ـ ئیمان‌دار بی مامەگیان، ئاغا لە سەرە؟

ـ بەلێ فەرموو، هۆی کا حەسەن! حەسەن مەیتەر لە دەرگای تەویلەوە سەری دەرهێناوە:

ـ بەلێ بەلێ.

ـ وەرە ئەو چارەوییە لە کوێخاکەریم بگرە، ها برۆ. حەسەن مەیتەر ماینە بۆرەی کێشاوەتە تەویلە. کوێخا لە پێشخانەیە، ئەحمەد فەراشی ناردۆتە ژووری ئیزنی بۆ بخوازێ، ئاغا ئیزنی داوە، کوێخا لە حوزووری ئاغادا دەستەوە نەزەر وەستاوە، هەمزەبەگ بە رووبەکی خۆشەوە ئیزنی دانیشتنی ئەدا، کوێخا دانیشتووە، ئاغا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ دەی کوێخا! با باسی خزمایەتییەکەمان بکەین! کۆتایی پێ بێنین باشە. وادیارە باشی لێ هەلناستێ، کەوێت دواندووە لەو بارەوە؟ کوێخا کزومات و داماوە، بیر لە داهاتووی کەوێ دەکاتەوە، بە سەر هاتی ژنە پێشووەکەی هەمزەبەگی لە بەر چاوە، بەر لەوەی عەدلە خانم بێنێ، خەجیجی کچی مام کەریمی هێنا بوو، دوو کچی لێی ببوو، چونکە کچە رەعیەت بوو، تەلاقیدا، ئەویش لە تاوی منداڵەکانی شێت بوو و ئەو دێ و ئەو دێ دەگەڕا، هەتا ئەو دەمەی مرد، منداڵەورکە شێتە شێتە وەدووی دەکەوتن هەمزەبەگ لیی چۆتە پێشێ و دەستی خستۆتە سەر شانی و بە بزەوە گوتی:

ـ بیر لە چی دەکەیەوە؟ قازانج دەکەی! رێوی بە پیرتەوە هاتووە! پشت لە بەختی خۆت و کچەکەت هەلمەکە، ئەبێتە خانم! عەتا کەوتی خۆش دەوێ، کاری مەکە بە زۆر رایکێشم، با

نەشەت نەشکێ، تا ئێستا خاترم گرتووی، ئەمجارە دەبێتە چوار جار خوازبێنییـت لێدەکـەم، ئەمـە ئاخر جار بێ، کەیفی خۆتە، دەڵێی چی؟

ـ جا قوربان! کەوێ کەنیزی خۆتە! زاوا لە عەتابەگ و خزم لـە تـۆ باشـتر؟ خـۆت دەزانی وەختی کاروکوێرەوەرییە، منیش تەنیا باڵم، با بکەوینە پاییز، کوڕ کوڕی خۆت و کچ کچی خۆتە، چۆن مەسلەحەتە، وابکە، ئاغا قاقا دەکێشێ، بانگی فەڕاش دەکا:

ـ ئەحمەد! چای بێنە. ئەحمەد چای هێناوە، دوو دەور چایی خوراوە، کوێخا لە سـەر ئیزنی ئاغا هەستاوە، پشتاوپشت لە دەرگـاوە دەڕواتـە دەرێ، چۆتـە حەوشـە، حەسـەن مەیتەر بۆرەی لە تەویلە دەرکێشاوە، کوێخا پێی لە ئاوزەنگی نـاوە، رکێفـی لێـدا و لـە دەروازەوە دەچێتە دەرێ.

## ٥

پازدەی بانەمەڕە، گەرمای زەویگولانە، دەشت و کێو تارای سروشتی بە سەردا کێشراوە، گیا نێر بووە، مەڕ گوانی رازاندۆتەوە، بەرخ هەراشە، جەنگەی مەڕە بێرەیە.

گاوس و مەشکە لە خووس نراون، تاڵ و خۆی کراون، سێپا پەت و گوریسی تێهەڵکێشراوە، لۆلەپ لە گاوس و مەشکە خراوە، گرم و هۆڕی گاوس و مەشکە لایەلایە بۆ دڵی کابان دەکا.

نیوەڕۆیە، مەڕ لە بێر دراوە و لە دێ چۆتە دەرێ. هەوا گەرمە، سێبەر خۆشە. مەڕ سەریان لە سێبەری یەکتر ناوە و ڕێچکەیان بەستووە. قەتارەی مەڕ لە ئاسۆگی هوولەکانە. دەستە مەڕی قەراغی کوێرە ڕێ لە رممەی سمی کوێتە زنجیرەی ڕێچکە دەپسێنن، سڵەمانەوە. کوێتە لە رەوی مێگەل قوشقی و کورەگوێ وەستاوە، گوێی لە سەر نێو چاوانی تیژکردووە، سم لە ئەرز دەگوتێ، پرمە و حیلەی تێکەڵە، هەڵدەستێتەوە سەر پاشوو و دەحیلێنێ، لە حیلە و کوڕژنی کوێتە، گەلاز لە کەوانەوە، ورچە و بۆرە بە دووی شوانەوە دا دەوڕن، حەمە سواری ناسیوە، عەتایە، ورچە و بۆرە بێ دەنگ دەکا، بانگی گەلاز دەکاتەوە، گەلاز بە دەنگی حەمە دەگەڕێتەوە، کوێتە لە جێی خۆی سم دەگوتێ، ڕێ داناگرێ. عەتا پێ لە ئاوزەنگی توند دەکا، ڕکێف لێ ئەدا، قەمچی هەڵدەسووڕێنێ، سەری سێ لیزگەی قەمچی وەلاتەڕافی دەکەوێ و کێوتە وەک کێچ دەردەپەڕێ. ناڵ و بزماری سمی، ناڵە لە گڕانە بەرد هەڵدەستێنێ، تریووسکەی ئاوری ناڵ و بەرد لە نێو تۆزی سمیدا پڕشنگ ئەداتەوە، سوار خۆی نووساندووە بە زینەوە، لەغاوی لێ دەکێشێ. کوێتە گوێی لوول و کلکی کلافەیە، سەری ناوە بە سینگی سوارەوە، پەل دەگوتێ، نووکی سمی وەئەرزدەکەوێ وەکو تۆپە جیر هەڵدەستێتەوە و بە دەم ڕەوتەوە دەست و پێی سەما دەکا.

زین و لەغاو قایشی سووری فەرەنگییە. دەسکەوسار، رەشمە و گولینگی لە ئاوریشمی زەرد و سوور و شین هۆنراوەتەوە و بە نێو چاوان و لاتەڕاف و کەفەلیدا شۆڕ بوونەتەوە و بە هەوای رەوت و سەمای دێن و دەچن.

سوار قیتوقۆزە، موو خورمایی و سوورکارەیە، چاوی شین و قەوی قەوییە، کەلەگەت و تیشکەلەیە، تەمەنی بیست ساڵ، بگرە کەمتر، پێکەوتوو و بە دیمەنە، جلوبەرگە رەشەکانی بە جارێ لێی بووە بە نەخش، کزەی بای رەوتی ئەسپە کوێت جاروبار رەشوەی شەدەکەی بە سەر روومەت و تەوێڵیدا دێنێ و دەیبا.

ئەو دیمەن و قەلافەتەی عەتا، حەمە شوانی خستۆتە گومانەوە و دڵ کرمێی کردووە! بە دڵ دوعای لێدەکا:

ـ دەی خوایە ئەو ئەسپە هەڵیگرێ و ملی بکا بە خڕخاڵ، ئەو درووی مەم و زینە چییە لە من پەیدا بووە؟! کەوێ ئاوا ببینێ بلێی دڵ نەگۆڕێ؟

عەتا گەیوەتە حاندی حەمە، شەوقی ئاوێنەی سینەبەندی کوێتە، تیشکی خۆری گێڕاوەتەوە و داویە لە چاوی شوانە و رووی پێ وەردەگێڕێ. عەتا بە قینەوە تەماشای دەکا، لەبەرخۆیەوە گوتی:

ـ با بچمە نێو دێ خەمت، دەخۆم! کەلەوەکێشی لەگەڵ من دەکەی؟ لە بەرەی خۆت زیاتر پێ درێژ دەکەی؟ پێت دەبڕمەوە! بزن ئەجەلی بێ، نانی شوان دەخوا! پەلە مەکە با بزانم راستە، کوێتە بە دەم چەپۆکان و نەرمە سەماوە مەڕ و شوانی جێ هێشت، بەلارەکە و پێچکەی کێوە بەرداوێلەدا دەڕواتە خوارێ.

ماڵی مام حەسەن چالیان دەرهێناوە، ژن و پیاویان لە پشت ماڵان زمهەڕ پاک دەکەن، مام حەسەن و کوێخاکەریم و حاجی قادر و سۆفی مینە و مام رەسووڵ لە دەوری گەنمەکە کۆ بوونەتەوە. لە پڕ لە رممەی کوێتە ئاوڕ دەدەنەوە، قرچە پێ هەڵدەستن، عەتا بایەخێکیان ناداتێ، بە پرتاو بە لایاندا تێدەپەڕێ.

سەر کانی پڕە لە ژن، فاتمی خێزانی فەیزە درێژ جل ئاو دەکێشێ. زارای ژنی فەتاحەکوێر خوری کەمێلاوی لە خووس ناوە، مینای حاجی قادر قاپ و کەوچکی خۆڵماڵ کردووە. نەرمینی مام رەسووڵ پەڕۆ و پالی برازاکەی دەشوا. کەوێ بە دیار گۆزەکانییەوە وەستاوە، مەحتەلە مینا کاسە و کەوچکەکەی ئاو کێشێ. زارا لە نەکاو هاواری لێ هەستاو:

ـ ئەیرۆ عەتا بەگ هات! هەموو هەستاون، کەویێ ڕەنگی پەڕیوە، مینا کەوتۆتە پەلە، عەتا کەوتی دیوە، عەقلی لە سەر پەڕیوە! چاوی هیچ نابینێ، لە خـوار ژنانـەوە کوێتـەی بەڕاندۆتە نێو جۆگە و بە نێوانیاندا رکێف لێئەدا، چۆتە بەر پلووسکی کانی و لە بەر دەمی کەویێ وەستاوە.

کوێتە بینی ناوە بە ئاوی پلووسکەوە، عەتا سوور هەڵگەڕاوە، چاوەشینەکانی تـەنگ بوونەتەوە و هەوەسیان لێدەباریێ، زەق زەق دەڕوانێـە کـەویێ. کـەویێ چـاوی تـرس و شەرمەزاری بەرداوەتەوە. ژنان بوونەتە پەیکەرە و مەتەقیان لێوە نایە. عەتا بیێ دەنگ هەر تێی دەڕوانێ، کەویێ سەری بەرداوەتەوە، دەڕوانێتە دەمی کوێتە و ئاوەکە، بـیێ تەکانـە. کوێتە دەمی لە ئاو کردۆتەوە، زیادە ئاوی بن لەغاو دەجوێتـەوە، کـەفاو دەرژێتـە نێـو پلووسکەکە، دەپرمێنیێ، بە پاشووی مێشە کز دەکا و سم لە ئاو دەکوتیێ. ژنان لـە ئـاو و قوڕ هەڵکشاون. عەتا دەم بە بزەوە گوتی:

ـ هێندیێ ئاومان بدەیە کەویێ خانم! کەویێ لە شەرمان جواناو دەڕێـژیێ، جـوابی پـیێ نادرێتەوە، مینا جام پڕ دەکا و دەیداتیێ، عەتا بە موڕەوە چاو لـە مینـا دەکـا، بـە پـشتی دەستی دەدا بە ژێر جامدا، ئاو ڕژا بە سەر سینگیدا، روو دەکاتەوە کەویێ. کـەویێ رووی وەرگێراوە! عەتا وەک شووشە تێکچرژا، بە سەر ئەسپەکەوە دەلەرزیێ، قـین لـە چـاوی دەباریێ! تا ئێستا کەس نەیتوانیوە بەرهەڵستی بوەستیێ و قسەی پـەرچ بداتـەوە! ئـەویش لەبەرچاوی ژنان!! خۆ بە شکاو دەزانێ، غـورووری زۆردارانـەی هـانی ئـەدا، بـە سـەر (کەویێ)دا دەگوڕێنیێ:

ـ کچەتیوە بیێ شەرمە! نابیێ حەیا بکەی؟! خۆت بە چی دەزانی؟ بە کیێ دەنازیێ؟ بەو هەتیوە شوانە؟ بە خودا دەیکوژم، لەبەرچاوی خۆت پەت پەتی پیێ دەکەم، حالی بووی؟ کەویێ تف لە زاریدا وشکبووە، مەرگی حەمەی لە بەر چاوە! بەدڵ بۆی دەگری، چـاویێ لە مینا دەکا، مینا لە چاوی کەویێ حالییە کـەویێ دەسـتی داوەتـە قوڵـفی گـۆزە، مینـا گورجیێ گوزەی لیێ هەڵێنا، کەویێ لە قوڵـکی کـانی وەسـەرکەوت و بـیێ ئاوردانـەوە، دوورکەوتەوە، عەتا وەک بەزیوێکەی سەر شۆڕانە سەری کوێتە وەردەسـووڕێنیێ و لـە جۆگەی کانی وەسەری دەخا، بـە تووڕەییـەوە ئەسـپی وەبـەر رکێـف داوە، لـە چـاو تروو کانێکا، بوو بە باریکە تۆزێک و لە دیێ دەرچووە.

مەڕ بە دەم لەوەڕەوە گەیوەتە دۆلی دزان. نزیکەی عەسرە، هەوا فێنک بووە. مێگەل بەمبەروئەبەری کێودا پەلی هەلخستووە، شوانە لە سەر بەردێ دانیشتووە و شمشال لێ‌ئەدا، مەڕ بە هەوای شمشال چەلیوە. گەلاز لە سەرووی مەڕەوە دوو سێ جار دەوەڕێ! ورچە و بۆرە لە قەراخ ڕێ، لە بن کەندەلانەوە دەردەپەڕن، بەدەم وەڕینەوە سەرەو ژوور هەلدێن. گەلاز لە قەدی کێوەوە سەرەوخوار بۆتەوە، حەمە شمشالی لە لێو کردۆتەوە، دەستی داوەتە بەرچاوی، سوارێ لە هۆولەکانەوە دێ! بێ گومان عەتایە. حەمە دەست بە گۆچانەوە پێشاوپڕی گەلاز دەداتەوە، ورچە و بۆرە لەدەست دەرچوون.

سەگەل بە سوار گەیون. ئەملا و ئەو لایان لێگرتووە. حەمە بەرەو سەگ و سوار ڕادەکا، گەلاز بە دوایەوەیە. ورچە و بۆرە لە دوو لاوە هێرش دەبەن، کوێتە لە هێرشی سەگەل شێتبووە، بە دەست و پێوە بەند نابێ، سوار مەجالی لێ براوە، دەمانچەی بڕنووی دەرهێناوە، تەقەیەک، یەکی دیکە، سێ تەقە، برووسکەیەک! نووزەیەک! ورچە گرمۆلە بووە! لە قورووسکەی ورچە، بۆرە بەرەو دوا بۆوە. حەمە بەرەو کەلاکی ورچە دەڕوا، عەتا بەرەو حەمە ئەسپی تاو داوە، پێشی پێ دەگرێ، حەمە لاتراسکە دەبەستێ، عەتا پێشاوبڕی دەداتەوە، قەمچی لێ هەلدەسوورێنێ، بە جنێوەوە گوتی:

ـ هەتیوە بەڕەللایە! وات لێ هاتووە سەگم تێبەر دەدەی؟! قەمچی ئاوقەی سەر و چاوی دەکا، حەمە خۆ لادەدا، پشتاوپشت دەکشێتەوە. عەتا ڕکێف لێ دەدا، تەپی داوەتەوە سەری. حەمە بە پشتەوە لە بەر سمی کوێتەدا کەوتووە. کوێتە هەستاوەتە سەر پاشوو، چەپۆک دادێنێتەوە، خۆ لادەدا. عەتا دەیهەوێ ئەسپی وەسەرگێڕێ. حەمە هاوار دەکا:

ـ دەتەوێ بمکوژی؟ چم کردووە؟ من بۆ سەگ لە تۆ دەکەم؟ وەللا ڕۆحم ئاگای لێ نەبوو. عەتا هەستاوەتە سەر ئاوزەنگی، سپێنی چاوی سوور بووە! خوێنی لێ دەبارێ! دەگۆڕێنێ:

ـ ڕۆحت ئاگادار نییە؟ ئێستا بێ ڕۆحت دەکەم بێژوو: ڕکێفی لێداوە، حەمە پاشەکشێ دەکا، یەک بە خۆی هاوار دەکا. گەلاز بە دەنگی هاواری حەمە، ئاوەقەی عەتا بووە، سێ چوار ملای پێدا دێ. عەتا لوولەی دەمانچەی وەرگێراوەتێ. حەمە دەگوڕێنێ:

ـ گەلاز هەلێ، دەتکوژێ! گەلاز دوورکەوتۆتەوە، عەتا ڕووی دەمانچەی وەرسووڕاندۆتەوە، حەمە مەرگی لێ میوانە! گەلاز پشتی لە عەتا گرتووە، عەتا قامکی لە سەر پەلەپیتکەی دەمانچەیە، حەمە هیوای مانی نەماوە، هیوای بە گەلازە! گەلاز لە بەرزایە، بە سەر سواردا سوارە، خۆی بە ئەرزەوە مەلاسداوە، هەر دوو گوێی هێناوەتە سەر نێو چاوانی، هەر دوو دەستی درێژکردووە، سینگی بە ئەرزەوە ناوە، پاشووی چەقاندووە و هێزی خستۆتە شانی و ددانی لە ڕێچەوە بردووە، لە چاوتروکانێکا، وەک باڵندە باڵ دەگرێ و لە ئەرز بۆتەوە، سێبەری وەسەر ئەسپ و سوار کشا، سواری لە سەر زین هەڵداشت، دەمانچە لە دەستی عەتا پەڕیوە، لە خۆڵی دەگەوزێنێ، کوێتە بە زین و لەغاوەوە بەلەسەی کێو بووە. گەلاز نیشتۆتە سەر عەتا، حەمە بە گۆچانەوە تەپی داوەتە سەر گەلاز و دووری خستۆتەوە، دەستی عەتا دەگرێ و هەڵی دەسێنێتەوە، عەتا تاساوا، خۆ لە سەر پێ ناگرێ، دانیشتۆتەوە، حەمە دەست لە ملی دەکا، جلە خۆڵاوییەکانی دەتەکێنێ، بە جامەلوسکێوە گوتی:

ـ ئاغاگیان! هیچ کوێت ئێشی پێ نەگەیوە؟ لە چی تووڕە بووی؟ عەتا خۆ ڕادەپسکێنێ، بە جنێوەوە گوتی:

ـ دەستم لێ مەدە بێژوو! گلاوم مەکە! حەمە دوورکەوتۆتەوە و دەستەونەزەر وەستاوە، عەتا لێی ڕاست بۆتەوە، وەبەر زللەی دەدا، حەمە بە پاڕانەوە لە بەری دەڕوا، عەتا دەستی داوەتە بەرد، وەبەر دووره بەردی داوە، بەردێ لە دەستی ترازاو زرینگەی لە سەریەوە هەستاند. خوێن بە سەریدا شۆلاوگەی بەستووە، دەستی داوەتە بەردێکی گەورەتر، دەیهەوێ یەکجاری کا.

حەمە هەڕای کردێ و پەلاماری دایە. هەر دوو قۆڵی عەتا کەوتۆتە نێو باوەشی بە هێزی حەمەو ڕێکی دەگوشێ، عەتا تاساوە و پشووی سوار بووە، بە هاوارەوە گوتی:

ـ بەرمدە حیزباب، بەرمدە! شین و ڕەش هەڵگەڕاوە، هەناسەی دەرنایە، بە هەناسە بڕکێوە دیسان هاوار دەکاتەوە:

ـ بەرمدە، باشە لێت نادەم!

ـ تا نەڵێی بۆ وادەکەی، بەرت نادەم.

ـ باشه بەرمدە پێت دەڵێم. حەمە دەستی شل کردۆتەوە، عەتا پشووی هاتۆتەوە سەرخۆ، بەرانبەر بە یەک ویستاون. ملیوانی کراسە سپییەکەی عەتا، بە خوێنی سەری حەمە سوور بووە. عەتا بە دڵ پرییەوە گوتی:

ـ دەست لە کەوێ هەڵگرە! دەست هەڵنەگری دەتکوژم، کەوێ بۆ تۆ نابێ! من خۆشمدەوێ، تۆ لەگەڵ منت پێناکرێ. حەمە خۆ شلوێ ناکا، لە سەرە خۆ گوتی:

ـ کەوێی چی؟! عەتا چاوی لێ دەردەپەڕێنێ، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ خۆ گێل مەکە! ناتوانی حاشا بکەی، تۆیان لەگەڵ کەوێ دیوە، بە هەڵەم مەبە.

ـ درۆیە! هەر کەس کتوویە درۆی کردووە، ئاخر من و کەوێ؟ ئەو خواردنی منە؟ باوەڕ مەکە، کێ دیویە من لەگەڵ کەوێ بووم؟ تۆ خوا کێ بۆی گێڕاویەتەوە، عەتا چاوەشینەکانی ئاوی تێزاوە، لە سەرەخۆ گوتی:

ـ فەیزە درێژ ئێوەی لە مێرگە گەورە دیوە. حەمە قاقا پێکەنی، گوتی:

ـ وەڵلا پیاوێکی ڕاست! جا باوەڕ بەو دوو زمانە دەکەی؟ بە خوا ئاغاگیان من ئاگام لەوە نییە، ئەو حەیس و بەیسە بۆ من نابێ، من شەووڕۆژ بەم کێو و شاخەوەم، ئەو کارانە کاری من نییە، کەوێش پێشکەش بە تۆ بێ، عەتا باوەڕی بە قسەکانی حەمە کردووە، دەم بە بزەوە گوتی:

ـ وەختا بوو بتکوژم! باش بوو ئەو سەگە کەوت. لە پڕ دەمانچە و کوێتەی هاتەوە بیر. هەردووکیان چوونەتە سەر ئەو شوێنەی کە کەوتبووە خواری، دەمانچەکەیان دۆزیوەتەوە. بە جووت لە کێوی حەوت کانیان وەسەرکەوتوون، بەڵام شوێن و هەتەرێ لە کوێتە نییە، عەتا بە پیادە بەرەو تازاوا وەڕێکەوت، حەمە بەرەو کەلاکی ورچە گەڕاوە.

# ٦

تەنگی نوێژی شێوانە. نیکاڵی ئاسمان بووە بە خوم. ئەستێرە تاقە تاقـە بـە ئاسمانـەوە وەدەرکەوتوون.

نێو دێی کانی‌توو شڵەژاوە، دەستە دەستە ژنان لە بنەدیواران کۆ بوونەتەوە نیگـەرانن. زارای خێزانی فەتاحەکوێر وەک جاوڕاوێڵکەرە، جاوی ناوەتـەوە و لای ئـەم کـوڕەوە دەڕوا بۆ لای ئەوی دی. زارا، فاتمی خێزانی فەیزە درێژی بە دیکردووە، چوەتە پەنایەوە و دەچپێنێ بە گوێیدا:

ـ ڕەنگە بەلایەکی بە سەر هاتبێ! دەنا بۆ نەهاتەوە؟! ئەوە چ وەختە شەوانی دی ئـەم دەمانە لە کار ببوونەوە، وا هەر نییە خات فاتم، دەبێ شتێک رووی دابێ!

فاتم بۆ ئاشکراکردنی ئەو باسە، وەکو مریشکی هێلکە دۆڕێن گـڵ و دۆر و هێلانـە دۆزیبوو، بیانووی بۆ ڕێ کەوتووە، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ قەدەرێ لەمەوبەر ئەو پیاوەی ئێمە لە کێو هاتەوە، دەیگوت ئەمڕۆ تەقەیـەکی زۆر لەدۆلی دزانەوە هاتووە! وەک باسی دەکرد، دوا بە دوای ڕۆینی عەتابەگ بـووە، نـەکا بەلایەکی بە سەر حەمەی داماو هێنابێ! ئا بڵێ تۆ بابایەکی شوان و لە دەرکی مالان چت بەو بەزمەی داوە؟ ئاخر قوڕبەسەر بۆ داو دەخەیە داوی عەتابەگەوە؟ تۆ لـەگـەڵ ئـەوت چۆن پێدەکرێ؟! بۆ بە قەدەر بەڕەی خۆت پێ ڕاناکێشی؟! ئاخر تۆچی و کەوێ چی؟!

زارا دەمی بە دەمەجاوە بنێشتەوە خولهەڵدا و لێوی لوولکرد و کردی بە قولی مـستیدا و بە سەر سوورمانەوە، وا کە هەموو گوێ بیس بن، گوتی:

ـ ئەیەڕۆ! ڕاستە!! ئەی مار بە دڵی کەوێوە دا، جا تۆ خودا هەر لە عەتابەگ و هەر لە حەمە؟

مینای کچی حاجی قادر قسەکەی بە زارا بڕییەوە:

ـ باشە خات زارا! حەمە چییەتی، بە برام بێ کچی شای قابیلە، بەڵام لە فەقیری گەڕێ باڵی شکاندووە و لەبەرچاوی ئێمەوماڵان سووکە، پیاوی بێ ماڵ هەر وایە، لە قەدیمەوە گوتوویانە: سەد کە ڕوستەم و نەتەوەی زاڵی، هیچ قودبت نییە چونکە بێ ماڵی.

زارا ویستی جوابی مینا بداتەوە، لە نەکاو دەستی گرت بە دەمیەوە و بە سرتە گوتی:

ـ باسەکە بگۆڕن! بێ دەنگەی لێ بێنن! پوورەگوڵە هات! ژنان هەموو کڕ و کەوتوون! کەس فزەی لێوەنایە!

تاپۆی پوورەگوڵە لە پەنای دیواری پشتی ژنانەوە وەدەرکەوت. دەستی داوەتە پشتی و وردە وردە دێتە پێشێ، چووە بەر دەمی فاتم و زارا، سەرتاپات پێیان دەڕوانێ. فاتم و زارا سەریان بەرداوەتەوە ودەڕوانە بەر پێیان. پوورەگوڵە هەروا تێیان ڕاماوە و هیچ ناڵێ، ئەوانیش مەتەقیان لێوە نایە، کەس مەتەقی لێوە نایە، پوورەگوڵە لە سەرە خۆ گوتی:

ـ باوەڕ دەکەن نیگەرانن؟ نیگەرانی چین؟ نیگەرانی نەهاتنەوەی مەڕ و حەمەن؟! ئەی خودا لە هاوماڵی و خزمایەتی کەمتان نەکا!!

فاتم و زارا دەزانن، پوورەگوڵە بە تەوسەوە دەدوێ، تووڕە و قەڵسە، هەر وا سەریان داخستووە و کڕیان لە خۆیان بڕیوە.

پوورەگوڵە گوتی:

ـ ئێوە ماڵ و مێردتان نییە؟ بۆ وەک قالاو تەماشای بن باڵ دەکەن و خەبەری عورووسیاتی لێ دەر دێنن؟ بۆ لە حەمە ناوسن؟! خەتای ئێوە نییە، مێردەکانتان قوڕمساخن! ڕووی لە زارایە:

ـ تۆ زارا دەم مقەست! ئەگەر ئەوندە دلسۆزی دەکەی بۆ عەتا، بۆ کەوێی بۆ ساز ناکەی؟ خۆ بۆ ئەوانە دەستانێکت هەیە، دە بۆی سازکە، بۆ بۆی ساز ناکەی؟ خۆ دەلالی چاک و باشی لێ دەزانی، خۆ فەتاحەکوێری قوڕمساخ پێی خۆشە، بۆ عەتا پێی ناخۆش نییە.

زارا ددانی بە بنێشتەکەی زارییەوە لکاو و لێو بە سەر ددانییەوە وشکهەڵاتووە و لە حاندی پوورەگولە نم نادا.

پوورەگولە رووی کردە فاتم و گوتی:

ـ فاتە گا خۆرا لەگەڵ زارا دەم مقەست قینی چیتان لە حەمەیە؟

فاتم وەکو کەڕولاڵ سەری بەرداوەتەوە و زمانی ناگەڕێ. هەموو خەڵکی کانیتوو خووی پوورەگولە دەزانن، دەزانن کە قینی هەستێ نابێ قسە بکەن، کەسیش قسەی پوورەگولە بە دڵەوە ناگرێ.

پوورەگولە تەمەنی شەست، شەست و پێنج ساڵ دەبێ. پیرێکی ساخ و توندوتۆڵە. وەک باسیدەکەن لە تافی لاویدا شۆخ و پێکەوتوو بووە. زۆر کەس لە دڵی خۆیەوە دڵی پێوەی بووە و بەڵام نەیوێراوە خۆ لە قەرەی بدا،

گولە کابانی ماڵێ پالاو دەشتەوانی دەشت و کوێخای مام کەریمی باوکی بووە. بە نێو مێو و بە سەر نێر، قەت کەسی بە نێر نەزانیوە. زۆر کەس بە دزی گولەوە خۆازبێنیان لە مام کەریم دەکرد کە گولەیان بداتێ، بەڵام هەرگیز باوکی نەیوێرا لای گولە بیدرکێنێ، ئێستاش هەر کچە و بنەماڵەی مام کەریمی ئاوەدان راگرتووە.

پوورەگولە زۆر بە کرد و بزانە، هەموو کارێ بەدەستیەوە کولاوە، حەکیمە، شکستبەندە، کەچەڵ تیمار و چاوێشە دەرمان دەکا، دەرمانی گشت برینێ دەگرێتەوە، هەورگەر و مامانە، تەونکەر و دەست و دروومان جوانە، وێنەی هەموو چەشنە گۆرەوی و پووزەدان و دەسکێش و سەرکلاوەی مەرەز و بەنی لە دەست دەرنەچووە.

پوورەگولە دڵپاک و سینە سافە. بە کاری هەموو کەسەوە ماندووە و چاوی لە دەسخۆشانەی کەسەوە نییە. خەڵکیش زۆریان خۆشدەوێ و چاویان لە سەریەتی و کاروباری بۆ بەڕێوە دەبەن و ئەو هەلە هەلە و قسانەشی لێ گوارە دەکەن و کەس بە دڵیەوە ناگرێ.

پوورەگولە شێرە ژنێکی ئازا و نەترسە، سەر لە بەر ئاغا و کوێخا دانانەوێنێ. هاوتەمەنەکانی شتی زۆر سەیروسەمەرەی لێ دەگێڕنەوە.

دەڵێن لە تافی لاویدا، بە سەرینی مام کەریمی باوکی، گولە شەوێ بە تاریکە شەوی زستان، بەر لە مەلا بانگدان، دەچێ وردە و تەپالە بێنێ بۆ تەنوور. گۆلە گورگێ لە ترسی سەرما پەنای هێنا بوو بۆ قەلاخ. گولە سەر دەکا بە قەلاخدا، گورگە ئامبازی دەبێ. گولە

ناخەجلێ، تایەک لە کەوشەکانی دادەکەنێ و لە دەستی ڕاستی دەکا و ئاوقەی گورگـە دەبێ. گورگە دەم دەکاتەوە و گولە دەستی بە کەوشەوە هەتا ئانیـشکی لـە گەروویـدا وندەکا. هەر گورگە دەکشێتەوە و گولە دەچێتە پێش و بە دەسـتی چـەپی پـشتە ملـی دەگرێ و گورگە بە دەستییەوە دەتاسێ و لە تەکان دەکەوێ و دەیخنکێنێ.

دەگێرنەوە:

ــ پاش مردنی مام کەریم، گولە کاری مامانی گرتە دەست.

شەوێ لە نیوە شەوی بەهاردا لە دەرگای مالی گولە دەدن، گولە دەرگـا دەکاتـەوە، ڕەش سوارێکی نەناسیاوە! ڕەش سوار دەلێ:

ــ ئێمە خێلاتین و خێلەکەمان لە دێ کۆن خستووە و ئافرەتێکمان بە ژانەوەیـە، نێـو نیشانی تۆیان بۆ هەلداوم، بێتوو فریای نەکەوی دەمرێ. گولە بێ ترسـانە لەگـەل ڕەش سوار ڕێدەکەوێ. کە دەچێتە ئەوێ شتێکی سەیر دەبینێ! ژن و پیاو، گەورە و بچووکیان وەکوو خەلکی ئاسایی ناچن!! درێژایی چاویان سـەرەو خـوارە؟! قـژی سـەریان وەک درووی ژیشک سەرەو ژوور هەلگەڕاوەتەوە!! هەمـوو بـۆر بـۆر و بچـووک و یـەک دەستن! گولە دەسەو جێ تێدەگا کە ئەوە خێلی (ئەوان گەلن) بێ ئەوەی خۆف بیگرێ، خەریکی کاری مامانی دەبێ.

سەرتاپا ڕەشێ وەژوور دەکەوێ. گولە دەیناسێتەوە، هەمان ڕەش سوارە.

ڕەش سوار دەلێ.

ــ من سەر خێلم ئەوەش کە بە ژانەوەیە ژنی منـە، ئەمـە یەکـەم مندالـمانە، ئەگـەر منداله‌کەمان کوڕ بێ ئەوەی دلت بیخوازێ ئەتدەمێ، ئەگەر خۆ کـچ بـێ، خـۆم دەزانم چت بە سەر دێنم! بە شێتی دەتنێرمەوە، جا کەیفی خۆتە.

گولە هێندێ مات دەبێ، دەکەوێتە بیری فێلەوە، بە سەر خێل دەلێ:

ــ ئەوەی دەمەوێ بۆم بەڕێوە ببە، ئەوەی دەتەوێ بەڕێوەی دەبەم.

سەر خێل دەلێ:

ــ داوا بکە.

گولە دەلێ:

ــ چەقۆیەکی تیژ، تۆپەلێ بەرەمێو، جامێ ئارد. دەوروبەرم چۆل بـێ و کـەس لێـرە نەمێنێ، تا خۆم نەلێم، مەیەنە ژووری.

سەر خێڵ داخوازەکانی گشت بەڕێوە دەبا، منداڵ لە دایک دەبێ، منداڵ کچ دەبێ. گولە ناپەشۆکێ. بەرە مێو نەرم دەکاتەوە و لوولی دەکا. سیرەت و باتوو بۆ کچە دروست دەکا و دەیکا بە کوڕ. نێوکی دەبڕێ، پێستی نێوک لە بەرەمێو هەڵدەکێشێ و منداڵ لە ئارد وەردەدا و بانگی سەر خێڵ دەکا.

سەر خێڵ لە خۆشیان هیچی لە بیر نامێنێ، شایی دەگرن، دەستوور دەدا زێر و ئالتوون بۆ گولە دێنن، بەلام گولە ناوێرێ وەریبگرێ. سەر خێڵ گولە سوار دەکا ودەیباتەوە ماڵەکەی خۆی.

پاش ماوەیەکی زۆر، شەوێ لە کولاوکەی سەربانی ماڵی گولەوە سەر خێڵ بانگی گولە دەکا و دەڵێ.

ـ فێڵێ تۆ کردت تا ئێستا نەدیومە، نە بیستومە، خودا بتکا بە قوربانی عەقڵی خۆت، تازە هیچ، من ئەجننەم! تۆ فێڵت لە ئەجننەکردا!!

پوورە گولە هەر دوو دەستی ناوەتە کەلەکەی و وەک لۆک گەرم بووە و بێ فەزیحەت بە فاتم و زارا و مێردەکانیان دەکا.

مینا بۆ ئەوەی کۆتایی پێ بێ و لەوە زیاتر ئابڕووی کەوێ نەچێ، لەوەش دەچوو وەک نەوت بیتەنێتەوە و پای خۆشی بگرێتەوە، ئاخر ئەویش پاشی کولۆشە! لە نەکاو، فێڵەبازانە گوتی:

ـ دا دەنگ، دا دەنگ، دەنگی زەنگ دێ پوورێ گیان، گوێت لێیە؟

ژنان گوێ قۆلاخ هەستیان راگرتووە. زارا و فاتم هەل بەدەرفەت دەزانن، ڕێوی پێچکێیان لێدا و دەرباز بوون.

مەڕ لە تاریکیدا ڕێ داناگرێ. شوانە بزنەگەلی وەپێش داوە و ئۆهۆ بۆ مێگەل دەکا. گەلاز کلکەی هەڵپێچاوە کردوویە بە قولەی هێلکە. بۆرە شان بە شانی شوانە،کلکی قەف، ناوەتە سەر شانی و مەڕی خستۆتە ژێر چاوەدێری.

حەمە بە پێچەکەی، سەری قەرەچی پێچکردووە، جار جارێ پەنجە لە سەر برینەکەی سەری دادەنێ و بە تاریکی چاو لە پەنجەی دەکا، خوێن و زنچکاوی بۆ سۆ لە پێچەکەوە سەری کردووە پەنجەی تەڕ دەکا.

حەمە پێی خۆش نییە خەلک پێی بزانێ سەری شکاوە، بە تایبەت پوورەگولە. هەر لە بەر ئەوەشە وا خۆی وەدرەنگ خستووە.

مەڕ لە دەوری دێیە. پڕمەی بزن و کۆخەی مەڕ دەگاتە دێ. حەمە گوێی لە دەنگی خەڵکەوەیە، وەدیارە بەرەو پیری دێن. حەمە دەنگی ئەحمەدی مام حەسەن دەناسێتەوە، ئەحمەد بەر لە هەموو کەس بە بەرایی مەڕ گەیشت.

ئەحمەد وەک هەمیشە دەم بە پێکەنینەوە ماندوونەبینی کرد و گوتی:

ـ دڵمان کەوتبووە قرت و فرت! بۆ وا درەنگ مەڕت هێناوە؟ ئەو تەق و تۆقە چی بوو؟

حەمە گوتی:

ـ دڵتان بۆ مەڕەکە کەوتبوو قرت و فرت،یان....

ئەحمەد گوتی:

ـ نازانم، من نیگەرانی خۆت بووم، خەڵکیش نازانم، بە راست ئەو تەقە چی بوو؟ یەک و دوو نەبوو!

حەمە کە زانی خەڵک زانیویانە، نەیشاردەوە، ئاشکرا گوتی:

ـ سەگەکان بۆ عەتابەگ چوون، ئەو بوو تەقەی کرد، تا فریا کەوتم ورچەی تۆپاند، ئەوانی دیش خستیانە خوارێ و ئەسپەکەی بە لەسەی کێو بوو، لەو دەمەوە بە دوویەوەین، ئاخری بۆمان نەدۆزراوە، بۆیە کەوتمە درەنگ. ئیتر باسی لێدان و سەرشکانی خۆی نەکرد.

یەک یەک و دوو دوو خەڵک گەیون و لە حەمە کۆ بوونەتەوە و بە باسەکەیان زانی. کەس مەتەقی لێوەنایە! هەر بە تەماشا لەگەڵ یەکتر دەدوێن! رەنگە هەر ئەوەندە بڵێن:

ـ جا دەڵێی چی کاکە؟! دەستێ زۆر بیبڕێ کوا خوێنی؟ ئەویش هەر لە دڵەوە ئەوە دەڵێن.

حەمە بە دەرفەتی دەزانێ، قەت ئاوا خەڵکی بۆ کۆ نابێتەوە، بێ دەنگی شکاند، گوتی:

ـ بەیانی کەسێ لە باتی من لەگەڵ مەڕەکە بچێ، من وەدووی سەگ دەکەوم، بە دوو سەگەوە خۆ شوانی ناکرێ.

کەس خۆ ناکا بە خاوەنی قسەکە. هەموو چاویان لە دەمی یەکە، ئەو بە تەمای ئەوی دی بێ دەنگە و کەس جواب ناداتەوە.

حەمە بە توورەییەوە گوتی:

ـ بۆ خۆ گێل دەکەن؟ ئەو مەڕە مەڕی ئێوەیە، خۆ ناچم لە هەندەرانەوە پیاو بێنم!
کەیفی خۆتانە براڵە، سبەی ڕۆژ گورگ لە مەڕ بدا نەڵێن، من ئەوە گوتم.

حەسەنە کەچەڵ هێندێ لاقوونی هەڵکراند، گوتی:

ـ من بەش بە حاڵی خۆم پێمناکرێ، بەرەئاشم داگرتووە و بەیانی دەچم بۆ ئاش، دەنا ڕۆژە پیاوێ هیچ نییە.

حەمەی نەنە خەجێ توتن و پەڕەکەی دەرهێنا و سیغارێکی پێچاوە و نای بە لێویەوە و دەم بە سیغارەوە گوتی:

ـ براڵە، کاکە حەمە! بۆ بیانوومان پێدەگری؟! وەختی کار و کوێرەوەرییە، کێ پێی دەکرێ؟ سەگێ ئەوەی هەڵناگرێ پیاوی بۆ لە کار بێ، ئەوە نێو دێ پڕە لە سەگ، سەگێ بە کەیفی خۆت هەڵبژێرە و لەگەڵ خۆت بیبە، ئەوەی بۆ چیە ڕەحمەتی خوات نەبێ؟

حەمە بە رق هەستانەوە گوتی:

ـ جا ئەوە قسەیە کاکە حەمە؟! سەگی نێو دێ بۆ لای مەڕ دەبێ؟! تۆ لای خۆت دنیات دیوە!

ئەحمەدی مام حەسەن بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ کەس نەچێ براڵە، کەس نەچێ، کەسی ناوێ، من دەچم کاکە حەمە، خۆم لە جێی تۆ دەچم، تۆ برۆ وەدووی سەگ بکەوە، تا نەیهێنی مەیەوە، دە ڕۆژێشت پێ بچێ، خۆم لەگەڵ مەڕەکە دەچم، دڵ لە دوا مەبە، بەڵام بەیانی وەرە مەڕەکەم بۆ وەرێ خە، نەک سەگەکان نامۆیی بکەن و ڕێ دانەگرن، لەگەڵ من، هەر یەک ڕۆژ لەگەڵم بێن خووم پێدەگرن. ئەحمەد ئەوەی گوت و توندێ لێیدا و ڕۆیشت. دوا بە دوای ئەحمەد، خەڵکەکەش بڵاوەیان کرد.

کزە بایەکی سارد هەڵیکردۆتێ و برینی سەری حەمەی وەژان هێناوە. حەمە ئەو شەوە خۆ لە هەموو کەسێ دەپارێزێ و حەز ناکا کەس بیبینێ. دوو شەوی ماوە نۆرەی ماڵی ساڵەی مام مەجید تەواو بێ. حەمە گەلاز و بۆرەی وەدوو خستووە و بە بەرگەڕەکدا تێدەپەڕێ. ماڵی ساڵە بە جێ دێڵێ، بە کۆڵانی ماڵی مام ڕەسووڵدا تێهەڵدەگەڕێ، وەدیارە بەرەو ماڵەکەی خۆی دەچێتەوە. گەیوەتە بەر دەرگای ماڵی مام ڕەسووڵ. دەرگا بە دەنگە دەنگ کراوە.

ـ کسه کسه، خەڵکه خەڵکه! پووره خاتووزینی خێزانی مـام رەسـووڵ بـوو، مـەڕه غەوارەیەکی له حەوشه وەدەر دەنا. پووره خاتووزین لوت و بزووت، لـووتی تـەقی بـه لووتی حەمەوە.

ـ ماندوو نەبی حەمەگیان، چاوێ له گوێی ئەو مەڕە بکه بزانه داخی کێیە؟

حەمە قەفی گۆچانی خسته ملی مەڕەکـه و لاقـی هـەڵـێناوە و کـەرەکی خـستیه ئەملاوئەولای کەلەکەی مەڕ و به دەستی راستی لمۆزی گرت و به دەستی چەپی گـوێی چەپی گرت و سەرنجی دایە، گوتی:

ـ تاریکییه پووری گیان، بۆم نابیندرێ.

پووره خاتووزین دەستی له گیرفانی کوتا، خرەی شەمچه دڵی حەمـەی داخورپانـد، سەری له سەر مەڕ دوور خستەوە و راست وێستا. پووره خاتووزین شەمچەی دەرهێنـا و هەڵیکرد. حەمە هەر له دوورەوە گوتی:

ـ داخی ماڵی کوێخاکەریمە، حەمە مەڕی وەپێشدا و دوورکەوتەوە.

خاد گەوەر! دادەگەوەر! مەری غەریبە له نێو مەڕەکاندا نییە؟ دەنگی کەوێ بوو، لـه دەرگای ماڵی حەسەنە کەچەڵ دەهات! دەنگی کەوێ دڵی حەمەی داترووسکاند، دەڵـێی مەڕەکەش دەنگی کەوێ دەناسێتەوە! دوو سێ جار کاڕاندی.

کەوێ گوێی له کاڕەی مەڕە، بەرەو کاڕە به کۆڵاندا دەگەڕێتەوە. له پڕ دا لەرزی و تاس بردییەوە.

حەمە و کەوێ بەرانبەر به یەک ڕاوەستاون. و مەڕە تاڵه له مابەینیاندایە. ئەوەنـدە لـه یەک نزیکن، هەست به هەناسەی یەکتر دەکەن.

کەوێ سەبرێ به پەله گوتی:

ماندوو نەبی! بۆ وا درەنگ مەڕت هێناوە؟ نیوە مەرگت کردم! ئەو تەقەیـه لای تـۆ بوو؟

حەمە به پەله گوتی:

ـ قسەم زۆره و وەختی نییه، ئاوایی خەوتن دێمە سەربان، نەخەوی.

کەوێ بێ قسه ملی مەڕەتاڵەی گرت و ڕۆیی.

حەمە دزانه به کۆڵاندا، بەرەو ماڵ بووەتەوە. ماڵی پوورەگوڵەی به جێ هێـشت، بـه دەوری خۆیدا، سرکانه قوته دەکا، گەیوەته بەر دەرگـا، دەرگـای حەوشـەی کـردەوە،

ئورێکی داوە، تارماییەک لە بنە دیوارەوە بێ خشە دەخوشێ. حەمە ویستی خۆ هەڵە بکا، تارمایی دەنگیدا:

ـ راوەستە! ئەوە بە ملی شکاوت لە کوێ بووی؟ بۆ وا دەرنگ؟

ئەوەی حەمە لێی دەترسا، وەک دیوەزمە بەربینگی پێگرت و دەرەتانی لێ بڕی، پوورەگولەیە!

پوورەگولە وردە وردە بەرەو حەمە دێ. بە رۆین و حالاتیدا لە توورە دەچێ.

حەمە بە لاشیپانی دەرگاوە وشکهەلاتووە و هەست و خوستی نییە.

پوورەگولە هاتۆتە پێشێ، بێ ماندوو نەبینی گوتی:

ـ دەڵێن لای تۆ تەقە بووە؟ راستە؟ باس باسی تۆ و عەتایە لە نێو دێ، ژنان پێی هەڵدەپەڕن! تەقەی لە تۆ کرد؟

حەمە تف لە دەمیدا وشکبووە، بە زمان لێوی تەڕکرد و گوتی:

ـ نا! نا، پوورێگیان! تەقەی لە سەگەکان کرد، تەقەی لە من نەکردووە، سەگەکان بۆی چوون، تەقەی لەوان کرد.

پوورەگولە بە شک زانیویە لە خۆشی داوە، گوتی:

ـ لە خۆشتی داوە! وەنییە؟ وەرە با برۆین وەرە، پوورەگولە بەرەو مالەکەی خۆی دەڕوا، حەمە بێ قسە وەدووی کەوتووە، تەنانەت ناوێرێ بلێ نایەم.

پوورەگولە لای ژووروویی ماڵە. لامپا لە سەر سندووقەکە خەفە کراوە، پوورەگولە گڕی لامپا هەڵدەکێشێ و دەستی دەگرێ بە شووشەکەیەوە و بە دەستەکەی دیکەی نێو قەدی دەگرێ دەیهێنێتە نێوەڕاستی ژوورەکە لە گوێی تەنوورەکە دایدەنێ، چاوێ بە مۆڕەوە لە حەمە دەکا.

حەمە هەر وا بە لاشیپانی چەپەرەکەوە وەستاوە بە ترسەوە چاوی بڕیوەتە دەمی پوورەگولە، داخوا چی بلێ؟!

پوورە گولە بێ ئەوەی چاوی لێکا، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ بۆ بووی بە دارتوورەکە؟ دەوەرە دانیشە.

حەمە پاپا نزیک بووەتەوە، ناوێرێ خۆ وەقەرەی شەوقی چراکە خا.

پوورەگولە زەینی دەداتێ بە گومانەوە گوتی:

ـ باوەڕ دەکەی رەنگت پەڕیوە؟! زەرد هەڵگەڕاوی! چی بووە؟

حەمە هەر بە پێوە وەستاوە و نقەی لێوە نایە!
پوورەگولە گوتی:
ـ بۆ دانانیشی؟ دەدانیشە، دەڵێی کەری دروێنەوانە و دوورە پەرێز وێستاوی.
حەمە بە ترسەوە دانیشت. پوورەگولە بە وردی سەرنجی داوە و بە سەر سوورمانەوە گوتی:
ـ ئەوە سەرت شکاوە؟! وەرە وەرە پێشێ بزانم، وەرە بەر شەوقەکە، بە چی لێیداوی؟
ـ بە، بە، بە بەرد، هیچ نییە، بە حاڵ قرنجاوە.
پوورەگولە لێی چۆتە پێشێ، پێچ و کلاوەکەی لە سەر دەکاتەوە و چاوێ لە برینەکەی دەکا، بە دڵئێشییەوە دەڵێ:
ـ ئەی رووی باوکی ڕەش بێ جا ئەوە لێدانە! بەینەڵلا کەلاکەکەت بهاتایەتەوە باش بوو. یا خوا سیپەلکی بە خوێن بێ! ئەی بۆ نەیکوشتی؟! پیاوی وەک تۆ بە کاری چی دێ؟ هەر بۆ مردن چاکی، دێلە پیاو، تۆ دێلی دێڵ، بە گوڵم گوێ بڕیت، بە دێڵ دەرچووی! وەرە ڕاکشێ وەرە، تەماشا ئەو ملە پانەی! وەڵلا لەتیکەی دووانی وەک عەتا ڕیوەڵەی تێدەبێ، وەرە ڕاکشێ وەرە دێلە!
حەمە لە بەر چرا خۆی درێژکردووە و دوو لێوەی نابزوێ.
پوورەگولە بە دەم قسە کردنەوە هەستاوە، کوولەکە سەراوێکی سەر بڕاو، پەتێ لە باریکی ملی خراوە بە دیوارا شۆڕەوە بووە، زەردە چێوەی تێدایە، لەگەڵ مقەستێک و هێندێ لۆکەی تازە، هێنای و گوتی:
ـ لەسەرچی لێیدای؟
حەمە چاوی بێ زاری لە سەریەک داناوە، شەرمەزارانە گوتی:
ـ نازانم، هەر لە خۆڕا،
ـ بە درۆ دەڕێی، لە خۆڕا نییە، بە شێتم دەزانی؟ پێتوایە من گێلم نەوەکەی بلە جەواڵ، من گێل و گەوج نیم، ئەوە لە سەر خاد (کەوێ)یە! لە تازە ڕاوکەر وایە کۆنە ڕاوکەر کوێرە، سەرت وەرسووڕێنە با بۆت دەرمان کەم.
حەمە سەبرێ سووڕا.

پووره‌گوڵه ده‌وری برینه‌که‌ی به‌مقه‌ست هه‌ڵپاچی وده‌می برینی کرده‌وه و پـڕیکرد
ـه زه‌رده‌چێوه و لۆکه‌ی له سه‌ر دانا و به په‌رۆیه‌کی خاوێن به‌ستی و گوتی:

ـ به جارێ لایه‌ک له سه‌ری هێناوه‌ته خوارێ، ده‌ڵێی به حاڵ قرنجاوه پوورێ گیـان، هیچ نییه! ئه‌ی هیچ چۆنه؟ هه‌ر ئه‌وه‌ی ماوه سوارت بێ، ئیشاڵلا سوارت ده‌بێ، په‌له مه‌که، تۆ هه‌ر وا ملی بۆ داخه، بزانه سوارت ده‌بێ، یان نا، هائه، ئه‌وه من مردوو و تۆ زیندوو. بۆ ـه‌به‌ری داده‌نه‌وێنی؟ ئه‌و دار ده‌مه‌موکانه چییه؟ له چی ده‌ترسێی؟ چیت له پاش بـه جـێ ده‌مێنێ؟ به‌ره جووته زۆره‌که‌ت، مه‌ڕ و ماڵاته‌که‌ت؟ ژن و منداڵ و دایک و بابت؟ ئاخر تۆ چیت هه‌یه؟ بابایه‌ک سه‌ڵت و قوڵت، بۆ ده‌ترسێی؟ پیاو به پیاو.

پووره‌گوڵه به ده‌م هاندانه‌وه که‌وڵ و کاسه و دیزه چێشتی هێناوه، نیوه شه‌ڕ و نیـوه ئاشت نان و خوانی ساز کرد.

ده‌ستیان له کاسه‌دایه، که‌سێ له ده‌رگاوه بانگیکرد:

ـ پوورێگیان! پووره‌گوڵه! کاکه حه‌مه لێره‌یه؟

ده‌نگی ئه‌حمه‌دی مام حه‌سه‌ن بوو.

حه‌مه پاروو له ده‌م به بڵمه بڵم جوابی داوه، به پێخاوسی ده‌رپه‌ڕی و چوو به پیریه‌وه و هێنایه ژوورێ.

پووره‌گوڵه به روویه‌کی خۆشه‌وه به خێر هاتنی کرد، به زۆر شێوی ده‌رخوارد دا.

شێو خوراوه، که‌وڵ و کاسه کۆوه‌کراوه، ئه‌حمه‌د به سه‌ر سوورمانه‌وه چاو لـه حه‌مـه ده‌کا، به په‌رۆشه‌وه گوتی:

ـ ئه‌وه چیه؟! ده‌ڵێی سه‌رت شکاوه!! بۆ؟

ـ حه‌مه ته‌نیا به بزه‌یه‌ک جوابی داوه.

ئه‌حمه‌د رووی پرسیاری بێ ده‌نگی کرده پووره‌گوڵه؟

پووره گوڵه به ته‌شه‌ره‌وه گوتی:

ـ عه‌تا بیانووی پێگرتووه! لێیداوه و سه‌ری شکاندووه، هه‌ر له خۆڕا!!

حه‌مه بۆ به‌رگری له قسه‌ی پووره‌گوڵه، په‌ڕیه نێو قسه‌که و گوتی:

ـ زۆریش له خۆڕا نه‌بوو، سه‌گه‌کان بۆی چوون، زۆریان شپرزه کـرد، ته‌نانـه‌ت لـه سه‌ر زین هێنایانه خوارێ و له خۆلیان وه‌ردا! ئه‌سپه‌که‌شی به له‌سه‌ی کێو بـوو، لـه سـه‌ر ئه‌وه وا قه‌لس ببوو کاکه ئه‌حمه‌دگیان، سه‌گێکیشی لێ تۆپانـدم، ورچـه! ئێـستا بـه دوو

سەگەوە چۆن بچمە کێو؟ ئەو قسانە بۆ ئەحمەد دووپاتەیە، حەمەش دەیـزانی، بـەڵام لـە ئانقەست بوو، بۆ ئەوە وا درێژەی دایە کە باسەکە بگۆڕێ، نەکا پوورەگوڵە باسی کەوێ بێنێتە گۆڕێ، ئاخر ئەحمەد خالی (کەوێ)یە.

پوورەگوڵە ویستی قسە بکا، بەڵام ئەحمەد زووتر هاتە کار، بە پەلە گوتی:

ـ کاکە حەمە! سەگم بۆ دیویەتەوە سەگ! سەگی مـەڕێ! ئەمـڕۆ بـاوکم چووبـووە کانییەکوێرە، دەیگوت خەڵکی کانییەکوێرە مەحموود شوانیان لە شوانی داناوە، ئەویش لە داخان سەگەکەی بردووە لە شار بەرەڵلای کردووە، وەک باسی دەکـرد سـەگەکەی زۆر سەگی چاک بووە.

حەمە لە خۆشیان هەستاوەتە سەر پێ، بە سەر لێشێواویەوە گوتی:

زالم؟! زالمی بـەرەڵـلا کـردووە؟! بـاوەڕ ناکـەم!! ئـەی بـە قوربانـت بم کاکـە ئەحمەدگیان، کوڕە زالم سەگ نییە، دەبـێ بـڵێی مـلکە! مـلکە مـلک.. حەمـە سـوور هەڵگەڕاوە، چاوی وەگەش گەش کەوتووە و پرشنگ دەپێکێ.

پوورەگوڵە چاوێ لە ئەحمەد هەڵدەتەکێنێ، ئاماژەی بە حەمە کرد و گوتی:

ـ چاوی لێکە! دەڵێی رۆن قازی لێدەدەی! تۆ باسی سەگی بۆ بکە، باسی سـەگی بـۆ بکە بەسیەتی.

ئەحمەد گوتی:

ـ ئاخر ئەویش کارەکەی ئەوەیە پوورێگیان، سەگی نەبێ شوانی پێ ناکرێ، ئەحمەد رووی کردەوە حەمە:

ـ بەیانی برۆ وەدووی کەوە. ئەحمەد ئەوەی گوت و هەستا. حەمـەش وێـڕای ئـەو هەستاوە، ئەحمەد لە سەر ئیزنی پوورەگوڵە وەدەرکەوت، حەمـە تـا دەرگـای حەوشـە ڕەوانەی کرد و گەڕاوە ژوورێ. حەمە هەر بە پێوە وەستاوە، چاوی داخـستووە، دەڵـێی شتێکی لە دڵدایە و ناوێرێ بیدرکێنێ! پوورەگوڵە تێگەیوە، گوتی:

ـ بۆ وا وشک بووی؟ یان وەرە دانیشە، یان برۆ بخـەوە، بـۆ وا دۆشـت دابـردووە؟ دەڵێی کارێکت هەیە.

حەمە بە ترسەوە گوتی:

ـ پوورێگیان! بەیانی دەچم بۆ شار، سێ چوار تمەنم پوول دەیە. پوورە گوڵە هێندێ ماتبوو، پاشان گوتی:

ـ پوولت بۆ چیە؟ تۆ دەچی بۆ سەگ، یان دەچی بۆ ئازووقە کڕین؟

حەمە گوتی:

ـ پیاو چوونی بەخۆیەتی، هاتنەوەی بە خۆی نییە، پیاو پوولی پێ بێ چاکـە، هـاتوو شەوێ مامەوە، جگە لەوەش، دەبێ مەحمود شوانیش لەگەڵ خـۆم ببـەم، دەنـا بـۆ مـن ناگیرێ، پەت بە من نادا.

پوورەگولە هەستاو بەرەو سندووقەکە ڕۆیی، بە دەم ڕۆینەوە گوتی:

ـ دەی چاوت دەرێ، من لە بەر خۆت دەڵێم، دەڵێم با شتێکت بۆ پاشەکەوت ببێ.

دەرگای سندووقەکـەی کردۆتـەوە، پرێـسکەیەکی دەرهێنـاوە، پـشتی لـە حەمـە هەڵکردووە و گرێی پرێسکەکە دەکاتەوە، گوتی:

ـ چەندە دەبەی؟

ـ پێنج تمەنم بەسە.

ـ ئەوە پێش تمەن، هەمووی خەرج مەکە، باقییەکەی بێنەوە، حەمە پوولی وەرگـرت و وەدەرکەوت.

شەو درەنگە، دوو بەشی خەڵک خەوتوون، حەڤدە و هەژدەی مانگـە، بـەری مانـگ ڕوون بووەتەوە. حەمە بێ چرپە لە قوونە بانی ماڵی کوێخاوە وەسەر کـەوت، بـێ چپـە چۆتە سەربان. هەر چاوێکی بووە بە چوار چاو و بە دەوروبەردا دەیگێڕێ.

بە ئەسپایی هەنگاو دادەنێ و هەڵیدەگرێتەوە، خۆی کە هـەسـت رادەگـرێ، زیـاتر دەنگی لێدانی دڵی دەبیستێ تا دەنگی پێی.

کەوێ کاسەوکەوچکی شـێوی بردۆتـە نێـو مـاڵ، دایـک و بـابی خـەوتوون، بـە دڵەڕاوکێوە تەماداری هاتنی حەمەیە.

ـ خشپەیەک، دوو خشپە، سەربان وەچرکە چرک دەکـەوێ، چرکـە لـە کولاوکـە نزیک و نزیکتر دەبێتەوە. کەوێ چاوی بڕیوەتە کولاوکە.

حەمە لە سەر کولاوکە چـۆکی داداوە ودەسـتی ناوەتـە ئەمبەروئەوبـەری و سـەری کردووە بە نێویدا، بە ئەسپایی گوتی:

ـ کەوێنگیان، نەخەوتووی؟

کەوێ دەستی بە کاسەوە لە نێو تەشتە ئاودا رادەگرێ، گوێ هەڵـدەخا، هـەسـت و خوست نایە، بە سرتە گوتی:

ـ بۆ وا دەرنگ هاتی؟

حەمە سەر لە کولاوکە دەردێنێ، تەماشایەکی دەوروپشت دەکا، سەری کـردەوە بـە کولاوکەدا و گوتی:

ـ دەزانی پێیان زانیوین؟ عەتاش زانیویە!

ـ هەموو کەس زانیویە،کار بەوەدا نەماوە، هەمووی فیتی فەیزە دریژە، ئەو رۆژە لـە میرگە گەورە ئیمەی دی، لەو رۆژەشەوە تۆم نەدیوە، دەرفەت نـەبوو پێتبـلێم. تـۆ خـوا حەمەگیان ئاگات لە خۆت بێ، پێت نەگوتم ئەو تەقەیە چی بوو؟ ئەمرۆ لـە عەسـەرەوە حەجمانم لێ براوە، لە تۆ دوور بوو؟

حەمە سەری هەلێنا و قوتەیەکی بە دەوری دا کرد و سەری بردەوە ژووری و گوتی:

ـ عەتا بوو، تەقەی لە سەگەکانی من کرد، سەگێکیشی تۆپاند، وەختـا بـوو خۆشـم بکوژێ، بە هەزار سوێند و قورعان باوەڕی کردووە کە من هیچ نێوانێکم لەگەڵ تۆ نییە، کەوێگیان شتێک بلێم دلمەند نابی؟

کەوێ هێندێ ماتبوو، پاشان سەری هەلێنا و گوتی:

ـ نا، نەوەڵلا چیە؟

حەمە بە دوو دلییەوە گوتی:

ـ تا ماوەیەک با لە یەک دوور بین، هەر ماوەیەکە، پاشان خەلک سـای دەخـەن و کۆن دەبێ.

کەوێ بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ جا تازە؟! کابرا گوتی تا سە رەوسەکە ئاو نەیبردووە، تازە ئاو بیبا بە کـاری چـی دێ؟!

حەمە بۆ دلخۆشی کەوێ گوتی:

ـ هیچ نییە! هەر گرۆپفێکە، دادەمرکێتەوە، با ماوەیەک لێک دوور بین، بزانین چۆن دەبێ.

کەوێ هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی:

ـ باشە حەمەگیان، باشە، خودا دەکا بەوە واز دێنن، قەیناکە، ئەگەر کارێ، قـسەیەک بوو، بە مینای بلێ، ئەو با لە نێوانماندا بێ.

حەمەبە سەر سوورمانەوە گوتی:

ـ مینا؟! مینای حاجی؟!

کەویێ بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ لەو مەترسێ، ئەو لە یەکەم ڕۆژەوە دەزانێ، ئـاخر ئـەویش دڵـی بـە خاڵـمەوەیە، خالیشم دەزانێ من و تۆ یەکتریمان خۆشدەوێ، مینـا پێـی گوتـووە، تـازە کـار لـەوە دەرچووە. حەمە ماوەیەکە بێ دەنگە، تاس بە سەریدا دێ، کەویێ دەنگی دەدا:

ـ چیە؟ بۆ وا بێ دەنگی؟

حەمە بە دەنگی کەویێ تاس لە سەری پەڕی، گوتی:

ـ هیچ هیچ، بەیانی دەچم بۆ شار، دەبێ سەگ پەیدا کەم، بە ڕاست مینا جێی باوەڕە؟

کەویێ دەم بە بزەوە گوتی:

ـ ئەرێ، ئەرێ، جێی باوەڕی منە، تۆش لێی مەترسـێ. لـە پـڕ جیـڕەی گرێژەنـەی دەرگای دیوەکەی کوێخا رایەڵەوپۆی قسەی حەمە و کەویێی پساند و لە یەکی هەڵبڕین. خشپەی پێی ڕەوەکانەی حەمە چرپە وەسەربان دەخا، پاش ماوەیەک ڕممـەی قوونـەبان کوێخاکەریمی خستۆتە گومان و دوو دڵیەوە.

# ٧

گزنگی هەتاو لە پەنجەرە دوو دەریەکەی روو بە رۆژ هەلاتەوە خۆی کێشاوەتە نێو کۆشکی ئاغاوە، داویە لە ئاوێنە بالا نوێنەکە، تیشک گەڕاوەتەوە بۆ نسێ و هەتاو بووە بە دووان.

هەمزەبەگ بە تۆیی کراس و دەرپێی سپییەوە بە نێو ژوورەکەدا دێت و دەچێ، جار جار بەری هەتاو لە ئاوێنە دەگرێ و تیشک لە بەرگە سپیەکەی دەکەوێ و ژوورەکە دەکا بە کولوو.

رەسوولی نۆکەر و ئەحمەد فەڕاش دەستەونەزەر بەلای دەرگاوە وێستاون، چاوەڕێی فەرمانی ئاغان.

عەتا لای سەرەوە، لە بەر دەستە نوێنێ، هەڵتروشکاوە، مستی دەستی چەپی لە نێو پەنجەی دەستی راستی ناوە و هەر دوو ئانیشکی ناوەتە سەر ئەژنۆکانی و تەوێڵی ناوەتە سەر هەر دوو مستی و زەق دەڕوانێتە نێوانی هەر دوو پێی.

عەدلە خانم لەوبەری عەتاوە، پاڵی داوە بەدیوارەوە، نازاداری کڵفەتی بە شانییەوە وەستاوە، جار جار کە ئاغا پشت هەڵدەکا، نازدار و ئەحمەد چاوە بڕکێیەک دەکەن و بە بزەیەک جوابی یەکتر دەدەنەوە.

هەمزە بەگ لەوسەری دیوەکەوە بە کرژی رووی کردە عەتا و گوتی:

ـ ئاخر ئەگەر سواری ناتوانێ بۆ سواری بووی؟ بۆ هەر دوێنێ نەتگوت؟ ئێستا چۆنی بدۆزمەوە؟ بەرەو کوێ پیاوی وەدووخەم؟ خودا دەزانێ رووی لە کام شوێنەوار کردووە، داخوا وەگیری کێ کەوتووە. چەند جارم گوت کوڕە سواری کوێتە مەبە؟ کوێتە بۆ ئەوە نابێ تۆ سواری بی. تۆ بۆ من حالی نابی و نابییە بنیادەم. هەمزەبەگ جار لەگەل جار دەنگی زیاتر هەڵدێنێ، عەتا بێ تەکان، ئەو چەشنەی کە دانیشتووە. نابزوێ.

عەدلە خانم چووەتە پەنای هەمزەبەگەوە، دەسرتێنێ بە گوێیدا:
ـ عەیبە ئاغا! بۆ ئەسپێ کورەکە لای ئەو رەش و رووتانە مەشکێنەوە، ئەگەر لێشی تێنی. ئەوانە وەدەرنێ با چاووروویان نەکرێتەوە.
هەمزەبەگ سووری سوورا، بە توورەییەوە رووی لە رەسوول و ئەحمەد کرد و گوتی:
ـ هاتوون بۆ سەیر؟! سەیر دەکەن حیزبابانە، بڕۆن یاڵلا لەبەرچاوم.
رەسوول و ئەحمەد بە جووت وەدەرکەوتن.
هەمزەبەگ بانگی رەسوول دەکاتەوە.
رەسوول سەری لە دەرگاوە هێناوەتەوە ژووری، بە ترسەوە گوتی:
ـ بەڵێ قوربان! لە خزمەتام.
بە ئەحمەد بڵێ حەسەن مەیتەر لەگەڵ خۆی بەرێ و وەنێو دێ کەون، ماڵی پیاوی بە گوریسەوە بێنە دەرکی قەلا، خۆشت بچۆ، ماڵ بوێری نەکەن، هەر کەس لە ماڵ نەبوو، بە سواری بڕۆن بە دوویدا و بیهێنەوە، هەر کەس نەهات شەڕەی بخەنە ئەو لای دێوە، زوو بڕۆن زوو.
نۆکەر و فەڕاش و مەیتەر وەنێو دێ کەوتوون، هەمزەبەگ لە پەنجەرەوە چاویان دەکا، لە بەر پەنجەرەوە، ئاورێکی لە عەتا داوە و گوتی:
ـ بۆ لەدەستت هەلات؟ کەوتی؟
عەتا سەری لە سەر دەستی بەرزەوە کرد، بێ ئەوەی تەماشای بابی کا، بە توورەییەوە گوتی:
ـ سەگ بۆم هات سەگ، یەکیان پەڕیە کۆلم و خستمیە خواری، لەوانە بوو کۆلەوارم کا.
هەمزەبەگ بە توورەیی و دلسۆزانەوە داخوڕی بە سەریدا، گوتی:
ـ خۆ تۆ ئەسلەحەت پێبوو، پێت نەبوو؟
ـ بەڵێ پێم بوو، یەکیانم تۆپاند، ئەوەی دیکەیان لە پشتەوە هێرشی هێنا و پەڕیە سەر ئەسپەکە، تازە هیچم پێ نەکرا، کوێتەش بە زین و لەغاوەوە بەلەسەی حەوتکانیان بوو.
دوێنێ عەسر ئەحمەد فەڕاش و حەسەن مەیتەریشم برد، شوێنەکەمان دیەوە و هەتا تاریکانێکی درەنگ گێڕامان، بەرەو بژوێ چووە.

بژوێ ملکی ڕەشیدخانی کوڕی بەدرخانە و زاوای هەمزەبەگە. هەمزەبەگ دوو کچی لە ژنە پێشووەکەی هەیە، ناسکێ خێزانی ڕەشیدخانی کوڕی بەدرخانە، تەنکە لە باخەڵی قادرخانی کوڕی خانانی کانی کەرویشکە دایە.

ئەحمەد فەڕاش و حەسەن مەیتەر لەگەڵ پەنجا پیاوی نێو دێ لە بەر دەروازەی قەڵا بە گوریسەوە وێستاون.

ڕەسوولی نۆکەر لە ئەندەروون، بەر حوزووری ئاغا وەستاوە، ڕەسووڵ بە پارێزەوە گوتی:

ـ قوربان! هەر ماڵێ پیاوێ، بە گوریسەوە لە بەر قەڵا چاوەڕێی فەرمانی ئاغان، دەستوور چیە؟

هەمزەبەگ لە عەتا دوورکەوتەوە، ڕووی کردە ڕەسووڵ و گوتی:

ـ بڕۆ بڵێ بێنە حەوشە، با حالیان کەم.

ڕەسووڵ لە حەوشە، لە سەر حەوزەکەوە بانگی مام عەلی دەرکەوان دەکا:

ـ مام عەلی! هۆی مام عەلی! دەروازە بۆ ئەو پیاوانە بکەوە! با بێنە حەوشە، ئاغا قسەیان لەگەڵ دەکا.

پەنجا و سێ کەس دەستەونەزەر لە بەر سەرسەرادا وێستاون. هەمزەبەگ لە سەر سەراوە بە دەنگێکی بەرز قسەیان بۆ دەکا:

ـ کوێتە بە زین و لەغاوەوە بەلەسەی کێو بووە، وەک باسی دەکەن بەرەو و بژوێ ڕۆیوە. ببنە دوو دەستە، دەستەیەک لەگەڵ ڕەسووڵ و ئەوی دی لەگەڵ ئەحمەد و حەسەن وەڕێکەون. دیتانەوە دەوری بگرن و گوریسی بۆ ڕایەڵ کەن و بیخەنە داو، تا نەیهێننەوە، نەیەنەوە، هەر کەس لە ماڵی خۆی نان و پێخۆر هەڵگرێ، بێ کوێتە بێنەوە، بە سەری بابم جەریمەتان دەکەم، جا کەیفی خۆتانە، هەر دەستەیەک بیهێنێتەوە خەلاتی دەکەم، دەبڕۆن دەی، بزانم چی دەکەن.

پەنجا و سێ کەس لە دەروازەوە چوونە دەرێ. ڕەسوولی نۆکەر سوارە و ئەوانی دیکە پیادەن.

لەو لای دێوە، ڕەسوڵ ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی:

ـ هەڵبژێرە، دەستەی خۆت جیا بکەوە، هەر کەس گۆ لە مەیدانی خۆ دەرکا.

ئەحمەد بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ تۆ لە من گەورەتری، تۆ هەڵبژێرە.
ڕەسووڵ بیست و پێنج کەسی جیا کردۆتەوە و بە قوڵێکدا، ئەحمەد و دەستەکەی بە قوڵێکی کەدا دەڕۆن.
ئەحمەد و حەسەن بەرەو بژوێ وەپێش کەوتوون، بە بەڵەدی دوێنێ کەوتوونە سەر شوێن.
شوێن لە هەورازی داوە بۆ نشێو، لە نشێوەوە بۆ هەوراز، لە هەورازەوە بۆ دەشت و مەزرا و مێرگە چووە. لە مێرگدا شوێن شێواو و چەواشەیە، وا دیارە کوێتە لەوەڕیوە!
حەسەن مەیتەر گوتی:
ـ ڕاوەستن، دەبێ لەغاوی بە سەروە نەمابێ، چارەوێ بە لەغاوەوە ناتوانێ بلەوەڕێ، دەوروبەر بگەڕێن.
دەستە بە نێو گژوگیای مێرگدا بڵاو بوونەتەوە.
عومەری مام حوسێن لە پڕ هاواری کرد:
ـ ئەوەتا، ئەوە لەغاوەکەی، خۆی، سمی لێ ناوە و لە قوڕدا غەرق بووە.
حەسەن مەیتەر لەغاوی هەڵگرتەوە، شوێنیان لە مێرگ دەرکرد، بەرەو دار و شیوێ ڕۆیوە.
شیو ودار پڕوچرە، بێ خورست و شیلان و گزیچار لێکیداوە. شوێنی کوێتە بە نێوانیاندا ڕۆیوە. لەتی دەسکەوسارەکەی لە بنە شیلانێ هالاوە و بە پچڕاوی بە جێ ماوە.
حەسەن لەتە دەسکەوساریشی هەڵگرتەوە و کەوتنەوە سەر شوێن:
ڕۆژ درەنگە، خۆر هاتۆتە چاوی ڕاست، سێبەر کورت بۆتەوە و دوو پێ و نیوە، نیوەڕۆیە، دەستە لە سەر کانی و ئاوێ وچان دەگرێ. هەر کەس نان و پێخۆری خۆی کردۆتەوە و نیوەڕوژە دەخۆن.
نان و ئاو خوراوە، دەستە بێ وێستان کەوتوونەتە سەر شوێن، کێو بە کێو و یاڵ بە یاڵ دەیگێڕن.
شوێن لە ڕەقانی کوێربۆتەوە. لە نەرمان دەکەونەوە سەری. دەستە گەیوەتە نزیکی بژوێ، لە سەر هەورازێ وچانیان گرتووە، کەس تاقەتی قسەی نەماوە، هیوای گرتنەوەی کوێتەیان لەدەستداوە و لە بیری دانی جەریمەدان.

حەسەن مەیتەر ورەی لە دەست نەداوە، بە هیوای خەڵاتە، بە وردی چـاو بـە وڵا تـدا دەگێڕێ، لە نەکاو وەک گەشکەدار گەشکەی هاتێ، هەستاوەتە سەر پێ، هاوار دەکا:

ـ هۆوەتا! ئەوەتا! ئەوەتا کاکە حەمەد! هۆوەیە کوێتەیە!! خۆم دیمەوە، خۆم دیمـەوە! دەستە هەموو هەستاونەتە سەر پێ و دەستیان داوەتـە بـەرچاویان. مانـدوویيان لـە بـیر چۆتەوە، وەریان گرتۆتەوە، رەنگیان گەش و چاویان روونبۆتەوە.

دەستە بە پەشۆکاوییەوە جاڵە بوون هەر کەس بە لایەکدا.

ئەحمەد فەراش گوڕاندی:

ـ بۆ وا جاڵە بوون؟ پەلە مەکـەن، بـە پـارێز لێـی بچنـە پـێش، سـەر چـڵ مـەبن، دەستوورەکەی ئاغاتان لە بیر چۆتەوە؟ گوریسەکانتان بکەنەوە و دەوری بگرن، کـەس پەلە نەکا.

بیست و پێنج گوریس کراوەتەوە، ئەم سەروئەو سەری هەر گوریسێ بە دەستی دوو کەسەوەیە، بە درێژایی بیست و پێنج حەوت باڵی، وردە وردە لە کوێتە نزیک و نزیکتر بوونەتەوە، گەمارۆیان داوە، دەچنە پـێش و پێـشتر، دەورەیـان داوە، جـەغزێ بـە دی هاتووە. ئەحمـەد و حەسـەن چوونەتـە نێـو جـەغزەوە. جـەغز وردە وردە بچـووک و بچووکتر دەبێتەوە.

کوێتە لە نێو جەغزدا کوێی لوول و کلکیکلافەکردووە و کورەگوێ وەستاوە، سم لە ئەرز دەکوتێ و دەپرمێنێ.

ئەحمەد فەراش لێی نزیک بۆتەوە، بە پارێزەوە فیکەی بۆ لێدەدا و دەیلاوێنێ.

کوێتە لووتیکردۆتە حەواو بە نێو جەغزدا غار و دەورە دەکا و بە نێـوانی ئەحمـەد و حەسەندا تێدەپەڕێ.

ئەحمەد هەڵی بۆ رێ کەوتووە، دەسکەوسارە پچڕاوەکەی دەگـرێ، کوێتـە سـەرێ هـەڵدەسـووڕێنێ و دەردەپـەڕێ، ئەحمـەد دەسکەوسـارێ بـە دەسـتەوە هاڵانـدووە، کوێتەتـەکان دەدا و ئەحمـەد بـە دووی خوێـدا دەکێـشێ و دەورێ بـە نێـو جـەغزدا دەیسووڕێنێ. ئەحمەد زانی چەنەبەری ناکا، دەسکەوساری بەردا، کوێتە بازراقە دەبەستێ و بە سەر گوریسدا تێدەپەڕێ و وەکوو گێژەڵووکە دوور دەکەوێتەوە.

ئەحمەد بە دەم بەردانی کوێتەوە کەوتبوو، لە مەیدان هەستاوەتەوە، خۆ دەتەکێنێ، بـە دەم خۆ تەکاندنەوە دەڵێ.

ـ وەدوویکەون، و نی مەکەن، بێتوو ونبێ، بۆمان نادۆزیتەوە.

دەستە گوریسیان کۆ کردەوە، دوورونزیک بە دوویەوەن.

دەمە دەمی ئێوارەیە، خۆر لە ئاوا بوونە. ئەحمەد دەستەی کۆکردۆتەوە، قسەیـان بـۆ دەکا:

ـ ئەمڕۆ هیچمان بۆ نەکرا، تازە گەڕانەوەشمان نابێ، شەویش هیچمان بۆ ناکرێ، نـان و پێخۆر ماوە؟

تێکڕا گوتیان:

ـ نەوەڵلا.

ئەحمەد گوتی:

ـ کەوایە ئێوە بڕۆنە سەر ئاوێ و داروپووش کۆکەنەوە بۆ ئاوری شەوێ با سەرمامان نەبێ، من دەچمە بژوێ لە ماڵی ڕەشیدخان نان و پێخۆر دەخوازم، نانی ئێوە لە سەر مـن، بەڵام چاو لە کوێتە خافڵ نەکەن، هـەوا تـاریکی بکـا تـازە نـاڕوا، بـەیانی ئیـشائەڵلا دەیگرین.

تاریکانە، تاریکەشەوە. گڕ بلێسەی سەندووە و دەوروبـەری روونکـردووە. شـەوقی ئاور دەستەی وەشەوارە خستووە، دەوروپشتی خۆیان نابینن.

ماوەیەکە ئەحمەد ماندوو و کەلەلا بە کۆڵێ نانەوە لە نزیکیان وەستاوە، کەس ئاگای لەو نییە، ئەحمەد خۆ ئاشکرا دەکا، گوتی:

ـ باش حەسانەوە؟ من ئەوە دەمرم، وەرن ئەو کۆڵە لە کۆڵم بکەنەوە.

حەسەن مەیتەر چاوی بە کۆڵە نان کەوت، بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

ئەو هەموو نانەت لە ماڵی ڕەشید خان هێناوە؟!

ئەحمەد ئارەقی نێو چاوانی بە لەپی سڕی و بە بزەوە گوتی:

ـ ڕەشیدخان ئەو ناسکێ ناسکەی داگیر کردووە، ئێمە هەقمان نییە نان لەوێ بێنین؟

زۆریش توورە بوو، دەیگوت بۆ نەهاتوونەتەوە بۆ ماڵێ؛ قەول وایە بەیانی سـەعیدی نۆکەر و چەند کەسێ بنێرێ کوێتەمان لەگەڵ بگرنەوە.

دەستە بەو هەواڵە شادی و سروورکەوتۆتەوە دڵیان، زۆرتر دڵیان بە سەعیدی نۆکـەر خۆشە. ئەو شەوە تا دەرنگانێ، باس باسی سەعید بوو!

یەک دەیگوت:

ـ قوەتی ئەو کابرایە ئەندازەی نییە، بە چاوی خۆم دیم، لە شەڕەکەلدا بە کلک کەلی ڕاگرتووە!

یەکێ دیکە دەیگوت.ـ کوڕە ئەوە هیچ نییە! جارێکی سواری ماینێ ببوو، ماینەکە لە جۆگەی ئاوێ نەدەپەڕیەوە، بەو چاوانەی خۆم دیم ئەو ماینەی کردە قەلاندۆشی و پەڕاندییەوە، بەلام لەو بەرەوە دای بە ئەرزدا و سەری بڕی، کا سەعید زۆر ڕق ئەستوورە، ڕق لە کەسێ هەلگرێ تازە لە کۆلی نابێتەوە، ئەگەر ئەو بێ، تازە لە کۆلی نابێتەوە، وەبزانن کوێتەمان گرتۆتەوە.

حەسەن مەیتەر لە دلەوە زۆری پێ ناخۆشە، بە خۆی دەلێ:

ـ ڕەنجەکەم بوو بە ڕەنجی قالۆنچە! ئێمە خۆمان کوشتووە، بە ناوی سەعیدی نۆکەرەوە تەواو دەبێ، بە هەر لەونێ بێ دەبێ خۆم بیگرمەوە، ئەگەر بشمرم دەیگرمەوە.

دەستە چوار چوار و پێنج پێنج، هەر دەستەی لە قوژبنێ ئاوریان کردۆتەوە و بە دیار سکلەوە خۆیان گرمۆلە کردووە. کەس بە تەواوی خەوی لێ نەکەوتووە، هەر خۆیان ماتکردووە.

دەمەو بەیانە، بای بەیان هەلیکردۆتێ. حەسەن مەیتەر بە دیار سکلەوە، هەلترووشکاوە، بە چیلکە خەریکی ئاوری دامرکاوە و سکلەکان، کۆوە دەکا، پووشە نەرمەی وەسەردەخا، فووی لێدەکا، سکل دەگەشێتەوە، پووش گڕ دەگرێ، بە گڕی ئاورەوە یەک یەک و دوو دوو لە ئاور دەچنە پێشێ.

هەوا ڕوونە، چۆلەکە وەجریوە جریو کەوتوون. ئاور لە چەند لاوەکراوە، نانە ڕەقی شەوێ بە ئاوری دەم بەیان گەرم و نەرم دەکەنەوە و دەیخەنە بەر دلیان.

گزنگی هەتاو لە سەرانی داوە. دەستەی سەعیدی نۆکەر لە ئاسۆ وەدەر کەوتن. سەعید بە سوارییەوە وەپێش پازدە پیاوی پیادە کەوتووە، دەستە نزیک بۆتەوە، ئەحمەد و دەستەکەی بە پیریانەوە دەچن و ماندوو نەبینی و بەخێر هاتنیان پێدەلێن.

سەعید نۆکەری ڕەشیدخانە، پیاوێکی شان و باهۆدار و کەلەگەتە، بە دیمەن و شێوە پیاوە، ڕوو خۆش و لەبز شیرینە، ئازا و نەترسە، دلپاک و خۆش باوەڕە، خۆ لە کەس بە زیاتر نازانێ. تەنیا عەیبی سەعید ئەوەیە زۆر گوێ لە مستی ئاغاواتە، ئەویش لە دلپاکی خۆیەتی.

سەعیدی نۆکەر و ئەحمەد فەڕاش راوێژ بۆ گرتنەوەی کویتە دەکەن. حەسەن مەیتەر حەجمانی نییە و ئەرز وەخۆی ناگرێ، گوێ بەوان نادا، خۆی راوێژی بۆ خۆیکردووە.

چل و سێ کەس دەووراودوور دەوری کویتـەیان گرتـووە. سـەعید بـە سـواری و ئەحمەد و حەسەن پیادە بەرەو کویتە دەڕۆن.

حەسەن و کویتە ماوەی چوار سالە پێک راهاتوون، قولێ گیای بە دەستەوەیە و لێـی جۆتە پێشێ، کویتە هەر دوو گوێی جووت لە سەر نێو چاوانی تیژ کردووە، حەسـەن بـە فیکە دەیلاوێنێ، کویتە نامۆیی دەکا، پشتاوپشت دەکشێتەوە، پڕمـەو حیلـەی تێکەلـە، جوی بڕیوەتە حەسەن مەیتەر، دەلێی دەیناسێتەوە، بەلام نامۆیی دەکا.

ئەحمەد و سەعید لە پشتی کویتەوەن، دەیانەوێ بێنە پێشێ.

حەسەن دەنگیان دەدا:

ـ مەیەن، مەیەن، قوشقی مەکەن، لەو خەلکە تۆقیوە، بلێن نەیەنە پێـشێ، ئێـستا خـۆم دەیگرم.

حەسەن وردە وردە چۆتە پێشێ، قولە گیای بۆ رادەوەشێنێ، بە فیکە دەیلاوێنێ، چۆتە دوو هەنگاوی.

کویتە بە دەم پڕمەوە پاشەکشێ دەکا و سەر هـەلـدەتـەکێنێ. لـە پـڕ لـە پـشتەوە ئەسپەکەی سەعید دەحیلێنێ، کویتە بـەرەو حیلـە وەردەسـووڕێ و تەنیـشتی کەوتۆتـە حەسەن. حەسەن لەو هەلە کەلک وەردەگرێ، لـە چاوترووکانێکـا بازراقـەی بەسـت و خۆی هاویشتە سەر پشتی و دەستی لە یالی گیر کرد و پێی لە ئاوزەنگی نا.

کویتە دەلـێی جوانـوو ئەسـپێکی نـەگیراو و تـۆڕە، تـازە سـوار سـواری دەبـێ، هەلدەخاتەوە، سم لە زەوی دەگوتێ، هەلدەستێ و چـوار دەسـت و پـێ خـۆ لـە ئـەرز دەداتەوە و بە دەوری خۆیدا دەسووڕێ. چەند جار ئەو حالەتانـە دووپـات دەکاتـەوە و پاشان دەحیلێنێ و وەک بالندە بال دەگرێ، بە نێوانی ئەحمەد و سـەعید دا تێدەپـەڕێ، دەنگی یا ئەللا لە هەر چوار لاوە بەرز بۆوە.

حەسەن مەیتەر دەلێی بە زینەوە دروا‌وە، بووە بە پینەی زین و لەگەل کویتە بووە بـە یەک و خوێ بە چارەنووس و کویتە دەسپێرێ.

کویتە بێ لەغاو و سەربەخۆ دەشت و کێو و نزاری گرتۆتە بەر. لە کێو تێدەپەڕێ. لە جۆگە بازراقە دەبەستێ، لەکەندولەند بال دەگرێ و لە چاوان ونبوو. ئەحمەد و سـەعید و

هاورێکانیان دەستەوئەژنۆ چاویان بڕیوەتە ئەو ئاسۆیەی کە کوێتە و حەسەن لێوەی ئاوا بون. ماوەیەکی زۆرە چاوی چاوەڕوانیان بڕیوەتە ڕێ. وردە وردە هیوای گەڕانەوەیان لە دەستداوە.

لە سەر یاڵەوە دەستە یەک یەک هەستاون و دەستیان داوەتە بەرچاویان و بریو بریویان تێکەوت!

ئەحمەد لە داوێنی کێوەوە گوتی:

ـ چیە؟

عومەری مام حوسێن و عوسمانی سۆفی حەبیب جوابیان داوە:

ـ سوارێ لە دوور دیارە، بەڵام زۆر خاو دەڕوا، لەوە ناچێ کا حەسەن بێ! ئەحمەد و سەعید و ئەوانەی کە لە خوارێ بوون. بە کرژی لە کێو وەسەرکەوتن.

سوار نەرم نەرم و سەبر سەبر دێ و دێ و دێتە پێش.

سوار تۆزاوی و سەر و پۆتک داماڵاو، بەڵام قیت و قۆز و دەم بە بزە و کەیف سازە.

ئەسپ لە ژێر رکێفی سواردا دەهانکێ و کلافەی ماندووی کەوتۆتە دەست و پێ و کەف و ئارەق لە ژێر نەرمەزینەوە، بە کەفەڵ و لاتەڕاف و بەرسینگیدا شۆڵاوگەی بەستووە، وەک گاوس دەهاژێ، کونە لووتی بووە بە هەمبانە و لەبەر یەک ڕەواوەتەوە.

ئەحمەد بە پیادە و سەعید بە سواری لە پێش دەستەوە، بە تاو خۆیان گەیاندێ.

ئەحمەد لە دوورەوە ئامێزی گرتەوە و گوتی:

ـ دەس خۆش کا حەسەن! دەس خۆش، ماندوو نەبی، ئابڕوومانت کڕییەوە، ماندووی کردی؟

حەسەن مەیتەر وەک سەرکەوتوویەکی بەرەی شەڕ خۆ بە سەر بەرز دەزانێ، خۆ قەف دەکا، بسکەی سمێلی دێ، بە بزەوە دەڵێ:

ـ هەر ماندوو؟! نانە جاوی حەوت ساڵی لە زگم هێناوە دەرێ، چۆن سوارێکم ئەحمەدگیان؟ شڕە دەگێڕمەوە، یان نا؟!

ئەحمەد بە شانازییەوە گوتی:

ـ هەر شڕە؟ ئابڕووی ڕۆیو دەگێڕییەوە، ئابڕووی ڕۆیو، هەزار بارەکەڵڵا، ئەوەی تۆ کردت، کاری نەکردوو بوو! چۆن بێ لەغاو ڕات گرت؟

حەسەن پێی لە ئاوزەنگی دەرهێنا و دابەزی و لەغاوی لە پشتی کردەوە و کردییە سەری کویتە و وردە وردە دەیگێڕێ تا ئارەقەی وشکبێتەوە، بە دەم گێڕانەوە گوتی:

ـ خۆشم نازانم! ئەوەندەم هۆش بوو خۆ بگرم و نەکەوم، وەختێ زانیم، خۆی خاوبۆوە و ویستا، وەک ماستی مەیوی لێ هات. بێ بەلا بی، ئێوارەش خەتای تۆ بوو، تۆ لێی چووی، من دلم نەهات بلێم تۆ مەچۆ، دەنا هەر ئێوارە دەمگرتەوە و زەحمەتمان بۆ مەر کا سەعید و ئەوانیش نەدەدا و خۆشمان ئەوندە ماندوو نەدەبووین.

سەعیدی نۆکەر بە لەبزێکی خۆش و شیرین گوتی:

ـ نا کا حەسەن شتی وا مەلێ، ئێمە هاتووین چمان کردووە؟ زۆرمان پێ خۆش بوو گرتەوە، شوکور حەوجێکتان نەکەوتە ئێمە، ئەگەر ئیزنتان لە سەر بێ نیوەڕۆ بچینەوە ئۆوی، کاولاشێکمان هەیە بحەسێینەوە، ئەوە نیوەڕۆیە.

ئەحمەد فەراش گوتی:

ـ مالت نەشێوێ کا سەعید، ڕێگامان دوورە، دەبێ وەڕێکەوین، بووینە زەحمەت، ئەگەر ئیزنمان بدەی، دەڕۆین.

سەعید بە بزەوە گوتی:

ـ ئیزنی ئێمەش بە ئێوەیە، کەوایە بڕۆن با وەدرەنگ نەکەون.

سەعید و دەستەکەی بەرەو بژوێ گەڕانەوە و لە چاو ونبوون.

حەسەن مەیتەر لەغاوی کویتەی گرتووە و هەر دەیگێڕێ. ئارەقی کویتە وشکەوە بووە و هاتۆتەوە سەرخۆ. حەسەن دەستی بە لەغاوەوە بەرەو ئەحمەد درێژ کرد و گوتی:

ـ فەرموو، ئامادەی سوارییە! سوار بە با وەڕێکەوین.

ئەحمەد دەکشێتەوە، بە سوێندەوە گوتی:

بە خودا سوار نابم، حەیە حەی! ئازایەتی هی تۆ و سواری بۆ من؟! نا! نا، کاری وا نابێ، دەبێ هەر خۆت سوار بی.

حەسەن سوار بوو و ئەحمەد و دەستەوەدووی کەوتن و بەرەو تازاوا گەڕانەوە.

ڕۆژ لە هەموو لایەک ئاوا بووە. هەوا ڕوو بە تاریکانە. دەستەی ئەحمەد فەراش گەیونەتە سەر چۆم و بەرانبەر بە قەلان.

دەستە داوا لە ئەحمەد دەکەن گۆرانی بڵێ. بەر لەوەی ئەحمەد ببێتـە فەڕاشـی قـەڵا، هەر کەسێ ژنی بێنایە، بە گۆرانی ئەو بووکیان دەگوێستەوە.

ئەحمەد بێ دڵیان ناکا. ئەو بە دەنگی خۆش و ئەوانیش بە هـەوای بووکمـان هێنـا و هاتینەوە، بە چەپڵە:

بووکمان هێنا و هاتینەوە، گوڵە بە قوربانت بم
لە گوڵە زەردان پەڕینەوە، گوڵە بە قوربانت بم
ئەوەی دێ خارا لەبەر، گوڵە بە قوربانت بم
ماینی بووکێم یالی شێیە، گوڵە بە قوربانت بم
زاوا کوانێ؟ بووکمان پێیە، گوڵە بە قوربانت بم

گەورە و بچووک، ژن و پیاوی تازاوا ڕژاونەتە دەرێ و گوێیان لـە دەنگـی خۆشـی ئەحمەد راگرتووە.

هەمزەبەگ و عەدلە خانم و عەتا لە سەرسەرا وێستاون، بە بزە مـزگێنی گرتنـەوەی کوێتە بە یەکتر دەدەن.

نازدار لە پشتی دەلاقەی مدبەقەوە وەستاوە و گوێی بـۆ گـۆرانی خۆشـەوێـستەکەی راگرتووە و لەگەڵ هەر وشەیەک دڵۆپێ فرمێسک لە چاوییەوە دەبارێنێ و لە دڵـەوە بـە قوربانی دەبێ.

دەنگی گۆرانی و چەپڵەڕێزان گەیوەتە بەر دەروازەی قەڵا.

هەمزەبەگ لە سەر سەراوە بانگی دەرکەوانی کرد و گوتی:

ـ مام عەلی! برازاوا گەیشتێ، دەروازەیان بۆ بکەوە بزانە بووکیان پێیە؟!

مام عەلی دەروازەی کردەوە، ئەحمەد لە پێشەوە و حەسەن و کوێتە و رەعیەتـەکان بە دوویدا ڕژانە حەوشە.

عەتا بە هەڵاتن بە پلیکاندا هاتە خوارێ، بێ ماندوو نەبینی، کوێتەی لە دەستی حەسەن وەرگرت و بردییە سەر حەوزەکە.

هەمزەبەگ بانگی ئەحمەد و حەسەنی کرد و گوتی:

ـ بەو خەڵکە بڵێن بڕۆنەوە، ئەوان مەرخەسن، ئێوە وەرنـە سـەرێ، حەسـەن! تـۆش وەرە، خۆت نەشارییەوە.

ـ.ـخیەت بەرەو دەروازە گەڕانەوە. ئەحمەد و حەسەن چوونە سەر حەوزەکە، دەست
ـحوجوویان دەشۆن. پاش خۆتەکاندن، ئەحمەد فەڕاش لە پێشەوە و حەسەن مەیتەر بە
ـ ـ چوونە حوزوور.
ـەستەی ڕەسوولی نۆکەر وەک لەشکری شکاو، سەرشۆڕانە، تاقەولۆقە بەر و دوا
ـ ـ ـەتە نێو دێ و هەر کەس دەڕواتەوە ماڵی خۆی.
ـەسووڵ بێ دەنگ چارەوێی کێشاوەتە تەویلە و بێ چرپە لە پێشخانە وەستاوە، گوێی
ـ ـکەنینی ئاغایە. سەبرێ، بە شەرمەوە لە دەرگا دەدا.
ـ کێیە؟ وەرە ژوورێ.
ـەسووڵ دەرگای کردەوە، بە شەرمەوە سڵاو دەکا، دەستەونەزەر بە لای دەرگاوە
ـستاوە.
هەمزەبەگ بێ بایەخانە، بە پێکەنینەوە گوتی:
ـ دانیشە ڕەسووڵ، ئەحمەد باسی گرتنەوەی کوێتە دەگێڕێتەوە، باسەکە زۆر خۆشە،
ـەی ئەحمەد.
ئەحمەد لە ئەوەڵ تا ئاخر دەیگێڕێتەوە، لەو شوێنانەی کە باسی ئازایەتی حەسەن
ـەکا. حەسەن دەست دەنێ بە سینگییەوە و خۆ دەچەمەمێنێتەوە و دەڵێ:
ـ خۆم نۆکەری ئاغام.
ڕەسووڵ لە بنەوە، بە دزی ئاغاوە مۆڕەیەکی گورچووبڕ لە حەسەن دەکا، سەر
ـ ـەکی بەدەمیەوە پێدەکەنێ.
پاش تەواو بوونی قسەکانی ئەحمەد، هەمزەبەگ بە دەنگێکی بەرز، وا کە لەو
ـیوەوە عەدلە خانم گوێی لێبێ، گوتی:
ـ عەدلە خانم! ئەو خەڵاتانەی کە دامناون، بەنازداردا بیاننێرە.
نازدار بە بوخچەیەکەوە دێتە ژوورێ، بە پارێزەوە بوخچەی لە بەردەستی ئاغادا دانا و
پاشەوپاش چووە دواوە.
هەمزە بەگ بە پێکەنینەوە سەری هەڵێنا و بە نازداری گوت:
ـ دەورێ چایشمان بۆ بێنە، ئینشاڵلا ئەم پاییزە کاریکتان بۆ دەکەم!
نازدار بە لۆی دەسماڵەکەی دەموچاوی دادەپۆشێ و بە شەرمەوە چووە دەرێ.

ئەحمەد فەڕاش سوورهەڵدەگەڕێ، سەری خەجاڵەتی بەرداوە و ئارەقەی شەرە دەسڕێ.

هەمزەبەگ قاقای کێشا و گوتی:

ـ وەرە پێشێ شەرم مەکە، حەسەن! تۆش وەرە، ئەوە یەکی دەستێ کەواوپاتوڵ و بیست تمەن پوولە، مزگێنی و خەلاتی ئەوەیە کە پیاوانە کوێتەتان گرتەوە، ماوەتەوە کاری ئەو هەتیوە شوانە! هەر یەکی کارێکتان پێ دەسپێرم، رووی کردە ئەحمەد و گوتی:

ـ ئەحمەد! کاری تۆ ئەوە بێ ئەو هەتیوە شوانەکەی کانیتوو بێنی.

کاری حەسەنیش دوو باخە شووڵەتەڕ باتە تەویلە.

رەسووڵیش خۆی دەزانێ دەبێ چی بکا، پێویست بە گوتن ناکا. هەر یەک بە نۆرەی خۆیان جوابی بەڕێوەبردنی فەرمانی ئاغایان داوەتەوە، ئەحمەد و حەسەن خەلاتیان وەرگرتووە و چوونەتەوە جێی خۆیان و چاوەڕێی چایین.

نازدار بەکەشەفە چاییەوە هاتە ژوورێ، چای ئاغای لەبەردەمی داناوە، سێ چایی بە کەشەفەوە لە نێوانی رەسووڵ و ئەحمەد و حەسەن دادەنێ و تەماشایەکی مانداری ئەحمەد دەکا بە تووڕەییەوە، چەشنێ کە ئەحمەد تێی گەیی، رۆیشتە دەرێ.

چای خوراوە، شێوکراوە، چای دوای شێو خوراوە، نۆکەر مەرخەس بووە و رۆیوەتەوە، مەیتەر چۆتە میانە و خەوتووە.

ئەحمەد سەر لە نازدار دەرناهێنێ! ئەو تووڕە بوونە و خۆبادانەی لەبەرچی بوو؟ لە سەر دڵی بووە بە گرێ و کوناوکون لە دووی دەگەڕێ، نازدار بووە بە دڵوپێ ئاو بە ئەرزدا چۆتە خوارێ!!

## ٨

لە حەوتکانیانەوە وەسەرکەوی ڕووبە ڕۆژئاوا بڕۆی، بەرەو بژوێیە.

بە شانی ڕاستدا وەرسووڕێی ڕوو لە باشووری ڕۆژئاوا بکەی، دەتباتە کانییە کـوێرە.

کانییەکوێرە گوندێکی بچـووکی پـازدە مالـییە لـە داوێـنی شـاخی هـەزاربەهـەزاری حەوتەواناان و پێلاودڕەدا بە دیهاتووە.

ئەو دوو کێوە سەربەرزە کوێستانی ئەو مەلبەندەن هـەمـوو چەشـنە گیاوگولـێکیان هەیە، هەتا مانگ و نیوێ هاوین هەر بژوێن و سەرسەوز دەمێننەوە.

لە داوێنی کێوی حەوتەواناندا، لە بـەر ئـاوایی و قـەراخ ڕێـی تـازاوا و کـانیتـوو، کانییەک سارد و بە پیت، لە خیزەلانێ هەلدەقولێ، ئاشگێڕێ ئاوی لە بەر دەڕوا.

هەموو سالێ، لە وەرزی بەهاردا، دەوروپشتی ئـەو کانییـە زۆنـگ دەبـێ و خیـزی دەوروبەری دەشاوتەوە، تێی دەرووخێ و سەر لە نوێ دەری دەیدەنەوە. بەو بۆنەوە ئـەو دێیەیان نێو ناوە کانییەکوێرە، هەر ئەو کانییەشیان هەیە.

تازە گزنگ لە سەرانی داوە، هێشتا سێبەری حەوتەواناان لە سەر کانی لانەچووە.

دەستەیەک کچی عازەب لە سەرکانێن بە نۆرە گۆزە پڕ دەکەن.

ڕێبوارێکی قۆچاخ، کرژ لە ڕێوە دێ. ڕێبوار کـوێرە جـەحێـلەیـەکی تونـدوتۆل و هەلکراوەی بە دیمەنە، پێکەوتوو و کەلەگەت، شانوباهۆ دارە.

ڕێبوار گەیوەتە بەرانبەری کانی، کچان سـەرنجیـان داوەتـێ و چـوار چـاوی تێـی دەڕوانن.

یەکیان زۆر جوان و بالا بەرز و خۆش دیمەنە، لـە نـاو ئـەوانی دیکـەدا دیـارە، بـە پێکەنینەوە گوتی:

ــ ڕەنگە چێودار بێ!

یەکی دی جوابی داوە و گوتی:

ـ ڕەنگە چێوداری تۆ بێ! خۆگە وا دەبوو!
لە تریق و هۆڕی کچان، ڕێبوار ئاوڕی داوە و گوتی:
ـ دادەکان! ماڵی مەحموود شوان لە کوێوەیە؟
یەکیان بە کچە جوانەکەی گوت:
ـ ئا، نەمگوت؟ کابان! ماڵی ئێوەی دەوێ! میوانی ئێوەیە، جوابی بدەوە.
کابان جوابی ڕێبواری داوە و گوتی:
ـ هەوەڵ ماڵ لە سەر ڕێیە.
ڕێبوارگوتی:
ـ کا مەحموود داخوا لە ماڵە؟
ـ بەڵێ لە ماڵە. ڕێبوار ملی ڕێی گرتەبەر و ڕۆیشت، دوورکەوتۆتەوە، بەلام هێشتا هەر دەنگی پێکەنینی کچان دەگاتە گوێی.
هەوەڵ ماڵ، لە سەری ڕێ ماڵی مەحموود شوانە. ماڵ زۆرتر لە وێرانە دەچێ.
دیوار بە بەردی قۆقز، لارووێر لە سەر یەک دانراون. لە هێندی شوێن بەرد لە دیوار دەرهاتووە و کەلەبەری تێخستووە.
دیواری حەوشە لە سێ چوار لاوە ڕووخاوە، دەرگایەکی شەقوشڕی بچووکی تەنکەکە، لە ژەنگدار رزیوە، لە گرێژنە چووە و بە دیوارەوە هەڵپەسێراوە، زۆرتر لە دەرگای کۆز دەچێ. میوان باوەڕ ناکا ئاوەدان بێ، بە بۆک و نابۆکەوە سەری بردە ژووریٚ و خاوەن ماڵی دی!
مەحموود شوان لە سەر بەردەخوێکەی حەوشە دانیشتووە. هەر دوو ئانیشکی لە سەر ئەژنۆی داداوە و چەناگەی ناوەتە سەر هەر دوو لەپی دەستی کردوویە بە کۆڵەکە و سەری پێ ڕاگرتووە. قامکی ئەملاوئەو لای ڕوومەتە تاو گەستووەکانی داپۆشیوە، چڵە چڵە ریشی سپی لە بەینی پەنجە کووڕ و چرچەکانییەوە هاتوونەنە دەرێ. مەحموود شوان لەبەرچاوی میوان زۆر لە جاران پیرتر و چەماوەتر دیاریدەدا. ئەوەندە چۆتە نێو خەیاڵەوە ئاگای لەوە نییە کە میوان هاتۆتە حەوشە.
ماوەیەکە میوان بەدیارییەوە وەستاوە. میوان ناچار گوتی:
ـ خاڵە مەحموود! میوان ڕادەگرن؟!
مەحموود شوان ڕاچەنی، هەستا سەر پێ و باوەشی گرتەوە و گوتی:

ـ حەمەگیان! ئەوە تۆی؟! ئەی بە خێر بێی، ماڵی خۆتە، تۆ میوان نی، بانگی خێزانی دەکا:

ـ نزە! نزاکەت! ئافرەت! میوانمان هاتووە، میوانێکی زۆر خۆشەویست، زووبە، ڕ خەرێکمان بۆ ڕاخە.

مەحموود شوان و حەمە دەستە ملان بوون.

نزاکەت لە بەر هەیوان تەنووری داخستووە، لە نێو دووکەڵەوە هاتە دەرێ، ئاوی چاو و لووتی بە گۆشەی چارەکەکەی دەسڕێ، کۆمەکۆم لبادێکی لوولە کراوی داوەتە بن هەنگڵ و لە سێبەری کەپرەکەی حەوشە ڕایخست و بە لەبزێکی زۆر شیرین، گەلێ بەخێر هاتنی حەمە دەکا و دەڕوا.

میوان و خانەخوێ لە سێبەری کەپر دانیشتوون. خشپەی پێیەک ئاوڕ بە میوان دەداتەوە، کچە جوانەکەی سەر کانیبوو، حەمە بە سیلە چاوی تێی دەڕوانێ و گورجێ چاوی هەڵدەبڕێ.

کابان لە بەینی قولفی گۆزەوە میوان ئەخاتە تەرازووی چاو، هەڵیدەسەنگێنێ، گۆزەکانی لە سێبەری دیوار دانا چووە بەر هەیوان و دەمی نا بە گوێی دایکییەوە.

حەمە لەدڵی خۆیدا گوتی:

ـ سەبارەت بە من دەدوێن!

مەحموود شوان بانگی کابانی کرد، گوتی:

ـ دادەی ڕۆڵە چایەکمان بۆ سازکە، میوانم لە کاکە حەمە خۆشەویستتر نابێ.

حەمە بە دەنگێکی بەرز، وا کە کابان ببیستێ، گوتی:

ـ نەوەڵلا، حەوجێ بە زەحمەت ناکا، خۆ من میوان نیم.

مەحموود شوان بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ڕەنگە بڵێی دەسکورتن؟ مەترسێ! پوولم پێ نەداوە! دوێنێ لە شار، لە قاوەخانەی حاجی ڕەشید هێناومە، بە زۆر بڕی بە سەرمدا، لەوە گەڕێ حەمەگیان، لەگەڵ شوانییەکەت چۆنی؟ لە بیرتە ڕوژەکە لەسەر ئاوەکەی حەوت کانیان چ شەڕە سەگێ ساز بوو؟ ئاگات لێ بوو زاڵم چۆن ورچەی دا بە ئەرزدا؟ خۆزگە بەو ڕۆژە.

حەمە قسەکەی لە بەر گران بوو، نێو چاوانی وێکهێناوە و گوتی:

ـ ورچە نەدەکەوت خاڵە، پاشووی لە بەردگیرا، ورچە لەو سەگانە نەبوو کە زاڵم دەرەقەتی بێ، ناڵێم زاڵم خراپە، ئەویش سەگی چاکە.

مەحموود شوان هەستاوەتە سەر چۆک، گوڕاندی و گوتی:

ـ حەیە حەی! شەل نییە و پای شکاوە!! ئەوە دەڵێی چی؟ کوڕە خۆ سەگ نەبوو زاڵم لە ئەرزدا! جا فایدەی چی؟ خۆ لای من نەماوە، دەنا ئێستا تێکمان دەکردن.

حەمە بە کزێکەوە گوتی:

ـ ورچەش نەماوە خاڵەگیان، هەتیوەکەی هەمزەبەگ تۆپاندی، ئێستا بێ سەگ ماومەتەوە، دەبێ کارێکم بۆ بکەی.

مەحموود شوان بە حەسرەتەوە دای بەرانیدا و گوتی:

ـ ئەی شەیتان ملی شکێ! جا من چووزانم تۆ سەگت دەوێ! دوێنێ زاڵمم بردە شار بەڕەڵلام کرد.

حەمە بە تێڕادیوی و تووڕەییەوە گوتی:

ـ دەک ماڵت خرا نەبێ! جا چۆن دڵت هات؟! جا پیاو سەگی وا بەڕەڵلا دەکا؟!

مەحموود شوان هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە دڵێکی ڕێشەوە گوتی:

ـ لۆمەم مەکە براڵە، لە داخی هاوماڵی خراپ وامکرد، ئەگەر وامنەکردایە، دەروێش عەلی دەیبرد، ئاخر ئێستا ئەو بە جێی من شوانە.

میوان و خانە خوێ بێ دەنگن. کابان بە کتری و قۆرییەوە بەرەو لایان دێ،

کابان بە شەرمێکی کچانەوە بە خێر هاتن لە میوان دەکا و لە خوار ئەوانەوە، لە سەر ئەرزەکە دانیشت، دەورێ چای بۆ تێکردن.

حەمە سەری داخستووە جار جارە لە ژێرەوە چاوی لە کابان دەکا و زوو چاو دادەخاتەوە.

کابان دەسگرەیەکی ڕەشی دەسک درێژی بە دەستەوەیە و زوو زوو دەسکە درێژەکەی قوڵفە دەکا و دەیکاتەوە و بە دزییەوە چاوێ لە میوان دەکا و کرژ چاو دادەخاتەوە.

مەحموود شوان پەنجەی لە ئەژنۆ هەڵپێکاوە و هەر دوو قامکە کەڵەی دەستی بە دەوری یەکدا خولدەدا. کەس قسە ناکا. لە پڕ مەحموود شوان بێ دەنگی دەشکێنێ، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ حەمە گیان! چیە؟ گەمیەکەت غەرق بووە؟! خەفەت مەخۆ، ئەمشەو بەیەکەوە دەبین، بەیانی دەچین بۆ شار دەیبینینەوە، خەم مەخۆ.

حەمە بە دووی سەری ئەو قسەدا دەگەڕا، سەری وەگیر هاتووە، سروور کەوتە دلی، بە کرژی گوتی:

ـ لێرە بەشک نیم، وەرە پیاوەتیم لەگەڵ بکە مەمخە درەنگ، مەڕەکەم بە خەڵک سپاردووە، با ئێستا وەڕێکەوین.

مەحموود شوان بە قەڵسییەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی:

ـ حەیە حەی! ئێستا؟! جا ئەوە نیوەڕۆیە، ئێستا بڕۆین دەبێ شەوێ لە شار بین.

حەمە بە پاڕانەوە گوتی:

ـ قەیناکە، لە شار دەبین، نەوەک زاڵمم لە دەست دەرچێ، ئەمڕۆ باشترە لە سبەینی خالەگیان.

مەحموود شوان بە ناچارییەوە ملی خست بە لادا و گوتی:

ـ دەی باشە، هەر گاوایە با نیوەڕۆژە بکەین، وەڕێدەکەوین، رووی کردە کابان و گوتی:

ـ کابان! گورجێ نیوەڕۆژەیەکمان بۆ سازکە کچم.

کابان گورجانە هەستا و لە حەوشە چووە دەرێ، لەو دیوی حەوشەوە قیرە لەفرووجەوە هەستا.

نیوەڕۆژە کراوە، پاش نوێژە، مەحموود شوان لە دەرگای حەوشە سواری گوێدرێژەکەی بووە، حەمە وەپێشی دەکەوێ و ڕێی شاریان گرتە بەر.

کابان لە بەر دەرگا وەستاوە، هەتا لە چاو وندەبن، هەر چاوی لێیانە.

ڕێ دوورە، دەردی دڵ زۆرە، قسە کۆتایی نایە. مەحموود شوان و حەمە قسەیان کردووە و بە نێردیوانی ڕێ و پلیکان پلیکان وەسەردەکەون:

هەر دوو زۆر کەیف خۆشن. حەمە بەوەی سەگی مەڕی وەگیر دەکەوێ و دەحەسێتەوە.

مەحموود شوان بەوەی کە زاڵم بە کەسێ دەبڕێ قەدری دەزانێ، لە لایەکی دیکەوە، خۆ بە سەرکەوتوو دەزانێ و سەگەکەی بە دەروێش عەلی نەداوە و قسەی خۆی بردۆتە سەر.

نزیکەو ئێوارەیە. لارە سێبەر داهاتووە. شار لە دوورەوە دیارە. دەستە دەستە خەڵکی دێ، بە سواری و پیادە بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوە.

دەوری شارە. حەمە لە پێشەوە دەڕوا، ئاوڕێکی داوە و گوتی:

ـ خاڵە! ئەوە گەیشتین، چۆن بکەین؟

مەحموود شوان گوتی:

ـ گوێدرێژەکە دەبەینە کاروانسەرا و جێ خەوی خۆمان دەگرینەوە، پاشان دەچینە قاوەخانەی حاجی رەشید، شێومان خوارد دەچین دەخەوین، بەیان شەبەقی دا، وەدووی زاڵم دەکەوین، بەخت یار بێ دەیبینینەوە و پەتی دەکەین. پێت چۆنە؟ باشە؟

حەمە لارە مل گوتی:

ـ هەر چۆن تۆ پێت چاکە، وا دەکەین.

دەوری شارە، سەگە بەڕەڵلا مووتە مووت و مل و مۆیانە. حەمە بە چاوی مشتەری سەرنجیان دەدا، بە دوو دڵیەوە گوتی:

ـ خاڵە مەحموود! من باش زاڵم ناناسم، خۆت چاو بگێڕە، لە نێو ئەوانە دا نییە؟

مەحموود شوان سەری راوەشاند و بە تەوسەوە گوتی:

ـ وەڵلا بابە سەگ ناسی! ئەوانە سەگە بەڕەڵلای نێو شارن، نەتدیوە چۆن کلکیان کردووە بە گەڵۆزا؟ ئەوانە رەوەک و ترسەنۆکن، زاڵم لە نێو سەد سەگدا بێ دیارە، لەودەمەوە سەگی منە، نەمدیوە کلکی دانەواند بێ، ما بێ چاکە، سەگی وا لە شاردا نامێنێ، خۆت و بەختت.

شار وەک ئەژدیها حەمە و مەحموود شوانی هەڵلوشی، کەوتنە گەرووی بازاڕەوە.

هاتوهاواری دەسگێڕ سەرنجی کڕیار رادەکێشێ، لەمبەر و ئەو بەرەوە رقەیانە مشتەری بانگ دەکەن.

حەمە سەری سووڕماوە! درینگە لە مێشکییەوە دێ، بێ ئیختیار چاو دەگێڕێ، گێژ گێژ وەدووی مەحموود شوان کەوتووە.

مەحموود شوان سەر دەرچووە، گوێ بەوانە نادا، دەگەڕێتەوە سەر حەمە، وەدووی خۆی دەخا، کۆڵان بە کۆڵان و شەقام بە شەقام دەڕۆن، گەیونەتە دەرکی کاروانسەرا.

عەلی شامی بە پیریانەوە هات، گوێدرێژ لە تەویلە دەکا. مەحموود شوان گوتی:

ـ جێمان بۆ راگرە کا عەلی، بۆ خەوتن دێینەوە.

عەلی شامی بە روویەکی خۆشەوە گوتی:
ـ جێی ئێوە لە سەر چاوی عەلییە، بە چاوان.

ئێوارەیە، تاریکانە. تاق و لۆق دووکان ماوە. مەحموود شوان و حەمە بەرەو قاوەخانەی حاجی رەشید دەڕۆن. دەگەنە بەر هەر دووکانێ؛ حەمە گەیەک دەگرێ و چاوێکی پێدا دەگێڕێ. گەیونەتە قاوەخانە.

قاوەخانە پڕە لە خەڵک. سەماوەرێکی رەژی زەردی گەورە لە بەر پەنجەرە، لە سەر چوار پایە دانراوە، کوڕێکی مێر منداڵ لە بەر شێرەیدا وەستاوە، خێرا خێرا چای تێدەکا و بە خەڵکدا دەیگێڕێ.

حاجییەکی شێوە پیاو لەولای سەماوەرکەوە، لە سەر سەندەڵی دانیشتووە، چاو بە میواندا دەگێڕێ.

دوو چراتۆڕ بە نێوەڕاستی قاوەخانەدا شۆڕ بوونەتەوە، لە بەر دووکەڵی سیغار بە حاڵ سۆڵەیان دێ.

حاجی رووی کردە دەرگا و مەحموود شوانی دی و قرچە پێ هەستا گوتی:
ـ وەرە ئێرە خاڵە مەحموود، بانگی چایچی کرد گوتی:
ـ قادر! دو چای جوان بێنە، قادر چای هێنا. هێشتا بە تەواوی دانەنیشتبوون، حاجی گوتی:
ـ دەی خاڵە! کوێخا شەریفەکەمان چۆنە؟ راسپاردەکەی منت پێ گەیاند؟ ئەو رەفیقە جوانەت لە کوێ بوو؟

مەحموود شوان دەستی لە سەر شانی حەمە دانا و گوتی:
ـ کاکە حەمە؟ دۆستی لە مێژینەی خۆمە، شوانی کانیتووە.

حاجی رەشید زۆر بە گەرمەوە بە خێر هاتنی لە حەمە کرد و لەگەڵ مەحموود شوان سەریان نا بە یەکەوە سرت و هۆر دەچپێنن بە گوێی یەکدا، حەمە هیچ حاڵی نابێ.

قاوەخانە وەک کۆترخانە هەر گمەی دێ، حەمە وەکو گێژ چاو بە خەڵکدا دەگێڕێ.

دەستە دەستە، چوار چوار و پێنج پێنج لە دەوری یەک کۆزیکەیان داوە و قسە دەکەن. لەو شانی حەمەوە کۆڕێ دانیشتوون، کابرایەکی قەوی قۆڵی سمێڵ زل بڕیویەتە بەر خۆی و نۆرە بە کەس نادا.

حەمە هێندێ گوێی بۆ شلدەکا، قسەکانی وردە وردە سەرنجی حەمە رادەکێشێ. حەمە لەوێڕا حالیبوو کە کابرا گوتی:

ـ سەد جارم دیوە! قسەکە لە بەینی خۆمان دەرنەچێ، دەجار، بگرە زیاتر هاتۆتە مالمان، سەد جار نانم بۆ بردۆتە شاخی، بیست جار هاتۆتە هۆبەکەمان و شەووڕۆژ ماوەتەوە، نازانن چ پیاوێکە! پارچەیەک زێرە زێڕ، دەم و لەبز شیرین، قسە زان و راوێژ خۆش، بە دیمەن و شێوەدار، تا دەست هەلێنێ کەلەگەت و قەوی و قۆڵ، کابرا هەستاوەتە سەر پێ، گوتی:

ـ منتان دیوە؟ دوو هێندەی من دەبێ! هێندێ دەلێن چەتەیە! ئەوەش فیتی ئاغاوات و ئەمنییەیە خستوویانەتە دوای، زۆری لێ دەترسێن، چاویان پێی بکەوێ، وەک رەوە؛ رەوی لەبەر دەکەن، خۆ ئێوە نەتاندیوە، فایدەی چی؟! ئیللا ماشاللا کە دەکەوێتە شەڕ! نازانن چ دەکا! بۆ هەزار کەس ئاوڕ ناداتەوە! خۆ گوللە نایبڕێ!! گوللە بەندی پێیە! رەنگە ئێوە باوەڕ نەکەن، منیش بم باوەڕ ناکەم، بەلام بەو چاوانەی خۆم دیومە، رۆژێکیان لە هەوار، لە رەشمالەکەی ئێمە خەوتبوو، ئەوندەم نەزانی دەورمان گیرا! سەروان خودایی بە خۆی و چل ئەمنییەوە دەوروبەری هۆبەکەی تەنیبوو، بوو بە تەقە!! هاوارم کرد و گوتم:

ـ کاک تاهیر! کاک تاهیر! کوڕە هەستە ماڵ کاول دەورت گیراوە! هیچ خۆی شلوێ نەکرد! سەبرێ هەستا و دەستێکی هێنا بە چاویدا و کلاشەکانی خستە سەر پێی و دەستی دایە تفەنگە بڕنووەکەی و چووە بەر دەرکی رەشمالەکە وێستا! بە دەنگێکی زۆر پیاوانەوە گوتی:

ـ سەروان خودایی! لە دووی من دەگەڕێی؟ ئەوە من لێرەم.

سەروان فەرمانی دەسرێژی دا، لە چل لاوە، چل لوولە تفەنگ گووللەیان لێ دەباری! کەژ و کێو پڕ ببوو لە تۆز و بۆنی باڕووت!

ئەمن رۆحم سپارد، گوتم لەشی بووە بە رووی بێژنگ، لە نێو ئەو گوللە بارانەدا کاک تاهیر قاقای کێشا!! گوڕاندی و گوتی:

سەروان! نۆرەی منە، خۆت بگرە، بەڵام نات کووژم! سەر پێیی سێرەی گرت، تەقە
ـە تفەنگەوە هات و سەروان لە خۆڵ گەوزا! سەروان هەستا و فەرمانی پاشەکشێی دا.
ڕەوەی ئەمنییە وەک هەرشتە دەکەوتن بە سەر یەکدا، ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو،
ـەو حاشییە و حەواڵە نەمان.

من واقم وڕ مابوو! کە چوومە پێشی، کاک تاهیر وەک پۆڵای سەوزەوار نوونی
تینەببوو!! بە سەر لێشێواوییەوە گوتم:

ـ کاک تاهیر!

ئەو نەیهێشت پرسیارەکەم بکەم، گوتی:

ـ دەزانم، ئەوەم لە پێش چاوت، زرپ و زیندووم. خۆی ڕاوەشاند، بە قەدرایی
ڕبەیەک گوللە لە لەشی کەوتە خوارێ!!

من لاڵ ببووم، هیچم بۆ نەدەهات بە زماندا! دەستی گرتم و بردمیە ئەو لاوە،
دەستیکرد بە باخەڵیدا و قایشێکی سووری دەرهێنا و گوتی:

ها ها ئەو مەڕە لەو بەرە خەوتووە، برۆ بیکە ملی، بەڵام خۆت لەوێ ڕاوەستە.

سەرتان نەیەشێنم، قایشم کردە ملی مەڕە و خۆم بە دیارییەوە وێستام. تەقە لە
تفەنگەوە هات، مەڕە لەترێکی بەست، هەڵاتمە سەری و تەماشام کرد، مەڕە لە کاوێژ
نەکەوتبوو!! قایشەکەم لە ملی کردەوە و بردمەوە و گوتم:

ـ تۆ خودا ئەوە چ سرپیاتێکە؟

کاک تاهیر شیرین بزەیەک گرتی و گوتی:

ـ ئەوە گوللەبەندە، لە ملی هەر چیدا بێ، گوللە نایبرێ!

گوتم:

ـ تۆ ئەوەت لە کوێوە وەگیر کەوتووە؟

بە پێکەنینەوە دەستێکیدا بە شانمدا و گوتی:

ـ کاکە حەمەدی سولەیمانی بۆ شێخ مەحموودی نەمری نووسیوە، دەست بە دەست
هاتووە بە من گەیوە.

حەمە وردە وردە و پێ پێ لە کۆڕەکە نزیک بۆتەوە، نەدیو و نەناسراو ئاشقی تاهیر
و گوللەبەندەکەی بووە، بە ترسەوە گوتی:

ـ کاکە، عەیب نەبێ، پرسیارێ بکەم؟

کابرا بە روویەکی خۆشەوە گوتی:
ـ پرسیار عەیب نییە، نەزانین عەیبە، پرسیارەکەت چیە برا گیان؟
حەمە بە شەرمەوە گوتی:
ـ ئەو کاک تاهیرە لە کوێیە؟
کابرا پێکەنی و گوتی:
ـ بۆ تۆ لە گوێی گادا خەوتووی؟! چۆن تا ئێستا نێوی ئەوت نەبیستووە؟ هەر ئەوە بوو پرسیارەکەت؟
حەمە سوور هەڵگەڕا، لە ژێر لێوەوە گوتی:
ـ نەوەڵلا، ئەو گوڵلەبەندە هەر بە کاک تاهیرە؟ یان هی دیکەش هەیە؟
کابرا چاوێکی لە خەڵکەکە قرتاند و گوتی:
برا گیان! بۆ تۆش دەتەوێ؟!
هەموو وێکڕا دایان لە قاقای پێکەنین.
لە دەنگی پێکەنینی ئەوان، مەحموود شوان ئاوڕی داوە و گوتی:
ـ حەمەگیان! وەرە شێوەکەمان بخۆین.
نان و چا خوراوە، شەو درەنگە، قاوەخانە روو بە چۆڵ بوونە. مەحموود شوان و حەمە هەستاون. حەمە دەست دەبا بۆ گیرفانی. مەحموود شوان دەستی گرت و گوتی:
ـ من دەیدەم.
حاجی رەشید هەستا و گوتی:
ـ لە هیچتانی وەرناگرم، ئەمجارە کاکە حەمە هاتۆتە ئێرە، میوانی منن، بۆ جارێکی دی، بڕۆن، بە خوام سپاردن.
بازاڕ چۆڵە، لە چەند لاوە لەنتەر لەبەر دووکان هەڵواسراوە و بەر دووکانی روون کردووە. دووکەس بە چراوە بە بازاڕدا دەگەڕێن، دالاندارن.
مەحموود شوان لە پێشەوە دەڕوا، حەمە بە دوایەوە کەوتۆتە گێژاوی قسەکانی کابرای قاوەخانە، تاهیر و گوڵلەبەندەکەی بە ئاوات دەخوازێ. لەودەمەوە ئەو قسە و باسانەی بیستووە، گۆڕاوە! هەست بە دەردێکی سەیر لەدەروونیدا دەکا. قسەی کابرای هاتۆتەوە بیر، خۆی سەرکۆنە دەکا:

ـ وەڵلا راست دەکا! دەڵێن لە گوێی گادا خەوتووم! ئاگام لە هیچ نییە، پێموایە
کەس چەنەبەری ئاغا ناکا! شار چەندە باشە پیاو هاموشۆی بکا، بۆیە دەڵێن کەسێ
گەڕێ چاک و خراب دەبینێ، شت فێر دەبێ، ڕەنگە خاڵە مەحموودیش نێوی تاهیری
بیستبێ! با لێی بپرسم:

مەحموود شوان سەری داخستووە و خەیالاوی دەڕوا. لە پڕ حەمە گوتی:

ـ خاڵە! پرسیارێکت لێ بکەم راستم پێ دەڵێی؟!

مەحموود شوان بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، گوتی:

ـ ئەگەر بزانم پرسیارەکەت چیە؟

حەمە هێندێ ماتبوو، گوتی:

ـ با بچینەوە کاروانسەرا، لێرە نابێ، هەر دوو بێ دەنگ و خەیالاوی ڕێیان گرتەوە
بەر.

دەستەیەک کاروانچی لە کاروانسەرا خەوتوون. جێی مەحموود شوان و حەمە لە
پێک یەکدا، لە قوژبنێ راخراوە، هەر دوو لە جێ خزیون.

حەمە سەری بردۆتە بن گوێی مەحموود شوانەوە، بە سرتە گوتی:

ـ خاڵە! نەخەوتووی؟

مەحموود شوان دەکەوێتە سەر تەنیشت؛ ئانیشک دادەدا و سەر دەنێتە سەر لەپی
دەستی، سەبرێ گوتی:

ـ نا، قسەکەی ڕێگا چ بوو؟

حەمەش وەک ئەو کەوتە سەر لاتەنیشت و ئانیشکی دادا و ڕوومەتی نایە سەر لەپی
دەستی و گوتی:

ـ لێم نەکەی بە عەیب! کابرایەک لە قاوەخانە شتێکی سەیری دەگوت! دەیگوت
تاهیر ناوێ لە دەولەت یاخییە، بە قسەی ئەو، ئەو تاهیرە گوللە کاری لێ ناکا! گوللە
بەندی هەیە! تۆ بیستووتە؟

مەحموود شوان بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ گوللەبەند و شتی وام نەبیستووە بیبێ، بەڵام ناوبانگی ئازایەتی تاهیرم بیستووە،
دەڵێن زۆر ئازا و نەترسە، هەو هەوانی بە ئەمینە و ئاغاوەت ناوەتەوە، بووە بە هۆرە
بۆیان. دەڵێن زۆری لێ دەترسێن.

حەمە لە جێ راستەوە بووە، بە دانیشتنەوە گوتی:
ـ تۆ دیوتە؟!
مەحموود شوان ماوەیەک جوابەکەی وەدرەنگ خست، پاشان گوتی:
ـ نا، من نەمدیوە، بەلام دەزانم، لەم و لەوم بیستووە.
حەمە لەو گە گرتنەی مەحمود شوان دوو شک بووە! بەلام وەنەزەری نادا، ماوەیەک بیر دەکاتەوە، پاشان گوتی:
ـ باشە، خالە! بلێی هەر تەنیا خۆی بێ؟
مەحموود شوان ویڕای حەمە لە جێ راست بووە و گوتی:
ـ نا، نەوەللا، پیاوی وەک تاهیر تەنیا نییە، دارودەستەی هەیە، بەلام هەر ناوی ئەو بە نیوە، وەک چۆن دەلێن شێخ مەحموود، مەلا مستەفا، سمایل ئاغای سمکۆ و ئەو سەر عێلانەی دیکە کە ناوبانگیان هەیە، ئەوانیش خۆ تەنیا نەبوون، پیاوی زۆر ئازا و رەشیدیان لە گەلدا بووە و هەیە، چونکە ئەوان سەرکردەن، هەر بە ناوی سەرکردەوە بە ناون. کاروبار و دەستوورات ئەوان دەیدەن، هەر جوولانەوەیەک، هەتا فەرمانی سەرۆکی لە سەر نەبێ، کەس ناتوانێ بەڕێوەی بەرێ، حالی بووی حەمەگیان؟
حەمە ماتبووە، لە دلیەوە لێکی دەداتەوە، بە سەر لێشێواوییەوە گوتی:
ـ سەیرە! ئەو عالەمە چۆن یەکیان گرتووە؟! بۆ دەبێ هەموو کارێ بەدەستووری کەسێ بەڕێوە بچێ؟ کەوا بێ ئەو کەسە ئاغایە!
مەحموود شوان بە پێکەنینەوە گوتی:
ـ نا، ئاغا نییە، بەڕێوەبەری ئەو رێکخراوە، یان ئەو بزووتنەوەیە. دەزانی چۆنە؟ مەسەلەن، ئەو بزووتنەوەی تاهیر، رەنگە لە نێو ئەواندا کوڕی زۆر ئازاتر لە تاهیر هەبێ، ئازایەتی ماوەرای زانینە، سەرکردە دەبێ کەسێ بێ زۆر زانا و هەلکەوتوو بێ، بە سەر هەموو سیاسەتێکدا زال و لێهاتوو بێ، تاهیر لە هەموویان زاناتر و وریاترە، بۆیە هەلیان بژاردووە، چۆنت حالیکەم؟ تەزبیحێک لە نەزەر بگرە، چۆن دەنکە تەزبیح دەکرێن بە بەنێکەوە هەر دوو سەری بەنەکە لە ئیمامی هەلدەکێشن، ئەودەم پێی دەلێن تەزبیح، ئاوایە، تاهیر ئیمامەکەیە، دارودەستەکەی دەنکە کانییەتی، بیروباوەڕیشیان بەنەکەیەتی، هەموویان باوەڕیان یەکە و لە دەووری ئەو باوەڕە کۆ بوونەتەوە، حالی بووی؟

حەمە دەستی لە ژێر روومەتی دەرهێنا، بە دەم راکشانەوە گوتی:

ـ تا ئێستا ئەوانەم نەبیستبوو، پێموابوو کەس بە ئاغا ناوێرێ! خۆزگـە رۆژێ ئـەو کەک تاهیرەم دەدی، بمزانیبا چۆن پیاوێکە.

مەحموود شوانیش راکشاوە، بە دەم باوێشکەوە گوتی:

ـ چۆنە؟ ئەویش وەک من و تۆیە، ئەو ئازا و نەترسە، ئێمە خوێڕی و ترسەنۆکین، دنیا پڕە لە تاهیر! سەدان لە تاهیریش ئازاتر هەنە، من و تۆ بێ هەواڵین، ئێمە بابایـەکی شوان کارمان بەو حەیس و بەیسە چیە؟ کوڕە بخەوە با بەیانی زوو وە خەبەر بـێین و زالم بدۆزینەوە.

مەحموود شوان ماوەیەکە پرخەی دێ. حەمە خەوی لێ زڕاوە، چۆتە نێو قـسەکانی مەحموود شوانەوە بیریان لێدەکاتەوە، ئەمشان و ئەوشان دەکا.

بەیانییە، بەر لە تاوکەوتنە. دەوری قەسابخانەیە. سەگەل لە سەر ورگ و سـیپەلـک مشتومڕیانە، زۆر بە دەستی زۆر دارەوەیە، بێ زۆر لـە دوورەوە تەماشـا دەکـەن، دەم دەلێسنەوە.

مەحموود شوان و حەمە لە زالم دەگەڕێن، زالم لەوێ نییە! دوور لە قەسابخانە گەلە سەگێ دیارە، حەمە بە پەلە گوتی:

ـ خالەگیان! هۆوە دەستەیەک سەگ، دێلە بەبایە، رەنگە زالم لەوێ بێ.

وردە وردە روویان کردۆتە سەگەل، مەحموود شوان بزەی هاتێ و گوتی:

ـ ئەوەتا! ئەوەتا! خۆیەتی، چاوی لێکە! تەماشاکە چۆن دێلی داوەتـە پـێش! بزانـە سەگ دەوێرێ وەقەرەی کەوێ؟! زالم، زالم...

زالم بە دەنگی مەحموود شوانەوە ئاوڕێکی داوە و وەدووی دێڵ کەوتەوە.

مەحموود شوان دەستی حەمەی گرت و گوتی:

ـ بێ فایدەیە، وەرە دانیشە، تا کاری لێ نەکا، دەس هەلگرنییە، خۆم دەزانم، وەرە دانیشە.

ـ زالم دێلی داوەتە بەر سینگی و ئەم لاو ئەولا دەیـسوڕێنێ، سـەگەل دووراودوور هەلتووتەکاون، ناوێرن لە زالم نزیک ببنـەوە. زالـم بـە دێـلەوە رواوە، ماوەیـەکـە پێکەوەن، دێڵ بەریناداا، سەگەل لە دوورەوە دەم دەلێسنەوە و دەوەڕن.

تاوبان گەرم بووە، دێڵە بە با زالمی بەرداوە، مەحموود شوان بە فیکەیەک زالمی بانگ کردەوە، زالم بە کلکە سووتێ بەرەو پیری دێ و بۆن بە پێی خاوەنەکەیەوە دەکا، مەحموود شوان زالمی پەتکردووە، بە حەمەی گوت:

ـ تۆ بڕۆ گوێدرێژەکە لە کاروانسەرا دەرکە و وەرە بۆ ئەو لای شار، من لەوێ چاوەڕێتم.

حەمە لە بازاڕ، لە سەر ڕێی کاروانسەرا ئاوێنە و عەتر و ئەنگوستیلەیەکی بۆ کەوێ کڕیوە، کرێ خان و کرێ جێی بە عەلی شامی داوە و لەولای شارەوە لەگەڵ مەحموود شوان یەکیان گرتۆتەوە و بەرەو دێ گەڕاونەتەوە.

# ٩

نازدار! نازدار! نەخێر لێرە نییە! چووتە سەر حەوزەکە، لەوێش نییە! گەڕاوە، بە پلیکاندا وەسەرکەوت، بە دیوەکاندا دەگەڕێ، دیار نییە! دەچێتەوە خوارێ، سەر بە مدبەقدا دەکا، بە سرتە بانگی دەکا:

ـ نازدار! نازدار! جوابی نییە! چووتە سەر حەوزەکە و ئەژنۆی گرتە باوەش.

نازدار لەبەر دەروازەوە دەنگی دێ! سرووری کەوتەوە دلی ئەحمەد فەڕاش، دەستی لە ئەژنۆ بەر دەدا، هەستاوە و بەرەو تاریکایەک خۆ دەکێشێ.

نازدار گەڕاوە، گەیوەتە حاندی ئەحمەد، بانگی دەکا:

ـ نازدار! ئەوە لە کوێی؟! نازدار جوابی ناداتەوە! ئەحمەد لە تاریکانی دەردەپەڕێ و سەرە ڕێی پێدەگرێ. نازدار خۆ لا دەدا و جواب ناداتەوە! ئەحمەد لە دواوە شانی دەگرێ و رایدەوەشێنێ، بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

ـ چ بووە؟! لە چی تووڕەی؟

نازدار خۆ رادەپسکێنێ و شانی لەدەستی ئەحمەد دەردێنێ، بە دڵپڕیەوە گوتی:

ـ لا چۆ لە پێش چاوم! تۆ بە ڕێی خۆت و من بە ڕێی خۆم! وەمزانی زۆر پیاوی!! برۆ مەم دوێنە!

ئەحمەد بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ باشە چم کردووە؟ بۆ پێم نالێی؟!

نازدار بە دڵتەنگییەوە گوتی:

ـ دەتەوێ چ بکەی؟ لەوە زیاتر؟! ئەوە نییە خۆت فرۆشتووە! لەوە زیاتر؟

ئەحمەد بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ خۆم بە کێ فرۆشتووە؟! ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ خۆشت نازانی دەڵێی چی؟

نازدار گەڕاوە و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ با، بەڕێوەڵلا زۆر چاک دەزانم، تۆ نازانی چ دەکەی! بارەقەڵلا! بە دەستێ جل و بیست تمەن پووڵ و دوو بارەقەلا با دەکەنە قۆلت، بەیانیش دەچی ئەو هەتیوە شوانە دێنی و ئەوەندەی دیکەش وەردەگری، بە زیاد بێ! خۆ دز نیت، دزی؟!

ئەحمەد سەری خەجالەتی باداوەتەوە و ئارەقەی شەرم دەڕێـژێ. تـاریکی بـووە بـە لەمپەر، نازدار شەرمەزاری ئەحمەدی بۆ نابینرێ. ئەحمـەد بـە پێکـەنینێکـی ئاوێتـە بـە شەرمەوە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

ـ لەوە قەلسی؟! گوتم داخوا چ بووە!!

نازدار دەنگی هەڵێنا و بە دەنگێکی تیژ گوتی:

ـ تۆ ئەوەت پێ کەمە؟! من نازانم تۆ فەڕاشی یا کوتەک بە دەستی؟ تۆ بۆ منت لێرە ڕاگرتووە؟! بە تەمای چیت؟ بە هیوای بەراتی ئەو چەند ساڵەی؟ وەڵلا ناپێیوی، یان بـە تەمای ئەوەی ماڵت بۆ پێکەوە بنێ و منت لێ مارە کا؟ ئەوانە هـەمـوو فریودانـە، هـەر تەفرەیە، ئەوە سێ ساڵە دەڵێ ماڵتان دەدەمێ، لێکتان مارە دەکەم، من نازانم لە کەنگێـوە ئێمە بووین بە کوڕ و کچی هەمزەبەگ؟! من لە هەوەڵ ڕۆژەوە گـوتم ئەوانـە درۆیـە، تەنیا لەبەر کارە ئێمەیان ڕاگرتووە، من بۆ کلفەتی و تۆ بۆ نۆکەری و ئازاری خەڵک، تۆ دەزانی ئەو حەمە شوانە کێیە؟ دەزانی بۆ لێی چوون بە قیندا؟

ئەحمەد بێ دەسەلاتانە ملی ناوە بە کەوچەوە، لە بن لێوەوە گوتی:

ـ دەڵێن خەتای ئەو بووە کوێتە هەلاتووە، ئـەو سـەگی کردۆتـە عەتابـەگ، هـەر ئەوەندەی لێدەزانم!

نازدار هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ ئاخر ئێمەومانان ئاوا لە دنیا دەگەین بۆیە گیرۆدەی دەستیان دەبین، ئەگەر ئـەوان چواری وەک من و تۆ هەڵنەفریوێنن، بۆ ئاغان؟ کوڕە بـۆ ئـەوەنـدە بـێ دەسـەلات و فەقیری! سەگی چی و شتی چی؟ ئەوە بیانووە بیانوو، بیـانووی پـێ دەگـرن، بیـانووی کەوێ! حەمە و کەوێ دڵیان پێکەوەیە، کەوێ کچی کوێخا کەریمـە، دڵـی بـە حەمـە شوانەوەیە، عەتا دڵی بە کەوێوەیە، کەوێ جوابی عەتا ناداتەوە، عـەتا حەمـە بـە مـلۆزم

ـەڕێ و دەیەوێ ئەو ملۆزمە لابا، بە زۆر دلی کەوێ بە دەست بێنێ! حالیبووی؟ تۆ ـەچی حەمە دێنی و بە لێدانی دەدەی؟ داخ دەنێی بە سەر دلی کەوێی هەناسە سارد دا؟ حەمە ئازار بدەی، خۆتت ئازار داوە، داخ بنێی بە سەر دلی (کەوێ) وە، داخت ناوە بە ـنی منەوە، دەبڕۆ، بڕۆ بیهێنە، نازدار هەنگاوی هەلگرت بڕوا.

ئەحمەد ڕێی پێدەگرێتەوە ناهێلێ بڕوا، ئەحمەد لە دەروونەوە تەقیوەتەوە، گرێکی سەیر ناخی گرتووە! بیر لە خۆی و نازدار دەکاتەوە! خۆی بردە جێی حەمە، نازداری کردووە بە کەوێ، ئەو زولمەی لە حەمە دەکرێ، لە منی دەکا، دلی پڕ بووە، چنگی ئەوەی دلداری دلی ڕێک دەگوشێ، خۆی لۆمە دەکا.

ئەو دەمەیە کە ویژدان رادەپەڕێ و بەرهەلستی کاری ناڕەوا رادەوەستێ، خۆی سەرکۆنە دەکا، لە کاری ناڕەوا خۆ دەپارێزێ، لە دەروونەوە دەنگی دەدا و دەلێ:

ـ ئەوە کاری تۆ نییە! کاری وانەکەی.

نازدار چۆتە دەروونی ئەحمەدەوە رازی دەروونی، هەست دەکا، بە گریانەوە گوتی:

ـ نەکەی ئەحمەد! نەکەی، کاری وا نەکەی، ئەوە کاری تۆ نییە، ئەگەر دلی منت دەوێ، کاری وامەکە.

ئەحمەد باوەشی کردووە بە نازداردا، بە کول، گوتی:

ـ ئەوە منیش نەچووم کەسی دی دەچێ و دەیهێنێ.

نازدار سەری نا بە سینگی ئەحمەدەوە، چاو یەکەو فرمێسک هەزار، بە گریانەوە گوتی:

ـ تۆ مەچۆ، هەر کەس دەچێ کەیفی خۆیەتی! با بچێ، تۆ مەچۆ.

ئەحمەد چەناگەی لە سەر سەری نازدار داناوە، چەنەی لابرد و پەنجەی خستە ژێر چەنەی نازدار و دەمی هێنایە بەر دەمی گوتی:

ـ جوابی ئاغا چۆن بدەمەوە؟

نازدار زەردەیەکی بۆ خستە سەر لێو و گوتی:

ـ بچۆ، بەلام مەیهێنە، بلێ نەمدیەوە، بلێ لە مال نەبوو، چووزانم هەزار بیانوو هەیە، هەرچی خۆت پێت باشە ئەوە بلێ، کەیفی خۆتە، حەمە بێنی، من نابینی، یان دلی من، یان دلی ئەوان. نازدار بە پەلە لە دەستی ئەحمەد هەلات.

تەزووی بای بەر لە تاوکەوتن لەرزی خستۆتە لەشی ئەحمەد، بە سەر ئەسپە رەشەوە کوشکەی کردووە. لەرز و مچوڕک هەموو دەمارەکانی لەشی گرتۆتە بەر هەلیدەچۆقێنێ، وەک نەخۆشێ یاوگرتوو بەدەم چەقوچۆوە وڕێنە دەکا.

ـ تووشی چ مەخمەسەیەک بووم؟! دوێنێ گوتم چووە بۆ شار، ئەمڕۆ بلێم چی؟ جوابی ئاغا چۆن بدەمەوە؟ بلێی حەمە مەڕی بۆ کوێوە بردبێ؟ رەنگە چووبێتە ئەو بەر وا لەمبەرە دیار نییە.

ئەحمەد نا بە دڵ سەری ئەسپەڕەش وەردەسووڕێنێ، بە داوێنی کێوی چڵ پەریدا رووە و هەزار ئەشکەوت وەڕێکەوت.

ئەسپەڕەش داهێزراو، سەروگوێ داتەپاوە! چاو خەواڵوو و بێ دەماخە! کلک ناگرێ! سم لە ئەرزی جوێ ناکاتەوە! دەڵێی ئەویش وەک سوارەکەی نابەدڵە! سەبر سەبر و نەرم نەرم لە تیرەشانی کێوی چڵ پەریەوە تێپەڕیوە، لە چۆم پەڕیوەتەوە و رووەوکانییە بەردینە سەری پێوە ناوە.

مەڕ لە سەر کانییە بەردینە پاڵێنی داوە. حەمە لە سێ لاوە نانی بۆ سەگەل خستووە و دەست بە گۆچان لە نێوانیاندا وەستاوە.

گەلاز و بۆرە ددانیان لە ریچەوە دەبەن و لە زالم دەمڕێنن. حەمە دەنگیان دەدا بێ دەنگ دەبنەوە.

گەلاز و بۆرە بە جووت راست بوونەوە، بە دەم وەڕینەوە، سەرەو خوریان داوەتێ! حەمە ئاوڕ دەداتەوە، سوارێ لە سەر چۆمەوە بەرەو لای دێ! لە حەمە وایە عەتایە، دەست بە گۆچانەوە، وەدووی سەگ دەکەوێ و زالم بە دووی حەمەدا، بەرەو سوار، بە وەڕینەوە دەڕوا.

گەلاز و بۆرە بە سوار گەیون، سەگ و سوار لە تۆزدا ونن، زالم چووە نێو تۆز و ونبوو. سوار لە نێو تۆز هاتۆتە دەرێ و دوورە پەرێز، بێ تەکان وەستاوە! لەوە دەچێ سەیری شەڕە سەگ بکا، بەلام نا، زۆر ترساوە و توانای رکێف لێدانی نییە.

حەمە گەیوەتێ، لە دوور ئەحمەد فەراشی ناسیوەتەوە، مەجالی ئەوەی نییە بچێ بۆ لای ئەحمەد، گەلاز و زالم شەڕیانە و یەکتر کۆلەوار دەکەن.

گەلاز و زالم مەچەکەیانە، کەلپەیان لێک گیرکردووە، بۆرە لە دواوە و گەلاز لە پێشەوە زالمیان گرتووە، بۆرە رەفیسکەی گرتووە و دەیکێشێ.

حەمە گۆچانی هەڵێناوە و دای لە بۆرە، بۆرە قرووسکاندی و هەڵات. گەلاز و زالم گیریان لە یەک گرتووە، هەر دوو لە سەر پاشوو ویستاون، دەستیان لە دەستی یەک هاڵاندووە و قەپ بە دەمی یەکتر دا دەکەن.

حەمە ئەوە دەزانێ کە سەگ مەچەکیان لێک هەڵپێکا نابێ لێیاندەی، چونکە بە لێدان زیاتر رقیان هەڵدەستێ و چاکتر یەک دەگرن، گۆچانی کردووە بە دەمی زاڵمدا و بە دەستەکەی دیکەی گوێی گەلازی گرتووە، گەلاز و زالم لێک بوونەوە، حەمە پەتی لە پشت کردەوە و زالمی پەتکرد، بە دووره بەرد گەلازی دوورخستەوە و بەرمو ئەحمەد دەڕوا، لە دوورەوە گوتی:

ـ یا خوا خێر! ئەوە یانی چی کاکە حەمەد؟ دوو رۆژە لە من دەگەڕێی! خێرە؟

ئەحمەد بۆ ئەوەی حەمە دڵ کرمۆڵ نەبێ، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ تۆ ئەگەر ونبی دەبێ گونی شەیتانت لێ ببەستن! دوێنێ هاتم، ئەحمەدی مام حەسەن گوتی چووە بۆ شار، ئەمڕۆ لە بەیانییەوە لە دووت دەگەڕێم، ئەوە لە کوێی ماڵتە؟ حەمە بە دوودڵییەوە گوتی:

ـ دوێنێ چووم بۆ شار و ئەو سەگەم هێنا، ئەمڕۆش ئەوە لە خزمەتام، خێرە؟

ئەحمەد جوابی قسەکەی حەمەی نەداوە، لە ئەسپەڕەش دابەزی و لەگەڵ حەمە دەست و مشتاقیان کرد، بەرەو کانییەکە وەڕێکەوتن.

حەمە شانبەشانی ئەحمەد دەڕوا، جار جار چاوێکی لێدەکا، ئەحمەد لەوە ناچێ تووڕە بێ! بزەی لە سەر لێوە! دڵسۆزانە دەیدوێنێ!

چوونە سەر کانی، ئەحمەد لەغاو لە سەر ئەسپەڕەش دادەماڵێ و دەیباتە سەر ئاو، ئەسپ ئاوی خواردەوە، دەسکەوسارەکەی بە تەڕەبنەیەکەوە بەستەوە و هاتەوە بۆ لای حەمە، لە دوورەوە گوتی:

ـ ئەحمەدی مام حەسەن پێی گوتی دوێنێ هاتووم؟

حەمە گوتی:

ـ بەڵێ، خێرە وا دوو رۆژە دێی؟!

ئەحمەد هاتۆتە پەنای حەمە دانیشتووە، دەستی خستە سەر شانی و دڵسۆزانە گوتی:

ـ شتێکت پێ بڵێم لە من دڵمەن نابی؟!

حەمە سەری سووڕماوە! بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

ــ نا، نەوەڵلا، چیە؟

ئەحمەد بە دڵتەنگییەوە گوتی:

ــ ئاغا دەستووری داوە بتبەم بۆ قەڵا، دوو سێ ڕۆژە زۆرت لێ تووڕە و قەڵسە، بەڵام من ناتبەم! ئەگەر کەسێ هات و پرسی ئەحمەدت دیوە، بڵێ نەمــدیوە، زۆریــش گــوێ مەدەیە،، دەیەوێ بترسێنێ تا دەست بەرداری کەوێ بی!

حەمە بەبیستنی ناوی کەوێ یەک بە خۆی لــە ناخــەوە ڕاپــەڕی، بــەڵام زوو وەخــۆ کەوت و بە سەر دەروونیدا زاڵبوو، وەخۆی نەخست، بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ زۆر سەیرە! خۆم ئاگام لێ نییە کەچی لە خۆڕا (کەوێ)یان کردووە بە دەسگیرانم! باوەڕ بکە نە من و نە کەوێ ئاگامان لەو حەیس و بەیسانە نییە، ئەوە بیــانووە، دەیانــەوێ بیانووم پێ بگرن، هەموو فیتی فەیزە درێژە، هەر ئەو چووە بە عەتابەگی گوتــووە، ئــەو گۆنگەڵەی خستۆتە ڕێ.

ئەحمەد دەزانێ حەمە ڕاستی بەو ناڵێ و بــە پیــاوی قــەڵای دەزانــێ، بــە زمــانێکی دڵسۆزانە گوتی:

ــ ئەگەر من بە پیاوی ئاغا دەزانی و لە من دەترسێی، مەترسێ! بە خودا ئەو زوڵــمەی لە تۆی دەکەن لە منیشیان کردووە. ئەحمەد دڵی پڕ بووە، ماوەیەک بــێ دەنــگ بــوو، پاشان وەک دڵپڕێ پێ کردووە:

ــ بە حەوت حەکیم بە قەت دەردەداری نازانن! منیش وەک تۆ دەردەدارم! نــازداری منیش وەک کەوێی تۆیە! ئێمەش وەک ئێوە لە داویان کەوتووین و خەلاســیمان نایــە! سێ ساڵی ڕەبەقە دەستی دەستیمان پێدەکەن! پاییز دەڵێ بەهار، بەهار دەڵێ پاییز لێکتان مارە دەکەم، هەق و بەڕاتی ئەو سێ ساڵەتان بە سەریەکەوە دەدەمێ، من بە نێو فــەڕاشــم، نازدار بە نێو کلفەتە، من فەڕاشم، نۆکەرم، نامــەبــەرم، جــارچیم، گزیــرم، گوتــەک بــە دەستم...... نازدار کلفەتە، کەنیزە، کابانە، بێرییە، نانەوایە.... چۆن بــڵێم؟ وەک چــارەوێ شەووڕۆژ، بێ حەق و بەڕات ڕامان دەدەن، بە نانە زگی کار دەکەین، خۆشمــان نــازانین پاشەڕۆژمان، پاشە کەوتمان چ دەبێ. ئەحمەد چاوی بوو بە دەریا و شــەپۆل دەدا، دڵــی کەیلە، دەڵێی کەسی وەگیر نایە دەردە دڵی لاهەڵڕێژێ.

حەمە لە نێو شەپۆلی چاویدا دڵی بێ غەلوغەشــی ئەحمــەد دەبینــێ، خــۆی، کــەوێ، ئەحمەد، نازدار، دەرد و ئازاریان دەبینێ. بە سەر دەرد و پــەژارەی خۆیــدا، بــەزەیی بــە ئەحمەددا دێ، وەک هاوالێکی لە مێژینە دلخۆشی دەداتەوە، بە زمانی هاودەردی گوتی:

ـ خەم مەخۆ خودا گەورەیە، خودا زولمی بێ ئەندازە قەبوول ناکا، دەلــێن هــەمــوو شتێک لەباریکیدا دەپسێ، زولم لە ئەستووری، رەنگە بەرقەنەشت نەکرد بێ، ئێستا نــان و شیرێکت بۆ سازدەکەم.

حەمە جامە رەشێکی لە تووربێن دەرهێنا و رۆیشتە نێو مەر. پاش ماوەیەک بە جامــێ شیرەوە گەڕاوە.

شیر لە سەر کوچکە ئاور کەفوکولیەتی، حەمە بە فوو کەفوکۆلی شیر دادەمرکێنــێ، جۆرەکە نانی کردەوە و جامە شیری لەبەردەمی ئەحمەد دانا گوتی:

ـ شیر هێشتا چەور نەبووە، مەڕ شیو دەخوا، دەی نانەکەت بخۆ، خەم مەخۆ، خۆم دێم! یان لەگەڵ تۆ دێم، یان دوای تۆ دێم، با جێ بە تۆ لێژ نەبێ.

ئەحمەد چاوی لێ دەرپەڕاند، بە توورەییەوە گوتی:

ـ بۆ کوێ دێی؟! ئەی نازدار؟! جوابی ئەو چۆن بدەمەوە؟ دەتــەوێ دڵــی ئــەوم لــێ بکەی؟ نا، کاری وا نەکەی، دڵی نازدارم زیاتر مەتلەبە، تۆ هەر کەسێ گوتی ئەحمــەدت دیوە، بڵێی نا، تۆ خەمی منت نەبێ، خۆم جۆری دەکەم.

نان و شیر خوراوە، مەڕ لە سەر ئاو رایــداوە، ئەحمــەد لــەغاوی کــردووە بــە ســەر ئەسپەڕەشدا و پێی لە ئاوزەنگی ناوە، دەستی لە قەڵپۆزی زین گیرکردووە و پەڕیــە ســەر پشتی.

حەمە لای لە سەگەل گرتووە. ئەحمەد دەورێکی بە سواریەوە لێدا و خودا حافیزی لە حەمە کرد و ئەسپەڕەشی وەبەر رکێفدا.

ئەسپەڕەش خۆش رەوتە، گوێی لوول و کلکی کلافەی ئاورێــشمی رەشــە، بــە دەم وێرغە و نەرمە غارەوە لە پێدەشتی هەزارئەشکەوت لە چاوی حەمە ونبوو.

هەتاو لە ئاسمانی خۆراواوە خۆی لەکەل داوە. پەڵەپەڵە هەوری سپی لەبــەر زەردەی زەردەپەڕدا سوور و زەرد دەنوێنن، سروشت سوور و زەردە!

ئەحمەد فەڕاش ڕەنگی سروشتی گرتووە! نازداری وەبیر دێتەوە سوور هەڵدەگەڕێ! ترسی ئاغای دێتەوە بیر، زەرد هەڵدەگەڕێتەوە. ئەو ڕۆژە تا ڕۆژئاوا بوون، ئەحمەد بە شادی و ترسەوە ڕایبوارد.

ئێوارەیە، ڕۆژ پەڕیوە، ئەحمەد لە پشتی دەروازەیە، لە دەروازە دەدا، مام عەلی دەروازەی بۆ کردەوە، ئەحمەد بە پرتاو بەرەو تەویلە ئەسپی تاو داوە.

حەسەن مەیتەر بە پیریەوە هات، ئەسپی لە دەست ئەحمەد وەرگرت و گوتی:

ـ ماندوو نەبی! شێری، یان...

ئەحمەد بە پەژارەوە گوتی:

ـ شێر نیم کا حەسەن.

حەسەن مەیتەر قاقای کێشا.

هەمزەبەگ لە سەر سەراوە گوێی لە دەنگی حەسەنە، بەرەو تەویلە ئاوڕی داوە، ئەحمەدی چاوپێکەوت، بانگی کرد:

ـ ئەحمەد! هێنات؟

ئەحمەد جوابی پێ نەدراوە! چووە سەر حەوزەکە، بە ترسەوە گوتی:

ـ قوربان! نەمدییەوە! دنیای لە دوو گەڕام، تووشی نەهاتم.

هەمزەبەگ بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ هەی بێژوو! تۆ بە کاری چی دێی؟ ئەوە کاری ڕەسوولە، ئەوە کاری تۆ نییە، نان خۆر و جێگر، بڕۆ! بڕۆ لەبەرچاوم، بڕۆ بەو خەڵکە حیزبابەی نێو دێ بڵێ بەیانی ماڵێ ژن و پیاوێ بەکەو و بێژنگەوە بێن بۆ حەوشەی قەڵا، زمهەرِ پاک کردنە، بڕۆ لەبەرچاوم، بڕۆ.

## ١٠

له هەزارئەشکەوت بەو دیودا دێ کۆنە. بە بیرەوەری کەس‌نییە لە کەنگێوە ئەو دێیە جۆڵە، ئەویش ئاو و ملکی هەمزەبەگە.

چوار پێنج ساڵە کابرایەکی نەناسیاو بە تاقی تەنیا ئاوەدانی کردۆتەوە، خۆی دەڵێ ـوم عەبەیە، خەڵک بە عەبە شێت ناوی دەبەن.

عەبە بە تەمەن چل، چل و پێنج ساڵ دەبێ. دەستە پیاوێکی کزۆڵە و قسە ڕەقە. ـەهجە و ڕێزمانی لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچە جیاوازە، لەهجەی عەبە تیلەکۆییە.

عەبە لە ئاوەدانی بێزارە، کەسی ناخۆش ناوێ، زۆر جەفەنگییە، خەڵکی ئاواییەکانی دەوروبەر زۆریان خۆشدەوێ. جارو بار کە ڕێی دەکەوێتە دێیەک، ژن و پیاو، گەورە و بچووک لێی کۆوە دەبن، جەفەنگی لەگەڵ لێدەدەن. جاری وایە سەر دەخەنە سەری و قەلسی دەکەن، ئەگەر قەلس بێ زۆر جنێو فرۆشە، بەلام کەس جنێوی ئەو بە دڵەوە ناگرێ.

عەبە دەنگی خۆشە، هۆرەی چاک دەڵێ کەیفی بێنێ هەموو گۆرانییەک دەڵێ. لەو دەمەوە عەبە پەڕەوازەی ئەو شوێنەوارە بووە، تا ئێستا کەس نەیزانیوە خەڵکی کوێیە و لە کوێوە هاتووە.

عەبە لە سەرەتاوە دوو سێ گوێدرێژی بوو، باخەخوازی و سەر خەرمان دەگەڕا، بەلام ئێستا دوو سێ جوانەگای پێکەوە ناو و دەوروبەری ماڵەکەی خۆی دەکێلێ و دەڵێ جووتبەندەم! هێندێ لە خەڵک دەڵێن عەبە شێتە، هێندێکی دیکە دەڵێن درۆ دەکا، بۆی دەلوێ بۆیە شێتە!

نزیکەی چێژتاوە. مەڕ لە تیرەشانی هەزارئەشکەوتەوە بە دەم لەوەڕەوە بەرەو کانییەکەی دێ کۆن دێ. حەمە لە دوورەوە عەبەی دیوە، مەڕی بەجێهێشتووە و وردە وردە، بێ ئەوەی عەبە بزانێ، لێی نزیکبۆتەوە.

عەبە جووتی دابەستووە، بە دەم هێلەوە بە سۆز گۆرانی دەڵێ:

لە دەسی زاڵم، لە جەوری رۆژگار
بووم کەل وانشین وەکو شێت و هار
لە بەر دەردی دڵ، لە ئێش پاگەلم
خۆم گردەنشین سەر ڕێگا گەلم
تا کەی دانیشم لە سای دیواران؟
زنجیر لە گەردن چون گوناهکاران؟

عەبە لەو سەری هۆگانەوە و جوانەگای هۆ داوە، لە پڕ چاوی کەوت بە حەمە! هەر لە سەر هۆگان گاسنی چەقاند و نەقیزەی لە سەر پاشبارەی ئاموور دانا و جوانەگاکان وێستاون، عەبە بە پێکەنینەوە بەرەو لای حەمە دێ، بە لەبزێکی شیرین گوتی:

ـ ئەوە لە کوێی نەحلەتی؟! ئاخر خۆ نایێژی ئەو برا شەل و شێتەم بە تەنیا لەو چۆلگە بە جێ ماو؟ ڕووی کردەوە جوانەگاکانی و بە هەوایەکەوە گوتی:

ـ ئەو کەلیەلەت پێ چۆنە؟! بە خوا ئەوەی بوورە و بایەر بێ پێیان ئەکێلم، با فەیزە درێژی باوک گەماڵ هەر بێژی حەفت! تۆ خوا ئەو جوانەگایەلەت پێ خاسە؟

حەمە چووە پێشی و دڵسوزانە گوتی:

ـ خێرە و دەربێ عەبەگیان، جووتبەندەی چاکی، نەچینە سەر ئاوەکە؟ وەختی وچانە، جوانەگاکانت وچان نادەی؟

عەبە بەرەو جووتەکەی گەڕاوە و گوتی:

ـ بوەستە با بەن کەلەمەکانیان شلکەم، ئیسا تێم.

مەڕ لە کێوەوە بەرەو ئاو خۆیان بەرداوەتەوە. گەلاز و زاڵم و بۆرە دوور و نزیک بە دووی مەڕەوەن، مەڕ ڕژاوەتە سەر ئاو، حەمە وردە وردە دەڕوا بۆ سەرکانی، عەبە چۆتە لای جووتەکە، لە پڕ هاواری لێ هەستا!

حەمە لە سەرکانییەوە بە هاواری عەبەوە گەڕاوە، هاواری لێکرد و گوتی:

ـ چ بوو عەبەگیان؟! ئەوە هاتم. لە دەنگی هاواری حەمە، گەلاز خۆی گەیاندە حەمە، گەلاز و حەمە بە جووت گەیونەتە سەر عەبە.

عەبە لە پشتی جوانەگا رەشەوە کەوتووە و وەک ژنـی کـەوان وێـک هاتۆتـەوە و حەمە خووی جوانەگا رەش دەزانێ، خووی لە قەوەشاندنی لەگەڵە، بە پەشێوی گوتی:

- چ بوو عەبەگیان؟! ئەو قۆڕە کوشتووە لەقەی لێدای؟

ـ عەبە جواب ناداتەوە! هاتۆتە حالی جاو! خۆ دەتلێنێتەوە و دەناڵێنێ!

حەمە بە دەم نالینەوە کردوویەتە کۆڵ و دەیباتە سەرکانییەکە، رایکێشاو دەیشێلێ، بە دڵتەنگییەوە گوتی:

ـ عەبەگیان کوێت ئێشی پێ گەیوە؟

عەبە دەستی گرتووە بـە زگییـەوە و خـۆی گولۆلـە کـردووە و بـە دەم ناڵـینەوە دەتلێتەوە! پاش ماوەیەک شێلان، عەبە هاتەوە قسە و گوتی:

ـ سکم ئێشێ! ئای سکم! ریخۆڵەم قەف قەف بووە، ئای مردم.

حەمە بێ دەسەلاتانە بە دیارییەوە داماوە، نازانێ چ بکـا؟ زۆر کەشـتەنگ و دامـاوە. عەبە لە پڕ هەستاوە و قاقای کێشا و گوتی:

ـ ئەوە بۆ چ داماوی؟! خەفەت مەخۆ گەوجە پیاو! شۆخیم کرد، تۆم تاقیکردەوە! بـە گەوجت ئەزانم! بۆ ریخۆڵەی تۆ قەف قەف نییە؟! ریخۆڵەی تۆ راستە گەوجە پیاو؟

حەمە سروور کەوتۆتەوە دڵی، بە شۆخییەوە عەبەی گرت و نایە ژێر و خرەپاندییەوە هەر دووکیان ماندوو بوون، حەمە عەبەی بەرداوە و لە سەر کانییەکە دانیشتوون، باسـیان هێناوەتە سەر سەگ، باسی زالم دەکەن. حەمە گوتی:

ـ زالم زۆر سەگی چاکە.

عەبە زۆر لە مێژە دڵی بە گەلازەوەیە، تا ئێستا دوو سـێ جـاریش داوای کـردووە، بەلام حەمە پێی گوتووە ئەگەر بلێ لە کوێوە هاتووە، خەڵـکی کـوێ بـووە، گـەلازی دەداتێ، جا لەبەر ئەوە، عەبە ناوێرێ داوای بکاتەوە.

عەبە لە جوابی تاریفی زالمدا گوتی:

ـ ئەی خوا بتگرێ بۆ درۆت! یانی لە گەلازیش خاسترە؟!

حەمە لە عەبە حالییە، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ نالێم لە گەلاز باشترە، دەلێم سەگی چاکە، گەلاز فەرقی زۆرە، ئەو دەست پەروەردەی خۆمە، بە تووتکی خۆم بارم هێناوە، گەلاز ملکە ملک!

عەبە ماتبووە، جوابی حەمەی نەداوە! هەر دوو بێ دەنگ بوون.

عەبە لە نەکاو هەستایە سەر پێ، دەستی داوەتە بەرچاوی و تەماشای ئاسۆی هەزارئەشکەوت دەکا، بە سەر سوڕمانەوە گوتی:

ـ ئەو سوارە کێیە؟!

لە حەمە وایە عەبە کەیفی جەفەنگی کردووە، گوتی:

ـ دیسان بەزمەکەیە!

عەبە گوتی:

ـ نە بە خوا، ها ها، تەماشاکە، لە بانی هەزارئەشکەوتەوە تێتە خوارەوە، ئەوە گەییە بەر تاشەکە.

حەمە بە دیتنی سوار قەلەمی دەست و پێی شکا و کەوتە دلە خورپە!

سوار نزیک بۆتەوە، حەمە سواری ناسیوەتەوە، رەسوولی نۆکەرە.

سوار گەیوەتە پێشێ، وەک میر غەزەب نێو چاوانی وێکهێناوە! دەلێی بورجی ژەهرەمارە! بە سەر ئەسپەڕەشەوە خۆی گێف هەلداوە، بە ناقایلییەوە گوتی:

ـ حەمە! هەستە وەپێشمکەوە با بڕۆین.

حەمە خۆی حالییە رەسوول بۆ کوێ دەلێ، خۆ هەلە دەکا، بە زمان باری لێو دەگرێ، لێوی تەڕکردەوە و گوتی:

ـ بۆ کوێ کا رەسوول؟

رەسوول بێ چاو لێکردن، گوتی:

ـ بۆ قەلا، ئاغا کاری پێتە.

حەمە بۆ خۆشامەیی دوو سێ هەنگاو چووە پێشێ و بزەیەکی ترساوی خستە سەر لێو گوتی:

ـ ئەی مەڕەکەم؟ باشە بە چاوان، نێوڕۆ مەڕم بردەوە دێمە خزمەتی.

ئەسپە ڕەش بە دەست و پێوە بەند نابێ، دەسووڕێ و سم لە ئەرز دەگوتێ، دەورێ بە دەوری حەمەدا خولاوە، رەسوول روویکردەوە حەمە و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ من کارم بەو حەیس و بەیسە نییە، خودام دەکرد قرِی تێدەکەوت، ئاغا دەیفەرموو ـەگەڵ خۆت بیهێنە، خۆت وەپێشم دەکەوی، یان بە...

حەمە تەماشایەکی عەبەی کرد و گوتی:

ـ عەبە گیان! لە تۆ زیاتر کەس شک نابەم، مەڕەکە ببەوە نێو دێ و بە ئەحمەدی مام حەسەن بڵێ حەمە دەیگوت تا دێمەوە بچێتە لایان. حەمە گۆچان و کەلوپەلی بە عەبە سپارد و وەپێش ڕەسووڵی نۆکەر کەوت.

حەمە و ڕەسووڵ دوورکەوتونەتەوە، حەمە ئاوڕ دەداتەوە، بانگ لە عەبە دەکا.

ـ هۆشی سەگەکانت بێ، شەڕ نەکەن.

عەبە دەست بە گۆچانەوە هەڵدەتەکێنێ.

ـ نا نا، ناهێڵم، زوو بێرەو، خاترجەم بە خاترجەم، تا دێیتەوە خۆشم لە تەک ئەحمەد ئەبم، دڵ لە دوا مەوە.

نزیکە و نیوەڕۆیە، هەوا گەرمە. حەمە لە پێش ئەسپەڕەشەوە پێ بە پێی دەڕوا، پشووی سوار و شەلالی ئارەقە. دوو دڵە، هەنگاو بە هەنگاو لە مەترسی نزیک دەبێتەوە:

بە درێژایی رێ لەگەڵ ڕەسووڵ نەدواوە، ئەویش هیچ پرسیارێکی لە حەمە نەکردووە.

دەرکی قەلایە. ڕەسووڵ بە سوارییەوە لە دەروازەی داوە، مام عەلی دەروازە دەکاتەوە، ڕەسووڵ حەمەی وەپێشدا و چوونە حەوشە.

حەوشەی قەلا پڕە لە ژن و پیاوی بێگارچی. پیاوان جەواڵ بە کۆڵ و تۆزاوی لە عەمبارەوە گەنم دەکێشنە حەوشە و ڕۆویدەکەن.

ژنان بە کەو و بێژنگ و شێلگیر باڵەکەو و گێژەو و پاکی دەکەن و کۆما کۆما هەڵیانداوەتەوە، دەستەیەک لە پیاوان لە جەواڵ و هۆڕدا دایدەگرن و بارە ئاشی دەکەن.

هەمزەبەگ و عەدلە خانم و عەتا لە سەر سەراوە بە سەر بێگارچییەوە ڕاوەستاون، کەس ناوێرێ سەر هەڵێنێ.

ڕەسووڵ ڕکێف لێدەدا، ئەسپەڕەش سینگی ناوە بە پشتی حەمەوە و مەجالی لێ بڕیوە، سوار و پیادە خۆیان کرد بە نێو بێگارچیا.

پیاوان بە کۆڵەوە عەبەساون! ژنان دەستیان بە کەو بێژنگ و شێلگیرەوە وشکبووە، دەم بووە بە تاقی چرا! هەموو دەڕواننە یەک!!

ڕەسووڵ حەمەی بردۆتە سەر حەوزەکە، بە دەنگێکی زوڵاڵەوە گوتی:

ـ قوربان! ئەوە حەمە، فەرمانت چیە؟

هەمزەبەگ لە جێی خۆی واق ماوە! دەڕوانێتە حەمە! تەماشای عەدلە خانم دەکا! دەڕوانێتە حەمە، چاو هەڵدەگولۆفێ، دیسان تەماشای عەدلە خانم دەکاتەوە، سەرنجی داوە حەمە هەستاو بە پلیکاندا هاتە خوارێ.

ڕەسوولی نۆکەر حەمە شوانی بەرانبەر بە عەدلە خانم و عەتا ڕاگرتووە، عەدلە خانم چاوی لێ ناترووکێنێ! دەمی بە تاق ماوە! دەسرە ئەورێشمەکەی دەردێنێ، چاوی دەسڕێ و دیسانەوە چاوی بڕیەوە چاوی حەمە!

حەمە خۆ لە بەر چاوی عەدلە خانم ناگرێ، سەری بەرداوەتەوە، جار جار چاوی هەڵدێنێ، عەدلە خانم هەر وا تەماشای دەکا! حەمە چاو دادەخاتەوە، ڕووە و خەڵکەکە سەر وەردەسوورێنێ.

بێگارچی بە ژن و پیاوەوە چاوی بێ دەسەڵاتیان تێبڕیوە، بە ئیشارە هاودەردی خۆیان دەردەبڕن. حەمە دیسانەوە بەرەو سەر سەرا تەماشا دەکا، دەڕوانێتە عەتا.

عەتا بزەی تۆلە و قینی لە سەر لێوە، دەڵێی بەو بزەیە پێی دەڵێ:

ـ دەست لە کەوێ هەڵگرە، تۆ لەگەڵ منت پێناکرێ. حەمە چاو لە بەر عەتا داناخا، ئەو چەشنە کە وەستاوە، چاو ناترووکێنێ.

ڕەسوولی نۆکەر ئەسپەڕەشی لە سەر ئاخوڕی حەوشە بە زین و بەڕەوە بەستۆتەوە، و هاتۆتەوە لای حەمە وەستاوە، هەمزەبەگ لە پلیکان هاتە خوارێ، ڕەسوول بەرەو ئاغا وەرسووڕاوە و لە دوورەوە سڵاو دەکا و سەر لەبەری دەخەوێنێ.

هەمزەبەگ بە سەر جوابی ڕەسوول دەداتەوە، بزەیەکی ڕەزامەندی بۆ خستە سەر لێو و دەڕوانێتە حەمە.

ماوەیەکی زۆرە هەمزەبەگ تێی ڕاماوە! لە بەری پێیەوە تا تەوقی سەری تێی دەفکرێ!

حەمە بووە بە پەیکەر و چاوی بە موڵەق وەستاوە، چاوەڕێی ئەوەیە داخوا چ خەوێکی بۆ دەبینن؟

هەمزەبەگ هەروا تێی ڕاماوە! وا دیارە بیر لە شتێک دەکاتەوە! دەڵێی بیرەوەرییەکی مردووی لێ زیندوو بۆتەوە! چاو لە سەر حەمە هەڵدەبڕێ، بەرەو سەر سەرا دەڕوانێ، چاوی بڕیوەتە عەدلە خانم! دەڵێی پرسیاری لێدەکا!

عەدلە خانم سەری شەرمەزاری بەرداوەتەوە! وە دیارە لە هەمزەبەگ حالییە.

حەمە سەرسام ماوە! سەرنجدانی ئەو ژن و مێردە کە سەرنجی ئەو دەدەن، شتێکی ئاسایی نییە!

عەدلە خانم خۆ لە بەر تەماشای هەمزەبەگ ناگرێ، هەستاو بە توندی ڕۆیشتە ژووری.

بە ڕۆینی عەدلە خانم، هەمزەبەگ ڕوویکردەوە حەمە، ڕوو لە حەمە و پشتی لە ڕەسوولە، بە سەر ڕەسوولدا گوڕاندی گوتی:

ـ لەو حەوزەی هەڵکێشە و ببە تەویلە، وات لێ هاتووە سەگ لە کوڕی من دەکەی؟ حەمە پشت بە حەوزەکە وەستاوە.

ڕەسووڵ لە حەمە چۆتە پێشێ، هەر دوو چاویان لە چاوی یەکە، چاوی حەمە بێ دەسەلاتانە لە چاوی ڕەسووڵ دەترسێ و دەپاڕێتەوە، چاوی ڕەسووڵ هەڕەشە لە چاوی حەمە دەکا و بێ ڕەحمانە دەیترسێنێ.

لە پڕ شڵپە لە ئاوەوە هەستا، ئاو بە چوار دەوری حەوزدا ڕژایە نێو جۆگە. حەمە کەوتۆتە پەلە قاژە، بە زەحمەت هەستاوەتەوە، گەروو و لووتی پڕ بووە لە ئاو و پشووی سوارە، بە دەم هێلنجەوە ئاو دێنێتەوە، چاو دەکاتەوە و بە نێو خەڵکدا دەیگێڕێ.

ژن و پیاوی بێگارچی ڕوو وەردەگێڕن. کەس هیچ نالێ. زمان لاڵە و توانای گەڕانی نییە! گوێ کەڕە و هیچ نابیستێ! هەستی مرۆڤ دۆستی مردووە! ئەوانە هەموو مردوون! مردوویەکی گیان لەبەر!

نا نەمردوون، خوویان بەوە گرتووە! دەیان و سەدان جار لەوەیان خراپتر دیوە، تەنانەت بە سەرخۆیان هاتووە. لێدان، دارکاری، لە ئاوخستن، هەڵواسین، داغکردن، برژاندن، لە چێنی دیوار نان، سەر لە گونجە نان و پەت لە مل خستن و کەڵ تێکردن و مل هەڵکەندن، سەرتاشینی ژنان، مەمک بڕین، لووت بڕین، سواری کەرکردن. بێ حورمەتی بە نامووس، ڕاکێشانی بووکی یەکشەوە، بە زۆر ڕاکێشانی ژنی جوان لەماڵە مێرد و لە سەر منداڵ، نا! نا! لە بیر ناچنەوە، ئەوانە نەمردوون، لە بیریانە، بەڵام خۆ کەڕ و کوێر دەکەن، نەدەبینن، نەدەبیستن، ئاورە سوورە لە خۆم دوورە!

ئاو لە کۆڵەی سینگی حەمە وەستاوە، پێی بەبنی حەوزەوە نووساوە، ئەژنۆی هێزی جووڵانەوەی نییە، هۆش لە سەری پەڕیوە، گێژ و وڕ لە نێو ئاودا وەستاوە.

هەمزەبەگ بە چاو رەسووڵ حاڵی دەكا.

نۆكەر دەستی حەمە دەگرێ و لە حەوزەكە دەریدێنێ و بە پاڵە پەستێ بەرەو تەویلەی دەبا.

هەمزەبەگ نێو چاوانی وێكهێناوە، بەرخەبەبەی بەرداوەتەوە تووڕەیە، بە تاڵووكە وەدوویان كەوت. بە دەم رێوە ئاوڕی داوە، دوو سێ هەنگاو دەگەڕێتەوە، روویكردە بێگارچییەكان و گوڕاندی.

ـ چیە؟ بۆ ماتەمتان گرتووە؟ بابتان مردووە حیزبابانە؟ ئێوەش یەكێكن وەك ئەو سەگبابە! ئێوە چاكن؟! كارەكەتان بكەن، زوو بن زوو.

جەواڵ دراوە بە كۆڵدا، كەو و بێژنگ و شێلگیر وەكار كەوتنەوە، خش و هوری بێژنگ هەمزەبەگی وەڕێ خستەوە چۆتە تەویلە. دوا بە دوای ئەو، عەتاش لە سەرسەرا هاتە خوارێ وەدووی بابی كەوت.

نێوەڕۆیەكی درەنگە، كەس لە بیری نێوەڕۆژە دا نییە. حەوشەی قەڵا ماتەم بارە، بێگارچی وەك كەڕولاڵ دێن و دەچن و مەتەقیان لێوە نایە، ترساون، ترس شكاوەتە لەشیان، خەم لە روخساریان دەبارێ.

لەودەمەوە حەمەیان هێناوەتە حەوشە، نازدار لە دەلاقەی مدبەقەوە تەماشای دەكا، بەزەیی بە حاڵی حەمەدا دێ، بە دڵ بۆ كەوێ دەگری، دۆعا و نزا لە ئاغا و زۆردار دەكا، تف لە چارەی رەسووڵ. نازدار بە چاوی سوورەوە لە مدبەق هاتە دەرێ، بە پلیكاندا وەسەركەوت و چووە سەرێ، كون بە كون لە خانم دەگەڕێ.

عەدلە خانم لە قوژبنی خەڵوەتی خزیوە! چاو یەك و فرمێسك هەزار! چاوی بووە بە گونكە هەویر!

نازدار گوتو پڕ كەوت بە سەریدا، بە سەر سوورمانەوە گوتی:

ـ ئەیەڕۆ! خانم گیان! ئەوە بۆ دەگری؟!

عەدلە خانم بۆی نەشاراوە، دەسرەكەی دەرهێنا و چاوی سڕی، بە دەم گریانەوە گوتی:

ـ چووزانم! هەر لە خۆڕا دڵم پڕە!

نازدار دووشكە، بە دوو شكییەوە گوتی:

ـ تۆ خودا بۆ دەگری؟ لە منی مەشارەوە.

عەدلە خانم سەری هەڵێناوە، تەماشای نازدار دەکا، چاوەسوورەکانی دەبینێ و بە دوو دڵییەوە گوتی:

ـ ئەی تۆ بۆ گریاوی؟

نازدار بە بزەوە گوتی:

ـ تۆ بۆ چی گریاوی، منیش هەر بۆ ئەوە، بەزەیم بەو شوانەدا هات، بۆ ئەو گریـاوم، ئینسان بە خۆی نییە، جاری وا هەیە هەر لە خۆڕا گریانی دێ، خۆ ئەوە هەوەڵ جار نییـە دەبینم لە خەڵکیان دابێ، بە خودا خانم گیان قەت ئاوا بەزەییم بە کەسدا نەهـاتووە، خـۆ نازانم لە سەر چیە، بەڵام لە خۆڕا زۆرم دڵ بۆی سووتا، تۆش بەزەییت پێدا هات؟

عەدلە خانم هەستاوە، چاوی دەسڕیتەوە، دەسرەکەی ناوە بـەر پـشتوێنەکەی و نێـو چاوانی وێکهێناوە گوتی:

ـ زۆرم بە دلڕەق دەزانی؟ بۆ من بەشەر نیم؟

نازدار بەو قسەیە خەجالەت بۆوە، بە شەرمەوە گوتی:

ـ دوور لە تۆ خانمگیان! ئەی بۆ تکات بۆ نەکرد؟ خۆ ئاغا تکای تۆی دەگرت.

عەدلە خانم نایەوێ لەوە زیاتر باسەکە درێژەی پێ بدرێ، هەرچـی بـێ، نـازداریش ڕەعیەتە، قسەکە دەگۆڕێ، گوتی:

نازدار جوابی داوە، گوتی:

ـ بەڵێ.

عەدلە خانم بۆ ئەوە دەگەڕێ بزانێ کوڕی کێیە، بیستوویە دەڵێن مەحموودی حـاجی برایم کوڕێکی لە پاش بە جێ ماوە، ئاخر حەمە لەبەرچاوی عەدلە خانم هەر لە مـەحموود دەچێ! دەڵێی سێوێکن کراون بە دوولەت، لە نازدار دەپرسی:

ـ تۆ لە نزیکەوە حەمە دەناسی؟ یان بە زمانی ئەم و ئەوەوە دەڵـێی نـاوی حەمەیـە؟

نازدار لە جوابدا گوتی:

ـ وەڵلا لەمەوبەر بیستوومە، دەڵێن دایک و بابی نەماوە، بە هەتیوی گەورە بووە، لـە مالان، کوڕی مـەحموودی حـاجی برایمـە ، وەک مـن بیـستوومە، دەڵـێن بنەچـەک دەولەمەند بوون، ئێستا حەمە شوانی کانیتووە، هەر ئەوەندە دەزانم.

عەدلە خانم ئەوەی دەیویست بزانێ زانی، لەوە زیـاتر لـە سـەری نـەڕوا باشـە، بـە نازداری گوت:

ـ ئەوە کاری من و تۆ نییە، لە سەر ڕۆینی بێ فایدەیە، ئاغا خۆی باشتر دەزانێ. هەڵبەت وا بە سەڵاح دەزانێ، ئێمە هیچمان لە دەست نایە، هەر ئەوەمان لە دەست دێ بگرین و دڵسۆزی بۆ بکەین، ئەویشمان کردووە، ڕۆژ درەنگە، بۆ نەهار چت سازکردووە؟

نازدار بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ من بۆ ئەوە هاتمە سەرێ! کەوتین بە کوی قسەدا، بۆ نەهار کەنگرم سوور کردۆتەوە، کەنگر و ماستمان هەیە، بۆ شام چ سازکەم؟

عەدلە خانم ڕووەو دیوەکەی خۆی دەڕوا، بە دەم ڕێوە گوتی:

ـ بۆ شام؟ مریشێکی سەر بە کلاوەمان هەیە، خۆ هێلکە ناکا، ئەو سەربڕە.

تەویلەیەکی دوور و درێژ. ریزە کۆلەکە لەم سەر و ئەو سەر بە نێوەڕاستیا ڕۆیوە، هەموویان ئەستوور و سەر کۆڵدارن.

لە نێوانی دوو کۆلەکەدا، کولاوکەیەک تیشکی خۆری لێوە هاتۆتە خوارێ و تەویلەی ڕوونکردۆتەوە.

ئەمبەرونەبەر گاوبەندە. سێ ئاخوڕی چارەوێ لای سەرووی تەویلە هەڵبەستراون، کوێتە لە سەر ئاخوڕ بەستراوەتەوە، لە شانی چەپیەوە ماینێکی بۆرە بەستراوەتەوە، ئاخوڕەکەی دیکە خالییە، ئەویش ئاخوڕی ئەسپەڕەشە.

تەویلە چۆڵە، هەر ئەسپە کوێت و ماینە بۆرەی تێدایە، هەمزەبەگ لە شانی چەپی کوێتەوە وەستاوە دەست بە یالی دا دێنێ.

عەتا لە نێوانی بۆرە و کێوتەدا وەستاوە. بە وردی دەڕوانێتە حەمە و بزەی سەر کەوتووانەی لە سەر لێوە.

حەمە لە نێوەڕاستی تەویلە وەستاوە، دوو لا باوەشی شوولەتەڕی بووز، دەڵێی لە گەرووی مار دەرکێشراون، لە بن کۆلەکەی پەنای دانراون، جار جارە چاوێکیان لێ دەکا و تەزوویەکی سارد بەلەشیدا دێ. لەو دەمەدا حەمە بیری بۆ لە هیچ ناکرێتەوە تەنیا بیری لای ئەو شوولانەیە.

ڕەسوولی نۆکەر بە لای شوولەکانەوە پالیداوە بە کۆلەکەکەوە و چاوی لە ئاغایە، چاوەڕێی دەستوورە.

هەمزەبەگ دەستی بە یالی کویتەوەیە، سەری هەڵیناوە و تەماشای حەمە دەکا، بە چو رەسووڵ حاڵی دەکا.

رەسووڵ لە حەمە چۆتە پێشێ، سینگی ناوە بەسینگییەوە، پێی راستی دەخاتە پشتی پێی راستی حەمە، پاشقولی دەدا، هەر دوو دەستی ناوە بە شانییەوە پاڵی پێوەنا، حەمە بە پشتەوەکەوت. لە کەوتندا پشتە سەری وەرەقانی ئەرزکەوت، یەک دوو جار دەناڵێنێ، دار و دیوار، ئەسپ و رەسووڵ، هەمزەبەگ و عەتا لە بەر چاوی تاریکبوو.

رەسووڵ دەستی داوەتە شووڵکە تەر، لە بەریی پێیەوە گرتوویە بەر تا تەوقی سەری، بێ بەزەییانە خوریشۆر لێیدەدا.

باخەیەک شووڵ تەواو بووە، رەسووڵ بەم دەست و ئەو دەست ئارەق دەسرێ، حەمە ئاخ و ئۆفی لێوەنایە!

رەسووڵ دەستی راگرتووە، وچان دەگرێ و پشوو تازە دەکاتەوە، دەچێتەوە سەری، بە شوڵک تێی بەر بووە، حەمە تەکان ناخوا! رەسووڵ بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ قوربان! بێ هۆشە!

هەمزەبەگ بە یالی کویتە کایە دەکا، پەلکە دەهۆنێتەوە و دەیکاتەوە، بە سەر سوڕمانەوە گوتی:

ـ بۆیە نقەی لێوە نایە! جا فایدەی چیە ئەو لێدانە؟ هاوار نەکا بە کار نایە، هاوار هاوارەکەی خۆشە! وەهۆشیبێنەوە.

رەسووڵ چووەدەرێ و گورجێ هاتەوە، گۆزەیەک ئاوی ساردی هێناوە، گۆزە ئاوی کرد بە سەری حەمەدا.

حەمە هاتۆتەوە هۆش، راستەوە بووە، چاو دەگێڕێ، وەبیری نایەتەوە لە کوێیە، دەڵێی خەو دەبینێ! تەکان دەدا هەستێ، پێی ئەرز ناگرێ سەری گێژ دەخوا و چاوی لە رەشەوە دێ، کەوتەوە.

حەمە گوێی لێیە هەمزەبەگ دەڵێ:

ـ بیبەستە بەو کۆڵەکەوە، زوو زوو ئاوی بە سەرداکە، با لە هۆش نەچێ.

رەسووڵ چووە دەرێ، گوریسی هێنا و هاتەوە، حەمە لە کۆڵەکە دەبەستێ، توند شەتەکیداوە، دیسان دەستی کردووە بە دارکاری کردنی.

داره بووز وەک میو و رۆن نەرمە، جلوبەرگی حەمە تەڕە و بـە لەشـیەوە نووسـاوە، بووە بە پێستی. سەری دار هەر جێیەک دەگرێ، بە ئەندازەی خۆی شووشی هەڵدەسـتێ. نینۆکی پێی هەموو خوێنی لێ دەرپەڕیوە، پشتە دەست و مەچەک و پەنجەکانی شـین و ڕەش بوونەتەوە خۆێنیان تێزاوە، بەری پێی و پشتی پێی توێ توێ بووە و خـوێنی لـێ دەچۆڕێ. حەمە لێوی بردووە بە دەمدا و بە ددان گەز توویە، ئاخ و ئۆف ناکا! ڕەسـوول ئارەقی ڕەش و شینی دەرداوە، هێزی دەستی نەماوە، بە پشوو سوارییەوە گوتی:

ـ قوربان! دار تەواو بوو!

هەمزەبەگ دەستی لە یالی کوێتە بەردا، بەرەو دەرگا دەڕوا، لە بەر دەرگاوە گوتی:

بە جێی بێڵە، تا بەیانی کەس نەیە بە لایدا، هیچی مەدەنێ با بێتە دەستی پوتـێ چەنـد مەنە، وەرە عەتا، وەرە دەرێ.

عەتا بە شانی حەمەدا تێپەڕی، ئاوڕێکی لێداوە و بزەکەی جارانی خستەوە سـەر لێـو چووە دەرێ، ڕەسوولیش بە دوویدا رۆیشت.

دەمادەمی ئێوارە. گەنم پاک و بارەئاشی کراوە، حەوشـەی قـەلا چۆلـە، بێگـارچی رۆیونەتەوە.

عەدلە خانم هاتۆتە مدبەق، لەگەڵ نازدار سەریان ناوە بە سـەری یـەکـەوە سـرت و هۆڕیانە! باسی حەمە دەکەن.

عەدلە خانم گوتی:

ـ نازدار! ئاغا زۆری لێ قەلسە، دەڵێ نابێ هیچـی بـدەنێ! ئەگـەر وابـێ لـە برسـان دەمرێ، تۆ دەڵێی چی؟

نازدار خۆ هەڵە دەکا، بە ترسەوە گوتی:

ـ جا من چم لە دەست دێ خانمگیان؟ بە ئێمە چی، چمان لەو حەیس و بەیسەداوە؟

خانم هێندی مات بوو، پاشان گوتی:

ـ ئاغا رقـی هـەسـتاوە، گوناهـــ بـار دەبـین! زۆرم زگ پێـی دەسـووتێ، خێـری جوانییەکەت کارێکی بۆ بکە!

نازدار گوتی:

ـ چ بکەم؟ لە بەر دلی تۆ هەرچی بلێی دەیکەم.

عەدلە خانم ڕەنگی گەش بووە، بە پەلە گوتی:

ـ ئەمشەو شێوی بۆ بنێرە.
نازدار بە سەر لێشێواوییەوە گوتی:
ـ ئەیڕۆ خانمگیان من؟!
خانم بە پێکەنینەوە گوتی:
ـ نا، تۆ مەیبە، بیدە بە ئەحمەد بۆی بەرێ.
نازدار سوور هەڵگەڕاوە، سەری داخستووە، بە شەرمەوە گوتی:
ـ ئاخر.
خانم قسەکەی لە دەم بڕیەوە و دەستێکی‌دا بە شانی نازدار و گوتی:
ئاخری ناوێ، ئەو دەتوانێ ئەو کارە بکا، بەڵام باسی من نەکەی.
نازدار گوتی:
ـ ئەی، ئەگەر بەویان زانی؟
خانم پێکەنی و گوتی:
ـ لە قەدیمەوە گوتوویانە: دز و خاوەن ماڵ شەریک بن، گا بە کولاوکەدا دەبەنە دەرێ، لەوە مەترسێ.
نازدار بە بێ مەیلییەوە گوتی:
ـ با بزانین چمان لەدەستدێ، لەبەرتۆ دەیکەم.
ماوەی سێ ساڵە نازدار لە قەڵایە، لەو ماوەدا تا ئێستا قەتی نەدیوە خانم ئاوا دڵسۆزی بۆ کەس کردبێ!
نازدار سەری سوڕماوە! لە دڵی خۆیدا دەڵێ:
ـ بڵێی کەری کێ تۆ پێبێ؟! بۆ وا شیری بۆ حەمە داداوە؟! خۆ تازە ئەو لەو رێ و جێی ئەوە دا نییە! ئەی بڵێی چی بێ؟!
شەو درەنگە. شێو خوراو. نۆکەر رۆیوەتەوە، مەیتەر چۆتە میانە. نازدار لە سەر حەوزەکە قاپ و کەوچک دەشوا، ئەحمەد لە پەنای یەختە بییەکەوە قسەی لەگەڵ دەکا. نازدار لە ئێوارەوە ئەو دڵسۆزییەی خانمی لە سەر دڵی بووە بە گرێ، گوتی:
ـ نازانم خانم بۆ سەبارەت بە حەمە ئەوەندە دەدوێ؟! زۆر دڵسۆزی بۆ دەکا! پێم سەیرە! قەتم وا نەدیوە!
ئەحمەد قوتەیەکی بە دەوری خۆیدا کرد و گوتی:

ـ حەمە بیرەوەری بۆ زیندووکردۆتەوە! وەبیری بابی حەمــە کەوتۆتــەوە! ئــاخر بــە جوانی دڵی بە بابییەوە بووە، خەڵک دەڵێن حەمە زۆر لە بابی دەچــێ، تەنانــەت دەڵــێن، دەڵێی سێوێکن کراون بە دوو لەتەوە، بۆ تۆ ئەوەت نەبیستووە؟!

نازدار دەمی بە تاق ماوە! ماوەیەک جواب ناداتەوە. ئەحمەد دەنگی دەدا:

ـ چیە؟ بۆ واق ماوی؟

نازدار رادەپەڕێ، بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ ئەوە بۆیە بۆی دەکڕووزێتەوە! تۆ چۆن دەزانی؟

ـ هەموو کەس دەزانێ، هەر تۆ نەتزانیوە! بابی حەمە هەمزەبەگ لە نێــوی بــردووە، کەس نازانێ چی بە سەر هاتووە، یەک دەڵێ کوشتوویە، یەک دەڵــێ هــەڵاتــووە، بــێ سەروشوێنە رەنگە حەمەش بەو دەردە دووچار کەن، ئــەوە قــسەی لــە مێــژ ساڵــە، بــە بیرەوەری ئێمە نییە، ئەو دەم خانم تازە مێردی بە ئاغا کردبوو، وەک دەڵێن مەحموودی بابی حەمە زۆر جوان و پێکەوتوو بووە، خانم چاوی پێی دەکەوێ و ئاشقی دەبێ، فەیەزە درێژ بە یەکەوە دەیانبینێ و راستیان لێ دەڵێ، شەوێ پیاوی ئاغا دەچن مەحموود دێننــە قەڵا، لەودەمەوە بێ سەروشوێن بووە.

نازدار تف لە چارەی فەیزە درێژ دەکا، بە دڵ رێشییەوە گوتی:

ـ ئەو بێ شەرەفە بووە بە خۆرە و دەیەوێ بە ریشەی بنەماڵــەیانــدا بڕواتــە خــوارێ، حەمەش هەر ئەو تووشی ئەو چەرمەسەرییەی کردووە.

ئەحمەد بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ تۆ چوزانی؟

ـ با، خۆم گوێم لێبوو، بە ئاغای گوت، بۆیە بە تۆم گــوت حەمــە مەهێنــە، دەمــزانی دڵی بە کەوێوەیە، بڵێی ئەو بەستەزمانە چی بە سەر بێنن، لە بەیانییەوە هیچی نەخواردووە، دەتوانی شێوی بۆ بەری؟

ئەحمەد بە دوو دڵییەوە گوتی:

ـ بڵێی پێمان نەزانن؟

کێ پێمان دەزانێ؟ قەولم بە خانمداوە، دەبێ بۆی ببەی! کەس نییە، ئاغا و عەتا تــازە نایەنە خوارێ، رەسووڵ رۆیوەتەوە، خانم خۆی دەپاڕاوە شێوی بە ئەحمەد دا بــۆ بنێــرە، دەی کێ هەیە؟ هەر حەسەن مەیتەرە، ئەویش بە جۆرێ بە زمان بیگرە.

ئەحمەد پێکەنی و گوتی:
لە حەسەن مەترسێ، ئەو دەمەی لە تەویلە لە حەمەیان دەدا، مـن لای ئـەو، لـە میانـە بووم، نازانی چۆنی بۆ دەگریا! چت بۆ داناوە؟ برۆ بۆی بێنە، من دەچمە لای حەسـەن و پێی دەڵێم بۆی بەرێ. دڵنیام دەیبا، قەت لە قسەی من دەرناچێ.
ئەحمەد چۆتە بەر دەلاقەی میانە، سەبرێ بانگی حەسەن دەکـا:ــ کـا حەسـەن! کـا حەسەن!
حەسەن مەیتەر سەری لە دەلاقەوە دەرهێناوە:
ـ بەڵێ بەڵێ، کا ئەحمەد! تۆی؟
ـ نەخەوتووی؟
ـ نا، کارت بوو؟
ـ ئا، دەرگاکەم بۆ بکەوە، لێرەوە نابێ. حەسـەن و ئەحمـەد لـە نێـو داڵانی تەویلـە وێستاون، ئەحمەد گوتی:
ـ نازدار شێوی بۆ حەمە داناوە! دەتوانی بیدەیتێ؟ من دەیهێنم، تۆش پیـاوەتی بکـەو بیدەیە، جا خۆت چۆن دەزانی وا بکە، دەوێری؟
حەسەن مەیتەر هێندێ خۆی هەڵمساند و بە توورەییەوە گوتی:
ـ بۆ من لە تۆ و نازدار کەمترم؟ ئێوە دەوێرن بیهێنن، من ناوێرم بیدەمێ؟ برۆ بیهێنە، برۆ، ئەوە دەچمە بەر دەلاقەکە، هێنات، بانگم مەکە، سەبرێ بیدە دەستم.
ئەحمەد نان و چێشتی لە نازدار وەرگرتووە، لە دەلاقـەوە دای بـە حەسـەن و خـۆی گەڕاوە.
تەویلە تاریک تاریکە، حەسەن مەیتەر بە بەڵەدی چۆتە لای حەمە، بە ئەسپایی گوتی:
ـ کاکە حەمە! ئەی کوێر بم، خـودا غـەزەبتان لـێ گـرێ زاڵـم، راوەسـتە، ئێـستا دەتکەمەوە!
حەمە بەسەرسوڕمانەوە گوتی:
ـ تۆ کێی؟
حەسەن دەست بە لەشی حەمەدا دەگێڕێ، بۆ گرێی گوریسەکە دەگەڕێ، سەری بردە بن گوێ و گوتی:

ـ من حەسەنم، حەسەن مەیتەر، نانم بۆ هێناوی! ئەحمەد و نازدار بۆیان ناردووی، ئێستا دەتکەمەوە.

حەمە بەزەیی بە خۆیدا دێ، نیگەرانی ئەوانە، بە ترسەوە گوتی:

ـ لە من گەڕێن خۆتان بە ئاوری منەوە مەسووتێنن.

حەسەن بە تووڕەیەکی دلسۆزانەوە گوتی:

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ دەترسێی؟

حەمە پێکەنینێکی تاڵی هاتێ گوتی:

ـ حەیە حەی، ترسی چی؟ تازە لە ترس دەرچووە، خەمی ئێوەمە، دەزانی پێتان بزانن چتان بە سەر دێنن؟

حەسەن سەری گوریسی دیوەتەوە، دەستی بە کردنەوە کردووە، بە دەم گرێکردنەوە گوتی:

ـ ئەرخەیان بە، کەس نییە، چەتوون رەسووڵە، ئەویش رۆیوەتەوە، نازدار و ئەحمەد لە حەوشەن، شتێک ببێ، خەبەر دەدەن، دلنیا بە کەس نایە، ئاغا و کوێخای شەو خۆمانین.

گوریس شلبۆتەوە، پشتی سڕ و برینداری حەمە لە کۆڵەکە جیا بۆوە و بارسایی لەشی کەوتۆتە سەرپێی شەق شەق کراوی، پێ سڕە، لەش کوتراو و بێ هێزە، وزە نەماوە، ئەژنۆ توانای راوەستانی نییە، نووشتاوە حەمە کەوتە ئەرز.

حەسەن هەڵیساندەوە، چۆتە ژێر باڵی و وردە وردە بەرەو میانەکەی دەبا، چوونەتە ژووری.

میانە بە سێ بەدەنە دیوار لە تەویلە جیا کراوەتەوە، لە هەر چوار لاوە دەلاقەی تێکراوە و هەرزاڵێکی بە دار تێدا هەڵبەسراوە، چرا فتیلەیەک لە سەر هەرزاڵەکە، لە نێو دووکەڵی خۆیدا ونە، بە حاڵ زەردایی خستۆتە میانەوە، جێی مەیتەرە.

حەسەن مەیتەر حەمەی لە سەر هەرزاڵ داناوە و وەک خانە خوێیەکی باش میوان نەواز، خانە خوێی دەکا، بە دڵنیاییەوە گوتی:

ـ چێشتەکە فرووجاوە، دەست پوختی نازدارە، دەستاوی خۆش و بە لەززەتە، بە ئەرخەیانی نانەکەت بخۆ، تا تاو وبان گەرم نەکا، کەس نایەتە تەویلە، نانەکەت خوارد، لە سەر ئەو جێیەی من بنوو تا بەیانی، بەیانی بەریدا خۆم دەتبەمەوە سەر جێی خۆت.

حەمە ئیشتیای هیچ نابا، ئیشی لەشی برسێتی لێ بڕیوە و برسایەتی لە بیر بردۆتـەوە، تەماشایەکی حەسەنی کرد و گوتی:

ـ برسیم نییە کا حەسەن، هیچم پێ ناخورێ.

حەسەن دلخۆشی دەداتەوە و غیرەتی وەبەردەدا، گوتی:

ـ کار لە پیاوان دەقەومێ، بەلا روو لە خوێری ناکا، نانەکەت بخۆ، وەللا دەیخۆی.

لایەک زۆر و لایەک تکا، حەسەن نـانی دەرخـوارددا حەمـە حـەجمانی نییـە، بـێ حەجمان ئەمشان و ئەوشان دەکا.

حەسەن بە دیارییەوە داماوە، بێ دەسەلاتانە گوتی:

ـ گیانت زۆر دیشێ؟

حەمە بە زەلیلیەوە دەلێ:

ـ دیشێ؟! کفتەی کوتراوە، بووە بە کەوکەمانە! دەرەلینگی هەلمالی، پووزی نیشانی حەسەن دەدا.

پێ و پووزە بووە بە خەریتە! شووشی هەستاوە، بە قەدپەنجەی دەست.

حەسەن مچورک بە لەشیدا دێ و بەندی دلی پێوە دەلەرزی، لـە دلـەوە خـۆی لۆمـە دەکا:

ـ من شـەریکی رەسـوول و ئاغـام! ئـەو دارانـە مـن هێنـام، چـاوە بچووکـەکانی هەلدەگولوفی، بە دلپڕیەوە گوتی:

ـ دەسەلات نییە، دەلێی چی؟ خودا قەهریان لێ بگرێ، ئـاخری خـودا تۆلـەی ئـەو هەموو زولمەیان لێ دەستێنێ، تۆلەی بزنی کۆلە لە شاخدار دەستێنێ، بلێی تۆلـە لـەوان نەستێنێ؟

حەسەن حەمەی لە سەر جێ راکێشاوە، ژانی لەشی ئوقرەی لێ بڕیوە و خۆ لـە سـەر هیچ لایەک ناگرێ، خەو و شەکەتی بە سەر ژاندا زالبوو و بارسایی کەوتە سەر پیلـووی چاوی.

بەیانییە، نزیکەو تاوکەوتنە. حەسەن مەیتەر حەمەی لە کۆلەکە بەستووە و چاوەڕێـی هاتنی ئاغا و نۆکەرە.

وەختا وەخت تەواوە، یەک شەو و رۆژە حەمە بە کۆلەکەوەیە، ئاغا دەستووری لـێ کردنەوەی داوە، رەسوولی نۆکەر، حەمەی لە کۆلەکە کردەوەتەوە.

نزیکەو قاوەڵتوونە، حەمە لە دەروازە چۆتە دەرێ و لارەوە لارەوە بـە لێـژی قـەڵادا دەڕواتە خوارێ.

عەدلە خانم لە بەر پەنجەرەوە تەماشای دەکا.

حەمە لە سەر چۆمە، ئاوڕ دەداتەوە، خانم هەر لەوێ وەستاوە، هەتا لـە چـاو ونـدەبێ، هەر چاوی لێیە، ڕۆژێ لە بەردانی حەمە تێپەڕیوە. حەسەن مەیتەر ئەحمەد فەڕاش بانـگ دەکا، حەسەن گوتی:

ــ ئەمانەتێکت دەدەمێ، تۆ خودا ڕایگرە!

ئەحمەد گوتی:

ــ چیە ئەو ئەمانەتە؟

حەسەن دەستیکرد بە گیرفانیدا، ئاوێنە و شووشە عەتر و ئەنگوستیلەیەک بوو.

ئەحمەد ئەمانەتی وەرگرت و بە دلپڕیەوە گوتی:

ــ دیاری حەمەیە بۆ کەوێ! خۆی گوتی لە شار بووم. ئەحمەد ئەمانەتی دا بە ئەمانەت دار، دیاری کەویی دا بە نازدار.

## ١١

ئەستیری بـەرکانی، کـانی‌تـوو گیراوەتـەوە و دار مالـە، وەکـو چـاوی بـێ دەسەلاتان زەلیوە.

ئاوپژنگی خواردۆتەوە و جۆگە خورەکەی مەندکردووە. جووتـێ مـراوی بـە جۆگەدا، تا بەردەمی کەوێ و مینا دێن و دەگەڕێنەوە.

دلی کەوێ وەک ئەستیرەکە کەیلە، پەشێو حال و خەیالاوی چاوی بـە دووی مراوییەوە وێلە! چاو یەکە و فرمێسک هەزار!

ـ لە خۆڕا دلتەنگی دەکەی، بـیری خـراپ دەکەیتـەوە، بـۆ دەیکـوژن، چـی کردووە؟ دێتەوە، بە خودا ئەمڕۆ سبەی سەرهەلدەدا.

کەوێ چاوی لە سەر مراوییەکانە، بێ ئەوەی چاو لە مینا کا، گوتی:

ـ مینا گیان! بە خۆم نییە، دلم خەبەری خراپ دەدا، دایمە چاوم دەفرێ! شەوانە خەوی هاشە و پاشە دەبینم! بە رۆژ دەستم بۆ کار ناچێ، هیچم پێ ناخورێ، بـاوەڕ بکە ئەو دنیایەم پێ تەنگـە! حـەز ناکـەم کـەس بمـدوێنێ، ئـەوە دوو رۆژە بـێ سەروشوێنە! دەلێی بەردە و کەوتۆتە گۆمەوە! بە خۆم نییە، دلـم تاقـەت ناهێنـێ، ناچار رووی خۆم هەلمالی و دوێنێ پەنام بردە بەر عەبە شێت و هەوالم پرسی!

مینا بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ جا عەبە بۆ؟!

کەوێ بە سیلەی چاوێ دەڕوانێتە مینا، گوتی:

ـ چوزانم! گوتم بەلکە ئەو هەوالێکی بزانێ.

ـ دەی؟ هیچت وەگیر کەوت؟

کەوێ بزەیەکی خەماوی خستە سەر لێو و گوتی:

ـ چەتیو نەبی، هەر ئەوەندە زمانم سووتا و گوتم عەبەگیان! هەوالێکی حەمە نازانی؟ ئەو شەل و شێتە بە دەنگێکی بەرز گوتی بۆ دادەگیان؟ حەمە چی تۆیە؟! هەر ئەوەم پێ کرا هەلێم! وەختا بوو ئابڕووم بەرێ!

مینا بە قسەکەی کەوێ پێدەکەنێ، بە دەم پێکەنینەوە سەر وەردەسووڕێنێ، لە پڕ پێکەنین لە گەروویدا تاسا! بە پەلە گوتی:

ـ چەتیو نەبی! زارا! هات! باسەکە بگۆڕە.

زارا لە دوورەوە وەیڕۆ وەیڕۆیەتی! گەیوەتە پێشێ، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ ئەیڕۆ ئەو خودا چاک بۆ نەکردووانە چیان بە ڕۆژی ئەو هەتیوە بەستەزمانە هێناوە! یا خودا گاور وای بە ڕۆژ نەیە.

مینا لە قسەکەی زارا گەیوە، مەتلەبی حەمەیە، چاوێکی لە کەوێ داگرت و بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ ئەیڕۆکێ خاد زارا؟

زارا بۆ ئەوەی حەمە لەبەرچاوی کەوێ سووک بکا، گوتی:

ـ ئەو حەمە هەتیوە بەستەزمانە! بە جارێ لە زەرافاتیان خستووە! لارەوە لارەوە، لە پشتی مالانەوە خۆی کێشا مالی پوورەگولە، مەعلووم نییە بمێنێ! مەپرسە پوورەگولە چ دەکا! پێش و پێش قەدەمی ئاغای دەرهێنا! لەقە لە با دەدا! خەلک هەموو تێرژاون! مال کەس نابا! ناوێرێ قسە بکا! بۆ ئێوە نەتانزانیوە؟!

مینا جوابی داوە و گوتی:

ـ نەوەللا، گوتم داخوا چ بووە! هیچ نییە! پوورەگولە هەر تاوێکە، وەک گڕالک گڕوپفێکە، حەمەش چاک دەبێ، کەس بە لێدان نەمردووە!

مینا دەستی دایە گۆزە و گوتی:

ـ کەوێ! ئەو گۆزانە بنێ سەر شانم، من دەڕۆم، تۆ نایێی؟

کەوێ ڕەنگە زەردەکەی گەشاوەتەوە، ڕوومەتە قوپیوەکانی سوور هەلگەڕانەوە و وەک کارگ هەلتۆقینەوە و باری لێوی تەڕی و سوورایيان تێکەوتەوە، چاوی وەگەشەگەش کەوت، بە پەلە و سەر لێشێواوانە گوتی: با با، دێم!

زارا زۆر حەریفە، بۆ ئەوەی دڵی کەویێ لە خۆ نەکا، گورجێ گۆزەکـانی لـێ هەڵێنا، کەویێ و مینا لە قووڵکی کانی وەسەرکەوتن.

زارا گورجێ گۆزە پڕ دەکا، دوا بە دوایان کەوتە ڕێ.

کەویێ و مینا گەیونەتە کۆلان، لە سەر پێچی کۆلان، کەویێ ئاوڕی داوە و بـە قینەوە گوتی:

ـ تۆ چاو! تۆ چاو! تەماشاکە! ئەو دێلە دەلالە چۆن کەوتۆتە پـەلـە! بـۆ قـسە دەگەڕێ، میناگیان! من دەڕۆم! با چاوم بە چاوی نەکەویتەوە، گورجێ خۆ بگەیننە ماڵی پوورەگوڵە و هەواڵێکی بزانە، چاوەڕێتم، ئاوڕ مەدەوە! با شک نەخا.

کەویێ و مینا بێ ئاوڕدانەوە لە یەک هەڵبڕان. مینا چۆتە حەوشە، زانی دایکی بۆ ماڵی حەمە چووە ، بە بۆنەی ئەوەوە، بە پەلە گۆزەی دانا و بەرەو ماڵی پوورە گوڵە وەڕێکەوت. ماڵ پڕە لە خەڵک، دەستەیەک دێ ودەسـتەیـەک دەڕوا. حەمـە بـە جێوبان، لە ژووروی ماڵەوە کەوتووە.

پوورەگوڵە لایەوە دانیشتوو و نیوەنمەکی بۆ دەگریتەوە. مام حەسەن و حاجی قدر و سۆفی مینە و مام ڕەسووڵ و کوێخاکەریم و فەیزە درێـژ و فەتاحـە کـوێر ئەمشان و ئەوشانییەوە دانیشتوون.

لای خواروی ماڵەکە تاریکە، ژنان وا چوونەتە باڵ یەک کەس ناناسـرێتەوە! ئەوانەی کە دیارن، پوورە خەرامان و حاجی ژن و ئەمان بێوە ژن و کوێخـا ژن و فاتمی خێزانی فەیزە درێژ و زارای خێزانی فەتاحە کوێرە.

هەموو دەستەوئەژنۆ دانیشتوون. کەس هیچ نالێ! تـەنیا پچـەپچـی ژنـان دێ، ئەویش کەس لێیان حاڵی نابێ! دەڵێی پلوورە هەنگە! هەر وزەوزی دێ!

پوورەگوڵە وەدیارە لە جنێو ماندووبووە، دیسان هـەڵـە سـوونی هێنـاوە، بـە دەنگێکی بەرز دوو سێ جنێوێ دا و بێ دەنگ بۆوە.

تارمایی مینا ڕووناکی لە دیو بڕیوە! ژنان ئاوڕ دەدەنەوە، حاجی ژن چاوی بـە مینا دەکەوێ، بەسەرسوڕمانەوە، بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ ئەیڕۆ مینا! ئەوە ئێرە بۆ هاتووی؟!

مینا لە مێژە جوابی ئەو پرسیارەی دیوەتەوە، بە شەرمەوە، گوتی:

ـ شیرەکەی ئەمڕۆ هەوێن کەم، یان بیکەم بە پەنیر؟

پووره‌گوڵه نه‌یهێشت حاجی ژن جوابی مینا بداته‌وه، له لای سه‌ره‌وه گوڕاندی و گوتی:

ـ بۆچی بۆ هاتووه؟ بۆ جیرانه‌تی نازانن! خۆ هه‌موو رۆژێ ئاوام به سه‌ر نایه، خۆ به ناشوکری نه‌بێ، من که‌سم نییه خانه خوێی له‌و عاله‌مه بکا، خۆم ئه‌وه به دیار ئه‌و مه‌یته‌وه‌م، نانا کچم مه‌ڕۆ.

حاجی ژن سه‌ری داخستووه و قسه له قسه‌ی پووره‌گوڵه‌دا ناکا.

مینا خڕوخۆڵ، توندوتۆڵ، به ژن رێکوپێک، سه‌وزه و ده‌موچاو خر و رووم‌ه‌ت پان و ته‌وێڵ ته‌خت و ره‌زا سووکه، گورجوگۆڵ که‌وش جووت ده‌کا و ئاو دێنێ و به ده‌م میوانی پووره‌گوڵه‌وه هه‌ڵده‌سووڕێ.

دایکی چاوی لێ ناترووکێنێ، له دڵه‌وه ده‌ڵێ:

ـ دایکت به قوربانت بێ میناگیان، بێ چاوێنی بی! شکور ده‌ڵێی مینای بێ گه‌رده!

خۆزگه به به‌ختی چاک ده‌بووی، ئه‌حمه‌دیش کوڕی چاکه، ئیشائه‌ڵلا خودا قه‌ڵه‌می لێده‌دا، ته‌ماشایه‌کی مام حه‌سه‌ن ده‌کا و چاو داده‌خاته‌وه.

مام حه‌سه‌ن قه‌ننه‌که‌ی داگرتۆته‌وه، دایده‌گیرسێنێ، یه‌ک دوو مژی لێدا، روویکرده حه‌مه و گوتی:

حه‌مه! رۆڵه له‌سه‌رچی لێیاندای، ئه‌و لێدانه‌ی له تۆیان داوه، ده‌بێ کارێکی زۆر خراپت کردبێ!

حه‌مه به دوو سێ وچان روویکرده مام حه‌سه‌ن و گوتی:

ـ ئێوه جیران و هاوماڵی منن، من شوانی ئێوه‌م، کاری بیلعه‌تم کردبێ ده‌بێ ئێوه بزانن، من چم کردووه مامه‌گیان؟ ده‌یگوت سه‌گت له عه‌تا کردووه! به خودا رۆحم ئاگای لێ نه‌بووه، من بۆ ده‌بێ سه‌گ له‌و که‌م؟

مام حه‌سه‌ن ته‌ماشایه‌کی خه‌ڵکه‌که ده‌کا و سه‌ر راده‌وه‌شێنێ!

فه‌یزه درێژ هه‌ڵیدایه و گوتی:

ـ وا هه‌ر نییه! ده‌بێ شتێکیان بیستبێ، داخوا چت گوتووه و بیستوویانه‌ته‌وه! له خۆڕا له‌که‌س ناده‌ن!

حاجی قادر به‌و قسانه‌ی فه‌یزه قه‌ڵس بووه، هاته جواب و گوتی:

ـ هەلبەت تۆ دەزانی کا فەیزە! بۆ نالێی لەسەرچی بووە؟

فەیزە ملی بە خوزدا برد و سەری بەرداوە و لە بنەوە گوتی:

ـ من نازانم، دەڵێم حەمە جەحێڵە و کەللە پڕە، نەکا قسەی کردبێ، ئاغاوات بۆ چەنە بە چەنە و کەلەوەکێشی نابن، لە قەدیمەوە گوتوویانە، گەورەی وڵات خودای سەر ئەرزە! ئاغا گەورەی ئێمەیە، ئێمە دەبێ مل کەچ بین!

پوورەگوڵە چاوی بووە بە کەشکە فەریکە و خەریکە لە کالان دەرپەڕێ، لە فەیزە بە چۆکا هات و گوتی:

ـ ئەوە دەڵێی چی فەیزە؟ گەورە وایە؟ ئەی بە گەورەی گڵ بن! خودا گەورەی وا بە کەس نەدا، بە خوا حەیف ماڵی خۆمە، دەنا جوابی چاکم دەدایتەوە، جا تۆ خودا ئەوە قسەیە پیاوەکان؟

هەموو سەریان داخستووە، کوێخاکەریم گوتی:

ـ بەڵێ، ئاغا گەورەیە، گەورە دەبێ عادڵ بێ و چاوی لە سەر بچووکی خۆی بێ، قەیناکە پوورێ گیان، کا فەیزە وەڵلا مەنزووری ئەوە نییە، هەر وا دەزانێ!

حەمە بە چاوێکی پڕ لە قینەوە تەماشایەکی فەیزە دەکا و روو وەردەسووڕێنێ.

پوورەگوڵە لەو قسانەی فەیزە زۆر قەڵسە، دیسان دەستی پێکردەوە:

ـ حەمە خوێنی بابی بە لای ئەوانەوەیە، کەچی ئەوان تۆڵە لەو دەکەنەوە! ئاخر پیاوی وەک فەیزەمان تێدایە بۆیە هەر رۆژێ بەلایەکمان بە سەر دێنن، هەر چاکە، بەس نییە سوارمان نابن! جا دەڵێن گوڵەی مام کەریم شێتە و قسە حەوا دەدا! چۆن قسە نەکەم؟ ئاخر حەمە چی کردووە؟ ژنی لێ هەڵگرتوون؟ پیاوی لێ کوشتوون؟ ملکی لێ داگیرکردوون؟ ئاخر چی کردووە، ها؟

سۆفی مینە بوو بە تکاکار و تکا بۆ فەیزە دەکا، گوتی:

ـ قەیناکە پوورێگیان، تۆ گەورەی هەمووومانی، کا فەیزەش حەز بەوە ناکا، ئەویش دەزانێ ئەوە زوڵمە، بەڵام دەڵێی چی؟ دەستێ زۆر بیبڕێ، خوێنی نایە، هەموو لە تۆمان پێ ناخۆشترە، دەسەڵات نییە.

پوورەگوڵە هاتۆتەوە سەر خۆ. میوان یەک یەک و دوو دوو چۆڵیان کردووە، مینا لە سەر ئیزنی حاجی و حاجی ژن ماوەتەوە، ژنان داویانەتە راوی قسە و هێشتا

لەوێ ماون، لە پڕ بزن بە بارە باڕ ڕژانە حەوشە، مەڕ هاتەوە، ژنـان کەوتوونەتـە پەلە و تابەتا کەوشی یەکتر لە پێدەکەن.

عەبە زانیویە حەمە هاتۆتەوە، لە حەوشەوە بانگی دەکا.

پوورەگوڵە دەرپەڕی و لە حەوشە پێشی بە عەبە گرت.

عەبە بە پەشۆکاوییەوە هاتۆتە ژوورێ، عەبەساوە! ئەحمەدی مام حەسەن دوا بـە دوای عەبە هاتە ژووری، هەر دوو چوونە لای حەمە.

ئەحمەد گوتی:

ـ دەزانم بۆ وا دەکەن! دەبێ بەوداخەوە بتلێنەوە، دیق بێ لە سـەر دڵـیان، بـە خودا مەگەر بمرم.

حەمە چاوی خەجالەتی بەرداوەتەوە و ئارەقەی شەرم دەڕێژێ.

عەبە سەر لەو قسانەی ئەحمەد دەرناهێنێ، هـەر تەقـەی گـوێی دێ! بـە سـەر سوڕمانەوە گوتی:

ـ من هیچ حالی ناوم! چەس؟ بۆ چ لێیان دای؟ چت کردیە؟ خـۆ ئـەو بـاوک گەماڵە وتی ئاغا کاری هەس! کارەکە ئەمە بوو؟ ئەی نەحلەت لە باوکی.

مینا لە دەرگاوە هاتە ژووری، ئەحمەد یەک بە خۆی راچەنی! مینا چـاوی بـە ئەحمەد کەوتووە! سوور هەڵگەراوە، هەر دوو سوور بوونەتەوە، مینا شەرم لە حەمە دەکا، بە بیانووی کارەوە چووە دەرێ.

عەبە تێکچڕژاوە، نێو چاوانی وێکهێناوە و دۆشی دابردووە.

حەمە بۆ ئەوەی لە بیری بباتەوە، دەستی عەبەی گرت و گوتی:

ـ هیچ نییە! لەگەڵ شوانییەکەت چۆنی؟ سەگەکان بە شەڕ نەهاتن؟

عەبە گوتی:

ـ جا بە کار چی تێ، توویان کەلەلا ختییە، چاو گەماڵ بێتە دەشتەو، شەڕ بـۆ ئەوانە خاسە وایانکردیە بە توو، شەڕ ناکەن، ئەوان فرە ماقوولن، کاکە حەمەدم هەر لە تەکا بوو، ئەویش ئەزانێ.

ئەحمەد بە جەفەنگەوە گوتی:

ـ کاکە عەبە زۆر شوانی چاکە، قەولم داوەتێ گەلازی بۆ بستێنم، دەیدەیتێ؟

ـ حەمە تەماشایەکی عەبەی کرد و گوتی:

ـ دەیدەمێ، ئاخری گەلاز سەگی ئەو دەبێ.

ئەحمەد و عەبە ڕۆیون، پوورە گولە لە حەوشە بزن دەدۆشێ. مینـا بەدەرفـەتی دەزانێ، چۆتە لای حەمە و ئەحوال پرسی دەکا، گوتی:

ـ کەوێ منی ناردووە، ئەحوالپرسی لێ دەکردی. کاکە حەمە! تـۆ یـەکێکـی وەک کاکم، ئەگەر قسە و باسێکت هەیە بۆ کەوێ، بە منی بڵێ، دڵنیابە، مـن بـە خوشکی خۆت بزانە، کەوێ دەیگوت بەو نیو نیشانە کە لە سەربان پـێم گوتـووە هەر کارێکت بوو بە مینا بڵێ، ئەگەر بەوەش باوەڕ ناکـەی، ئـەو شـەوە بـوو وا بەیانی دەچووی بۆ شار.

حەمە یەک بە خۆی دڵی داخورپا! دیارییەکانی بیرکەوتەوە، بە پەلـە دەسـتی کرد بە گیرفانیدا، دەست لە گیرفاندا وشکبووە! تاس بە سەریدا دێ! دەمی بە تـاق ماوە و چاوی بە مۆلەق دەڕوانێتە مینا!

مینا سەری سوڕماوە! حەمە بۆ چی وا چاوی لێدەکا! دەنگی دەدا، گوتی:

ـ کاکە حەمە! چ بووە؟!

حەمە گوتی:

ـ کوا! ئەوە کوا! دیاریم بۆ کڕیبوو! عەتر و ئەنگوستیلە و ئاوێنە بوو!

دەنگی پوورەگولە مینای تاراند و لە حەمەی دوورخستەوە.

# ١٢

دوندی کێوە بەرداوێلە هەتاوی کردووە بە دوو لەتەوە و چەشنی دەمە کلاوەی زێڕ لە سەری ناوە.

لارە سێبەری کێو وەکو تالانچی پەنجەی رەشی بە سەر کانی توودا کێشاوە، دڵی تەنگی کەویێ رێک دەگوشێ.

مەڕ شەو بە کێوە، یەکەم شەوە، تازە مەڕ لە دێ دەرچووە. کەویێ دڵی پڕە لە خەم، بە دوو گۆزەوە گەیوەتە دەرگایماڵی حاجی قادر.

مینا لە حەوشەوە کەویی دیوە، بانگی کرد و گوتی:

دەچی بۆ کانی؟ مەڕۆ منیش دێم. کەویی خەمبار هاتەبەرچاو، مینا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ نێو چاوانت کرێوەی لێ دەبارێ! چیە دیسان؟

کەویێ بزەیەکی ساردی هاتێ، گوتی:

ـ تۆ بی چ دەکەی؟ خۆت لە جێی من دانێ و وەبزانە خالیشم شوانە و شەوێ بە تەنیا لەو کێووشاخەیە، ئەو زاڵمانەش قینیان لێیەتی، ئەو دەم خەمبار نەدەبووی؟ چم پێ دەڵێی بیلێ، وەختە لە تاوان دڵم بتۆقێ، دڵم بە قەت دڵە چۆلەکەیەکی ماوە!

مینا بۆ دڵخۆشی کەویێ گوتی:

ـ زۆر منداڵانە بیر دەکەیتەوە! شەوورۆژ فەرقی چیە؟ بیانەوێ کارێ بکەن، بۆ بە رۆژ نایکەن؟ لە کێ دەترسێن؟ تۆ لە خۆڕا دڵتەنگی، دەزانم دڵتەنگی ئەوەی شەوانە

ـتوانێ بتبینێ! بلە رۆژیش رێ نییە! خەم مەخۆ، سوار و پیادە کـەیفیان لێبـێ دەسـت و مشتاق دەکەن، دەرفەت دەبێ، خەمی ئەوت نەبێ.

کەوێ بەو قسانەی مینا وەپێکەنین دێ و سرووری کەوتە دڵی.

ئێوارەیە و سەرکانی جەنجاڵە، ریزە گۆزە لە بەر پلوسک ریزکراوە، نـۆرەیـە، هـەر کەس بە نۆرەی خۆی گۆزەیان پڕکردووە، نۆرەی کەوێ و مینا هات، گۆزەیان پڕ کرد و بە پەلە گەڕانەوە.

قسە و رازی دڵ بێ پسانەوەیە. لە دەرکی ماڵی حاجی گۆزەیان داناوە و سـرتەیانـە. تەقەیەک قسەیان پێ لەنگ دەکا! هەر دوو گوێ قۆلاخ بوون! تەقەیەکی دیکە!! یەکی دی! تەقە بوو بە دەسرێژ! رێژنە بارانی گوللەیە!

کەوێ و مینا عەبەساون! رووە و کێوە بەرداویلە دەمیان بە تاق ماوە! زمان لە گـەڕان کەوتووە! رەنگ لە روو پەڕیوە، تەماشای یەک دەکەن، چاویان لە یەک دەپرسێ.

ـ ئەوە چ باسە؟!

بریو بریو کەوتۆتە نێو دێ، خەڵک رژاونەتە سەربان، دووربەدوور لەگەڵ یەک قـسە دەکەن، لە یەکتر دەپرسن:

ـ ئەوە چیە؟! لە دۆڵی دزانەوە تەقە دێ!

ـ رەنگە شەڕی چەتە و ئەمنییە بێ!

ـ چەتە بێ چ بکەین؟

ـ پێم وا نییە چەتە بێ، رەنگە قاچاخچی و ئەمنییە بن.

دەوڵەمەند وە دلە خورپە کەوتوون، نەدار کلاوی لار داناوە و شا بە جووتێر نازانێ!

بێ دڵەڕاوکێ و ئەرخەیانە.

هەر کەس لە بیری شتێک دایە، کەوێ لە بیری حەمە! نۆبەتێ هـەڵـی دەچوقێنـێ! و ددانی بە ددانەوە بەند نابێ! بەرۆکی لە چنگ نـاوە هـەڵـی دەگولـۆفێ، بـە گریانـەوە بەرۆکی مینای گرت و گوتی:

ـ حەمە! مینا گیان حەمە! حەمەیان کوشت!

مینا بە تووڕەییەوە گوڕاندی، گوتی:

ـ بۆ ئەوەندە دەم رەشی کچەتیوە سەگە؟ ئاخری سەری دەخۆی! دایمەی خودا بـۆی دەقرێنی! حەمەی چی لە خۆڕا؟ ئەو مەڕی برد بۆ هەزارئەشکەوت، من بـە چـاوی خـۆم

دیم، دەڵێن لە بەغدا تەقەیە، ئەم لێرەوە دەڵێ حەمە! بۆ ئەوەندە ترسنۆکی؟ خۆ تۆ منداڵ نی.

کەوێ بەو قسانەی مینا رووناکی کەوتەوە دڵی و ئۆقرەی گرت.

پوورەگوڵە کردوویەتە سەربان، بێ فەزیحەت بە خەڵک دەڵێ.

ـ هۆ هۆ خوێڕیە پیاوان! ئەوە بۆ وەک دێڵی کرمێ خۆتان کردووە بە ژێر کراسی ژنەکانتان دا فزەتان لێوە نایە؟! ئینشاللا ژنەکانتان داگیر دەکەن! ئەوانیش داگیرکەن ئێوە هیچ ناڵێن! کلاوەکانتانیان بە حیزی ناسیوە، ئەوە بۆ وەدەر ناکەون! بزانن ئەو هەتیوە چی بە سەر هاتووە، ئاخر بە لای ناخێری ئەو شوانی ئێوەیە، دنیا پڕە لە دز و درۆزن، نەکا مەڕەکەی لێ بڕ دەن!

مقۆ مقۆ کەوتۆتە نێو خەڵک، پوورەگوڵە دڵیانی وەقرت و فرت خستووە، سێ کوڕە جەحێلە لە دێ وەدەر کەوتن، بەرەو هەزارئەشکەوت دەڕۆن.

تەنگی نوێژی شێوانە، مەڕ لە دێ کۆنە. حەمە تێر و کەپەنکی لە پەچەخڕەی پشتی دێ کۆن داناوە و زاڵم بە لایەوە کەوتووە.

مەڕ بەدەم لەوەڕەوە بەرەو پەچە بۆتەوە. ئەو تەقە تفەنگەی ئێوارە حەمەی نیگەران و چەواشە کردووە، بە دوودڵییەوە مەڕی بردە پەچە.

یەکەم شەوە، مەڕ نامۆیە، پەچە ناگرێ، شوانە بەدەوری مەڕدا هەڵدەسووڕێ، مێگەلی کردووە بە قوڵەی هێلکە و بە پەچەدا دەیانگێڕێ. پەینە مردووی پەچە بە سمی مەڕ لێک درا، بۆن بڵاو بۆتەوە، مێگەل وێستانەوە و ئۆقرەیان گرت، حەمە چووە لای کەلوپەلەکەی، ئاور دەکاتەوە.

گڕ و شەوقی ئاور بەرز بۆتەوە. حەمە نانی لە توربێن دەرهێناوە، ورتە ورت لە نێو شیوەوە دێ! سەگەل گوێیان تیژ کردووە، دەمڕێنن، بەدەم وەڕینەوە، سەرە و خوار هێرشیان برد.

حەمە لە بەر شەوقی ئاور وەشەوارە کەوتووە، دەستی داوەتە گۆچان و بە دووی سەگەلدا ڕۆیشت.

سەگەل گەیونەتە نێو شیو، بێ دەنگ، بەرەو دوا بوونەوە! تارمایی سێ کەس بەرەو ژوور دێنە سەرێ! حەمە دەنگیان دەدا:

ـ کوڕە کێن؟ بەو شەوە لە چ دەگەڕێن؟

یەکیان جوابی داوە:

ـ خۆمانین کاکە حەمە! دەنگی ئەحمەدی مام حەسەنە!

سێ کەس بە هەناسکە هەناسک لە لێژ وەسەرکەوتن. ئەحمەد و عەلی حاجی قادر و کەریمی سۆفی مینەن، ماندوونەبینیان لە حەمە کرد.

حەمە جوابی دانەوە، گوتی:

ـ ئەوە بەو شەوە یانی چی؟ خێرە؟

ئەحمەد بە پشوو سوارییەوە گوتی:

ـ جارێ لێمان گەڕێ، زۆر ماندووین، هێندێ ئاومان دەیە جا جوابت دەدەینەوە، ئەو تەقە تفەنگەت بیست؟

حەمە مەتارەی لە تێر دەرهێناوە، ئاوی بۆ لە جامە ڕەش کردوون، جامی‌دا بە دەستیانەوە، گوتی:

ـ ئەوەندە دەزانم لە دۆڵی دزانەوە بوو، ئێوە چی؟ هیچی لێدەزانن؟

عەلی و ئەحمەد ئاویان خواردۆتەوە، کەریم جامە ئاوی بە سەرەوە ناوە، ئەحمەد دەستێ بە دەمیدا دێنێ و ئاوی سمێلی سڕی، گوتی:

ـ ئێمەش بە قەت تۆی لێ حالین، خودا ئەو پوورەت لێ بستێنێ! ئەو دێیەی ناوە بە سەرەوە! دوو هەزار جنێوی بەو عالەمە داوە! مەپرسە چی کرد!

حەمە بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ پوورەگوڵە هەر بەو تووڕەیی و هەڵە هەڵەوە بووە بە پووری هەموو کەس، هەر بەوەوە جوانە! باشە بۆ؟

هەموویان پێکەنین، ئەحمەد گوتی:

ـ بۆ تۆ نایناسی؟ دەیگوت ئەو هەتیوە بەو شەوە لەو چۆلگە بە تەنیایە، بۆ ناچن هەواڵێکی بزانن، ئەو ئێمەی بەو شەوە ناردووە، خۆ لای تۆ هیچ نەبووە؟ خۆ هیچت بە سەر نەهاتووە؟

حەمە هەستاوەتە سەر پێ و خۆ نیشاندەدا، گوتی:

ـ ئەوەم لە بەر چاوتان! هیچم لێهاتووە؟! دیسانەوە دایانەوە لە قاقای پێکەنین.

ئەحمەد و عەلی و کەریم رۆیونەتەوە، حەمـە بەشـە نـانی بـەشـداری داوە، شـێوی کردووە و بە لای ئاورەوە چۆتە نێو قاپووت، خـۆی گولۆلـە کـردووە، دەسـبێنی لـە قۆلدایە.

گەڕانی بێ وچانی ئەو یاڵ و ئەویاڵ بە دووی مەڕەوە حەمەی شـەکەت کـردووە. چاوی گەرمی خەوە.

سەگ لە سێ لاوە، بە وەڕینەوە هوروژمیان بردە گابـەردی ژوور مـەڕەوە! سـەگ زمانی گرتووە! سەگی بنیادەمە!

حەمە کەپەنکی لە سەر خۆی فڕێدا و دەست بە گۆچان بە دووی سـەگـەلـدا دەڕوا. هەیتی سەگ دەدا، سەگ دەنگی خاوەنی بیستووە، هێرشیان بردە گا بەرد.

لە بن گابەردەوە کەسێ هاوار دەکا:

ـ شوانە! مەهێڵە! ئەو سەگانە دوورخەوە!

حەمە گوڕاندی و گوتی:

ـ تۆ کێی؟ بەو شەوە لێرە چ دەکەی؟

کابرا گوتی:

ـ ڕێبوارم! نابەڵەدم، ڕێم لێ گۆڕاوە! ئەو سەگانە دوورخەوە، پەنام بۆ تۆ هێناوە. حەمە دەستی داوەتە بەرد، سەگەل دوور خاتەوە، سەگ دوور کەوتوونەوە، حەمە پێ‌پـێ، دوو دڵ چۆتە پێشێ، دەنگی دەدا، گوتی:

ـ تۆ کێی؟! بۆ نایێتە دەرێ؟ خۆ ئاشکراکە! وەرە دەرێ بزانم کێی.

تارماییەک لە بن گابەردەوە هەستا و کەوتەوە! دیسان هەستاوە، هەنگـاوێ هـات و کەوتەوە! دەناڵێنێ! لە ناڵەی، سەگەل وە وەڕین کەوتنەوە.

حەمە سەگ بێ دەنگ دەکاتەوە، چۆتە پێشێ، دەنگی دەداتەوە:

ـ بۆ خۆ ئاشکرا ناکەی، بۆ وا دەکەی؟ نەخۆشی؟ چت دەوێ.

کابرا بە ناڵەوە گوتی:

ـ بریندارم! یارمەتیم بدە! فریام کەوە، مەترسێ، وەرە پێشێ.

حەمە چۆتە پێشێ، لە دوور هەنگاوێ پاڵی داوە بە گابەردەکەوە، بێدەنگ وەسـتاوە! دەڵێی کەڕولالە! ترساوە!

بریندار دەنگی دەداتەوە، دەزانێ ترساوە، غیرەتی وەبەر دەدا، پرسیاری لێدەکا: ــ شوانی کام دێی؟ ناوت چیە؟ تەنیای؟

حەمە زمانی شکاوە! قسەی لە بیر چۆتەوە! لە جێی خۆ وشکبووە و ناوی خۆی لە بیر نەماوە! عەبەساوە!

بریندار لەسەرەخۆ دەیدوێنێ، گوتی:

ــ دێیەکەتان لێرەوە دوورە؟ ملکی کێیە؟ بۆ هیچ نالێی؟ ترساوی؟ مالـتە خـۆ تـۆ پیاوی! پەنام بۆ تۆ هێناوە، غیرەتت بێ، منیش وەک تۆ بەشەرم، خـۆ نـاتخۆم! مەترسـێ چەتە و مال خۆری کەس نیم، دەربەدەر و زولم لێکراوم.

حەمە وردە وردە وەهۆش دێتەوە، بیر دەکاتەوە، تەقەکـەی ئێـوارەی هاتـەوە بـیر! گوتی:

ــ لەو تەقەیەی ئێوارەدا پێکراوی؟

بریندار بە بێ حالییەوە گوتی:

ــ ئەرێ، حالم زۆر خراپە، زمانم وشکبووە، خوێنم زۆر لەبەررۆیوە، زوو فریام کەوە، لە دوور ئاورەکەی تۆم دی، هیچ کوێ شک نابەم، پەنام بۆ تۆ هێناوە.

حەمە غیرەتی بزووت، ورەی بەرز بووە، هێز و توانای بە خۆی دا، باوی لاقی خۆشە، پڕیدایە و برینداری لە ئەرز هەستاند، چۆتە ژێر بالی و بەرەو ئاوری دامرکاوی دەیبا.

خۆلەکەوە سکلی دامرکاندووە، حەمە بە نـووکی گۆچـان تێکـی وەردا، پـووش و پەلاشی وەسەر دەخا، فووی لێدەکا، گڕ وەسەرکەوت، شێوە و قەلافەتی چەکدار لە بـەر شەوق ئاشکرا بوو.

بریندار تابشی وێستانی نییە، خۆ بە پێوە ناگرێ. حەمە بە وردی سـەرنجی دەدا، تێـی راماوە!

پیاوێکی بە دیمەن و شێوەدارە، تەمەنی سی و نۆ، چل سالە، دەسـتە پیـاوێکی تێـک سمڕاوە، چاو و برۆ رەش و سمێل قەترانییە. دەسـتێ جلـی بـۆری لـە بەردایـە، بەرگـە بۆرەکانی لەبەر شەوقی ئاورەکە پەلە پەلـە رەش دەنوێنـێ، شـلکەی رانی راسـتی بـە پشتوێنەکەی توند جەڕاندوویە، باسـکی چـەپـی بـە جامانەکـەی بەسـتووە، دوو ریـز فیشەکدان، راست و چەپ بەسەر سینگیدا، هاتووە، دوو قەف بە دەوری نێو قەدیدا قـەفی

خواردۆتەوە، قەبزەی دەمانچە و مشتۆی خەنجەر لە ژێر فیشەکدانەوە پڕ بە مشت سەریان وەدەرهێناوە.

حەمە بە وردی سەرنجی پەڵەرەشی جلەکانی دەدا، شەڵاڵی خوێنە! چاوی بە خوێن دەکەوێ، تەزوو و مچورک بە لەشیدا دێ، بە دەم لەرزەوە گوتی:

ـ برینەکەت زۆرە؟ چەند گوللەت لێ کەوتووە؟

بریندار بە بێزارییەوە گوتی:

ـ دوو گوللە، ران و باسکی گرتووم، باسکم هیچ نییە! رانم کوڵەوارە، جێی کارییە. کارێکم بۆ بکە، کەسێ وات پێ شک نایە سەری لە برین و شتی وا دەرچێ؟ پوولی دەدەمێ! داوای هەرچی بکا، دەیدەمێ، باڵای غیرەتت! چاک بمەوە تۆڵەت بۆ دەکەمەوە.حەمە ماتبووە! پوورەگوڵەی لە بیرە، بەڵام هەرچی دەکا ناوێرێ، وەبیری هاتەوە کە هێشتا نازانێ کێیە و ناوی چییە؟ بۆ دەستی داوەتە چەک؟ لەگەڵ کێ بە شەڕ هاتووە؟ بە پەلە گوتی:

ـ تۆ کێی؟ ناوت چیە؟ لەگەڵ کێ بە شەڕ هاتووی؟ ئەگەر راستی بڵێی ئەوە بەراستی ئەوەی لە دەستم بێ دەیکەم.

بریندار گوتی:

ـ تۆ نەتگوت ئێرە ملکی کێیە، شوانی کام دێی، ناوت چیە؟

حەمە گوتی:

ـ من ناوم حەمەیە، شوانی کانی تووم ئێرە ملکی هەمزەبەگە، تۆ ناوت چیە؟

بریندار لە سەرەخۆ گوتی:

ـ من ناوم تاهیرە! خەڵکی ئێرانم، لەگەڵ دەوڵەت بەشەڕ هاتووم! ئەوانەی ئێوارێ برینداریان کردووم ئەمنییە بوون، ئێستاش هەر بە دوومەوەن، لەوبەری چۆمەوە خۆم لێ ونکردن لەوسەر شاخەوە ئاورەکەی تۆم بەدی کرد، هاتم، کوڕە وەزعم باش نییە، زوو وەفریام کەوە.

حەمە واق ماوە! باوەڕ ناکا تاهیر بێ! لە رووی هەڵنایە بڵێ تۆ ئەو نیت! تێداماوە! بریندار دەنگی دەداتەوە:

ـ کاکە حەمە! بۆ مات بووی؟ کارێ، چارەیەک، دەوام ناهێنم.

حەمە گوتی:

- نازانم بلێم چی؟! تۆ لە تاهیر ناچی!

بریندار بەدەم دەردەوە پێکەنی و گوتی:

- تۆ تاهیر دەناسی؟ دیوتە؟

حەمە بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

- نە! نە، نێو نیشانیان پێداوم، وەک دەڵێن ئەو گوللە نایبڕێ! گوللەبەندی هەیە! جگـە ـەوەش، دەڵێن زۆر کەلەگەت و بە خۆوەیە، نازانم بلێم چی؟

تاهیر ماتبووە! لە حەمە دەڕوانێ، پاشان گوتی:

- باشە، تاهیر نەبم یارمەتیم ناکەی؟ با تاهیر نەبم، خۆ ئینسان و بریـنـدارم، وا دیـارە ـزۆر دلڕەق و بێ بەزەییت!!

حەمە بە پەلە و سەرلێشێواوییەوە گوتی:

- بابا، بەرێوەللا، بە گەوج و لەوجەم نەزانی! زۆر لە مێژە دیـتنی تـاهیر بـە ئـاوات ـدەخوازم، بۆیە ئەوەندەی لە سەر دەڕۆم، دەنا هەر کـەس بی، ئـەوەی لـە دەسـتم بـێ، ـدەیکەم، تۆ خودا تۆ ئەوی؟!

تاهیر ئارەقی ڕێی سارد بۆتەوە، ئێشی برینی بڕستی لێ بـڕیوە، سـەرمایەتی، بـە دەم چەق و چۆوە گوتی:

- حەمە! بە حەزرەتی موحەممەد من تاهیرم، گوللەبەندەکـەم بـە رەفێقێکمـە، بـاوەڕ دەکەی؟

حەمە لە خۆشیان پەلاماری دا، لە سەر ئەرز هەڵیساندەوە، ماچی دەکا! کەپەنکەکـەی بۆ هێناوەتە بەر ئاورەکە، لە کەپەنکی پێچا.

تاهیر بە دەم نالەوە داوای ئاو دەکا. حەمە لە پوورەگوڵەی بیستووە برینداری گوللـە نابێ ئاوی بدرێتێ، گوتی:

- نا، نابێ تۆ ئاو بخۆی، بۆ تۆ خراپە. خۆ ڕاگرە، ئێستا حـەکیمت دێنمـە سـەر، خـۆ ڕاگر بە، ددان بگرە بە خۆدا.

تاهیر بێ ئۆقرە داوای ئاو دەکا، حەمە مەتارەکەی هێنا، دوو سێ دلۆپ دەکاتە سـەر لێوی، تاهیر لەسەرخۆ چوو.

حەمە وەک شێت بە دەوریدا هەڵدەسووڕێ. دەست لـە سـەر دڵـی دادەنـێ رەگـی دەستی گرتووە، رەگ وەک دڵی چۆلەکە لە نێو دەستیدا لێدەدا، حەمـە هـەسـتاوە، بـە

دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، دەست و پێی ونکـردووە! نازانـێ چ بکـا؟ مـەڕ و تـاهیری کەلەلا چۆن بە جێ بێلێ؟

لە پڕ عەبەی وەبیر هاتەوە! سەرەو خوار، بـەرەو دێ کـۆن هـەلات، هـەر دەڕوا و سەرنگرێ دەدا خۆ دەگرێتەوە.

عەبە گلی کەلاوایەکی گەورەی دەرداوە و دیوارە کۆنەکەی بە مۆرە پینە کـردووە. بە دووتیغە کردویە بە سێ دیو. لە دەرگاوە دەچێتــە ژووری، کادینــە، لـە کادینەکـەوە دەچێتە تەویلە و لەوێوە دەچێتە دیوەکەی خۆی.

حەمە لە پشت دەرگایە، بە قەفی گۆچان لەدەرگا دەدا، ماوەیەکە کە لێیــدەدا، عەبـە وەخەبەر نایە! لێی دەداتەوە و هەست رادەگرێ، جوابی نییە، لە پشتەوە دەچێتە سەربان و لە کولاوکەوە بانگی دەکا:

ـ عەبە! عەبەگیان! کاکە عەبە! عەبە شێت! ئەوە مردووی؟ ئەی خەوی مەرگت بـێ!

عەبە بە دەم خەوەوە شانە وشان دەکا، حەمە دیسان بانگی لێ دەکاتەوە:

ـ عەبە! عەبە شێت!

دیسان وەردەسوڕێ، بەدەم خەوەوە گوتی:

ـ ئم.

ـ دە هەستە، ئەوە مردووی؟ مالتە لە کەنگێوە لە دەرگا دەدەم و بانگــت دەکـەم! دە هەستە.

عەبە لێفە شڕەکەی لە سەر خۆی فڕێدا و راستەوە بوو، بە دەنگی گڕ و خەوالــووەوە گوتی:

ـ حەمە! ئەوە تووی نەحلەتی؟! چەس بەم نیمە شەوە؟ یا خوا خێر وێ.

ـ خێرە کاکە عەبەگیان، کارم پێتە، دەبێ یاریدەم دەی.

ـ تا ئێستا عەبە شێت بووم، ئێستا بوومەسە کاکە! چەس ئەو کارە وا بە من ئـەکرێ؟ ئادەی بێژە؟

ـ لێرەوە نابێ، وەرە دەرێ.

عەبە هێندێ پشت ملی هەلکڕاند و بە بۆک و نابۆک هەستایە سەرپێ گوتی:

ـ خاسە، تۆ بێ خوارەو، ئەوە من تێمە دەشتەو.

عەبە دەرگای کردۆتەوە، دەستی ناوە بەمبەروئەوبەری لاشیپانەوە حەمە لەو دیــوەوە وەستاوە. عەبە گوتی:

ــ ئەو کارە چەس وا بە عەبە شێت ئەکرێ؟ زووکە بێژە، نیمە گیان بووم!

ــ وا مەڵێ عەبەگیان! من تۆ بە دۆستی نزیکی خۆم دەزانم، خەڵک کەیفی خۆیانە، چ دەڵێن با بیڵێن، کەس لە تۆ دڵسۆزتر نابینم.

ــ دەی خاسە، بە گەوجم مەزانە گەوجە پیاو! زووکە بێژە.

ــ لەو تەقە تفەنگەی ئێوارەدا پیاوێ پێکراوە! ئەمنییە پێکاویانە، بــە برینــداری خــۆی گەیاندۆتە لای من، زۆر کوڵەوارە، فریای نەکەوین دەمرێ، وەرە بەڵکو هەوڵــێکی بــۆ بدەین.

عەبە مات و گێژ دەڕوانێتە بەر پێ، لەوە دەچێ بترسێ، بە دوو دڵییەوە گوتی:

ــ جا من چەم لە دەس تێ، خۆ حەکیم نیم! ئا تۆ خوا تۆ بێژە؟

حەمە باش لە زمانی دەزانێ؛ بێتو بڵێ نا، تازە هەر نایە، دەستی پێش دەخا، گوتی:

ئەو کابرایە دۆستی ئێمەیە، پەنای بۆ ئێمە هێناوە، بێتو وەفریای نەکەوین دەمرێ، ئەو بمرێ، تازە قەتت نادوێنم، جا گەلازیشت دەدەمێ! بە قەبری دایکم دەتــدەمێ، پــاییزێ شەرتم پەڕی، گەلاز سەگی تۆیە.

عەبە پێی لە دەرگا هێناوەتە دەرێ، لەوە دەچێ پێی خۆش بێ.

ــ چەتە و مەتە نەوێ! من خۆشم لە وانە نایە نەحلەتی.

حەمە بۆ دڵنیایی عەبە، گوتی:

نا! نا، دۆستی خۆمە! من دەیناسم، ناوی تاهیرە، دوژمنی ئاغا و ئەمنییەیە.

عەبە داهاتەوە، کەوشە شڕەکانی هەڵدەکێشێ، هەستاوە گوتی:

ــ من سازم با بڕۆین.

حەمە و عەبە گەیونەتە بەرپەچە، سەگەل تارمایی ئەوان هەست دەکەن، هورووژمیــان هێنا، بە فیکەی حەمە، سەگەل بەرەو دوا بوونەوە.

بە هەناسکە هەناسک گەیونەتە لای تاهیر، تاهیر هەر وا بێ هۆشە.

حەمە گوتی:

ــ عەبەگیان، من دەچم بە دووی پوورەگوڵەدا، بە لایەوە دانیشە، وە هــۆش هاتــەوە، ئاوی نەدەیتێ، دەنا دەمرێ. بە پەلە ئەوەی گوت و گوێدرێژی وەپێشدا و ڕۆیشت.

شەو درەنگانە، خەلک دەستێ خەوی کردووە. حەمە لە دەوری دێ گویدرێژەکەی بەستۆتەوە، بێ چرپە چۆتە بەر مالی پوورەگولە. لە دەرگای حەوشە نادا، سەبرێ لە دیوارەوە وەسەرکەوت، لە پشت دەرکی ژووری وەستاوە، سەبرێ بە ترسەوە بە قەفی گۆچان لەدەرگا دەدا، قەفی گۆچان گەیی بە سواخی چەپەر، سواخە شیاکە وەک دەهۆلی دراو تەپەی لێوە هات!

پوورەگولە بە چەشنی کەرویشکی بازرە راپەڕی بەدەنگێکی نێرەوە گوتی:

ـ کێیە؟

حەمە سەری ناوە بە کەلێنەوە و سەبرێ گوتی:

ـ منم پوورێگیان.

پوورەگولە گڕی لامپاکەی هەلکێشا و خۆ کۆ دەکاتەوە، بۆ خاتر جەمی گوتی:

ـ تۆ کێی؟

ـ حەمەم پوورێ، بیکەوە.

شەو ژەنی لە پشت دەرگا لابرد، گوتی:

ـ بەو نیوە شەوە بۆ هاتوویەوە؟! وەرە ژووری وەرە، خێرە؟

ـ خێر دەبێ ئیشاللا، کارێکی خێر وەرێت هاتووە! بە تۆ دەکرێ پووری گیان.

پوورەگولە بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ چیە ئەو کارە وا بە من دەکرێ؟

ـ بە قسەم دەکەی؟

ـ نابێ بزانم! چیە؟

ـ سوێندم بۆ بخۆ! سوێند نەخوی پێت نالێم، بلێ بە گۆڕی دایکت بە قسەت دەکەم.

پوورەگولە ماتبووە، بیری لێ دەکاتەوە.

حەمە تێی دەڕوانێ، دلی بە توندی لێدەدا، بێ ئۆقرەیە، بە پەلە گوتی:

ـ دە بلێ! دەبلێ دەی!

پوورەگولە چەپۆکێکی دا بەسەریدا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەی عەمرت بە کەم بێ باشە، بە قەبری دایکت لە دەستم بێ بە قسەت دەکەم. چیە وا بە خەمی بۆی؟

حەمە چۆتە پێشێ بە یەقینەوە گوتی:

ـ پوورێگیان! تۆ بۆ هەموو کەس کەولی ساردوگەرمی! دێ بە دێ بە دووی کاری خێرەوەی، نەخۆش و بریندار دەرمان دەکەی و چاوت لەدەستی کەس نییە، چاوت لە کەرەمی خودایە، ئیشاڵلا قەت بەردی ساردوگەرم وەرێت نایە، خودا چاکت بۆ بکا و ..ی ئەو ون نەبێ، ئێستاش خێرێکی گەورەت هاتۆتە رێ، ئەو کارە بکەی، جوانێ لە مەرگ رزگار دەکەی، زوو نەگەیتێ، دەمرێ! جا خۆت و خودای خۆت.

پوورەگولە بە مۆرەوە گوتی:

ـ وەی وەی لەو زمانە! چۆنی لێدەزانی، دایکی سفتەرۆ!! کێیە وا بۆێ دەلالێیتەوە؟

حەمە سەری داخستووە، بە ترسەوە گوتی:

ـ ناوی تاهیرە، لەو تەقەی ئێوارەدا بریندار بووە.

ـ ئەویش چەکی پێیە؟

ـ بەڵێ

پوورەگولە هەنگاوێکی لێ چووە پێشێ و سەبرێ گوتی:

ـ چەتە و مەتە نەبێ؟!

حەمە بە دڵنیاییەوە، چاوی زەق کردەوەو گوتی:

ـ نا، نەوەڵلا، چەتەی چی؟ پیاوی چاکە، زۆر بە نێو بانگە، ئەو جارە چوومە شار، خەڵک بە چاکە ناویان دەبرد.

پوورەگولە رووی لە حەمە وەرگێراوە، بەرەو لای ژووروو دەڕوا و دەست دەدا بە لاراندا، گوتی:

ـ نازانم، پیاو نازانێ بڵێ چی؟!

حەمە وردە وردە وەدووی کەوتووە، حەجمینی نییە، گوتی:

ـ دەی پوورێگیان! دەڵێی چی؟ دێی؟

نازانم، خۆشم نازانم چ بکەم؟ دەترسێم بێم پێمان بزانن، بزانن دەزانی چمان بە سەر دێنن؟! ئەوە دەولەتە! لەگەڵ دەولەت هیچ ناکرێ، نەیەم دڵم تاقەت ناهێنێ، جوانێ دەمرێ! یارەبی خودا غەزەبت لێگرێ، کوڕی سەگە. گووی سەگ بە گۆرەکەی بلە جەواڵ! دایمە ژانە سەری بۆ من، لە کوێیە ئێستا؟

حەمە گوێ بە جنێوی پوورەگولە نادا، چۆتە بەردەمی، باوەشی پێداکردووە و ماچی دەکا، بە کەیف خۆشییەوە گوتی:

ـ بە قوربانت بم پووریٚ گیان! لە دیٚ کۆنە.
ـ باشە بەرم دە تووتکە سەگ، بەو نیوەشەوە من چۆن دەگەمە دیٚ کۆن؟
ـ دەتگەیـەنم، گوێدرێژەکـەم هێنـاوە، سـوارت دەکـەم، دەتبـەم، دەشـت هێنمـە پووریٚگیان.
پوورەگوڵە بە پێکەنینەوە دوو سیٚ جنێوی دیکەی دایە گوتی:
ـ وەی لە دەستی تۆ! ئاخری سەرم بە فەتەڕات دەدەی، باشە، زۆر کوڵەوارە؟ کـوێی بریندارە؟
ـ ران و باسکی، من برینەکانم نەدیوە، خۆی دەیگوت رانم زۆرکوڵەوارە.
ـ خوا بکا گوللەگیری نەکردبیٚ، گوللەی تێدا مابیٚ، چەتوونە، تۆ هاتی چۆن بوو؟
ـ بیٚ هۆش بوو پووریٚ گیان، بە بیٚ هۆشی بە لای عەبەوە بە جێم هێشتووە.
پوورەگوڵە چاوی دەرپەڕاند و بە تووڕەییەوە گوتی:
ـ عەبە شێت؟!
ـ بەڵیٚ.
ـ ئەو شەل و شێتەش زانیویە؟! جا ئەو چۆنی زانیوە؟! منیش دەبەی ئەو بزانیٚ؟
حەمە بە پێکەنین و ترسەوە گوتی:
ـ خۆم چووم بە دوویدا، عەبە زۆر پیاوی چاکە پووریٚ، من باوەڕم پێی هەیە، پیـاوی لا بکوژە، لەو دڵنیابە، سەری پیٚ بسپێرە!
پوورەگوڵە هێندیٚ سەری راوەشاند و چووە سەر سندووقەکە، سـەری سـندووقی لا بردووە دوو سیٚ پرێسکەی دەرهێناوە و دەیانکاتەوە، سەر حیسابی دەرمان دەبیٚ، دەیـان پێچێتەوە، هەموویانی خستە پرێسکەیەک و دای بە حەمە و گوتی:
ـ گوێدرێژەکەت لە کوێیە؟
حەمە پرێسکەی داوەتە بن باخەڵی، بە پەشۆکاوییەوە گوتی:
ـ لە، لە، لە پشتی ماڵانە پووریٚگیان.
پوورەگوڵە بە دەمە لاسکەوە گوتی:
ـ لە، لە، لە! لالیش بووە کوریٚ سەگە تۆ لە پێشەوە برۆ، منیش دوا بە دوات دێم، بـا کەس نەمانبینیٚ، دەبرۆ دەی برۆ.

حەمە لە پشت مالانەوە چاوەڕێی پوورەگولەیە. تارماییەک لە بن دیوارەوە کرژ دێ، نزیکبۆتەوە، حەمە بە ئەسپایی گوتی:

ـ پوورێگیان هاتی؟

ـ ئەرێ، سوارم کە با بڕۆین، درەنگە، دەبێ بەر لە رووناکی من لە مالێ بم.

حەمە پوورەگولەی سوار کردووە، گوێدرێژی وەپێش داوە و بێ وچان تێی دەگوتێ. گوێدرێژ کەوتۆتە وێرغە، پوورەگولە بە پشتی گوێدرێژەوە نووساوە، نقەی نیوە نایە.

عەبە بە دیار تاهیرەوە خەو دەیباتەوە. بە دەنگی سەگ وەڕەوە راپەڕی و کەوتە دوویان سەگەل بێ دەنگ بوون، بەرەو دوا بوونەوە، عەبە دوو تارمایی دیوە، دەنگیان دەدا:

ـ کێن؟

حەمە جوابی داوە، گوتی:

ـ وەهۆش نەهاتۆتەوە؟

ـ نا، میمکە گولە و هاورد؟

ـ ئەرێ هێناومە، ئاورەکە خۆشکە.

عەبە پووش و پلاشی وەسەر ئاور خستەوە، ئاور گڕی گرت.

تاهیر بە دەم بێ هۆشییەوە دەنالێنێ.

پوورەگولە گوتی:

ـ وەهۆش دێتەوە، لەبەر شەوقی ئاورەکە لە تاهیر دەڕوانێ، خوێن شیرین و رەزا سووک دێتە بەرچاوی.

تاهیر بە نالەوە داوای ئاو دەکا.

پوورەگولە چۆتە ژوور سەری، بە حەمەی گوت:

ـ ئاوت پێیە؟

ـ ئا، ئاخر ئاو خراپ نییە؟ خۆت گوتت ئاو بۆ بریندار خراپە!

ـ تۆ لە سەری مەڕۆ ئاوەکەم دەیە.

حەمە مەتارە ئاوی دایە.

پووره‌گوله حه‌وت هه‌شت دلۆپی کرده سه‌ر زمانی، تاهیر چاوی هه‌ڵێنا و ده‌ڕوانێته پووره‌گوله، به ئه‌سپایی گوتی:

ـ تۆ کێی؟

ـ کارت به‌وه نه‌دابێ، غیره‌تت بێ، پووری خۆت چاکت ده‌کاته‌وه، پووره‌گوله رووی کرده حه‌مه و گوتی:

ـ ماڵه‌که‌ی عه‌به دووره؟

عه‌به جوابی داوه، گوتی:

ـ نه‌وه‌ڵلا، بووچه میمکه‌گیان؟

ـ لێره هیچم بۆ له‌گه‌ڵ ناکرێ، ده‌توانن بیبه‌نه ئه‌وێ؟ تاهیر! رۆڵه خۆ به‌سه‌ر گوێدرێژه‌وه ده‌گری؟

حه‌مه گوتی:

ـ ده‌یکه‌مه کۆڵ! زۆر دوور نییه، سیغارکێشێکه.

تاهیر راسته‌وه بووه، گوتی:

ـ ده‌توانم! له خۆ راده‌بینم.

حه‌مه گوێدرێژی هێناوه‌ته پێشێ، عه‌به و حه‌مه، تاهیریان سوارکردووه، حه‌مه و پووره گوله تاهیریان به‌ره‌و دێ کۆن برد، عه‌به به لای مه‌ڕه‌وه ماوه‌ته‌وه.

حه‌مه له رێ به‌ده‌ستێ له‌نگه‌ری تاهیری گرتووه، به ده‌سته‌که‌ی دیکه‌ی گوێدرێژه‌که لێده‌خوڕێ، پووره‌گوله له پێشه‌وه ده‌ڕوا و کوڕ هه‌و کوڕهه‌و بۆ گوێدرێژ ده‌کا. گه‌یونه‌ته دێکۆن، له‌به‌ر ده‌رگاکه‌ی عه‌به وێستاون. حه‌مه تاهیری دابه‌زاندووه، له کۆڵی ده‌کا، له پێش پووره‌گوله‌وه، به به‌له‌دی ده‌ڕوا، چوونه‌ته ژووری.

حه‌مه به تاهیره‌وه وه‌ستاوه، پووره‌گوله گڕی له‌نته‌ره‌که هه‌ڵده‌کێشێ، لێفه کۆنه‌که له سه‌ر جێگه‌ی عه‌به لاده‌با، تاهیریان له سه‌ر لباده‌کۆنه‌که راکێشا.

پووره‌گوله پرێسکه ده‌رمانی کرده‌وه، به حه‌مه‌ی گوت:

ـ ئه‌و له‌نته‌ره بێنه پێشێ.

حه‌مه له‌نته‌ری بۆ بردۆته پێش چاوی له ده‌ستی پووره‌گوله‌یه.

پووره‌گوله خه‌نجه‌ری ده‌بانی له‌به‌ر تاهیر هه‌ڵکێشاوه، قۆڵی که‌وا و ده‌ره‌لینگی پاتۆلی تاهیری هه‌ڵدڕی.

ئەمدی و ئەو دیو چاو لە برین دەکا، برینەکانی دیواودەرن، بۆ خاترجەمی، بە نووکی مقەست نێو برین دەگەڕێ، بە دڵنیاییەوە گوتی:

ـ گوللە و موڵڵەیان تێدا نییە، زوو خۆش دەبنەوە، جێی مەترسی نییە، بەڵام خوێنی زۆر لە بەر ڕۆیوە، گیانی بەو بەستنە بووە، دەنا دەیکوشت.

تاهیر لەسەرخۆ چووە، پوورەگوڵە بە کەیفی خۆی برین خاوێن دەکاتەوە و پڕیان دەکا لە هەنگوین و زاخ، زەردە چێوەیان لە سەر دەکا و بە تەنزیلێکی خاوێن دەیانبەستێ.

خوێن بەر بەس بووە. پوورەگوڵە و حەمە بە دیار تاهیرەوە دانیشتوون، تەماداری وەهۆش هاتنەوەین. پوورەگوڵە بە حەمەی گوت:

ـ خوێنی زۆر لە بەر ڕۆیوە، هۆشت پێوەی بێ، شیر و جەرگ و گۆشتی برژاو بۆ ئەو زۆر باشە، ئەگەر چووینەوە لە بیرت نەچێ، هێلکەورۆنی زەنگی بۆ بێنە، وەبیرمی بخەوە.

حەمە لە خۆشیان سوور هەڵگەڕاوە، بە بزەوە گوتی:

ـ باشە پوورێگیان، لە بیرم ناچێ.

تاهیر وەهۆش هاتۆتەوە، چاو هەڵدێنێ، ئێشی زۆرتر بووە! دەڵێی داغی پێوە دەنێن، هەنگوین و زاخ دەیبرژێنێتەوە، دیسان لە خۆ چووە.

پوورەگوڵە گوتی:

ـ لێی گەڕێن، کەس نەیدوێنێ، بە دەم بێهۆشییەوە دەخەوێ، بە عەبە بڵێ، تا خۆی قسە نەکا، نەیدوێنێ، هەستە بمبەوە، شەو درەنگە، پاش دوو سێ شەو دێمەوە، دەرمانی دەکەم، هەستە با بڕۆین.

حەمە پوورەگوڵەی سوارکردووە، بێ ئەوەی عەبە بزانێ، بە کوێرەڕێی خوار پەچەدا، بردییەوە بۆ کانیتوو.

بەیان شەبەقی داوە، حەمە گەڕاوەتەوە و عەبەی لە خەو هەستاندوە، بە عەبە دەڵێ:

عەبەگیان! ئەگەر چوویەوە، لەگەڵی مەڵێ، تا خۆی نەتدوێنێ، تۆ هیچ مەڵێ، هۆشت پێوەی بێ، ڕەنگە بەیانی بە دوویدا بگەڕێن، باشی بشارەوە، ئەگەر بێتو بیگرن من و تۆشی پێوە دەکوژن! من تازە ناتوانم بێمەوە لای، تۆ کەیفی خۆتە، با بزانم چ دەکەی، ئەوەش نان و هێلکە و ڕۆنە، وەختەبەر هات و داوای نانی کرد، هێلکە و ڕۆنی بۆ

دروست بکە بیدەیە، سبەی شەوێ خۆم دێم بۆ لاتان، باشت ئاگا لێبی، کاک تاهیر نەجاتی بێ گەلاز سەگی تۆیە.

مەڕ لە پەچە رایداوە، شوانە کەلوپەلی پێچاوەتەوە و دوورونزیک وەدووی مێگەل دەکەوێ.

شوان بە درێژایی شەو وەنەوزی نەداوە، لە دلەوە هەست بە شادی دەکا، غەرە و لە خۆباییە، لە خۆیدا جێی نابێتەوە!

بەیان بەریدا و پەلەوەر وەجریوە جریو کەوتوون، کەو شەوپەڕ دەکا، ئەمبەر و ئەوبەر غورەیە، دەخوێنن.

ئاسمان بەرگی تازەیەباری وەلا ناوە، رەنگی وەنەوشەی وەخۆ گرتووە، ئاسمانی خۆرهەلات بووکە و خەیاتی سروشت کراسی زێوی بە بالا بڕیوە، بە دەم حەمە شوانەوە پێدەکەنێ.

ولات روون و روونتر بۆتەوە، روونتر، هەتاو لە ئاسۆوە، گەش، بە قەدەر کەللە بێژنگێ هاتۆتە دەر، گزنگ لە سەرانی داوە.

حەمە بەرایی مەڕی شکاندۆتەوە، بەرەو کانییە بەردینە، لەو شوێنەوارە دوور دەکەوێتەوە.

قاوەلتوونە، چێژتاوە، مەڕ لە سەر کانییە بەردینە پالێنیداوە، هەوا گەرمی کردووە، حەمە خەو شکاوەتە چاوی بووە بە گۆمی خوێن، بێ بەرەقەنە، کەپەنگی لە بن گابەرد راخستووە خۆی درێژ کرد.

چاو گەرمی خەوە، سەگ وەڕە! هۆروژمە! پەلامارە، سەگ وەزمان هاتوون! تەقەی تفەنگ خەوی لە سەر پەڕاند، حەمە وەک خوودار راستەوە بووە!

سەگ هەلدەسوورێن، ئەمنییە گوللە بە حەواوە دەنێن! ئەسپ قوشقی و کورەگوێ دەحیلێنن.

حەمە عەبەساوە! چاوی رەشکە و پێشکە دەکا، سوارێ بە دوو دەبینی، چاو هەلدەگولۆفی، تەماشا دەکاتەوە، دە سوارن، عەتا و رەسوولی نۆکەر دەناسێتەوە.

عەتا بە جنێوەوە هاوار دەکا، گوتی:

ــ هەتیوە! ئەوە مردووی؟ دەوەرە، ئەو سەگانەت دوورخەوە.

حەمە بە هەلاتن بەرەو لایان دەڕوا، سەگەلی بێ دەنگ کرد.

عەتا رووی کردۆتە یەکی سووری زرپن، بە فارسی گوتی:

ـ سەرکار ئیتسیوار! دەبێ ئەمە دیتبێتی، هەر ئەمە لە کێو بووە.

ئیستیوار دەستێکی بە سملّیە زەردەکەیدا هێنا و بە چاو دەڕوانێتە حەمە و بە زمان رووی لە عەتایە، گوتی:

ـ زمانی ئێمە دەزانێ؟

عەتا بە بزەیەکی ژەهراوییەوە گوتی:

ـ نەخێر سەربازی نەکردووە!

ـ بزانە ئەو نەیدیوە؟

عەتا نێو چاوانی وێکهێناوەتەوە، بە تووڕەییەوە روویکردە حەمە، گوتی:

ـ چەتەیەک بە برینداری بەرەو ئێرە هاتووە، تۆ نەتدیوە؟ ئێوارە بریندار بووە، هەر کەس دیبێتی، یان بیبینێ راپۆرت بدا، خەلاتی هەیە، بابیشم خەلاتی دەکا، ئەگەر دیوتە دەنگ بکە، چەتەیەکی خوێن خۆرە!

حەمە لە دلەوە دەلێ.

لە ئێوەش خراپترە! ئەگەر گوللەبەندەکەی پێ دەبوو، جا با ئێوە وەدووی بکەوتایەن.

عەتا دەنگی دەدا:

ـ چیە؟ بۆ لاڵ بووی؟! دیوتە؟

حەمە بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ نا، نەوەڵلا، من کەسم نەدیوە، بیبینم، خۆم خەبەر بە ئاغا دەدەم.

عەتا قسەکانی حەمەی بۆ ئیستیوار دووپات کردەوە.

ئیستیوار رکێفی لێدا و سوارە بە دوویدا، سەرڕەو بە دۆلی هەزار ئەشکەوتدا وەسەرکەوتن.

## ١٣

تاریکە شەوە، پێنج چراتۆر لە قەلا دایسێ، شەوقی چراتۆڕ دەوروبەری حەوشەی ڕوونکردۆتەوە.

چل و دوو چارەوێ لە سەر ئاخوڕی حەوشە بەسراونەتەوە، حەسەن مەیتەر پەیتا پەیتا کا و جۆیان لە بەر دەکا و بە نێویاندا دەگەڕێ.

کاوڕ بەرانێکی دابەستە سەربڕاوە، عەدلە خانم و نازدار لە مدبەق خەریکی شێو سازکردنن، پەیتا پەیتا ئاغا پەیغام دەنێرێ چێشتەکە کەم نەبێ!

دیوەخان پڕن، ماندوو کەلەلان، کەس خۆ بە پێوە ناگرێ. دوو شەو وسێ ڕۆژە کێو و شاخ دەتەقێنن، قەیتانی پۆتینیان نەکردۆتەوە، جەناب سەروان ئیزنی پشوودانی داوە.

هەمزەبەگ چوار دیوی بۆ قوشوون تەرخان کردووە، خۆی و سەروان خودایی، سیتوان عەبدوللایی، ئیستیوار ڕەزایی و عەتا لە دیوێکن.

ئەحمەد فەڕاش سێ سەماوەری لە پێشخانە تێخستووە، بەم دەست و ئەو دەست چای تێدەکا و بەدیوەخاندا دەیگێڕێ.

ڕەسووڵی نۆکەر سەرپەرشتی دیوەخان دەکا، بە دزییەوە دەیانبژێرێ، بە دیوی ئاغاوە و ئەوەی سەربانەوە، چل و چوار کەسن.

ڕەسووڵ لە پێشخانەیە، چۆتە بن گوێی ئەحمەد، بە سرتە گوتی:

ـ بە ئاغا و عەتابەگ و ئەوەی سەربانەوە، چل و چوارن، بڕۆ بە خانم بڵێ، چاوەڕێیە.

گۆشتی کاوڕ لە مەنجەڵێکی زنجیردار دا وەسەر ئاور نراوە، برینج کراوە بە سەلەدا، هەڵم و هالاوی برینج و گۆشت مدبەقی ئاخنیوە، شەوقی لە گڕی لامپا بڕیوە، بۆنی پلاو و گۆشت حەوشە و دەوروبەری قەلای پڕ کردووە.

شەوقی پێنج چراتۆر لە پێنج پەنجەرەوە داویە لە حەوشە و لەم سەر تا ئەو سەر زەنگیانەی لە بەر بگرەوە.

چل و دوو چارەوێ سەریان لە ئاخوڕناوە، کرم و هۆڕ جۆ دەکرمێنن و دەپرمێنن.

فتیلەکەی مام عەلی دەرکەوان، شەوقێکی کز و لاوازی خستۆتە بەر دەروازە و مالۆچکەکەی، خۆی وەک تارماییەک دیارە پالیداوە بە جێوبانەکەیەوە.

تارماییەک لە سەربانی قەلا دێت و دەچێ، شەوقی پۆلووە ئاوڕێکی کز و لەگەلی دەگەڕێ، جاروبار شەوقەکە دەچێتە سەر و دێتە خوارێ و دەگەشێتەوە، کز دەبێ، شەوقی سیغاری کێشکچی قوشوونە.

کزەبایەک هەلیکردێ و هەلم و هالاو بە دەرگای مدبەق رامال دەدا، شەوقی چرا گەشایەوە و ئەحمەد فەڕاشی ئاشکرا کرد.

عەدلە خانم سەری هەلێنا، گوتی:

ـ ئەحمەد! سەر حیسابیان بوون؟

ـ بەلێ خانم، بە ئاغا و عەتا بەگەوە، چل و چوارن، شام سازە؟

ـ ئەرێ، وەرە تا دەم دەکێشێ، بەر کولێ بکە، دادەی نازدار! چێشتی بۆ تێکە، دەزانم دوایی وەبەری ناکەوێ، زوو نانەکەت بخۆ و برۆ دەستیان بشۆ، تا تۆ دەستیان دەشۆی، ئێمە تەواو دەبین.

بانگی خەوتنانە. ئەحمەد فەڕاش بە ئافتاو و لەگەنەوە لە دیوی ئاغادەستەونەزەر وەستاوە.

پیاوێکی بە سام و هەیبەت لای سەرووی هەمزەبەگەوە دانیشتووە، دەستێ بەرگی بۆری نیزامی لە بەردایە، قایشێکی رەش لە سەر شانی چەپییەوە، بە سەر سینگیدا هاتووە، لە قایشەکەی نێو قەدی هەلپێکراوە و دەمانچەیەکی بەرگ رەش بە لای راستییەوە شۆڕبۆتەوە و نووکی لە دۆشەکچەکە هەلچەقیوە.

لە سەر ئەمشان و ئەوشانی سێ ئەستێرەی زەردیان لە سەرە، لە بەر شەوقی چراتۆرەکە دەدرەوشێنەوە.

ئەحمەد چاوەڕێی دەستوورە، هەمزەبەگ بە چاو ئاماژەی کردێ، ئەحمەد بەرەو سەروان رۆیی، بە پارێزەوە لەگەنی لەبەردەمی دانا‌وە، چۆک دادەدا و ئاو بەدەستیدا دەکا، یەک بە یەک دەستیان شتووە، ئەحمەد ئافتاوە و لەگەنی هێناوەتە دەرێ.

پێنج مەجومعە براوەتە دیوی ئاغا، دیوەکانی دیکە دانگۆیی نان و چێشتیان داونەتێ، رەسووڵ لە پێشخانە، بە جیاواز نانی خوارد.

تاریکە شەوێکی ئەنگوستە چاوە، هەورێکی رەش ئاسمانی گرتۆتە بەر، شریخ و هۆڕی هەور شووشە و پەنجەرەی قەلای وەلەرزە خستووە، دایداوەتە رێژنە باران، بەختە بارانە.

شێو کراوە، مەجومعە براوەتە مدبەق، دەست و دەم شۆراوە. سەروان خودایی چاوەڕێی راوێژی هەمزەبەگە، تاهیری لەو دەوێ! لە ملکی ئەودا ونبووە، مردوو یان زیندوو، لەوی دەوێ.

هەمزەبەگ بانگی رەسووڵ و ئەحمەد دەکا.

هەر دوو بە جووت لە حوزوورن.

ئاغا گوتی:

ـ رەسووڵ! تۆ برۆ کانییە کوێرە، ئەحمەد! تۆش بچۆ بۆ کانیتوو، بە کوێخا شەریف و کوێخا کەریم بڵێن بەیانی کەس لە دێ نەچێتە دەر! نۆری ئاویانە، ئاو بەرەڵلا کەن! ئازووقەیان نییە و دەچن بۆ شار، نەچن، بارە ئاشیان داگرتووە، پەکی بخەن، گاوگاڕان لە تەویلە دەرنەکەن، ژنیان بە ژانەوەیە، منداڵی نەبێ! مردوویان لێ مردووە، نەیننێژن، بڵێن ئاغا بەیانی لە خزمەتی جەناب سەرواندا دێ و ئەو چەتەی لە خەڵکی ئەو سێ دێیە دەوێ، دەبڕۆن، بە سواری بڕۆن، حەسەنم بۆ بنێرنە سەر، ئەویش بکەوێتە نێو دێ.

دوو سوار بە پرتاو لە دەروازەی قەلاوە چوونە دەرێ. بۆرە سوار بە رێی کانییە کوێرەدا و رەش سوار بەرەو کانیتوو، بە رێی دێ کۆندا، لەیەک جوێ بوونەوە.

ئەسپەڕەش بێ هەڵەوپەلە رێی گرتۆتە بەر، سوار لەغاوی بۆ شلکردووە و هەر دوو دەستی ناوەتە گیرفانی باڵتەکۆنەکەی ئاغا هیچ پەلەی لێ ناکا.

سوار بیر و هۆشی لە سەر پەڕیوە، ونازانێ شەوە و چی پێسپێراوە، بۆ کوێ دەچێ! رابەدەستی ئەسپەڕەشە، چۆن دەڕوا و بۆ کوێ دەچێ، کەیفی خۆیەتی.

سوار لە نێو خەیاڵدا ونبووە، حەپەی سەگ هێنایەوە سەر خۆ، حەپەی سەگە خوێڕیلەکەی عەبە بوو، دێ کۆنە، سێ سەگ لەدەم کێوەوە بە دەنگی سەگەکەی عەبەوە دەڕۆن. سوار لە نێو کەلاوەکانە، گەیوەتە بەر ماڵەکەی عەبە، ئەویشی بە جێ

هێشتووه، گەیوەتە گۆڕستانە کۆنەکەی دێ کۆن. سوار لەغاوی لە ئەسپەڕەش کێشا و ڕایگرت، فاتیحایەک هەدیە دەکا.

ئەسپە ڕەش گوێی لە سەر نێو چاوانی تیژ جووت کردووە! دەپرمێنێ و لە جێی خۆی سم لە ئەرز دەکوتێ! سوار ڕکێفی لێدەدا، ئەسپ ڕێ داناگرێ، پشتاوپشت دەکشێتەوە! سوار هەستی بەوە کردووە ئەسپەکەی شتی دیوە، لە نێوانی گوێیەوە دەڕوانێتە ئەو شوێنە کە ئەسپەکە چاوی تێبڕیوە.

لە بن دووکەلی بەرز، لە بلندایی قەراخ ڕێوە، تارماییەک دەجوولێتەوە! سوار هەستاوەتە سەر ئاوزەنگی و دەنگی دەدا:

- کێی کوڕە؟

تارمایی هەستاوەتە سەر پێ، بێ دەنگ لە جێی خۆی وەستاوە! لە دەنگی سوار سێ سەگەکەی دەم کێو، لە پشتی کەلاوەکانەوە، بە وەڕین بەرەو لای دێن.

سوار وەک هەورە برووسکە بیری جۆراوجۆر بە مێشکیدا دێ و دەڕوا! بیری بۆ ناکرێتەوە، ترس تەواوی لەشی گرتۆتە بەر، مچوڕکی پێدا دێ! گۆڕستان خۆفناکە، نێوی خودا و پیغەمبەر دێنێ، ئایەتەلکورسی دەخوێنێ.

سەگەل نزیک بوونەتەوە، تارمایی هاتۆتە پێشێ، لە بەرزایی قەراخ ڕێ وەستاوە و بە سەر سواردا سوارە، ئاسمان لە نێو لینگییەوە دیارە!!

سوار خۆی دۆڕاندووە و ورەی لە دەست داوە، لای وایە دێوەزمەیە! بیستوویە دەست بەی بۆ دۆخین، دێوەزمە دەڕوا، دەستی بە دۆخینەوە دەلەرزێ.

تارمایی هەر دێ و نزیک و زلتر دەبێتەوە، بووە بە حووج! دەڵێی سەری بە ئاسمانەوە نووساوە!!

هاسکەی سەگ لە پشتییەوە دێ، بەری حووجە و پشتی سەگە، خۆ گورج دەکاتەوە، دەیەوێ هەڵێ، بەڵام ئەسپەڕەش ڕێ داناگرێ، سەگەل گەمارۆیان داوە و دەرەتان نییە.

ئەسپەڕەش لە سەر پاشوو دەخولێتەوە، حیلە و پرمەی تێکەڵە، دەچێتە حەوا و دێتەوە خوارێ.

تارمایی لە سەر کەندەڵانەوە خۆ دەخاتە خوارێ، دەنگی سەگەل دەدا، سەگ لە سوار دوورکەوتنەوە، دەنگی سوار دەدا:

کاکە حەمەد! نەترسێی! خۆمانین، حەمە شوانم! ئۆغرت خێر بێ! بەو شەوە بـۆ کـوێ دەچی؟!

ئەحمەد لە ترسان خاو بۆتەوە، دلی وەک مریشکی سەربڕاو لە نێو قەفەسەی سینگیدا هەلدەبەزێتەوە، خۆ بە سەر ئەسپەوە ناگرێ، دابەزی، ئەگەر رۆژ بایـە، حەمـە دەیـزانی چەندە ترساوە، تاریکی شەو ئابڕووی ئەحمەدی کڕیوەتەوە و حەمە تێناگا، ئەحمـەدیش وەخۆی ناخا.

حەمە لە هەوەلەوە لە ئەحمەد ترسابوو بۆیە چووبووە بن ئەو کێلانـە، ئەحمـەد کـە دەنگی‌دا، حەمە دەنگی ناسیـۆوە، گوتی:

ـ تۆ چی و ئێرە چی بەو شەوە؟!

ئەحمەد هێشتا نەهاتۆتەوە سەرخۆ! دلە کوتێ مەجالی نادا جواب بداتەوە، یـەک دوو جار ئاوی زاری قووتدەدا، گەرووی تەڕ بۆوە. گوتی:

ـ تۆ بەو نیوەشەوە لێرە چ دەکەی؟!

حەمە بە پەشوکاوییەوە گوتی:

ـ گورگم لە سەر بوو! لەو بارانەدا دەرفەتی هێنا و کەلاکی لێساندووم، بە مـردارەوە بووی لێم سانەوە، خەریکی کەول کردنی بووم، تۆ هاتی، نەتگوت بۆ کوێ دەچی؟

ئەحمەد هاتۆتەوە سەرخۆ، لەغاوی کردە قۆل و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ شێواوە! قەلا پڕ بووە لە ئەمنییە! دەلێن چەتە پەیدا بووە! یەکیان بە برینـداری لـەم کێوانە ونبوو، وەک باسی دەکەن زور بێ رەزایە، لەبەر تۆ لێرەوە هاتم، کوڕە ئاگات لـە خۆت بێ.

حەمە گوتی:

ـ بەیانی ئەمنییەکان لە منیشیان پرسی، بلێی راست بێ؟

ـ جا چووزانم، منیش وەک تۆ!

حەمە دەیەوێ باسەکە درێژەی پێ نەدرێ، لە بیانوو دەگەڕێ، بۆ ئەوەی زوو ئەحمەد بەڕێکا، گوتی:

ـ کوڕە بە ئێمە چی؟ من و تۆ چمان هەیە لە خۆمان بترسێین؟ خودای دەکرد ولات پڕ دەبوو لە چەتە، من هەر شوانم و تۆش هەر فەڕاشی! هەر کەس لە سەرەوە بـێ ئێمـە

ـەگەڵ ئەوین! وەک کابرا دەڵێ، هەر کەس کەر بێ، ئێمە کورتانین، لەوەی گەڕێ، ..زدار چۆنە.
ئەحمەد هەناسەیەکی هەڵکێشا، گوتی:
ــ چۆن بێ؟ دۆعاچیتە، لە نێو کاردا گول بووە.
ــ بە راست بۆ کوێ دەچی؟
ئەحمەد لەغاوی لە قۆڵ دامالی، خستییە سەر یالی ئەسپەکە، گوتی:
ــ دەچمە کانی‌توو بە کوێخا کەریمی خەزوورت دەڵێم بەیانی کەس بۆ هیچ کوێ لە دێ دەرنەچێ، ئاغا لەگەڵ گەورەی ئەمنییە سەبارەت بەو چەتەیە لەگەڵیان دەدوێن، رەسوولیشی ناردووە بۆ کانییە کوێرە، من دەڕۆم، ئاگات لە خۆت بێ رەنگە تۆش بانگ بکەنەوە. ئەوەی گوت و پێی لە ئاوزەنگی ناو سوار بوو، رکێفی لێدا، ئەسپە ڕەش وەک کێچ دەرپەڕی، ئەسپ و سوار لەتاریکیدا ونبوون.
دوا بە دوای رۆینی ئەحمەد، حەمە گەڕاوە بۆ بن کێل، کەلاکی سەربڕاوی شەکی دابە کۆڵدا و بەرەو ماڵەکەی عەبە وەڕێکەوت.
هەتاو دوو سێ هۆگان لە هەزارنەشکەوتەوە وەسەرکەوتووە، ئاوایی کانی‌توو شلەژاوە، دەڵێی جێژنە، یا شینە! کەس نەچۆتە کار. بەر دەرکی مزگەوت، سەر حەوز و بنە دیوار پڕن لە خەڵک، دەستە دەستە، دەستەو ئەژنۆ چاویان لە رێیە.
سواری، یەکی دی! سێ سوار لە کێوەبەرداویلەوە قەرەولیان داوە، پێش قەرەوڵن، سوار بە دووی یەکدا رێچکەیان بەستووە، مارپێچ بە کوێرەڕێدا سەرەوخوار بوونەتەوە، لوولەی تفەنگی برنو لە بەر گزنگی خۆر ترووسکەیان دێ. چوار قەرەیەخە لە نێو دەستەی ئەمنییەدا ڕەش دەکەنەوە.
جوولەجوول وەخەڵک کەوتووە. ژن و منداڵ رژاونەتە، سەربان. پیاوان بە پێشوازیانەوە لە دێ چوونەتە دەرێ.
پێش قەرەوڵ گەیونەتە دەوری دێ، دوو ئەمنییە و رەسوولی نۆکەرە.
ئەمنییە و خەڵک تێکەڵبوون، رەسووڵ بە کوێخاکەریمی گوت:
ــ کەس لە دێ دەرنەچووە؟
کوێخا چاو بە خەڵکدا دەگێڕێ، گوتی:
ــ نەخێر، تەواوین، بۆ دەرنگ هاتن؟ وەختی کار و کوێرەوەرییە!

ڕەسووڵ بە مۆڕینکەوە چاو لە کوێخا دەکا، گوتی:

ـ کارمان بوو! چووینە کانییە کوێرە، لە تازوا قسەیان بۆ خەڵکی کرد، هەر وا فریا کەوتووین.

دەستە گەیونەتە پێش، هەمزەبەگ سواری کوێتە بووە، شانبەشانی سەروان خودایییە، عەتا و ئەحمەد فەڕاش بە دووی سیتوان و ئیستیوارەوەن.

خەڵکی کانی‌توو، بە مەلا و کوێخا و پیاو ماقوولەوە ئەمبەروئەوبەری ڕێیان گرتووە، بەخێر هاتنیان لێدەکەن.

حەوت سوار لە دەستە جوێ بوونەوە و چوونە بن یەختەبییەکی سەرکانی. ئەوانی دی بە دەوری دێدا بلاو بوونەتەوە.

خەڵکەکە بە دووی ئەو حەوتە کەوتوون، پشتە و خۆر، بەرانبەر بە سەروان و ئاغا بە سەف بوون.

هەمزەبەگ بانگی کرد و گوتی:

ـ وەرن ئەو چارەوێیانە بگرن.

فەیزە درێژ و فەتاحە کوێر، حەمەی نەنە خەجێ و عەلی مام ڕەسووڵ، کەریمی پوور پەریزاد لە سەف هاتنە دەرێ، هەر یەکەی ئەسپێکی گرت، فەیزە درێژ کوێتەی گرتووە، ئەحمەد و ڕەسوڵ ئەسپی خۆیان گرتووە.

ئاغا دەمی ناوە بە گوێی سەروانەوە، پاش هێندێ سرتوخورت، ڕوو دەکاتە خەڵکەکە، گوتی:

ـ خەڵکینە! کەیخوداکان! مامۆستا! بێ شک هەموو لەو تەقەیەی پێری ئێوارە ئاگادارن؟ چەتە و پیاوکوژێ لەو تەقەدا بریندار بووە، بە برینداری هەلاتووە و ونە! هەرکەس شاردوویەتەوە، لە ڕووی نابەڵەدییەوە، یان لە ڕووی دڵسۆزی و سینە سافییەوە بووە، ڕاستی بلێ، خەلاتی دەکەین، بیشارێتەوە و نەیلێ، دوایی ئاشکرا بێ، سزای مەرگە، ئەوەتان لە بیر نەچێ، ئەو چەتەیە زۆر بێ ڕەزایە! گورگی هارە و بریندار بووە! چاک بێتەوە، بەزەیی بە کەسدا نایە! جەنابی سەروان لە سەر حەددی ئێراقەوە وەدوای کەوتووە. لە دۆڵی دزان پێکاویانە، چونکە لە ملکی من پێکراوە، هەر لەوێ ونبووە. مردوو، یان زیندوو، لە منی دەوێ و منیش لە ئێوە! جا کەیفی خۆتانە! لە ملکی من ونبووە، من تاوانبارم.

لای جەناب سەروان سەرشۆڕم مەکەن، من سەرشۆڕ بم، خەڵــکی ســێ دێ ســەریان شۆڕە! هەرکەس دیویە، یان شاردوویەتەوە، خۆی بڵێ، دەیبەخشین، دەنا دەکەوینە ماڵان و ماڵ پشکێن دەکەین، تەنانەت دەرپێی ژنەکانیش دەگەڕێین!!

ئەگەر خۆتان راستی بڵێن، خەڵاتتان دەکەم، لای جەناب ســەروان ســەربەرزم کــەن، سەربەرزم کەن مەڕ و ماڵاتتان بەرگیرەوەی نابێ، هەر کەس دەست کورت بێ دەستی دەگرم، گای نەبێ، گا جووتی دەدەمێ، تووی نەبێ، تووی دەدەمێ، کــوڕی ســەربازبێ، نایدەم بە دەستەوە، کوڕی ژن بێنێ، یان کچ بە مێردبدا، پێشکەشی لێ ناستێنم.

بەڵام لێرە بێ چی؟! ماڵێ دووسەدتمەن جەریمــەتــان دەکــەم. مووچــەتان لێدەبــڕم، تالانتان دەکەم! بووره و بایەرتان لێ قەدەغە و مەڕتان ناهێڵم لە ملکمدا بلەوەڕێ، ئاو لــە دۆڵیانی ئاش هەڵدەبڕم! زمهەڕتان نابێ لە ئاشی من لێ بکرێ!

بە شەرعی خودا و پێغەمبەر، ئێرە ملکی منە، من رازی نەبم، مردووتان لە ملکم بنێژن! رازی نابم و گەردنی ئازا ناکەم! دەی؟ دەڵێن چی؟

مەلا کەریم لە سەفی پێشەوە، لە نێو خەڵکەکــە هاتۆتــە دەرێ، بــە دەنگێکــی بــەرز گوراندی گوتی:

ـ خەڵکینە! هەموو گوێتان لە فەرمایشی ئاغاوە بوو؟ هەرکەس ئەو چەتەیەی حەشــار داوە، بیڵێ، دەنا ماڵ پشکێن دەکەن.

کەس هیچ نالێ! پیاوان مات و بێ دەنگن، هەموو دەڕواننە یەک! ژنــان کــۆڕ کــۆڕ کۆزیلکەیان داوە، بەرۆک هەڵدەگلۆفن. منداڵی خۆیان خزاندۆتە داوێنی دایکیــان، خــۆ دەشارنەوە و ملیان ناوە بە لارەوە، ترسەنۆکانە دەڕواننە ئەو بەرگ بۆرانە، چاویــان زەق کردۆتەوە و قوڕوقەپ وێستاون!

لە پشتی کۆڕی ژنانەوە، پوورەگوڵە بە تەنیا دێت و دەچێ و بێ فەزیحەت بە حەمــە دەڵێ.

ـ بە گەوجم دەزانی؟! چەتەم پێ دەرمان دەکەی؟ وێستاییت! مەگەر بمــری و نەیەیتــەوە! مەگەر دەستم بەدەست نەگا، خەمت دەخۆم، وەک ژانکردوو دێت و دەچێ.

عەتا لە پشتی هەمزەبەگەوە، پاڵیداوە بە یەختە بییــەکــەوە، دەســتی راســتی ناوەتــە کەلەکەی، بە دەستی چەپی سمێڵە خورماییەکەی با دەدا، چاوەشینەکانی بــە نێــو ژنانــدا دەگێڕێ، چاو لە کەوێ دەگێڕێ، وەبەرچاوی نایە.

هەمزەبەگ سەری لە سەروان بردۆتە پێشێ، دەچپێنێ بە گوێیدا، سەروان بە بزەوە سەر رادەوەشێنێ!

ئاغا روویکردە کوێخاکەریم، گوتی:

ـ بە لای نا خێرت تۆ کوێخای ئەم دێیەی و جێنشینی منی! بۆ نقەت لێوەنایە؟

کوێخا چووە پێشێ، گوتی:

ـ قوربان! من چم لە دەست دێ؟ ئەوە خەلکەکە، هەموو لە فەرمایشەکانی ئاغا حالی بوون، رووی کردە خەلکەکە، گوتی:

ـ کێ ئەو چەتەی بردۆتە مالێ، یان بە شوێنی دەزانێ و دەنگ ناکا؟

مەلا کەریم و مام حەسەن و حاجی قادر چوونە پێشێ، مەلا گوتی:

ـ قوربان، تۆ دەفەرمووی چەتە و پیاوکوژە، خەلک چۆن رێی پیاوکوژ دەدا، یان دەیشارنەوە؟ بە قورعانێ خۆم لێم خوێندووە، خەلک تووشی شتی وا بێ، خۆیان سەری پان دەکەنەوە، من لە لایەنی ئەو دێیەوە سوێند دەخۆم کەس نەیدیوە، لەمەو بە دوا ببینین، خۆمان راپۆرت دەدەین بە ئاغا، چ بە مردوویی، چ بە زیندوویی، ئەگەر باوەڕیش ناکەی، فەرموون ئەوە مالان و بگەڕێن، لە مالی هەر کەسدا بوو، ئاوری تێبەردەن، لەوە زیاتر ئێمە هیچ نازانین، ئاغاش کەیفی خۆیەتی، ساحەب ئیختیارە، هەر سێ پاشەوپاش کشانەوە.

هەمزەبەگ قسەکانی مەلا بۆ سەروان دەگێڕێتەوە.

سەروان ئاماژەی کردە سیتوان و ئیستیوار، بەرەو ئەسپەکەی رۆیی. سوارە سوار بوونەوە.

فەیزە درێژ کوێتەی هێناوەتە پێشێ و جلەوی گرتووە، هەمزەبەگ پێی لە ئاوزەنگی نا فەیزە شانبەشانی کوێتە دەڕوا و جلەوی بەر نەداوە، چپ و هۆڕ لەگەل هەمزە بەگ دەدوێ.

سوار لە دێ دوورکەوتوونەوە، فەیزە لە کوێتە جوێ نابێتەوە! خەلک لەو چپەچپەی فەیزە زەنین! ترسیان لە دل نیشتووە.

سوار لە کێوەبەرداویلە وەسەرکەوتوون، مەڕ لە بەر دێوە ڕژاوەتە نێو دێ. خەلک هێشتا بلاوەیان نەکردووە. حەمە لە دوورەوە کۆڕی خەلک دەبینێ، رۆیی بۆ لایان.

ئەحمەدی مام حەسەن لە کۆڕ دێتە دەرێ، بەرەو پیری حەمە چوو، لە دوورەوە گوتی:

ـ کاکە حەمە! ماندوو نەبی.

حەمە جوابی داوە، گوتی:

ـ ئەوە چ باسە؟ یا خوا خێر بێ!

ئەحمەد بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ نەتزانیوە؟! نێو دێ پڕ بوو لە ئەمنییە! ئاغا دەیگوت چەتەیەک بە برینداری لەو کێوانە ونبووە! دەیگوت گورگی هارە، تۆ ئەو گورگە هارەت نەدیوە؟

حەمە چاوێکی بە خەڵکەکەدا گێڕا، فەیزە درێژی وەبەرچاوکەوت، بەدەنگێکی وا کە فەیزە گوێی لێبێ، گوتی:

ـ بەرێ وەڵڵا، ئەمشەو لای من بوو! تا ڕۆژ نەیهێشت وەنەوز چاوم بچێ.

فەیزە گوێی لێیە، وردە وردە بەرەو لایان دێ، یەک یەک و دوو دوو لە حەمە کۆ بوونەتەوە، حەمە باسەکە درێژە دەدا.

ـ باوەڕ بکە ئەو دوا بڕاوە ئەمشەو هەدادانی نەبوو! هەر نەخەوتووم.

فەیزە لە حەمە چۆتە پێشێ، گێلانە گوتی:

ـ چۆن بوو کاکە حەمە؟!

حەمە چاوێکی لێکرد، گوتی:

ـ چی چۆن بوو؟ تا ئێستا گورگت نەدیوە؟! گورگ گورگە، بۆر بوو.

فەیزە پاشەوپاش کشاوە، گوتی:

ـ گوتم داخوا چی دیوە! دەی گورگ ئەم نەقڵ گێڕانەوەی بۆ چیە؟!

حەمە دەستی کرد بە باخەڵیدا و گوتی:

ـ کا فەیزە! پێم شەکە قزڵی ئێوەیە، داخی ئێوەیە، ها ئەوەش قولاخەکەی.

فەیزە قولاخی وەرگرت، بە مۆڕەوە تەماشایەکی حەمە دەکا، قولاخی لە مست نا و بێ قسە و باس بەرەو ماڵ بۆوە.

پوورەگوڵە لە دوور وەستاوە، چاوەڕێیە حەمە لە نێو پیاوان بێتە دەرێ.

حەمە لە کۆڕ جوێبۆتەوە، پوورەگوڵە بانگی کرد:

ـ حەمە! تا ماڵێ وەرە.

حەمە دووروونزیک بە دووی پوورەگوڵەوەیە، لە حەوشەوە بانگی دەکا:

ـ پووریگیان! لە کوێی؟ جوابی نییە؟ پێ پێ دەچێتە ژووری، چاو دەگێڕێ، دیار نییە! بانگی دەکاتەوە:

ـ پووری! پووریگیان! لە ناکاو زرمە لە نێو شانی حەمەوە هەستا! ئەوەندە لە ناکاو لێیدا، حەمە پێی وا بوو ماڵەکە رووخاوە بە سەریدا، وەکو خوودار هاواری کرد:

ـ ئەی ئەی!! ئەوە بۆ وادەکەی؟!

پوورەگوڵە بە کوڵەوەژەوە لای دەرگای پێ گرتووە و وەریگەڕاوەتێ. دەست ناپارێزێ، هەر لێیدەدا، دەڵێ.

ـ ئەوە، ئەوە، ئەوە تۆ! هەی بیژوو بە گەوجم دەزانی؟ چەتەم پێ دەرمان دەکەی؟ خۆت بە زیرەک دەزانی، من بە شێت؟

حەمە دەستی گرتووە بە سەریەوە دەپاڕێتەوە، بە دەم پاڕانەوە گوتی:

ـ بۆ لێم دەدەی؟ چم کردووە؟

پوورەگوڵە وەک لۆک گەرم بووە، کەف دەچێنێ، بە کەف چاندنەوە گوتی:

ـ چەتەم پێ دەرمان دەکەی؟ سەروسڕت لەگەڵ ئەوانەیە؟ دەبڕۆ بڕۆ تۆش ببە بە چەتە و ڕێگر، کەسێ لە لێفەی بابی خۆیدا گەورە نەبێ و لە قوونی ماڵان چاوی پشکووت، هەر دەبێ وابێ! خەتای تۆ نییە، من گەوجم! دەنا چۆن شەو و نیوە شەو دەکەومە شوێن پاشەڵ گواوی وەک تۆ؟

پوورەگوڵە دەستی لە لێدانی کێشاوەتەوە، حەمە وەک منداڵ بە دیوارەوە پاڵیداوە و سەری بەرداوەتەوە، نقەی لێوە نایە، مانی کردووە! دەزانێ پوورەگوڵە بە رق هەستاوی لە قسە حاڵی نابێ.

هەر دوو بێدەنگن، پوورەگوڵە بە چاوی تووڕەییەوە دەڕوانێتە حەمە، لەدڵەوە بۆی دەسووتێ، زوو زوو تەماشای دەکا.

حەمە دەزانێ هەڵیەتی، پشتی لەدیوار کردووە و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ بۆ تووڕە بووی پووریگیان؟ چیان گوتووە؟

پوورەگوڵە جوابی نەداوە، وەک تۆراو رووی وەرگێڕا.

حەمە لە دواوە باوەشی پێدا کردووە، ماچی دەکا، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ تۆ لە منت داوە، دەشتۆریی؟ ئاخر چم کردووە؟

پووره‌گوڵه روویکرده‌وه حه‌مه، گوتی:

ـ ده‌یانگوت تاهیر چه‌ته و پیاوکوژه! تۆ ده‌تزانی وایه، بۆ منت بـرد پێـت ده‌رمـان کردم؟

حه‌مه نێو چاوانی وێک هێناوه‌ته‌وه، راست ته‌ماشای پووره‌گوڵه ده‌کا، بـه یه‌قینـه‌وه گوتی:

ـ ده‌ی ده‌بێ وا بڵێن، خۆ ناڵێن تاهیر پیاوی چاکه! که‌سێ قینی لـه که‌سـێ بـێ، بـه خراپه باسی ده‌کا، خۆ من نازانم چاکه، یان خراپه، منیش وه‌ک تـۆی ده‌ناسـم، خه‌ڵـک ده‌ڵێن پووره‌گوڵه دوڕناسه، منیش پێموایه، خۆت وه‌ره بیدوێنه، ئه‌گه‌ر خراپـه‌کـاره، بـا دووری لێ بکه‌م، ئه‌گه‌ر پیاوی چاکه، تۆ چاکه‌ت له‌گه‌ڵ کـردووه، چاکـه لای خـودا و خه‌ڵک ون نییه،

پووره‌گوڵه بزه که‌وتۆته سه‌ر لێوی! قسه‌کانی حه‌مه‌ی به‌دڵه، گوتی:

ـ دێم، ئه‌مشه‌و دێم، پاش خه‌وتنان وه‌ره لـه دووم، وه‌ره دانیـشه، خـۆ نێـوه‌رۆژه‌ت نه‌خواردووه، خواردووته؟

حه‌مه سه‌باره‌ت به‌وه‌ی که‌دڵی پووره‌گوڵه‌ی هێناوه‌تـه‌وه جـێ، کـه‌یف سـازه، بـه پێکه‌نینه‌وه گوتی:

ـ نه‌مخواردووه، به‌ڵام ده‌ڕۆم، ماڵی حاجی چاوه‌ڕێمن.

حه‌مه له ماڵ وه‌ده‌رکه‌وتووه، گه‌یوه‌ته ده‌رکی حه‌وشه، پووره‌گوڵه بانگی کردۆته‌وه.

ـ له بیرت نه‌چێ! شه‌وێ بێیته‌وه! ده‌بێ ده‌رمانی بکه‌مه‌وه!

حه‌مه به ده‌م ڕۆینه‌وه گوتی:

ـ باشه باش، دێمه‌وه، دێمه‌وه.

## ١٤

رممه و کۆڕژەنی چل و شەش چارەوێ، پڕ بە دۆڵی دزان دەنگ دەداتەوە و کەروێشکی وازرە دوورڕەو دەکا.

پڕمە و کۆڕژەنی کوێتە تەنگی بە ئەسپی سەروان خودایی توند کردووە، لە کوێرەڕێ هەڵەی دەکا.

هەمزەبەگ لەو گیرودارەدا ماوەتەوە! هەرچەند بیری لێدەکاتەوە، بیری بڕ بە هیچ کوێ ناکا! روویکردە سەروان گوتی:

ـ جەناب سەروان! ئێستا دەفەرمووی من چ بکەم؟ ئەوەی فەرمووتە، کردوومە، بیرم بە هیچ کوێیەک ناگا! جێ نەماوە سەرمان لێنەدابێ، دەڵێی قەترەیەک ئاوە بە ئەرزدا چۆتە خوارێ!

سەروان راست لە سەر مەڵبەندی زین دانیشتووە، دەڕوانێتە دوور، بێ ئەوەی سەروەرگێڕێ، بێ بایەخانە گوتی:

ـ من چ بکەم؟ ئەوە گرێی کاری تۆیە، دەبێ خۆت بیکەیتەوە، دەبێ قولاخێکی بدەی بە دەستەوە، مردوو، یان زیندوو، من راپۆرت دەدەم، ئەوەی بووە و رووی داوە، بە سەرەوەی رادەگەیەنم، ئێتر خۆت دەزانی، چۆن جواب دەدەیتەوە، من نازانم.

هەمزەبەگ بە سەر کوێتەوە مات و کز خۆی چەماندۆتەوە، بیر لە قسەکانی فەیزە دەکاتەوە. دیسان بانگی سەروانی کردەوە، گوتی:

ـ جەناب سەروان! جێیەک ماوە بگەڕێین! زۆر جێی شکە، با سێ چوار کەس بنێرین سەرێکی لێدەن، زەرەری نییە.

سەروان چاوی لە دوور هەڵبڕیوە، دەڕوانێتە هەمزەبەگ، بە ناهۆمێدییەوە گوتی:

ـ کوێیە؟
هەمزەبەگ پشتە چەماوەکەی ڕاست کردەوە، بە هومێدەوە گوتی:
ـ دێ کۆن! زۆر جێی شکە، لەوبەرە، لەنێو ئەو کێو و شـاخەدایە، دێیـەکـی چۆڵـە، کابرایەکی شێت بە تاقەماڵە لەوێیە، زۆرم شک لێیـەتی، ئەگـەر ئیزنـت لـە سـەر بـێ، دەستەیەک بچێ، بەڵەدیان لەگەڵ دەنێرم، دەفەرمووی چی؟
سەروان ماتبووە، بێ ئاوڕدانەوە، دەستی چەپی هەڵێناو لەغاوی کێشا، ئەسپ وێـستا، دەستە وێستاون، بانگی ئیستیوار ڕەزایی دەکا:
ئیستیوار لە نێو سوارەکان هاتۆتە دەرێ، ڕکێفی لێدا و بە غـار خـۆی گەیانـدێ لـە بەرانبەری سەرواندا وەستاوە، ئیحتیرامی نیزامی بە جێ هێنا، گوتی:
ـ جەناب سەروان! لە خزمەت دام.
سەروان لە سەرەخۆ گوتی:
ـ دەستەی خۆت جیا بکەوە، لەگەڵ نۆکەری ئاغادا بڕۆ بۆ ئەو جێیەی ئەوان دەڵـێن، دەڵـێن جێـی شـکە، بـە پـارێزەوە بچنـە ژووری، دەبـڕۆ دەی، وەک ئاغـا بـاس دەکا،کابرایەکی شێتی لێیە، دەڵێ زۆر زیرەکە! خاوتـان نەبەسـتێ! هێنـدێ جەزرەبـەی بدەن بەڵکو هەواڵێکی بزانێ، دەبڕۆ.
ئیستیوار بە یاسای نیزامی، بە سوارییەوە دەستی بردە بەرچاو و خۆی قیت کـردەوە، خەبەردار وەستاوە.
هەمزەبەگ سەری کوێتەی وەرسووڕاند، بانگی ڕەسووڵی کرد.
ڕەسووڵ بە وێڵغارەوە هاتە بەردەمی ئاغا، گوتی:
ـ بەڵێ قوربان! لە خزمەتام.
هەمزەبەگ گوتی:
ـ لە خزمەت سەرکار ئیستیواردا بچۆ دێ کۆنی نیشاندە، عەبـە شـێتی پـێ بناسـێنە، ڕەنگە شتێکی لە ژوور سەر دابێ، ڕەسووڵ! ئەو سڕە ئاشکراکە، ئەوەم بـۆ ئاشـکراکەی، خەلاتت دەکەم، خەلاتی باش، خۆت ڕازی بی، دەبڕۆ بزانم چ دەکەی.
پازدە سوار بە داوێنی کێوی چل پەریدا، بە پڕتاو تێپەڕین، لە چۆم پەڕینەوە، مقەست بڕ، لە هەزار ئەشکەوتەوە وەسەرکەوتن.

لە پشتی کەلاوەکانی دێ کۆن عەبە کڕوکاش دەکا. هەر لقێ دڕوو هەڵدەبڕێ و جارێ سەر هەڵدێنێ، چاو بە دەورو پشتدا دەگێرێ. دەستەیەک سوار لە هەزار ئەشکەوتەوە سەریان هەڵدا. عەبە داس و دوو لقی داناوە، لە سەرەخۆ بەرەو ماڵ بزووە. ماوەیەکی زۆر ونبوو، پاشان هاتە دەرێ، بەرەو شوێنەکەی خۆی دەڕواتەوە، دەستی داوەتەوە داس و دوو لق دڕوو دەدووری.

سوار نزیک بوونەتەوە، گەیونەتە نێو کەلاوەکان، چوونەتە بەرماڵەکەی عەبە، عەبە چاوی لێیە، خۆ گێل دەکا، وەکو ئەوەی هەر نەیدیبێتن!

ڕەسوولی نۆکەر بانگی دەکا.

عەبە داس و دوو لقی داناوە، بە پەلە بە دەنگییەوە دێ، لە دوور بەدەمیەوە پێدەکەنێ، گوتی:

ـ ئەی وەخێر بێن! خوا ئەو قازاخمنە لێ نەسەنێ! باوەڕت بوێ دوو سێ شەوە نەخەفتووم، لەوەتی ئێژن چەتە هاتووەتە ئەم ناوچە، عەبە بیو نەسرەوتیە! دلم ریزەیەکی ماگە، ئۆغرتان خێر کا ڕەسووڵ؟

ڕەسووڵ خۆ لە ئەسپ دەهاوێتە خوارێ، بە جنێوەوە گوتی:

ـ خۆت گەوجی بیژوو! لە کوێت شاردۆتەوە؟

عەبە زاری کردۆتەوە بووە بە پەیکەرە! بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ من چەم هەس بیشارمۆ؟! من چکێ دلم بە ئاغایەلە ئەکریتۆ ئەمە تۆ چە ئێژی کا ڕەسووڵ؟! من چەم هەس؟ تا ئێوارە هەسم ئەو دوو جوانەگایە! ئەویشە خێرەو مە وەخێر داویانە پێم، گەرەکتە ئەویشم لێ بسەنی؟

ڕەسوول لێی چۆتە پێشێ، بەرۆکی گرتووە و رایدەوەشێنێ، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ خۆت هەڵە مەکە شێتی سەگ! جوانەگای چی؟ ئەو چەتەیەت لە کوێ شاردۆتەوە؟ ئاشکرا بووە، مەیشارەوە! حەمە شوان راستی گوتووە! ئەو ئێمەی ناردووە، لە کوێیە؟

عەبە سەری سوڕماوە لەو کارە! حەمە چۆن کاری وایکردووە؟ قسەکانی تاهیری هاتەوە بیر، تاهیر گوتبووی، ئەوانە زۆرزانن، درۆی وا دەکەن هەر لە راست دەچێ، قەت باوەڕیان پێ مەکەن. عەبە دیسانەوە پێدەکەنێ، دەستی ڕەسوولی لە بەرۆکی کردەوە، گوتی:

ـ گالتەم پێ ئەکەی؟ ئێستا وەختی ئەم قسە گەلە نییە کا رەسووڵ.

رەسووڵ دەسکەوساری لە ملی ئەسپەکەی داماڵــی بــە بەردێکیــەوەی دەبەســتێ، بــە کرژی رووی کردەوە عەبە، گوتی:

ـ خۆت راستی دەڵێی، یان بێم بە زۆر پێت ئاشکرا کەم؟ لە کوێت شاردۆتەوە؟

عەبە گوتی:

ـ من کەسم نەدیوە و هیچێ نازانم، بێ خۆت بگەڕێ، ئەر دۆزیتۆ، بــە شــایەتی ئــەو قازاخیەلە، ئا لەم حانە بمکوژە، بۆ چ وازم لێ ناهێنی؟ من هەسم ئەو دووکەلوایە، خــۆت بچۆوژێرە و ژووری کە، خونەمناگەسە قەور باوکم، دەبچورەژوور ئێتر وازم لــێ بێــرە، نەشاباوە شەڕوتڕ دریا وەپیا بگرێ، ئەممسا! ئاخر بێژە من چە و ئەو کاریەلە چە؟ مەیمون لە خویانییە، هاولەش دەرکا! بە خوا واز نەهێری شکات ئاغات لێ ئەکەم!

رەسووڵ رووی لە ئیستیوارە، عەبە پشتی لێیەتی، رەسووڵ تەماشای ئیــستیوار دەکــا، تەماداری دەستوورە.

ئیستیوار بە چاو ئاماژەی دەکاتێ، گوتی:

لێیدە.

عەبە و رەسووڵ هەر مشتومڕیانە، عەبە ناخافڵ زرینگەی لە پەنا ملیەوە هەڵسا! زللــەی رەسووڵ هێندە لە نەکاو بوو، عەبە لەنگەری خۆی پێ نەگیرا، رەهێل بوو.

رەسووڵ بێ بەزەیانە بە لەقەو شەپ ئەمدیوونەودیوی دەکا! خــوێن بــە دەمولــووتی عەبەدا هاتۆتە خوارێ، بە نالەوە هاوار دەکا. رەسووڵ دەسبەردار نییە! عەبە کەوتە فێڵ.

هەر دوو چاوی وەک کەشکە فەریکە لە ژێلا هات، رەشێنەی لێبڕا! زمان لــە زاریــدا هاتۆتە دەر و دەیجوێتەوە، کەف و خوێن بە لێویدا هاتۆتە خوار، هەڵێدەخلێنێ، پــشووی سوارەو لە گەروویدا تاساوە، ئێستا نــا تــاوێکی دی دەخنکــێ! رەش و شــین بۆتــەوە و وەلینگە فڕە کەوتووە و خۆ بە داروبەردا دەدا.

ئیستیوار تەزوو بە لەشیدا دێ و ترسی مردنی عەبە لە دڵی نیشتووە، بە سەر رەسووڵدا دەگوڕێنێ:

ـ چ دەکەی؟ دەیکوژی بەسیە، بــە جێــی ئــەوە بڕۆنــە ژووریێ بگــەڕێن. ئیــستیوار دەستەی بە دەوری کەلاوەدا بلاوکردۆتەوە، رەسووڵ دوو ئەمنییەی بە چەکەوە ناردۆتــە ژووریێ وخۆشی بە برنووە بەردەرکی گرتووە.

سێ قامک لە سەر سێ پەلەپیتکە دەلەرزێن! سێ دڵ بە توندی لێدەدەن و پڕن لە خورپە! شەش چاو زەق زەق بە دیوی تاریک و تنۆکدا دەگەڕێن، ترسیان لێدەبارێ و لە هەر قوژبنێ سەد تاهیر سێرەیان گرتووە و قامکیان لە سەر پەلەپیتکە داناوە، لەشی بێ هێزیان کون کون دەکا!

رەسووڵ پێشەنگە. گەرووی وشکە، ئەژنۆی بێ هێزی، لەشی بە نێو دیوی تاریکدا کێش دەکا، دەڵێی تاوانبارە بەرەو سێدارە دەڕوا!

کادێن گەڕاون، پێیان ناوەتە تەویلە، رەسووڵ پشتاوپشت دەگەڕێتەوە، لە کادێنەوە بانگ دەکا، گوتی:

ـ سەرکار! زۆر تاریکە! چاو چاو نابینێ، چ بکەین؟

ئیستیوار رەزایی گوتی:

ـ هەر کوێیەک نابینرێ، وەبەر گوللەی دەن، بست بە بست گوللە بارانی کەن.

سێ چەک تەقەیان دامەزراندووە، کەلێن و کولێن دراوەتە بەر گوللە، دار و دیوار بووە بە رووی بێژنگ، دیو پڕ بووە لە تۆز و بۆنی باروت.

لە تەقەی تفەنگ، دڵی عەبە دادەخورپێ، مەرگی خۆی و تاهیری لەبەر چاوە، بەڵام ددان بەجەرگیدا دەگرێ و چۆن کەوتووە، نابزوێ.

تاهیر لە درزی کەلەبەرەوە چاوی لە سێ چەکدارە و قامکی لە سەر پەلەپیتکەی دەمانچە داناوە، خۆی بە چارەنووس سپاردووە.

دوو ئەمنییە و قەرەیخەیەک، بە تەقە کردنەوە روویان تێکردووە. تاهیر دەزانێ تەقە لە ئاکۆییە، خۆ لە بەرکون لا دەدا.

سێ چەکدار گەیونەتە بەردەرکی ژوورەکە، چوونە ژوورێ و پاشەوپاش بوونەوە، بە کرژی چوونە دەرێ.

رەسووڵ و دوو ئەمنییە تۆزاوی و رەنگ هەڵبڕوسقاو لەبەردەمی ئیستیوار رەزاییدا وێستاون.

رەسووڵ گوتی:

ـ سەرکار ئیستیوار! دیوبەدیو و کەلێن بە کەلێن گەڕاین، کەسی لێ نییە، چ بکەین؟

ئیستیوار بە چاوێکی پڕ لە بەزەییەوە دەڕوانێتە عەبە، گوتی:

ـ ئەوە چی؟ نەهاتۆتەوە هۆش، نەمرێ!

ڕەسووڵ بە بزەوە گوتی:

ـ هیچی لێ نایە، وەک سەگ دەمی بە برینی خۆی بگا، خۆی چاک دەکاتەوە، پەرۆشی ئەوە مەبە، ئازاری لەگەڵە.

ئیستیوار نابەدڵانە سوار بۆوە، بە نیشانەی ڕۆین ئاماژە دەکاتە دەستە، سوارە سوار بوون، لە دێ کۆن دوورکەوتوونەوە، لە هەزار ئەشکەوتەوە ئاوا بوون.

سوار شوێنەواریان بڕاوە، عەبە ڕاستەوە بووە، بە هەڵاتن چووە ژووری، لە دەرگاوە بانگ دەکا، کاک تاهیر! ماوی براکەم؟

ـ ماوم عەبەگیان، لەو کونەدا خنکاوم وەرە دەرمهێنە، تۆ چۆنت نەجات بووە؟

عەبە سەوەتەی لە کەلێن لابردووە، تاهیری لە کونە دیوار دەرکێشاوە و چۆتە ژێر باڵی و بەرەو ماڵی دەباتەوە، بە دەمولووتی خوێناوییەوە گوتی:

ـ من هەزاری وەک ئەوانەم گەوج کردیە، ئەو ڕەسووڵە باوک گەماڵە فرەی دا لێم، ڕەسووڵ نۆکەر ئێژم، نۆکەر هەمزەبەگە، قەیناکە، خاسمان نەجات بوو، خوا بکا تۆ خۆش بیتەوە، من بە توون.

تاهیر لەبەر ڕووناکی کولاوکە چاوی بە دەمولووتی خوێناوی عەبە دەکەوێ، بە شەرمەوە گوتی:

ـ عەبەگیان! شەرمەزاری لای تۆم، ئەگەر نەمرم تۆڵەی تۆیان لێدەکەمەوە.

عەبە بە ئاتەگی کەواکەی دەمولووتی سڕی و گوتی:

ـ خەفەت من مەخۆ، فرە وام بە سەر هاتییە، تا تۆ وەمن قایل وی، وەدییەکانم ئەتپارێزم، گوێ بەوە مە، پیاو ماسی بگرێ قوونی ئەشێ تەروێ.

تاهیر بە دڵپڕییەوە دەستی لە ملی عەبە کردووە، ماچی دەکا، گوتی:

ـ شەرتە لە پێش چاوی خۆت تۆڵەی لێ بستێنم، مەگەر هەر وەگیرم نەکەوێ. تاهیر لە سەرجێ ڕاکشاوە، عەبە ڕۆیوەتە دەرێ.

ڕۆژ گەیوەتە ڕۆژ ئاوا، مانگ نوێیە و بە قەدەر دەمەداسێ بە ئاسمانی خۆرئاواوە وەدەرکەوتووە، مزگێنی جۆزەردان بە بێ نان دەدا.

ئەستێرە، یەک یەک لە ژوانگەی ئاسمانەوە کەوتوونەتە چاوبرکێ ئەوینداران دەخەنە بیری جێ ژوانەوە.

مەڕ لە پەچە خڕە کەوتووە، حەمە مەڕی بە سەگ سپاردووە و گەیوەتە بەر ماڵەکەی عەبە. عەبە لە سەربانە، دەنگی حەمە دەدا:

ـ کێی کوڕە؟

ـ خۆمانین، بەو شەوە بۆ چوویتە ئەو سەرە؟ کاک تاهیر چۆنە.

ـ تۆی کاکە حەمە؟ چۆنە، کەیف کەیفی ئەوە، لە تەڕ ئەخوا و لە وشک ئەخەفێ و تیهەڵدانەکەش بۆ منی بەدبەختە!

ـ لێیانداوی عەبەگیان؟

ـ لێدان؟! ئەو ڕەسوولە باوک گەماڵە کوشتمی، ڕاوەستە با بێمە خوارەوە، بۆتی ئەگێرمۆ.

عەبە و حەمە چوونەتە ژووری، تاهیر لە جێدا کەوتووە، لەم شان و ئەوشانییەوە دانیشتوون، حەمە ئەحواڵپرسی لێدەکا.

تاهیر بە شەرمەوە گوتی:

ـ باشترم، بوومەتە هۆی ئازاری ئێوە، زۆریان لە کاکە عەبە داوە.

حەمە بۆ دڵ خۆشی دانەوەی تاهیر، گوتی:

ـ لەوە گەڕێ، عەبە چۆنی شاردییەوە؟

تاهیر سەری بەرەو عەبە وەرسووڕاند، بە بزەوە تەماشای دەکا، گوتی:

ـ ئەوەی کاکە عەبە کردوویە، بە کەس ناکرێ، نازانم چۆن بوو! دەبێ خۆی بیگێڕێتەوە.

حەمە گوتی:

ـ عەبەگیان چۆنت شاردەوە؟

عەبە چاوی زیت کردۆتەوە، هەست بە شادی و غوروور دەکا، بە شانازییەوە گوتی:

ـ بەیانێکی درک دوورینەوە چوومە پشت ماڵ، چاوم تێوە بوو لە هەزار ئەشکەوتەوە هاتن بەم دیوا، گورجێ ڕامکردە ماڵ و شاردمو.

حەمە پێکەنی، گوتی:

ـ دەزانم شاردووتەوە، لە کوێت شاردەوە گەوجە پیاو؟

عەبە بە جەفەنگەوە لێی هەستاوەتە سەرچۆک، نێو چاوانی وێکهێنا، گوتی:

ـ گەوجە پیاو تۆی، چەن ساڵە تێیە ئەم ماڵەکاوڵە نازانی چۆنە، بە خوا گەوجی، لە .و تەویلە کەرهۆڵەیەکم لێ داوە، بۆ رۆژی تەنگانەم لێ داوە، گورجێ کاک تاهیرم خستە ناوی و سەوەتەیەکم نا بە رووی، جێوبانەکەم کۆ کردۆ، ئاسەوارم نەهێشتۆ، خۆم چومۆ دەشت، رەسووڵ دەسی کردە کوتانم، لێی کەوتمە فێڵ و فێم لە خۆم هاورد، چوونە ژوورۆ تەقەیان کرد، ئەونەی تەقە کریا، ئەتوت لە دڵمی ئەدەن، دڵم رێزەیەکی مابوو، خاس بوو بە سایەی خواوە نەیاندۆزیۆ، تۆ بوایی لە جیای من چت ئەکرد گەوجە! ئیشەڵلا تۆ بوایەی.

حەمە خۆی پێ رانەگیرا، دای لە پرمەی پێکەنین.

تاهیر بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ، روویکردە حەمە، گوتی:

ـ دەنگ و باس چیە؟ چوونەتە دێ چیان گوتووە.

حەمە هێشتا پێکەنینی تەواو نەبووە، بە دەم پێکەنینەوە گوتی:

ـ هیچ، هەمزەبەگ هێندێ قسەی بۆ کردبوون لەگەڵ هێندێ هەڕەشە، ئەو چوونەی ئەوان تەنیا بە زەرەری من تەواو بوو، هیچی دی.

تاهیر راست بۆتەوە، کەوتۆتە سەر لا تەنیشت، بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ تۆ بۆ؟!

ـ بە لێدانی پورەگوڵەیان دام! هەمزەبەگ گوتبووی تاهیر چەتە و رێگرە، ئەویش باوەڕی کردبوو، دەیگوت تۆ چەتەت پێ دەرمان کردووم، بە کوڵەوەژ تێم بەربوو، بە هەزار سوێند دەس بەردارم بووە، قەرارە ئەمشەو و بێ و لەو بارەوە بتدوێنێ.

تاهیر بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ دەی باشە، بە خێر بێ.

عەبە بە چەپۆک دای بە سەر خۆیدا، گوتی:

ـ ئەی برا رۆ! رۆحم لەو وروڕەی جادووە تۆقیە! ئەونەی ئەیوینم زاڵە ترەک ئەوم!

حەمە چاوێ لە تاهیر دەقرتێنێ، بێ ئەوەی پێبکەنێ، گوتی:

ـ باشە، لە بیرت نەچێ کاکە عەبەگیان، بۆ پوورەگوڵە چیە وا لێی تۆقیوی؟ مەگەر نەیبینم، مابێتمان.

عەبە بە پاڕانەوە گوتی:

ـ بۆ خاتر خوا لام لەو پیرێژنە لابە، باوە بێ جام وت، خاسە؟ بە خوا بـە قـەد دایکـم خۆشم گەرەکە، هەر لە خۆمۆ هات وەزمانما.

تاهیر تکای بۆ دەکا، حەمە تکای دەگرێ و چاوپۆشی لێدەکا، گوتی:

ـ دەیکەم بە خاتری تۆ، بۆی ناگێڕمەوە، هەستە کوانووەکە بکەوە با هێندێ گۆشـت ببرژێنین.

عەبە ئاوری کردۆتەوە، حەمە گۆشتی شەکی تویێتوێ خوێ کردووە لـە شیـشی داوە دەیبرژێنێ.

شێو خوراوە، شەو دەرنگانە، حەمە گوتی:

ـ عەبەگیان! هەستە با بڕۆین، تۆ بچۆ لای مەڕەکە، منـیش دەچـم بـە دووی پـوورە گوڵەدا با ئەمجارەش برینەکانی کاک تاهیر دەرمان کا.

حەمە و عەبە رۆیون. تاهیر لەگەڵ دەردی دەروون و ژانی برین ماوەتـەوە، سـواری باڵی خەیاڵ بووە، چۆتە رابردوویەکی دوور، رەحیمی وەبیر هاتۆتەوە:

ـ وەی رەحیم! چۆن بوویە هۆی دەربەدەریم! چەندەم هاوار کرد بەقسەت نەکردم؟

بۆ ئاوقای ئەو ورچە بووی؟ خۆشت لەنێو برد و منیشت دەبەردەر کرد! بڵێی کاڵێ لە چ حاڵدا بێ؟ خۆزگە مێردی کردبێ، ئەگەر ئەو مێرد بکا، من لەو عەزابـە رزگـار دەبم، بەخوا چاک لە بەند رامکرد! ئەگەر هەڵنەهاتبام، ئێستا لە مێـژ بـوو ئێسکیـشم رزیبـوو، حەوت ساڵە! حەوت ساڵە دەربەدەرم! لە ئێران و ئێراق جێم نابێتەوە، چ ژیـانێکی خۆشـم بوو، چاک لە دەستم دەرچوو! هەمووی خەتای بابم بوو! ئەگەر ئەو نەیناردبایەم بۆ قـەرز سەندنەوە، من چی و ماڵە ئاغا چی؟ کەنگێ کاڵێم دەناسی؟ لە کوێ رەحیمم دیبوو؟ من چی و راوی چی؟ تازە رێی گەڕانەوەشم نییە، کارێکم نەکردووە دەوڵەت لـێم خۆشـبێ! ئەوە هات و دەوڵەتیش لێم خۆشبوو، ئەی ئەو خەڵکە چ لێبکەم؟ زۆربـەیـان بـە هـۆی منەوە وەشاخی کەوتوون، وەدووی قسەی من کـەوتوون، نـا! نـا! قـەت نابـێ بـیر لـە گەڕانەوە بکەمەوە، تازە سەر و ماڵییە، یان مردن، یان سـەرکەوتن. تـاهیر هـەروا لـەو گێژاوەدا گێژ دەخوا، ئەوەی لەو ماوەی حەوت ساڵەدا بە سەری هاتووە و دیویـە، وەک هەورە برووسکە بە مێشکیدا دێ و دەڕوا، خەو بردیەوە.

بریو بریو و تەق و شەقی دەرگا، تاهیری لە خەو راپەڕاندووە، دەستی داوەتە تفـەنگ و لە سەر جێ راستەوە بووە، گوێ هەڵدەخا، دەنگی حەمە دێ، دەڵێ:

ـ پەلە مەکە، تۆ نابەڵەدی پوورێگیان، ئالەوێوە، ئالەوێوە برۆ.

تاهیر تاقە جارێ پوورەگوڵەی دیوە، شێوەی لە بەرچاو نەماوە، زۆر بۆ مێشکی دێنێ، هیچ نایەتەوە بەرچاوی، تەنیا دەنگی لە گوێیدا دەزرینگێتەوە.

جیرە لە گرێژەنەی چەپەرەوە هەستا، ئافرەتێکی گەڕاوەی توندوتۆڵ، بە ڕواڵەت کورتە باڵا، بەستەکلیلێ بە بەرۆکی چەپی کولۆنجە مۆرەکەیەوەیە، بە لای ڕاستییەوە سمڵ و مێخەک هەڵواسراوە، کرژ لە دەرگاوە هاتە ژوورێ.

تووڕە و تۆسن دیارە، لە سەر تەوێڵە گرژەکەی، دەسماڵی کەتانی سپی لارەپێچ داناوە، لەگەڵ ئەوەی کە تووڕەیە، ڕەزا سووک و لەبەر دڵانە، تووڕەیی لێ ناحەز نییە. نە کزۆڵە نە گۆشتنە، ددانی تاق و لۆق کەلەبەری تێکەوتووە، سەر ڕوومەتەکانی چرچیان تێکەوتووە، تاهیر بە دڵ خۆشی دەوێ، تەکانی دا لە بەری هەستێ.

پوورەگوڵە گوتی:

ـ مەبزووا! تۆ برینداری، حەوجێ بە هەستان ناکا، ئێستا چۆنی؟

ـ ئیمانت سەلامەت بێ، چاکترم پوورێگیان، بوومە هۆی ئازار بۆ تۆ، خودا ولامی چاکەت بداتەوە.

ـ هاتووم دەرمانت کەم و هێندێ لەگەڵت بدوێم!

ـ سەبارەت بە چی پوورێگیان؟

ـ من قسەی پێچانەوە نازانم، ئەوەی لە دڵمدا بێ، دەیڵێم، سا خۆش یا ناخۆش، تۆش ڕوو ڕاست بە.

ـ باشە، شەرتە ڕاست و ڕەوان، ئەوەی بزانم بیڵێم.

پوورەگوڵە چۆتە پەنای تاهیر دانیشتووە، بێ پێچانەوە گوتی:

ـ دەڵێن تۆ چەتەی! ئەوەی ڕاست بێ تۆ کێی؟ لەودەمەوە ئەوەم بیستووە، زۆر نیگەرانم، چووم بە گژی حەمەدا و لێشمدا، بە ڕاستی لێت دڵکرمۆڵم! دەبێ من بزانم تۆ کێی؟ دەبێ بزانم کێم دەرمان کردووە، ئەوەشت پێ بڵێم، درۆ بکەی دەزانم، درۆ لە مێشکت دەرکە، هەرچی هەی ببە، تۆ بەڕێی خۆت و من بەڕێی خۆم، دڵنیاش بە ڕاپۆرتت ناپۆرتت لێنادەم، هەر پێم خۆشە بزانم کێم دەرمان کردووە.

تاهیر بزەی لە سەر لێوە، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ هەموو شتێکت ڕاست پێدەڵێم، بەو مەرجە پەڵپی ئەوەم لێنەگری کە خەڵکی کوێم و کوڕی کێم، چونکە ئەوت پێ ناڵێم. ناوم تاهیرە، خەڵکی شارێکی کوردەواریم، بابم دارا و تاجری شارەکەمانە. هەشت ساڵ لەمەوبەر، لە خوێندن گێڕامییەوە و لە سەر دووکانی دانام، سیایی و قەرز و قوڵەی پێ دەنووسیم و پێی کۆ دەکردمەوە.

ڕۆژێ ناردمی بۆ دێیەک، پوولی لای ئاغا بوو، چوومە ماڵی ئاغا، ئەوشەوە مەرخەسی نەکردم، شەوێ لەگەڵ کوڕی ئاغا، ئەویش لە تەمەنی مندا بوو، تا دەرنگانێ دانیشتین، ناوی ڕەحیم بوو، لەگەڵ ڕەحیم هۆگری یەک بووین، بە چەشنێ پێک ڕاهاتین دەتگوت چەند ساڵە پێکەوەین. گوتم بەیانی دەڕۆم، ڕەحیم سوێندی لێ خواردم و نەیهێشت.

بەیانی زوو لە خەو هەستام، هێشتا ڕەحیم هەڵنەستابوو، لە سەر پلیکانەکان، ئافرەتێ وێستا بوو، بە پارێزەوە سلاوی کرد، کاغەزێکی لوولەکراوی دامێ بە شەرمەوە گوتی:

ـ کاڵێ خانم بە خێر هاتنت لێدەکا! هاها لەوبەر پەنجەرە وەستاوە، چاوەڕێی جوابە، من کلفەتی ئەوم، ئەوەی گوت و ڕۆیی.

خەجاڵەتییە پووڕێگیان، بەلام چۆن کارەساتەکە لەوەوە دەست پێدەکا، ناچار دەبێ باسیبکەم، دوور لە رووتان، چوومە سەر ئاودەست و نامەکەم خوێندەوە، سەرت نەیەشێنم، جوابەکەم بۆ نووسییەوە و دام بە کلفەتەکە. ئەو ڕۆژە لەگەڵ ڕەحیم چووینە ڕاو، تا ئێوارە بە دوو تفەنگی ڕەشۆکییەوە لە کێو بووین، تا ئەو ڕۆژە تفەنگم بەدەستەوە نەگرتبوو، ڕەحیم فێری کردم، سێ کەو و دوو کۆترمان کوشت، ڕەحیم کوشتبوونی.

دوو ڕۆژ لەوێ مامەوە، سەری سێ ڕۆژە چوومە لای ئاغا و ئیزنم لێ خواست بڕۆمەوە، ئاغا بێ ئەوەی قەرزەکە بنێرێتەوە بۆ بابم، مەرخەسی کردم.

سێ مانگ دوای ئەوە، ئاغا قەرزەکەی بە ڕەحیمدا ناردەوە، منیش سێ ڕۆژ ئەوم مەرەخەس نەکرد.

پاش سێ ڕۆژە، ڕەحیم ئیزنی لە بابم خواست و منی برد بۆ دێ. دۆستایەتی نێوان خۆشیمان وای لێهات بە بێ یەک گیانمان نەبوو، دوو سێ جار دەیدا بە گوێمدا داوای کاڵێ بکەن، بەلام من لە رووم هەڵندەهات.

خۆشەویستی و دڵداری من و کاڵێ هەر بە نامە بوو، جاروبار لە دوورەوە چاومان بە یەک دەکەوت، هیچی دیکە.

هاوین و پاییز رۆیی، زستان بە سەر داهات. نیوەڕاستی مانگی زستان رەحیم هات بـە دوومدا و بردمی بۆ دێ. هەموو رۆژێ دەچووینە راو. رۆژێ چووینە کێـوێ دەیـانگوت ورچی هەیە، رەحیم زۆر لە خۆ رازی بوو، ئەلحەق لێشی دە کالاوە. لـەو کێـوە هـەر وا دە گەڕاین، لوت و بزووت تووشی ورچە بووین، ورچێکـی رەشـی گـەورە، بـە قـەدەر جوانە گایە ک دەبوو، رەحیم دوو فیـشە کـی پێوەنـا، گـوتی پێکاومـە، کەوتینـە سـەر شوێنە کەی، خوێنێکی زۆر رژا بوو، شوێنمان بردە ئەشکەوتێ، رەحـیم چـووە ژوورێ، هەرچەند هاوارم کرد، بە قسەی نە کردم و چووە ژوورێ، ناچار وەدووی کەوتم، مـابووم بگەمە رەحیمیش دیار نەبوو، تفەنگ بە چوارپارە داگیرا بووە، سێرەم گرت و دەستم پێدا هێنا و هاڕەی کرد، ورچە پڕ بە ئەشکەوتە کە بۆڕاندی، نالەیە ک لە رەحیمەوە هات، کـە چوومە سەر کەلاکی ورچە، رەحیم لە ژێریدا کەوتبوو و لە حەوت سالان راست ببۆوە.

تاهیر ماوەیە کە بێ دەنگ دەستی گرتووە بە چاویەوە هەر دوو شانی هەلدەبەزنەوە.

حەمە دلی پڕ بووە، بێ ئیختیار ئاو بە چاویدا دێتە خوارێ.

پوورە گولە واق و عەبەساو دەڕوانێتە تاهیر، هیچ نالێ.

تاهیر دەستپێ دە کاتەوە:

ـ قەتم لە بیر ناچێ پوورێگیان، دەستم بشکێ و چاوم کوێر بـێ، ورچـە و رەحـیمم پێکەوە کوشت، دوور بوون و بە دەنگ نەیگەیشتمێ. پاش شین و گریانێکی زۆر، هـەر بەو چەشنە کە کەوتبوون، بە جێم هێشت و چوومەوە بۆ دێ، چاوتـان رۆژی وا نـەبینێ، بوو بە شین و گابۆڕێ وە ک رۆژی حەشر، خەلـک لەوانـە بـوو بـە زینـدوویی چـاوم دەرهێنن، بابی رەحیم دەستووریدا منیان خـستە دیـوێ. بـەیانی زوو ئەمنییـە هـات و بردمیان بۆ شار.

سەرتان نەیەشێنم، شەش مانگی رەبەق، بێ پرس و جواب لە بەنـد دا مامـەوە، پـاش شەش مانگە دەوسیەم هاتەوە. بابی رەحیم داوای کوشتنی منی دە کرد، پوولی دابـوو بـە قەتل لە قەلەم درابوو، قەتلی ئانقەست، بابیشم زۆری تەقەلا و پوولی دابوو، بـەلام تـازە کار لە کار ترازابوو، هیچی پێ نە کرا، ناچار لە لایـە کی دیکـەوە دەس بـە کـار بـوو، پوولی بە سەرۆ کی بەند دابوو بەلکە کارێ بکا.

رۆژێ سەرۆ ک بانگی کردم، گوتی:

ـ پەروەندەکەت هاتۆتەوە حوکمی کوشتنەوەی لە سەر دراوە، بە بابیشتم گوتووە، هەر ئەوەندە بوو دلم نەتۆقی، گوتم،

ـ ئەی چارە چیە؟

ئیستیوار گوتی:

ـ تەنیا ڕێیەکت هەیە، هەلێ!

گوتم:

ـ چۆن؟ لە کوێوە؟

گوتی:

ـ دەرفەت بێ دەتوانی هەلێی؟ لەڕێوە باوەڕم پێنە کرد، ئەویش تێگەیبوو من باوەڕی پێ ناکەم، گوتی:

ـ من بەراستمە! ئەگەر دەوێری، بەیانی خۆت بکە بە نەخۆش، دەتنێرم بۆ نەخۆشخانە، لە ڕێ هەلێ.

بەیانی خۆم هێنایە حالیجاو، هاوبەندەکانم لە دەرکەیاندا و بردمیانە دەرێ.

ئیستیوار بێ دەستبەند و کەلەبچە، لەگەل پاسەوانێ ناردمی بۆ نەخۆشخانە، لە ڕێ دەرفەتم هێنا و هەلاتم، ڕاستەوخۆ چوومە ئەو دیو و تێکەلاوی شۆڕشی بارزانی بووم.

چوار سال لەوێ مامەوە، لەگەل تاقمێ ئێرانی، ئەوانیش هەر یەک بە چەشنێ لە دەولەت قاچاخ بوون، ڕامان هێنایە سەر ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ ئێران، پیاو ئەگەر قەرارە گورگ بیخوا، گورگی ولاتی خۆی بیخوا، دەستەکەمان پازدە کەس بوو. ئیستا سێ سالە لە نێو خەلکی ولاتەکەماندا هەلدەسووڕێین.

بوینەتە چقلی چاوی زۆرداران، ماوەی دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەر، لە سەرحەد کەوتمە نێو ئابلۆقەی ئەمنییەوە. بە قوونە شەڕ تا ئەو مەلبەندە هاتم و بریندار بووم، ئیستا بە برینداری لەبەردەستی دایکێکی دلسۆز دام، جا نازانم دەرمانم دەکا و چاکم دەکاتەوە، یان ڕاپۆرتم لێدەدا، ئەوەش بزانە ئەو سەرە بێ قابیلە دە هەزار تمەن جایزەی هەیە!

پوورەگولە سەری بە هەنیسکەوە دەجوولێتەوە! بە دەم گریانەوە گوتی:

ـ ئەی کالێ چی بە سەر هات؟ هەوالت لێی هەیە؟ هەرماوە؟ یان بە مێرد دراوە؟

ـ هەر ماوە پوورێگیان، مێرد بە کەس ناکا.

حەمە خۆی پێ ڕانەگیراوە، چۆتە دەرێ.

پووره‌گوڵه بۆ که‌س نه‌گریاوه، وه‌ک مه‌نجه‌ڵ ده‌کوڵێ، به‌ گۆشه‌ی چاره‌که‌که‌ی چاو و لووتی وشک کرده‌وه، گوتی:

ـ ڕۆڵه تاهیر! له‌ ئێستاوه‌ من به‌ دایکی خۆت بزانه، هه‌ر کارێکت بوو ده‌نگ بکه، ده‌نگی هه‌ڵێنا و حه‌مه‌ی بانگ کرده‌وه ژووره‌. برینی تاهیری ده‌رمان کرده‌وه، به‌ حه‌مه‌ی گوت:

ـ ئه‌گه‌ر هاتییه‌وه‌ له‌ بیرت نه‌چێ ده‌ستێ جلی خۆتی بۆ بێنه، ئه‌و جلانه‌ی بێنه‌وه‌ بۆی بشۆم و بیدروومه‌وه.

پووره‌گوڵه له‌ ڕۆیندا گه‌ڕاوه‌ سه‌ر تاهیر، گوتی:

ـ ڕۆڵه! ئیشتیات له‌ چیه‌ بۆت بنێرم؟

تاهیر به‌ شه‌رمه‌وه گوتی:

ـ ئه‌گه‌ر به‌ زه‌حمه‌تی نازانی، هه‌ڵوا، هێندێ هه‌ڵوام بۆ بنێره.

پووره‌گوڵه هێندێ تێی ڕاما، پاشان وه‌پێش حه‌مه‌ که‌وت، ده‌رگایان له‌ سه‌ر تاهیر پێوه‌دا.

پازده‌ی جۆزه‌ردانه، ئێواره‌یه‌ و تاریک داهاتووه، مانگ له‌ ده‌م که‌ڵه، نیوه‌ی وه‌ده‌رکه‌وتووه.

مه‌ڕ له‌ په‌چه‌ که‌وتووه، حه‌مه‌ جامێ شیری وه‌سه‌ر کوچکه‌ ئاور ناوه، به‌ لایه‌وه هه‌ڵترووشکاوه تاهیر به‌ جووتێ چێیوشه‌وقه‌وه به‌ دیارییه‌وه وه‌ستاوه، گوێی بۆ به‌ سه‌ر هاتی حه‌مه‌ ڕاگرتووه:

ـ کاک تاهیرگیان! به‌ر له‌وه‌ی بێمه‌ دنیا، بابم له‌ به‌ین چووه، هه‌مزه‌به‌گ له‌ نێوی بردووه، یه‌ک ده‌ڵێ کوشتوویه، یه‌ک ده‌ڵێ هه‌ڵاتووه! که‌س نازانێ چی به‌ سه‌ر هێناوه، بێ سه‌ر و شوێنه! بڵێی مابێ؟ دایمه‌ دڵم ده‌ڵێ ماوه!

تاهیر بۆ دڵخۆش بوونی حه‌مه، گوتی:

ـ به‌ دوور نییه، ڕووداوی وا زۆره، ئیشائڵلا ڕۆژێ سه‌ر هه‌ڵده‌دا، دنیا هه‌زار ڕووداوی وای تێیدا ڕوو ده‌دا، چاوه‌ڕێی به.

حه‌مه گوتی:

ـ من چاوه‌ڕێم، خودا که‌یفی خۆیه‌تی، دایکیشم تا مرد هه‌ر به‌ ته‌ما بوو، به‌و ئاواته‌وه سه‌ری ناوه‌ دیدار وه‌ئاخرکه‌وتن، ئه‌و زوڵمه‌ی له‌ من کراوه، له‌ که‌س نه‌کراوه، سه‌ره‌ڕای

ئەوەش، لە کۆڵم نابنەوە، هەر ڕۆژێ بیانوویەکم پێدەگرن، لێدانێ لە منیـان دا، دوور لـە ڕووی تۆ، لە کەریان دابا دەتۆپی! ناچار دەبێ هەر دەنگ نەکەم! چـی دەکـرێ لەگـەڵ زاڵم؟

تاهیر بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ چۆن هیچ ناکرێ؟! پیاوی وەک تۆ بۆ دەبێ ئاوا بێ دەسەلات بێ؟ خەتای خۆتـە! حەمە دەرِوانێتە تاهیر، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ من چـم لـە دەسـت دێ؟ دەرەقـەتیان دێم؟ کـێ دەوێـرێ لـە پێـستی خۆیـدا بجوولێتەوە؟ هەر کەس سەر هەڵێنێ، سەری پان دەکەنەوە، قامک هەڵێنن، سەدی وەک فەیزە درێژ ڕاست دەبنەوە و دەبنە گۆپاڵی دەستیان، سەر بزێو بێ سەر دەکەن سەرەڕای ئەوەش، چوار قوڵە ئەمنییەت لێهاندەدەن، ڕاپێچێکت دەدەن، یان بـۆ کونـە ڕەش، یـان دەڵێن مەشموولی، تەفروتوونات دەکەن. ئەوەیە دەردی خەڵک کاک تاهیرگیان، دەنـا خۆیان هیچ نین.

تاهیر لە مێزە بە پێوە وەستاوە، چێو شەقەکانی، دادەنێ، دەستی ناوەتـە سـەر شـانی حەمە و سەبرێ لە تەنیشتییەوە دانیشت، گوتی:

ـ چەوتی کار هەر ئەوەیە، دار هۆرەی لە خۆی نەبێ ناقـەڵـشێ، هـۆرە لـە خۆتانـە، هەوڵبدەن هۆرەتان تێدا هەڵنەکەوێ، ئەگەر هەموو یەک بن و هۆرەتـان نـەبێ، ئـەوان چۆن دەرەقەت دێن؟ ئەوە یاسای زۆردارەکانی دنیایە، دەستەیەک لە خەڵـک دەکەنـە خۆیان و ئەوانی دیکەیان پێ سەرکوت دەکەن، خۆیان لە بەر و بۆی دەحەسێنەوە. هەوڵ دەدەن خەڵک هیچ نەزانێ، تەقەلای ئێمە ئەوەیە خەڵک ڕێورەسمی یەک گرتن فێر بن، تەنیا یەکگرتنە، بێت و هەموو یەک بگرن و بە یەکەوە پێ بدەن بە ئەرزدا، بوومە لەرزە وەڕێ دەخەن، کۆشکی زۆردارەکان دەڕووخێنن، کوڕی وەک تۆ بۆ دەبێ سەر لە بـەر ئەوانە دانەوێنێ؟ بابت ئـەوان شـرتوگومیان نـەکردووە؟ دایکـت بەوداخـەوە سـەری نەناوەتەوە؟ چۆن دەبێ دەست لە سەر دەست دانێی و هیچ نەڵێی؟! لـە چـی دەترسـێی؟ چت هەیە لە کیست بچێ؟ ماڵ و ملکە زۆرەکەت؟! ژن و منداڵـەکـەت؟ ئـاخر چـی؟ ژیان بە جەزرەبە و ئازارەوە ناخۆشە، هەر ڕۆژێکی مەرگێکە، ژیان بـە سـەر بەرزییـەوە خۆشە. مرۆڤ ڕۆژێ لە دایک دەبێ، ڕۆژێکیش دەبـێ بمـرێ، پیـاوی ئـازا لـە مـردن

ناترسێ، تۆ ئازا بە با خەڵک چاو لە تۆ کەن، تۆ چاو لەوان مەکە، تۆ ڕچەیان بۆ بشکێنە، ڕچە بشکێ خەڵکی پێدا دەڕوا،

حەمە بێ دەنگ گوێی داوەتێ، قسەکانی پوورەگوڵەی وەبیر هاتۆتەوە، ئەویش هەر ئەوانەی دەگوت، لە دڵی خۆیەوە دەڵێ.

ـ دەڵێن چت هەیە لە پاشت بە جێ بمێنێ! ئەوەی من بە جێی دێڵم، بە دنیای نادەم، سەری هەڵێنا، گوتی:

کاک تاهیر! من پێوەند لە پێمدایە! ناتوانم ببزوێم! هەر لە سەر ئەوەیە قەڵسەم لێدەگیرن.

تاهیر بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ نەکا ئاشق بی؟ ئەی فێڵەزان! ئەویش جوابت دەداتەوە؟

حەمە بە شەرمەوە گوتی:

ـ سوێندخۆری یەکین، کوڕی ئاغا واز ناهێنێ، دەڵێ دەبێ وازی لێ بێنی! من دەیهێنم! خۆ بشم کوژن کاری وا ناکەم.

تاهیر ئەوەندەی دیکە گرژ بووە، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ لایان بۆ شل مەکە، زوڵم لەوە زیاتر هەر نابێ، ئەوپەڕییە. شیر لە سەر ئاور هەڵچوو، چزە چز ڕژایە نێو سکڵ. حەمە جامە شیری لە سەر کوچکە ئاور داگرتووە، نان و شیر دەخۆن.

ئەو شەوە تا شەوێ حەمە دەردەدڵ بۆ تاهیر دەکا. تاهیر کەندوکۆسپ بۆ حەمە شی دەکاتەوە، ڕێنوێنی دەکا، نزیکە و بەیان تاهیر گەڕاوە بۆ لای عەبە.

لە دوو گەڕانی تاهیر لە گۆڕێدا نەماوە، وڵات هێمن بۆتەوە، ئاو کراوە بە ئاوردا، تاهیر چێو شەقی وەلا ناوە، وادەی ڕۆیشتنە.

نیوە شەوە، شەوشەق بووە، زرینگاوەتەوە، مانگ کەت بووە، گوڕوتینی لە دەست داوە.

حەمە بە لای دەرگاوە دۆشی دابردووە، نقەی لێوە نایە! عەبە کزومات، ئەژنۆی لە باوەش گرتووە، دوودڵۆپ فرمێسک لە قولینچکی چاوەکانیدا قەتیسن. تاهیر لە مابەینی هەر دووکیاندا وەستاوە، تفەنگی برنووی لە شان کردووە، ڕاست و چەپ، دوو ڕیز

فیشەکدانی لە خۆی داوە، نازانێ دڵخۆشـی کامیـان بداتـەوە؟ بـەرەو لای عەبـە دەڕوا، بزەیەکی لەرزۆکی لە سەر لێوە، بە پێکەنین و دڵپڕییەوە گوتی:

ـ بۆ ماتەمت گرتووە؟ دەزانم جیا بوون تاڵە، بەڵام، ناچارم.

عەبە بە پەنجە لاوازەکانی چاوی دەسڕێ، بە دڵتەنگییەوە گوتی:

ـ خووم بە تەنیایی گرتبوو، تازە خووم بە تۆ گرتییە، بێ تـۆ ژیـوارم پێنـاکرێ، بـە دەنگێکی بەرز دای لە پرمەی گریان.

تاهیر چۆتە لایەوە، دەستی لە مل کردووە، بە دڵپڕییەوە گوتی:

ـ منیش خووم بە ئێوە گرتووە، بیرتان دەکەم، کارەکە وایە دەبێ برۆم، دەڵێی چی؟ چارە نییە، بەو مەرجە بمێنم، دێمەوە بۆ لاتان، هەستە بەڕێم کە.

عەبە هەستاوە، تاهیر دەستەملانی بووە و ماچی دەکا، عەبە بێ تەکان لە جێـی خـۆی وەستاوە، واق دەڕوانێتە تاهیر، زمانی ناگەڕێ، تاهیر سێ جار لە دەرگـا چـووە دەرێ و هاتەوە ژوورێ، عەبە هەر وا وەستاوە! نە ئەو خودا حافیزی دەکا، نە عەبە هیچ دەڵێ!

حەمە دەنگی عەبە دەدا، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ بۆ وشک بووی؟! وەرە بەرێی کە.

عەبە دەڵێی خەواڵووە و لە خەو ڕاپەڕیوە! لە پڕ ئامبازی تاهیر بووە دەستی لـە ملـی کردووە هەر سێ تاپەچە، شانبەشان و دەستەملان ڕۆیشتن، تاهیر و حەمە بەرەو کانیتوو وەڕێکەوتن، عەبە بە لای مەڕەوە ماوەتەوە.

نێو دێیە، حەمە و تاهیر بێ چپە چوونەتە دەرکی پوورەگوڵە، حەمە لە دیـوار وەسـەر دەکەوێ، دەرگای کردۆتەوە، تاهیر چۆتە حەوشە، حەمە پوورەگوڵەی وەخەبەر هێناوە، پوورەگوڵە دەرگای بۆ کردنەوە، چوونە ژوورێ.

تاهیر گوتی:

ـ پوورێگیان! ئەو چاکەیەی تۆم قەت لە بیر ناچێ، زۆرت زەحمـەت بـۆ کێـشاوم، گەردنم ئازانەکەی، رزگاریم نایە، گەردنم ئازا کە.

پوورەگوڵە قورس و قایم وەستاوە، بێ دڵە راوکێ گوتی:

ـ ئەوەی کردوومە، هەزار جار گەردنت ئازا بێ، ئاگات لە خۆت بـێ، زوو سـەرمان لێ بدەوە، بێ هەواڵمان نەکەی.

تاهیر تفەنگەکەی لە شان کردووە، پوورەگولە نێو چـاوانی ماچـدەکا و وەپێـشیان دەکەوێ، تا دەرکی حەوشە ڕەوانەیان دەکا.

تاهیر و حەمە لە کێوەبەرداویلە وەسەر کەوتوون، گەیونەتە هوولەکان. حەمە وەبیری گوللەبەندەکە کەوتەوە، گوتی:

ـ تۆ ئەو خودایە قەت ئەو گوللەبەندە لە خۆت دوورمەخەوە، بە خودا من بم بە بابمی نادەم.

تاهیر قاقای کێشا، وتی:

ـ کوڕە گوللەبەندی چی؟! وەڵلا قەتم نـەدیوە! ئـەوەی بـە تـۆی گوتـووە، درۆی کردووە، دەڵێن شێخ مەحموودی نەمر بوویەتی، ئەویش کەس نەیدیوە، لەوانەیە درۆ بێ.

حەمە لە جێی خۆی وشک بووە! بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ ئەی بۆ دەتگوت بە ڕەفیقەکانمە؟!

تاهیر دەستی خستۆتە سەر شانی، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئاخر تۆ باوەڕت نەدەکرد من تاهیر بم، ناچار دەڕۆم کرد، درۆم نەکردبا، دەمـردم، حەمە بێ قسە و باس، بێ دەنگەی لێ هێنا و وەڕێ کەوتنەوە.

دۆڵی دزانیان بە جێ هێشتووە، لەداوێنی کێوی چل پەریـن، تـاهیر وەسـتاوە، ڕووی کردە حەمە، گوتی:

ـ لەوە زیاتر نابێ بێی، ئەگەر کارت بە من بوو، مەحموود شوانی کانییە کوێرە ببینە! ئەو بە شوێنم دەزانێ، ئەگەر باوەڕی نەکرد، بڵێ ڕەش لاچێ سـپی وەدەردەکـەوێ! لـە بیرت نەچێ، ڕەش لا چێ سپی وەدەردەکەوێ، خودا حافیز، حەمە لەبەرخۆیـەوە دەڵـێ، ڕەش لا چێ سپی وەدەردەکەوێ.

تاهیر دوورکەوتۆتەوە، حەمە لە جێی خۆی بە ئەرزەوە دووراوە! بـیر لـە مـەحموود شوان و قسەکانی دەکاتەوە، زمانی خۆی دەگەزێ!!

## ١٥

کۆتەڵ گێرە کراوەتەوە، گسک لە جێ خـەرمان دراوە، دەو دوو، شـەرتە شـوان و هەقە پێلاو، بەراتی مەلا و رەنجبەر، زەکات، زمهەری زستان و بەهار، تۆوی پاییزە کێڵ، قەرزی قەرزداران وەلانراوە.

مانگی رەزبەرە، کا لە کادێن، گەنم لە چاڵ و سووتەمەنی لە تایـە دراوە، سـەربان و گوێبان سواخ کراونەتەوە.

گیا و وێنجە لە سەربانان لە تایە و گیشە دراون، دوابەری وێنجە درواوە، جێ وێنجە و بێستان بەرەلا بوون.

نۆرە ئاو دامەزراوەتەوە، ئاو لە زەوی ئاژێن کراوە، کەشاوکەشی هاتۆتەوە جەنگـەی پاییزە گێلە و توو چاندنە.

قەرزی کۆن دراوەتەوە، ئازووقەی زستان، خراوە، جلوبەرگ نوێ بوونەتەوە، سەر لە نوێ سیایی نووسراوەتەوە.

پاییزە، رەنگی زەوی بزرکاوە، رۆژ کورت و فێنک، شەو سارد و درێژە.

مەر یەک دانە، شیر چەور و کەم، بەران و مەڕ رەنگ کراون، مەڕ و بەران تێکەڵە.

دەشت و کێو رووتەنە، تا چاو هەتەر دەکا بێ زیانییە، شوان ئاسوودەیە، و مـەڕ بـەر گێڕەوەی نییە.

ژنان پەلە پـڕووزەی ئازووقـە و دانـەوێـڵەیانـە، کەشـک، دۆینـە، شـەلەم وشـک کراونەتەوە، پەڕشە، تەبەق و بە با کێشاوە، کرەیە، ئاشەوان پێی لە ئاش هەڵێناوە، پەڕشە دەکا بە برۆێش، ئاش وەبەرناکەوێ.

نۆک لە خووسکراوە، وشک بووتەوە، دەستاڕ وەکارکەوتووە. ماڵە و ماڵ، ئەمدەست و ئەو دەست دەگەڕێ، نۆرەی بۆ دەگرنەوە. دەستاڕ لە ماڵی فەیزە درێژە.

قاوەلتوونە. فاتمی خێزانی فەیزە دەستی بە دەسکی دەستاڕەوە وشکبووە! دەمی زارا دەستاڕی لە کار خستووە! دەمی کردووە بە پزووە دەرپێ و لە قولی مستی ناوە، بە مۆر و پنجێکەوە گوتی:

ـ ئەیەڕۆ! فەتاح بزانێ سەرم دەتاشێ! ئەو دوو سێ جارەش لە بەر دلی عەتابەگ بوو، دەنا قەتم دەلالی نەکردووە!! بە خودای ئەوە کاری من نییە!

عەتا و فەیزە درێژ لای سەرەوە پالیانداوە بە جێوبانەوە، هەر دوو دەڕواننە یەک!! فاتم چاوێ لە عەتا دەقرتێنێ، روویکردە زارا، گوتی:

ـ بۆ خودای نەخواستە ئێمە دەلێین تۆ دەلالی؟ بۆ عەتابەگ لە سەر سووکایەتی (کەوێ)یە؟ دەیەوێ بیخوازێ، ئەوە کاری خێرە، لە قەدیمەوە گوتوویانە، هەر کەس کاری خێر رێکخا، بە ئاوری جەحەندەم ناسووتێ، تۆ دەبییە سەبەبکار، ئەوە دەلالییە خاد زارا؟

دوا بە دوای فاتم، فەیزە هەلیدایە، گوتی:

ـ زارا، زارا! تۆ گوێ بدە بە برای خۆت، تۆ بلێی و نەلێی، تازە کەوێ هی عەتابەگە! چونکە ئاغا دەیەوێ بۆی بێنێ، کوێخاش قەولی داوەتێ، ئەمڕۆ ئاغا ناردوویە لە دووی و لەم بارەوە دەدوێن، بۆیە تۆمان هەلبژاردووە، بە خوییت دەزانین، بۆیە دەلێین بە کەوێ بلێ، دەلێین با ئەویش رازی بێ، دەنا کار لەوەی دەرچووە، تۆش بیانوومان لێ مەگرە، کا فەتاح بۆ کاری خێر پێی ناخۆش نییە، ئەویش بۆ عەتابەگ، زۆری پێ خۆشدەبێ، بیری لێ مەکەوە، کاری خێر بۆ بیر کردنەوە نابێ، عەتابەگیش ئەو چاکەی تۆی لە بیر ناچێ، تۆلەت بۆ دەکاتەوە.

عەتا پشتی لە پالپشت کردۆتەوە، هاتووە بە چۆکدا، رووی لە فەیزەیە، بە زارا دەلێ:

ئەگەر خاد زارا ئەو کارە بکا و کەوێ زارای کا، دەستێ جلی سەر تا پا بۆ دەکرم.

عەسلەن خۆت بۆی بکڕە کا فەیزوللا.

زارا ماتبووە، پاشان گوتی:

ـ ئاغاگیان! وەبیرم هاتەوە! بۆ کارێ ناکەی!

عەتا رووی لە زارا کرد، گوتی:

ـ چ بکەم! هەرچی بلێی دەیکەم.

زارا دەستێکی بە لەوسیدا، هێنا، گوتی:

ـ نووشته! نووشته‌یه‌کی چه‌ور و شیرین بنووسه! بچۆ لای سه‌ید غه‌فوور نووشـته‌یه‌ک بنووسه، نووشته‌ی ئه‌و ده‌نکه جۆ به دیواردا هه‌ڵده‌گیرێ! نووشته بۆ ئیستر ده‌نووسێ بـه‌ر ده‌گرێ! به من ده‌که‌ی، ئیستا وه‌ڕێکه‌وه، ماڵه‌که‌ی له شاره، له‌مه‌یدانی ئاسنگه‌ره‌کانه، تۆ نووشته‌یه‌ک بێنه، ئیدی به ئستۆی من.

عه‌تا به سه‌رسووڕمانه‌وه ته‌ماشای فه‌یزه ده‌کا!

فه‌یزه ملی بێ دسه‌لاتی ناوه به که‌چه‌وه.

عه‌تا بێ قسه هه‌ستاوه، به‌ره‌و ده‌رگا وه‌ڕێکه‌وت.

فاتم له پێش عه‌تاوه ده‌ڕوا، که‌وشه‌کانی جوتکردووه.

فه‌یزه چۆتـه ته‌ویلـه، ئه‌سـپه‌ڕه‌ش لـه ته‌ویلـه ده‌رده‌کێـشێ، لـه ده‌رکـی حه‌وشـه رایگرتووه.

عه‌تا له‌غاو له فه‌یزه وه‌رده‌گرێ، پێی له ئاوزه‌نگی ناوه، په‌ڕیه سه‌ر پـشتی، لـه چـاو تروو‌کانێکا له دێ ده‌رچووه. سوار به تالووکه رکێف لێده‌دا، ئه‌سـپه‌ڕه‌ش لاڕێ بـووه و ده‌شت و نزار له ژێر سمیدا وێکهاتۆته‌وه، سه‌بر ده‌ڕوا.

نیوه‌ڕۆیه، عه‌تا گه‌یوه‌ته، شار، ئه‌سپی بردۆته کاروانسه‌را، به عه‌لی شـامی سـپاردووه، عه‌لی شامی ئه‌سپی ئاوداوه، کا و جوێ داوه‌تێ و قاشاوی داوه.

دوا نێوه‌ڕۆیه، تاق تاق دووکان کراونه‌ته‌وه، عه‌تا له مه‌یـدانی ئاسـنگه‌رانه‌وه بـه‌ره‌و ماڵی سه‌یید غه‌فوور ده‌ڕوا، به پرسیار ماڵی دیوه‌ته‌وه، له به‌ر ده‌رگا وه‌ستاوه.

ده‌رگایه‌کی دووتایی به دوو ریز قوبه‌ی زه‌رد، ئه‌مبه‌روئه‌و به‌ر رازاواته‌وه. له‌مـشان و ئه‌وشانی ده‌رگاکه‌وه دوو خواجه‌نشین له به‌ردی تاشراو هه‌ڵبه‌سراون، وێنه‌ی ده‌ستێ به تا ده‌رگای راسته‌وه شۆڕ بۆته‌وه و به قوبه‌یه‌کی ئاسنیندا.

ده‌ستی له‌رزۆکی عه‌تا ده‌سته ئاسنینه‌که‌ی گرتووه، دوو جار هه‌ڵیهێناوه و دایه‌وه بـه سه‌ر قوبه‌که‌دا، هه‌ستی راگرت.

خشپه‌خشپی پێیه‌ک دێ، نزیکبۆته‌وه، ده‌رگا له که‌ڵێنه‌وه قه‌ڵه‌شاوه، ئافره‌تێ گوتی:

ـ کێیه؟

عه‌تا دوو سێ هه‌نگاو له ده‌رگاکه دوورکه‌وتۆته‌وه، سه‌برێ گوتی:

ـ ماڵی سه‌ید غه‌فووره؟

ژنە سەری هێناوەتە دەرێ، رەزا سووک و بەروالەت جوان و بە تەمەن پیرە، لۆیەک
ە سەرپۆشەکەی کێشا بە روویدا و بە گۆشەی چاوێ دەڕوانێتە عەتا، لە یەکەم روانینـدا
زانی میوان بەگزادەیە، تا دەرگای خستە سەرگازی پشت، خۆی دوو هەنگاو کشاوە، بـە
حورمەتەوە گوتی:

ـ بەلێ، مالی خۆتە، فەرموو ئاغاگیان.

عەتا بە شەرمەوە شانی تیلا کرد، چووە حەوشە.

سەیدی ژن عەتا رێنوێنی دەکا، خۆی چووە ژێرخانەکە.

عەتا لە حەوت هەشت پلیکانەوە وەسەرکەوت، لە بەردەرکی وەتاخەکە وەستاوە، لـە دەرکە دەدا، جوابی فەرموو نییە! لێی دەداتەوە، جواب نییە!

سەیدی ژن لە خوارەوە گوتی:

ـ فەرموو بڕۆ ژووری، سەید نوێژ دەخوێنێ، تۆ فەرموو بڕۆ ژووری.

وەتاخێکی ژێکەلەی بەرجەوەن خۆش، پـەنجـەرەیـەکـی دوودەری روەوتـاو، لای سەرووی پەنجەرەکە هیلالی بە شووشەی رەنگاورەنگ رازاوەتەوە، پـەردەیـەکی سـپی ساکار لوول و گرێ دراوە، تا نیوەی پەنجەرەکە شـۆڕبۆتەوە. لـە بەرپـەنجـەرەکـەوە، کورسییەکی بچووکە سەری پڕە لە کتێب و کاغەز و قەلەم و جەوهەر.

سێ قالی سووری نەخشین، پڕبەپڕ وەتاخەکەیان پڕکردۆتەوە، دوو دەستە نـوێن لای سەرەوە نراون بەدیوارەوە، دوو پوپـەشمـین، بـەین بـەین گولـێنگی سـەوز و زەرد و سووریان تێهەلکێشراوە، هەر یەک لە سەر دەستە نوێنـێ، لـە ژێـر سـەرینێکی بـەرگ مەخمەری سوور دانراون، دۆشەکچەیان لە بەردا راخراوە.

لە شانی چەپی کورسییەکەوە، کەولە بەرخێکی سپی خۆشکراو لە بەر سـێ سـەرینی بەرگ زەردا راخراوە.

دیوەکە خاوێن و بۆن خۆشە. دیوار بە گلە سپی گسکە سواخ کراوە، بە هـەر بەدەنـە دیوارێکەوە ئەسپەندەری بە پارچەی رەنگاوڕەنگ گیراوەتەوە، هەلواسراوە.

لە پشتی دەستەنوێنەکانەوە، دوو تاق دەمیان کردۆتەوە، تاقی دەسـتە چـەپ هێنـدێ کتێبە کۆنی بەرگ دڕاوی چلکنی لە سەرە، ئەوی دی قورعانێکی گەورە، پارچەیـەکی سەوزی تێوە ئالاوە، لامپایەکی دە نمرە لە پەنای دانراوە، لە پشتی قورعان و لامپاکـەوە،

ئاوێنەیەکی سەنگ بە دیواری نێو تاقەکەوە هەڵپەسێراوە، هەر کەسێ لە دەرگـاوە بێتـە ژووریێ خۆی لە ئاوێنەکەدا دەبینێ.

عەتا خۆی دیوە، سەروپیچەکەی لە سەری ڕێکوپێک دەکا، بە وردی دەڕوانێتە سەید، لەو دەمەوە عەتا چۆتە ژووریێ، سەید بێ تەکان سەری ناوەتە سوژدە، لە جێی خـۆی نابزوێتەوە.

سەیدی ژن بە کتری و چادانەوە هاتە ژووریێ، بە زمانێکی شیرینەوە گوتی:

ـ ئەیرۆ ئاغاگیـان، لـەو دەمـەوە بـە پێـوەی؟ ئـەی خەجالـەت خـۆم، ئـەوە بـۆ دانەنیشتووی؟ فەرموو دانیشە.

عەتا بە شەرمەوە گوتی:

مەحتەلی سەیدم تەواو بێ.

سەیدی ژن بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ کوڕە ئەوە خووی هەروایە، تا بانگی نەکەی سەر لە بەرماڵ ناکاتەوە، سـەیدی ژن دەنگی هەڵێنا،گوتی:

ـ سەید! سەید! میوانت هاتووە، سەر هەڵێنە.

سەید غەفوور سەری لە سوژدە هەڵبڕیوە، بەئەسپایی، بە شانی چـەپـدا ئـاوڕی داوە، شاڵەکەسکەکەی لە سەر دەئاڵێنێ، پچەپچ لێوی دەبزوێ، وێرد دەخوێنێ، فوو لـە بـەری دەست و بەوشان و ئەوشانی دەکا، سەبرێ وەرسووڕاوە، عەتا بە دوو سێ وچان هەستایە سەر پێ.

پیاوێکی کورتە باڵایە، تەمەنی شەست ساڵ دەبێ. نێو چاو پاک و نوورانییـە، ڕیـشە سپییەکەی قەڵەمییە و تۆپ لە سەر چەناگەی قوت بۆتەوە، دەستێ بەڕیـشیدا دێنـێ، بـە ڕوویەکی خۆشەوە خولقی عەتا دەکا.

ـ فەرموو دانیشە، بە خێرهاتی کوڕم، بڕۆ پاڵدە بەو جێوبانەوە، لـە مێـژە وێـستاوی؟ عەتا بە پارێزەوە دانیشتەوە.

سەیدی ژن چای لە پێش داناون.

سەید چاو لە خێزانی هەڵدەتەکێنێ.

سەیدی ژن حاڵییە، بە بیانووی کارەوە، کتری و قۆری بـە کەشـەفەوە خزانـدە بـەر دەستی سەید و ڕۆیشتە دەرێ.

سەید دوو سێ جار بە خێر هاتن لە عەتا دەکاتەوە، بە بزەوە گوتی:
ـ هەرچەند عەیبە، تەشریفت لە کوێوە هاتووە؟
عەتا ئیستیکانە چایەکەی دانا، بە شەرمەوە گوتی:
ـ قوربان، من کوڕی هەمزەبەگی تازاوام، ناوم عەتایە.
سەید لە سەرەخۆ گوتی:
ـ دەی دەی، بە خزمەتی گەیوم، بابت سەلامەتە؟
عەتا دەستی بەئیستیکانە نیوەکەوەیە، کلۆیەک قەندی لە قەندانەکە دەرهێنا و لە چایەکی هەڵدەژێنێ، گوتی:
ـ دۆعاچیتە قوربان، قەندەکە دەنێیە دەمی و نێو چایەکە دەکا بە سەریدا.
چای خوراوەتەوە، سەید تەماداری دەربڕینی رازە.
عەتا سێ و دوویەتی، راز لە گەروو ناترازێ، رێی پشووی بڕیوە، وەک دووگیان بە کۆرپەی رازەوە جەڕراوە، گەرمەژان دەبرژێتەوە! پەنجە هەڵدەگولۆفێ و رەنگ دەگۆڕێ، زەرد هەڵدەگەرێ، سوور دەبێتەوە و کۆرپەی راز لە گەرووی بە تاساوی دەترازێ، سەراو دەتۆقێ.
ـ باوەلێ! دەستم بە داوێنت، گیرۆدەم! هیچم پێ ناخورێ! شەو خەوم نییە! رۆژ بێ ئۆقرەم! کەمتر لە قسە حالی دەبم، حەز ناکەم کەس بمدوێنێ، تەنانەت لە خۆشم بێزرام! خۆم لە لاسووکە! هەرچەند کە سووک نیم، تاقانە کوڕی هەمزەبەگم، سێ پارچە ملکم هەیە، بکوژ و ببر هەر خۆمم، خەڵکی سێ دێم لە بەر دەستدایە، ژین و مانیان بە دەستی منە، کەچی ژین و مانم کەوتۆتە دەستی کەسێ، دڵی بردووم، دڵیم بۆ بە دەست نایە! پەنام هێناوە، سەید پەنام بدە.
عەتا چاوەشینەکانی پڕ بوون لە ئاو، بە دەم قسەکانییەوە لێوی دەلەرزێ لەرە لە دەنگییەوە دێ.
سەید تێی راماوە، دڵسۆزانە، دڵخۆشی دەداتەوە، لە سەرەخۆ گوتی:
ـ دڵتەنگ مەبە، بە هومێدی جەددی گەورە چارەی دەردت دەکەم، ئەوە بە دەستی منەوە کەوی کولاوە، با چاوێ لە کتێب کەم.
سەید هەستاوە بەرەو تاقەی کتێبەکان دەڕوا، کتێبی هێنا، لە سەر کورسی بەر پەنجەرەکە داینا و خۆی چووە سەر کەولە بەرخەکە دانیشت، بە عەتای گوت:

ـ وەر پێشێ.
عەتا چۆتە شانی کورسیەکە دانیشتووە.
سەید کتێبی کردۆتەوە لە بن لێوەوە دۆعا دەخوێنێ، دەستی عـەتای لەسـەر کتێـب داناوە، بە پێکەنینەوە گوتی:
ـ ئەستێرەی بەختت بەرز و روونە، جار جار پەڵە هـەورێکـی بچـووک دەکەوێتـە سەری لێڵی دەکا! دڵ بـە دڵ مەدە، هەور بە ئاسمانەوە نامێنێ، ئەو ئەستێرە، ئەو کەسەیە خۆشتدەوێ، هەورەکە کەسێکە بووە بە بـەردی سـەر رێ، دیـواری لـە نێـوانی ئێـوەدا کردووە. ئەو کچە لە خشتە براوە، دڵی بە کەسێکی دیکەوەیە، دوو دڵە، تۆشـی خـۆش دەوێ! نازانێ کێهاتان هەڵبژێرێ، قەولی بەو داوە، بە رووودا کەوتووە، بیر بکـەوە بزانـە ئەو کوڕە ناوی چیە با بیسووتێنم! هۆی دوو دڵی ئەو کچە هەر ئەوەیە.
عەتا لێوی بردووە بە دەمدا، بە لێوە کورۆژە، گوتی:
ـ دەزانم کێیە، تۆش نەیسووتێنی، خۆم دەیکوژم، حەمە شوانە، خۆم دەزانم.
سەید دەستی عەتای گرتووە، رایدەتەکێنێ، بە هێمنی گوتی:
ـ کوشتن چارەی کارنییە، کارەکەت خراپتر دەکا، ئەوە کاری نووشـتەیە، گوتـت ناوی حەمەیە؟
بەڵێ، ناوی حەمەیە.
سەید غەفوور دەستی داوەتە قەڵەم و ناوی حەمە لە سەر کاغەز دەنووسێ.
عەتا سەری بردۆتە پێشێ تەماشا دەکا.
سەید دەنگی دەدا:
ـ تەماشا مەکە، نابێ تۆ بزانی من چ دەنووسم! دەنا کار ناکا!
عەتا بە شەرمەوە چۆتە دواوە.
سەید دۆعا بە سەر نووسراوەدا دەخوێنێ و ئاور لـە نـاوی حەمـە بـەردەدا، کاغـەزە سووتاو لە پەڕۆیەک دەکا، هەرگرێیەک فوویەکی لێـدەکـا، پڕێـسکەی‌دا بـە دەسـتی عەتاوە، گوتی:
ـ ئەوە نێوی ملۆزمەکەتە، نەیکەیەوە!چاڵێ هەڵکەنە و لە تەڕایی ئەرزدا بینێژە، تا ئەو پەڕۆیە نەڕزێ، کار ناکا! دەی بڵێ بزانم کچە ناوی چیە؟ بـاب و دایـک و خوشـک و براکەی؟

ـ بابی کەریم و دایکی نازەنین، خوشک و برای نییە.

سەید نووشتەی نووسیوە، قەبزە نووشتەی کردووە، هەستا و لە پەنجەرەکەوە بانگی خێزانی دەکا.

ـ شەوکەت ئەو جامە مێوەم بۆ بێنە.

سەیدی ژن جامە مێوی هێنا و سەید نووشتەی لە مێودا خووساندووە و مشەمای داوە، دای بە دەستی عەتاوە، گوتی:

ـ ئەوەش دۆعا، بەڵام شێوەی بەڕێوە بردنی، هۆشت لای من بێ، هەڵە نەکەی! هەڵە لە کاردا بێ، کار ناکا، دەستووراتەکەی جوان بەڕێوە بچێ. خەتا ناکا، گوێ بە دەستووراتەکەی بدە.

کەسێکی وا لەگەڵ کەوێ وماڵی بابی هاموشۆی بێ، دۆعاکە لە ئاو هەڵدەکێشێ و یەک بە یەک دەرخواردیان دەدا. پاشان لە بەرگێکی سەوزی دەگرێ و لەسەر دەرانەی دەرگای حەوشەکەیان دەیشارێتەوە، ئەوە دوودۆعایە، یەکیان دۆعای چەور و شیرینە، ئەوی دی ڕەشکردنە. ئەوەشت پێ بڵێم، من دۆعای وا بۆ کەس نانووسم! دڵم نەهات دڵت بشکێنم، نووسینی دۆعای وا، گوناهی زۆرە، بەڵام بابت هەقی بە سەرمەوە زۆرە.

عەتا لە خۆشیان لە هیچ کوێ جێی نابێتەوە. نووشتەی لە گیرفان ناوە، دەست لە گیرفان دەردێنێ و دەیکا بە ژێر کەوڵە بەرخەکەدا، بە پەلە دەستی سەید ماچدەکا، هەستا وەدەرکەوت.

عەتا لە پلیکان چۆتە خوارێ، لە حەوشە چووە دەرێ، سەید و سەیدی ژن قولینچکی کەوڵیان هەڵداوە، گۆشەی شینی دوو بیست تمەنی وەدەرکەوت.

دەمادەمی عەسرە. دوو سوار بەرەو دێ دێن. یەکیان لە ڕێی شارەوە، ئەوی دی لە کێوە بەرداوێلەوە دێتە خوارێ. سواری ڕێی شار قیت و قوزە، دەڵێی سەرکەوتووی بەرەی شەڕە! کەیف خۆش و بەدەماخە.

سواری ڕێی کێوە بەرداوێلە وەک پاشماوەی لەشکری شکاو سەری سەر شۆڕی بەرداوەتەوە، مات و داهێزراو خۆی باریک کردەوە، چووە نێو دێ، لە بەر دەرگا پێی لە ئاوزەنگی دەرهێنا و چارەویی کێشا حەوشە، بە وەڕەزییەوە بانگی کرد.

ـ کەوێ! نازەنین!

کەوێ لە بەرهەیوانەوە جوابی داوە:

ـ بەڵێ، ئەوە هاتم بابەگیان.

کوێخاکەریم چارەویێی لە سەر ئاخوڕی حەوشە بەستەوە، لە سەر بەردە خوێکەی نێوەڕاستی حەوشە دادەنیشێ، گوتی:

ـ دادەی ڕۆڵە ئاوێ، دِۆیەکی سارد، زۆرم تینووە.

کەوێ تازە لە کانی هاتۆتەوە، بە گۆزەڵەیەکی سوورەوە، دەم بە بزەوە بەرەو بابی دێ، لە یەکەم چاوپێکەوتن بزە لە سەر لێوی کەوێ تارا! بە دوو دڵییەوە گوتی:

ـ پەڕۆشی! چی بووە؟

کوێخا بێ جواب دانەوە، گۆزەڵەی لە دەستی کەوێ وەرگرت، نای بە سەریەوە.

ئاوی لە دەم کردۆتەوە.

کەوێ بێ ئیختیار دەپرسێتەوە:

ـ زۆر شێواوی؟ چ بووە بابەگیان؟

کوێخا تەماشایەکی تەوساوی کەوێ دەکا! دەڵێی لەو دلمەن بووە! چاو دادەخاتەوە.

رمەی سمی چارەوێیەک سەری بە کوێخا هەڵێناوە، باب و کچ بە جووت دەڕواننە دەرکی حەوشە.

سوار لەبەر دەرگا وەستاوە! بە وردی سەرنجەدەدا، بزەیەکی مانا داری لە سەر لێوە! کوێخا سەری بێ دەسەلاتی بەرداوەتەوە، کەوێ رووی بێزاری وەرگێڕاوە و دەڕوانێتە بابی.

سوار بزەی لێوی بووە لۆچ و کەوتۆتە نێو چاوانی، بە تووڕەییەوە رکێفی لێدا و بەرەو ماڵی فەیزە درێژ وەڕێکەوت.

دوا بە دوای رۆینی عەتا، کوێخا بە تووڕەییەوە هەستا، چووە ژووری.

کەوێ لە شەرمان سوورهەڵگەڕاوە، بە ترس و دوودڵییەوە بە دووی بابیدا چووە ژووری لە پشتی دەرگای دیوەکە گوێی لە قسەی دایک و بابی گرتووە.

کوێخا گوتی:

ـ چاک پێوە بووین ئافرەت! کچەتیوەکەمان لێ دەستێنن! دەست هەڵگر نییە، بە زۆر داگیری دەکەن، ئاغا دەیگوت، بەیانی کەیخودا دەنێرم، تاکەی دەستی دەستیم پێدەکەی؟ لەوە زیاتر مۆڵەتت نادەم، پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێ مارەی دەکەم.

کوێخا ژن بە پەنجە روومەتی دەڕنێ، بە دلپڕییەوە گوتی:

ـ ئەیەڕۆ! ئاخری چوویە ژێر بار؟ بە خودا کچەتیوەکەم دیق دەکا، یەخسیر فرۆشی دەکەی؟

کوێخا بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ قوڕی کوێ وەسەرکەم؟ دەسەلاتم هەیە؟ ناچارم ئاخری. دەبێ بچمە ژێر باری، دارونەدارم لە کیس دەچێ، من دەسەلاتی ئەوم نییە، بە سەد تکا خستوومەتە دوو سێ حەوتەی دیکە، ئەویش بە بیانووی کارەوە، با بزانین خودا چ دەکا، بەڵکو وەک سوڵتان مەحموود و نەجارەکەی بە سەر بێنێ.

کوێخا ئەوەی گوتو بەرەو دەرگا گەڕاوە

کەوێ بە پەلە گەڕاوە حەوشە.

پاییزە، کوڕوکاڵ خۆیان رازاندۆتەوە، خوازبێنی دەستی پێ کردووە، جەنگەی بووک گوێزانەوەیە.

عەتا حەجمانی نییە، پەیتا پەیتا لە کەوێ رادەسپێرێ، زارا تێیدا شل و کول بووە، کەوێی پێ رازی نابێ! تەنانەت نووشتەش دلی نەرم نەکردووە! زارا دەغەلی لە کاردا نییە و نەبووە! سەید غەفووریش بە دڵ بۆی نووسیوە، عەتاش باوەڕی پێیەتی، دەستووراتی سەیدیش بەڕێوە براوە! زارا سەری سوڕماوە؟! رەنگە دلی کەوێ داروبەرد بێ!! یان دلی لە دەروونیدا نەبێ!! دەنا بەردیش بایە دەبوو بە نووشتەی سەید غەفوور ببوایە بە ئاو!

ـ نازانم! سەرم سوڕماوە ئاغاگیان!! بۆ دەبێ کاری نەکردبێ؟

عەتا بە دوو دلییەوە گوتی:

ـ رەنگە تۆ شتێکت لە بیر چووبێ خات زارا.

زارا بە دلنیاییەوە گوتی:

ـ نا، نەوەڵلا، لە ئاوم هەڵکێشاوە، یەک بە یەک دەرخواردم داون، پارچەی سەوزم تێوە ئالاندووە لە سەر دەرانەم ناوە، رەنگە پرێسکەکەی تۆ نەرزیبێ، چاوت لێ کردووە؟

عەتا گوتی:

ـ نەوەڵلا، کوا بە زوانە دەرزێ.

زارا پێکەنی گوتی:

ـ دەی بۆیە کار ناکا، شەرت و شرووتی هەیە ئاغاگیان.

عەتا لە حەوشەی ماڵی فەیزە دریژ بێ دەسەڵاتانە بە دیار زاراوە وەستاوە چاوی لە دەمی ئەوە.

زارا بە پەلە گوتی:

ـ دەتەوێ کەوێ لە پێش چاوی حەمە سووک بێ؟

عەتا بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەوە چ قسەیەکە؟

زارا گوتی:

ـ ڕێیەکی باشم دیوەتەوە، ئەگەر بە قسەم بکەی.

ـ هەرچی بڵێی دەیکەم.

زارا بەنی ڕێسراوی تەشیەکەی لە سەر پەنجەی قانگلە دەکا و هەڵیکردەوە سەر تەشی، سەبرێ گوتی:

ـ خۆت قسەی لەگەڵ بکە.

ـ ئاخر گوێم ناداتێ، تەنانەت چاو لە چاوم ناکا.

زارا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ شەرمت لێدەکا، بۆیە دەڵێم، هەرچی بێ، تۆ ئاغای و ئەویش رەعیەتە، ئەگەر بیدوێنی، سامی دەشکێ، سەوازەی دەبێتەوە، بە مەرجێ حەمە دیار بێ و لە بەرچاوی ئەو بیدوێنی، بە زۆر بیدوێنە، هەموو ڕۆژێ لەگەڵ مینا دەچێ بۆ نێو مەڕ، بڕۆ لەبەر چاوی حەمە بیدوێنە، ئەوەشت لە بیر نەچێ، مینا دڵی بەئەحمەدی مام حەسەنەوەیە، ئەگەر ئەو کارە بکەی، بە تیرێ دوو نیشانە دەشکێنی، هەم کەوێ لەبەرچاوی حەمە دەخەی، هەم سامی دەشکێنی، بە زۆر ڕایگرە و قسەی لەگەڵ بکە، ڕەنگە شەرم بکەی! شەرم مەکە.

عەتا لە خۆشیان سوور هەڵگەڕاوە، ئەسپی لە حەوشە کێشاوەتە دەرێ، لێی سوار بوو ڕۆیشت.

زارا بە پل لێدانی تەشیەوە، لە حەوشەی ماڵی فەیزە دریژ هاتە دەرێ بەرەو ماڵی خۆیان ڕۆیشتەوە.

نیوەڕۆیە، مەر لە میرگی کانییە بەردینە کەوتووە. دەستە دەستە بێری بە مەڕدۆشەوە لە دێ وەدەرکەوتوون.

کەوێ و مینا شانبەشان دەڕۆن. کەوێ زەرد هەڵگەڕاوە، لێوی باری گرتووە، بە سەر ددانییەوە وشک بووە.

مینا بە جەفەنگ، بەلام دلسۆزانە گوتی:

ـ چیە دیسان؟ مەیموونەکەت تۆپیوە! دایمە دەڵێی پیرێژنی دۆ لێ رژاوی! بۆ وا بێ ـەشەی؟

کەوێ بە دلپڕییەوە گوتی:

ـ ئاگات لە دەردم نییە، کارم کراوە! ئەوەی لێی دەترسام خەریکە وەڕاست بگەڕێ، ڕێ و چارەیەک، دێن مارەم دەکەن.

مینا بە تەوسەوە گوتی:

ـ دەیباشە! دەبی بە خانم! بە راستە، یان لە خۆوە دەڵێی؟

ـ نەوەلا، لە خۆوە نالێم، بابمیان بانگ کردووە، دوو سێ حەوتە مۆڵەتیان داوە، بە گوێی خۆم بیستم، بابم بۆ دایکمی دەگێڕاوە، چ بکەم میناگیان؟ دەڵێم لەگەڵی بڕۆم، تۆ دەڵێی چی؟

ـ جا چووزانم! بلێم بڕۆ، نابێ، بلێم مەڕۆ نابێ، من لە جێی تۆبم، دەڕۆم. مینا سەری هەڵێنا وەک پەیکەر لە جێی خۆی وشک بوو! بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ باسی گورگمان کرد پەیدا بوو! ئەوە بۆ وەک بەراز سەرە ڕێی گرتووە؟!

کەوێ قەلەمەی دەست و پێی شکاوە! ڕەنگ لە روخساری پەڕیوە، بە دەمولێوە لەرێوە گوتی:

ـ چ بکەم میناگیان؟ دەیەوێ ئابڕوم بەرێ، وەرە لاڕێ بین.

عەتا ئەسپە ڕەشی لە سەر جۆگەی کانییە بەردینە بەستۆتەوە، خۆی سەر ڕێی بێری گرتووە.

فەیزە درێژ لە خوارترەوە بەرد لە زەوی هەڵدەبژێری.

دەستەیەک بێری لە نێو مەڕن، دەستەیەکی دیکە بەڕێوەن.

حەمە لە سەر کانییە بەردینە کەپەنکی ڕاخستووە، لە سەری ڕاکشاوە، چاوی لە عەتایە، کەوێ و میناشی دیوە کە لاڕێ بوون.

هەڵۆیەک لە سەر ترۆپکی هەزارئەشکەوتەوە راوی دامەزرانـدووە، بـەرز و نـەوی دەبێتەوە، لەنگەر دەگرێ ودەور لێدەدا، سای باڵ دەدا، سای شاباڵی هەڵۆکرێ لە پەلەوەر و گیانەوەر بڕیوە.

کەوێ و مینا لە رێ لایانداوە.

عەتا وردە وردە پێشاوبڕیان دەداتەوە، وەک سیر لەبەردەمیان شین بـوو، بزەیـەکی ساردی لە سەر لێوە، بە تەشەرەوە گوتی:

ـ ماندوو نەبنەوە! بۆ سڵ دەکەی کەوێ خانم، سڵ مەکە، تۆ کەوی منی.

کەوێ بووە بە مێخ زنجیر و بە ئەرزدا چۆتە خوارێ، ئاوی زاری وشک بـووە، وەک بنی ئاو دەلەرزێ.

مینا وەجواب هات، گوتی:

ـ عەیبە ئاغا! ئابڕووی دەچێ، ئەو عالەمە چاویان لێیە!

عەتا وەک یاو گرتوو سوور هەڵگەڕاوە، هیچ نابیسێ، بە تووڕەییەوە گوڕاندی،

ـ کێ لەگەڵ تۆیەتی کچەتیوە بێ شەرمە؟! بڕۆ یالـلا، دەزانم خـەریکی چـێ! مـن هێندێ قسەم هەیە دەبێ بە کەوێی بـڵێم، کـەوێ پێـی بـڵێ بـڕوا، نـەڕوا، بـە سـەری هەمزەبەگ خاڵت دەکوژم، ئەو هەتیوە شوانەش دەکوژم، هەر ئێستا لـە پـێش چـاوت دەیکوژم، دەمانچەی دەرهێناوە، روو بە حەمە گرتوویە.

کەوێ بە چاو مینا حالیدەکا.

مینا نابەدڵانە دوور کەوتۆتەوە، بە پەنجە روومەت و بەرۆکی هەڵدەگولوفێ.

عەتا ملهوڕانە لە کەوێ چۆتە پێشێ، سینگی ناوە بە سینگییەوە، هەناسـەی کـوورەی دەروونی بەفری روخساری کەوێ دەتوێنێتەوە.

کەوێ وەک شەختە لێدراو، بە هەناسەی عەتا گوڕوتینی گرتۆتەوە، رادەپەڕێ، هـەر دوودەستی ناوە بە چەناگەی عەتاوە، دەمی لە روومەتی دوور دەخاتەوە، دەزیرێنێ.

هەڵۆکە سەر هەزار ئەشکەوتی بەرداوە، لە سەر کانییە بەردینـە لەنگـەری گرتـووە، سێبەری باڵی وەسەرحەمە کشاوە، زۆر گەیوەتە ئەوپەڕی زۆرداری، ژیانی هەڵـۆیی بـە ئاوات دەخوازێ، قسەکانی تاهیر وەبیری خۆی دێنێتەوە:

ـ تۆ چت لە پاش بە جێ دەمێنێ؟«زوڵم لەوە گەورەتر هـەر نابـێ و نییـە». بـەری چاوی تاریکە و هیچ نابینێ، گوێی کەرە و هیچ نابیسێ، دەست بە گۆچانەوە رادەپەڕێ.

ژنان بە پاڕانەوە بەرەنگاری بوون، حەمە کەڕوکوێرە، قەفی گۆچانی بناوی سەر
بەرەو ژێر کردووە، دەگوڕێنێ.
- بەری دە خوێڕی.
نرکە و هەیبەتی دەنگی حەمە پڕ بە دۆڵی هەزار ئەشکەوتە، کێو ئەمبەروئەوبەر
دەنگیان داوە، خوێڕی، ڕی، ڕی.
دەنگی حەمە، دلی عەتای دا خوڕپاند.
گەلاز و زالم و بۆرە ڕاپەڕیون، لە پێش حەمەوە هێرشیان بردێ.
دەستی عەتا لە نێو قەدی کەوێ بێ هێز و شل بۆتەوە.
دەستی کەوێ بە هێزتر چەناگەی عەتا دوور دەخاتەوە، خۆی لە دەستی رزگارکرد.
سەگەل لە سێ لاوە هوروژمیان کردۆتێ.
عەتا وەک شێت هەلدەسووڕێ و تەقەیان لێدەکا، سەگەل تەنگیان پێ توند کردووە.
کەوێ خۆی لە باوەشی مینا خستووە و دەگری.
عەتا پەشۆکاوە، سەگەل کردوویانەتە نۆرەماڵ، بۆرە هێرش دەبا، تەقە بە دەمانچەوە
هەستا و تەپلی سەری بۆرەی سمی، لە خۆل گەوزا.
گەلاز و زالم لە دوو لاوە هەلمەتیان بردێ، عەتایان لە خۆل وەردا.
حەمە گەیوەتێ، خوێن لە چاوی دەبارێ! دەنگ و هانی سەگ دەدا:
- گەلاز بیگرە.
گەلاز بە گوڕەی حەمە شێلگیر بووە، کۆ ناکا، شالاو دەبا، زالم لەدواوە پەلاماری
دەدا.
عەتا لوولەی دەمانچەی ناوەتە سەر پشتی.
گەلاز مەجالی نادا، لە دواوە تێی ڕۆ هات.
عەتا وەردەسووڕێ، حەمە لە بەرانبەری وەستاوە، لوولەی دەمانچە دەکاتە حەمە، زالم
لە دواوە پەلاماری دەداتەوە، عەتا لە بەرانبەری وەردەسووڕێ، وەرسووڕان و تەقە و
قورووسکەی زالم و کەوتنی یەکە.
زالم گلا، حەمە مەجال بە عەتا نادا، قەفی گۆچان، بە هێزی پڕ لە قینی حەمە بەرز
بۆتەوە، دێتە خوارێ، پڕ بە پڕ باسکی ڕاستی عەتای گرتە بەر، سەرەو نخوون کەوتە
ئەرز. بۆڕەی عەتا پڕ بە دۆلی هەزار ئەشکەوت دەنگی داوە.

فەیزە درێژ هەستاوەتە سەر پێ، دەستی داوەتە بەرچاوی، زانی چ باسە، سەر بەرەو خواری دایە، بەرەو تازاوا هەڵدێ.

ژنان لە نێو مەڕ، مەردۆشە شیریان فڕێداوە، بە زریک و هۆڕ، بەرەو دێ دەڕۆنەوە.

عەتا دەمانچەی لە دەست پەڕیوە، دەمەو ڕوو لە بەر دەستی حەمەدا کەوتووە.

حەمە بێ بەزەییانە، بە گۆچان وەری گەڕاوەتێ و خوری شۆر دەست ناپارێزێ، ئەو دیوئەودیوی دەکا.

عەتا لە جوولانەوە کەوتووە، هەموو لەشی شەلتانی خوێنە.

مینا بە گریانەوە دەپاڕێتەوە:

ـ بەسیە کاکە حەمە، دەمرێ، قین بەری چاوی گرتووی، دەیکوژی، بەسە، بۆ خاتری خودا بەسە.

کەوێ هاتۆتە پالی مینا، باوەشی کردووە بە حەمەدا و دووری دەخەنەوە، بە زۆر گۆچانیان لە دەست ساندووە، کەوێ و مینا ئەمشان و ئەوشانیان لە حەمە گرتووە و لە نێوانی کەلاکی زالم و بۆرە و عەتادا دانیشتوون.

کەوێ بە گریانەوە گوتی:

ـ من قوڕی کوێ وەسەر کەم، بە خودا دەتکوژن.

حەمە بە توورەییەوە گوتی:

ـ دەمکوژن بە توون، ئەوەی دلم دەیویست کردم، چم بە سەردێ بابێ، تۆ نەبی، من چم هەیە لە پاشم بە جێ بمێنێ، تۆش خۆت و نامووست، مانەوەم تازە بە کار نایە، کەوێگیان! من دەڕۆم، ئەگەر مام سەرت لێدەدەمەوە، ئەگەر نەشمام، گەردنم ئازاکە.

کەوێ پەردەی شەرمی دڕیوە، لە پێش چاوی مینا باوەشی کردووە بە حەمەدا، بە گریانەوە گوتی:

ـ بۆ کوێ دەچی، دێم، سوێندەکەت لە بیرە؟

حەمە ئاو زاوەتە چاوی، کولیگریان لە ناخەوە هەڵدەقولێ، بە سەر دەروونندا خۆ زاڵ دەکا و قووتی دەداتەوە، سەری کەوێی ناوە بەسینگییەوە، چەناگەی لە سەر سەری داناوە، سەبرێ گوتی:

ـ تۆ قیبلە و دینی منی! لە هەر کوێ بم ڕۆحم لای تۆیە، من بوومە هۆی ئازاری تۆ، ئەو ڕۆژەم هەر لە بیرە، ئەرێ، من سوێندخۆری تۆم، بەلام ئێستا نابێ، بەو سوێندەی کە

خواردوومانه دەرفەت ببێ دیمەوە بە دووتدا، تا حەوتەیەک مۆڵەتم بدە، جێ و ڕێ پەیدا کەم، دیمەوە، بەو مەرجە بمێنم تا حەوت شەوی دیکە دێم و دەڕۆین، باشە کەوێگیان.

مینا چاوی بووە بە گۆمی خوێن، بە نووزەی گریانەوە گوتی:

ـ ژنان گەیونەتە دێ، فەیزە درێژ ئێستا گەیوەتە تازاوا، کەوێگیان، زووبە بەڕێی کە، ئەوەی گوت و پشتی تێکردن.

حەمە و کەوێ دەست لە یەک بەرنادەن، دڵ لە دڵ جوێ نابێتەوە، ئەژنۆ هێزی نییە، دەست توانای لە مل بوونەوەی نەماوە، پەردەی شەرم دڕاوە، قسە زۆرە و لە بیر چوونەتەوە، هەر دوو بێ دەنگ دەڕواننە یەک، عەبەساون.

مینا روویان تێدەکاتەوە.

حەمە دووسێ هەنگاو دوورکەوتۆتەوە، خودا حافیزی دەکا.

کەوێ بانگی دەکا:

ـ راوەستە حەمەگیان.

حەمە ئاوڕ دەداتەوە.

کەوێ بەرەو کەلاکی عەتا دەڕوا، دەمانچەی پەڕیوی عەتا هەڵدەگیرێتەوە، دەیدا بە حەمە.

حەمە دەمانچەی بێ فیشەکی ناوەتە بەر پشتوێن، ویستی بڕوا، کەوێ بانگی دەکاتەوە.

ئەو ئەسپە بێ خاوەنەش ببە، بە پیادە مەڕۆ.

حەمە گوتی:

ـ نا کەوێگیان، ئەسپ بۆ من نابێ، دەبێتە هۆی دەردی سەریم، ئاشکرام دەکا.

حەمە رووی وەرگێڕاوە، بێ ئاوڕدانەوە، گەلازی وەدووی خۆی خست و لە هەزار ئەشکەوتەوە وەسەرکەوت.

## ١٦

دوا نیوەڕۆیە، بایەکی توند هەڵیکردووەتێ، گێژەلووکە و تەپوتۆزە، خـۆڵ دەبـارێ. هاژەی با، داربییەکانی گوێی چۆمی نزیک تازاوای کردووە بە دەوریـش، پرچیـان لـە ئەرز دەکوتێ و راست دەبنەوە.

گڤەی با و هاژەی دار، گوێی فەیزەیان کپ کـردووە، پێچوکلاوەکـەی لـە سـەر دامالکاوە، کلاوی لە قـۆل نـاوە و پـێچ کەوتۆتـە دەوری ملـی. بـە دەم راکردنـەوە، هەردەکەوێ و هەڵدەستیتەوە. هەناسکە هەناسک گەیشتۆتە بە دەرکی قەلا. هـەلەشـەیە، پەیتا پەیتا دەروازە دەداتە بەر مست و پێلاقە.

مام عەلی بە تووڕەیی تێی ڕادەخوڕێ:

ـ کێیە؟ دەروازەکەت شکاند! ئەوە هاتم.

فەیزە لەو تووڕەتر جوابی دایەوە:

ـ بیکەوە مالوێران، بیکەوە!!

مام عەلی لەسەرخۆ دەروازەی کردەوە:

ـ چییە فەیزە؟! بۆ دەلێی رەپییان ناوی؟!!

ـ مالوێران بووین!! ئاغا لە کوێیە؟

ـ چ بووە؟ کێ مالوێران بووە؟

ـ عەتابەگی کوشت! بە خودای هەموومان دەکوژێ، ئاغا کوا؟ لە کوێیە؟ ئاغا! ئاغـا! ئا! ئا! ئا!

فەیزە کەوتە گاڵ و پخووڕ، خۆڵ بە سەردا دەکا، قەلای وەسەرگەڕا.

مام عەلی دەروازەی بەر بەرەڵلا بە جێ هێشت، عەبەسـاو، پـێ‌پـێ وەدووی فـەیزە کەوت، هەر تەقەی گوێی دێ!!

ئاغا و خانم، پێخاوس هاتنە حەوشە. نۆکەر و فەڕاش، کلفەت و مەیتەر کۆ بوونــەوە، کەس لە فەیزە حالی نابێ!

هەمزەبەگ فەیزەی گرت و رایوەشاند:

ـ چ بووە؟ بۆ حالیم ناکەی حیزباب؟

ـ عەتابەگ قوربان! عەتابەگی کوشت! حەمە هەتیو، عەتابەگی کوشت.

ـ چۆن کوشتی؟! بە چی؟ لە کوێ؟ شێت بووی؟

ـ لە کانییە بەردینە تێکهەڵچوون، ئەوەندە دەزانم عەتابەگ هــاواری لــێ هــەســتا و کەوت. بەرلە کەوتنی، تەقەیەکی زۆر کرا، پێم عەتابەگ بوو تەقەی لێدەکرد.

هەمزەبەگ لە قێندا رەش هەڵگەڕاوە، بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ نەخێر، عەتا چەکی پێ نییە، بڵێ ئەو هەتیوە چەکی پێبوو، دەبێ وا بێ، تۆ بڵێ بــەو بوو.

ـ نازانم، من دوور بووم، نەموێرا خۆ لە قەرەی دەم، ئەوندەم لــێ حاڵــییە، عەتابــەگ هاواری کرد و کەوت، منیش بە هەڵەداوان خۆم گەیاندۆتە خزمەت، وە فریا کەوە ئاغا، ئەوێ کەوتووە، وە فریاکەوە.

ـ بە خودای کەری! من چ دەڵێم. ئەو چ دەڵێ! بڵێ خۆم لەوێ بووم، کەسی لێبوو؟

ـ بەڵێ ئاغا. نێو مەڕ پڕ بوو لە ژنان، کەوێی کوێخا و مینای حاجی لە نزیکان بــوون، ئەوان نێو بژیان دەکردن.

هەمزەبەگ وەک ژێ وێکهاتەوە، بە پێخاوسی کەوتــە هــاتوچۆ. دەنگــی نۆکــەر و مەیتەر و فەڕاشی دا:

ـ زوو بن، وە خۆ کەون. رەسووڵ! ئەحمەد! بڕۆنە مزگەوت، بزانن کێی لێیــە، بــڵێن بێنە دەرکی قەڵا. رووی لە مەیتەر کرد:

ـ حەسەن! بڕۆ چارەوێ زینکە. رووی لە نازدار کرد:

ـ کچێ! بڕۆ کەوشەکانم بۆ بێنە. دە بڕۆن حیزبابینە.

نۆکەر و فەڕاش وەدەرکەوتن. مەیتەر چووە تەویلە. کلفەت لە پلیکان وەسەرکەوت. مام عەلی چووە بەر دەروازە. عەدلە خانم ســینگ و بــەروک دەکوتــێ، چــاو یەکــە و فرمێسک هەزار. هەمزەبەگ بۆ دلخۆشی دانەوەی لێی چووە پێشێ:

ـ فەیزە زۆر جێی باوەڕ نییە! باوەڕ مەکە وابێ، ڕەنگە عەتا لەوی دابێ، فەیزە بۆ خۆڕێخەری وا دەکا، درۆزنە.

ئاغا، لە خشپەی پێی نازدار، قسەکانی بڕیەوە و وەرسووڕا. نازدار کەوشی جووت دانان. ئاغا و خانم کەوشیان لە پێکرد.

دەستە دەستە ژن و پیاوی نێو دێ هاتنە حەوەشەی قەلا. ژنان بە وەیڕۆ وەیڕۆ و سنگ کوتان چوونە ژووری. پیاوان لە حەوشە مات و مەلوول وێستاون، ڕاست، یان درۆ، ماتەمیان گرتووە! کێ دەزانێ، ڕەنگە هەر ئاغاڕۆ خوداشکور بێ.

ڕەسووڵ و ئەحمەد هاتوونەوە. حەسەن مەیتەر، کوێتە و ئەسپە ڕەش و ماینە بۆرەی زین و لەغاوکراو لە سەر ئاخوڕی حەوشە بەستوونییەوە و چاوەڕێی ئاماژەیەکی ئاغایە.

هەمزەبەگ لە سەر جەوز و بنەدار بییەکان دێت و دەچێ. پیاوانی پیر و جوانی ئاوایی لە حەوشە وێستاون، کەس ناوێرێ خۆ لە قەرەی ئاغابدا. خۆی سەری هەڵێنا و چاوی بە حەوشەدا گێڕا. بە ئاماژەی دەست، کوێتەی خواست.

حەسەن، کوێتەی بردە پێشێ. دەستە جڵەوی گرت. ئاغا سوار بوو. نۆکەر و فەڕاش سوار و حەشیمەت بێ قسە و باس وە دووی سوارە کەوتن.

فەیزە دەست بە دەستە جڵەوی کوێتەوە، بە دەم ڕێوە چەقۆی قینی ئاغا تیژ دەکا:

ـ قوربان! ئەو هەتیوە خوێن بەرچاوی گرتووە! لەگەڵ منیش بەدەهۆیە! هەر ئەو عەبە شێتی هانداوە زەوی من بکێڵێ، دەنا شێت و جووتوگا؟! ئەوانە هەموو فیتی گوڵەی مام کەریمە، ئەو حەمەی هانداوە ململانێ لەگەڵ ئاغا بکا. ئەو چەتەیە کە ون بوو، بە دەستی عەبە و حەمە ون کرا، ئەویش دەستی گوڵەی تێدا بوو، ئەو دەرمانی کرد. ئەو دەمیش عەرزی ئاغام کرد، لە بیرتە؟ ئەو قسانەی فەیزە وەکو بایەک بێ و بە لای گوێیدا بێ، هەمزەبەگ تەنانەت سەریشی بۆ نا لەقێنێ، ئەنەهوو لە هیچ حاڵی نا بێ!!

ڕکێفی لە کوێتە دا و فەیزەی بە جێ هێشت.

سوارە لە پێش پیادەوە گەیشتنە کانییە بەردینە. ماڵ و پیاوی کانی توو، تاق و لۆق خەڵکی کانییە کوێرە، تەنانەت عەبە شێتیش لەوێیە! بەشێکیان لە ترسان، هێندێ بۆ ڕیا و خۆڕێخەری...، عەبە بە چ نیازێکەوە هاتووە؟! سوارە گەیشتنێ. خەڵک دڕیان دا. ئاغا دابەزی. فەیزە خۆی گەیاندێ و دەستە جڵەوی کوێتەی گرت.

عەتا وەهۆش هاتۆتەوە، دەنالێنێ. هەمزەبەگ چووە پشت سەری و چوار مێلکەیدا. سەری عەتای نایە سەر رانی. سەری لە سێ لاوە شکاوە و لەشی شەلالی خوێنە. شانی ڕاستی کەوتووە بەپشتدا و باسکی بووە بە گولینگ و لە پشتوێنە بەرەو خواری لەسمە و ئەرز ناگرێ.

دەست لە هەر کوێی دەدەن، پڕ بە زاری دەزریکێنێ. دوو کەس چوونە ژێر بالی و هەلیانساندەوە. پێی ئەرز ناگرێ، نووشتایەوە، بە باوەشیانەوە لە هۆش چوو و رایانکێشاوە.

هەمزەبەگ کاس و وڕ دەڕوانێتە رەعیەتەکانی:

ـ کێ بڕوا دەکا کەرەستەی دەست لە خاوەنی وەرسووڕێ و بیگەیێنێتە سەرە مەرگ؟! ئەویش کێ؟! شوانێ کە کەرەستەی کەرەستەکانی من بێ!! دیارە ئەوە لە خۆڕا نییە! پێش قەرەولی رووداوێکە، رووداوێکی بنەڕەتدار. لەش کێ لە دایک بووم نەدیومە، نەبیستوومە. دەنگی هەلبڕی:

ـ خەلکینە! کوڕم بەلا یەکی بە سەر بێ، خەلکی کانی توو تاونبارە! کوڕم بمرێ، کوڕیان دەکوژم، تالانیان دەکەم، مالیان ئاور دەدەم و لە ملکم دەریان دەکەم! حەمە هەتیوم لەوان دەوێ، کوێخاکەریم و حاجی قادر تاوانبارن!!

حاجی قادر بەسەرسووڕمانەوە چاوێکی بە خەلکەکەدا گێڕا و گوتی:

ـ ئێمە بۆ ئاغا؟! بەش بە حالی خۆم، کوڕم بمرێ، ئەگەر بشێوێنی و شەڕوشۆڕم پێ خۆش بێ، تاوانی من چییە؟

هەمزەبەگ بە دەسرەسڕەکەی خوێنی دەموچاوی عەتای سڕییەوە و بە توورەییەوە گوتی:

ـ کچەتیوەکانی ئێوە لە جەنگەی شەڕەکە لە لایان بوون، فەیزە ئاگای لێبووە. ئەوان نێوجێییان نەکردوون! سەیریان کردووە، حەمە هەتیو بە دەمانچە لە کوڕی منی داوە.

حاجی لە قینذا سوورهەلگەڕاوە. رەگی لاملی بووە بە داردەست، پێشی خواردەوە. هەناسەیەکی بێ دەسەلاتی هەلکێشا و بە لۆمەوە گوتی:

ـ عەیبە ئاغا! عەیبە! ئەوە قسەی تۆ نییە! تۆ خوێندەواری! ئاغا و گەورەی هەموومانی، ئەوە قسەی تۆ نییە، ئێمەومانان شتی وا بلێین، تۆ لێمان گوارە دەکەی؟ بە قسەی فەیزە مەکە، ئەو قولە فیتنەیە، بەو بێ دنیا بە یەکدا دەدا، ئەگەر راست دەکا، ئەو

بۆ نێو جنێی نەکردوون؟ بەو وتەی خۆی، ئەو لەوێ بـووە و پیاویـشە، ئـەو بـۆ دەسـتی نەگرتووە؟ درۆ دەکا ئاغا، ئەوە فوو لە ئاور دەکا، خۆ من داکۆکی لە حەمە ناکەم، هـەر دوو چاوی دەرێ، عەتابەگ قەلسە لەو دەگێرێ، لە بەهارەوە بیانووی پێ دەگرێ، ئێمـە ئاگادارین، دوو سێ جار لێیداوە، بەهارێ سەگێکی لێ تۆپاند، ئێستاش دوانی تۆپانـدووە، هاها کە لاکیان کەوتووە، فەیزە درۆ دەکا، حەمە نان بە زگیـدا راناگـا، دەمانچـەی لـە کوێ بووە؟ دەمانچە بە کوڕی تۆ بووە، ئەو سەگانە بەلگەن، ئاور هەلمەیسێنن، خەلـک تاونبار مەکەن، دوو جەحێل شەڕیان بووە، بـووە، کۆتـایی پـێ بێـنن، تـۆ گـەورەی و گەورەیی بە جێ بێنە.

هەمزەبەگ بە جنێوەوە لە حاجی راست بۆوە.

ـ تۆ چووزانی دەمانچە بە حەمە نەبووە قوڕمساخ؟ ئێوە هەمـوو گۆشـتی گایـەکـن، پشتی یەک بەر نادەن، بەیانی شکایەت دەکەم، خودام لەو خودایە حیز بابێ مۆری نـەکا، حەمەشم لە ئێوە دەوێ، یان حەمە، یان، مالی سەد تمەن جەریمە، کەیفی خۆتانە. بـە بـێ فەزیحەتەوە روویکردە کوێخاکەریم:

ـ ئەوە هەموو فیتی تۆیە! کچەکەت بە دەستەوە نەدا تاتاوای لێ هات، حەوتوویـەک مۆلەتت بێ، لە عەتای مارەدەکەی چاکە، نەیکەی، بە سەری بابم بە زۆر رایـدەکێـشم و دەرتدەکەم، حالی بووی قوڕمساخ؟!

کوێخا لانزەلیلانە گوتی:

ـ قوربان! من ئەوجار عەرزم کردی، کچ کەنیزی خۆتە، حەز دەکەی ئێـستا مـارەی کە، وەختی ئەو قسانە نییە، لە حەولی کوڕەکەدا بە، نەک...

هەمزەبەگ سەری ناوەتە بەینی هەر دوو دەستی و مـاتبووە. پـاش ماوەیـەک، بـە ئەسپایی گوتی:

رێ بەکار نابەم! ئەقلم بڕ ناکا، سەرم لێ شێواوە، چی بکەین کوێخـا؟ خـۆت چـۆن دەیزانی، وابکە.

ـ قوربان! بە من بێ دەیبەینەوە بۆ قەلا، من دەچم بە دووی پوورەگولەدا و دەیهێـنم، مەگەر ئەو، ئەویش ئەگەر بێ، باشە!

ـ چۆن نایە! خێر بۆ بابی دەکا؟! بە زۆر دەیهێنم، ئێستا رەسوول دەنێرم بە زۆر پـەتی کا.

ـ نا نا ئاغا، تۆ خووی نازانی! ئەوە گوڵە شێتە!بۆ ئەوەی نابێ، دەبێ بە زمانی خۆی لە گەڵی بدوێی. من دەچم. ئاخر حەمە بە کوڕی خۆی دەزانێ، ئەو پەروەردەی کردووە، بە منی بسپێرە، تا ئێوە دەچنەوە قەڵا، من دەیهێنم. کوێخا رووی کردە خەڵک:

ـ ئێوە دارە تەرمی بۆ هەڵبەستن و بیبەنەوە، کەسێ بچێ گوریس بێنێ، ئێستا مـن دەگەڕێمەوە. کوێخا سواری ماینە بۆرە بوو و بەرەو کانی توو وەڕێکەوت.

خەڵک وە خۆکەوتن. دەسەیەک چوون بۆ دار بڕین، فەیزە سـوار بـوو و چـوو بـۆ گوریس لە تازاوا، هەمزەبەگ و کەیخوداکان بە دیار عەتاوە داماون.

مەڕ بێ شوان و سەگ لە بێرگ رایداوە و خۆرە تاوی هەزار ئەشکەوتی گرتۆتە بەر، خەڵکی کانی توو کەوتوونە بیری مەڕی بێ شوان.

ئەحمەدی مام حەسەن و عەلی حاجی قادریان هەڵبژارد ئەو رۆژە بچینە بـەر مـەڕی. ئەحمەد و عەلی وەدووی مەڕ کەوتن.

دار بڕ داریان هێناوە، فەیزە بە گوریسەوە لە تازاوا گەڕاوەتەوە. دارە تەرم هەڵبەسرا، عەتایان وەسەرخست و چوار دەستان بردیانەوە بۆ تازاوە.

نێو دێی کانی توو نێرینەی تێدا نەماوە. ژنان کۆڕکۆڕ لە بنـە دیـواران کۆزیلکـەیان داوە و پچەپچ، سرتە دەکەن.

زارا وەک ژان کردوو بە نێو ژناندا دەگەڕێ و لە هیچ لایەک حەجمانی نییە و جێـی نابێتەوە.

کوێخاکەریم لە کۆڵانەوە وەدەرکەوت. ژنان یەک‌یەک و دوو دوو بۆ هەواڵ بەرەو لای وەڕێکەوتن.

زارا بەر لە هەموو خۆی گەیاندێ، بێ سلاو و ماندوو نەبی، گوتی:

ـ ئەرێ عەتابەگ چۆنە؟ لەوە دەچێ بمێنێ؟

کوێخا بێ ئاوڕ دانەوە جوابی داوە:

ـ خودا بە روحم بێ، خودا بەزەیی بە ئێمە دا بێ.

فاتمی خێزانی فەیزە درێژ وە جواب هات:

کەس لە مەکری تۆ ناگا زارا! وەڵلا وات بەکوشتدا خۆی بە خۆی نەزانی!

زارا چاوی وێکنا و زاری کردەوە:

ـ جا من بۆ؟ بۆ نایینیی بە سەر مندا دێڵە بێ بن!

ـ ئێ ئێ!! ئەوە بە من دەڵێی زارا...؟! عەتابەگ ... خۆ ماست نییە بە لێوتەوە دیار بێ!
زارا هاشاوێلکی بردێ و گوتی:
ـ ئەی خۆت؟! نەهاتم بە سەر تانا؟! هەمزەبەگت لە بیر چۆتەوە، بە بێ... نەیدای بە فەیزە درێژەی قورمساخ؟ خۆ ئەوە هەموو دەزانن.
زارا و فاتم چنگاولی یەک بوون، دەستیان داوەتە سەر و قژی یەکتر، زارا پەلکەی فاتمی لەدەست هاڵاندووە و خاوەکێشی دەکا. فاتم بەدەستیەوە دەزیڕێنێ. ژنان کەوتوونەتە بەین لێکیان کەنەوە،زارایان پێ ناوەستێ و پەلکەی فاتم بەر نادا، هاوار لە کوێخا دەکەن:
ـ مام کوێخا! بگەیە.
کوێخا لە بۆرە دابەزی، پەلکەی فاتمی لە چەنگی زارا دەرهێنا و لێکی دوور خستنەوە و بە بێ فەزیحەتەوە گوتی:
بۆ وا دەکەن ژنە تیوانە؟ نەهاتی باشە، قۆرتەکانی خراپە، ئەوە قۆرتەکانییە، ئاغا ئەوانەتان لێ ببیسێ، سەرتان دەتاشێ، شەرم نەماوە! ئاخر زەمانە!
فاتم بە گریانەوە دەڵێ:
ـ زارا... عەتابەگی نارد بۆ ڕێی مەڕی، ئەو بە کوشتی دا،بەو گوێیانەی خۆم بیستم، گوتی لەبەرچاوی حەمە، کەوێ بدوێنە، بە فەیزەشم گوتووە بۆ ئاغا بگێڕێتەوە، بۆ منداڵی خەڵک وا لێدەکا زارا دەلاڵ؟ دەستم خۆش بێ.
کوێخا سەری شەرمەزاری بەرداوە، سواریماینە بۆرە بۆوە و بەرەو ماڵی پوورەگوڵە ڕێیگرتە بەر. دوورکەوتۆتەوە، دەنگی شەڕە نێونێتکەی زارا و فاتم هەر دێتە گوێی.
لە دەرکی ماڵی پوورەگوڵە، کوێخا لە بۆرە دابەزی، لەغاوی کرد بە قۆڵدا و سەبرێ لە دەرکەیدا.
پوورەگوڵە لە حەوشەوە جوابیداوە:
ـ کێیە؟ وەرە ژووری، دانەخراوە.
ـ منم، پوورێگیان! کوێخاکەریم
ـ فەرموو، وەرە ژووری، خۆ دانەخراوە.
کوێخا دەسکەوساری بۆرەی بەست بە لاشیپانی دەرگاوە چووە حەوشە، بە ترس و دوو دڵییەوە قسەی درکاند:

ـ پووریگیان! بیستووته حەمە لە عەتای داوە؟
ـ بەڵێ بیستوومە، حەمە گیراوە؟
ـ نا نا، عەتا زۆر کوڵەوارە! فریا نەکەوی دەمرێ، بمرێ، هەموو بە سەر و ماڵەوە تێدا دەچین، ماڵ وێران دەبین، دەستم بە داوێنت پووریگیان، لە تۆ زیاتر کەس شک نابەین، دەزانم تۆ دایکی بۆ حەمە، دایکی هەمووماني، ئەمەگت بە سەرمانەوەیە، لەو شەڕە ناحەقە بمانپارێزە، لە بەر هاو ماڵەتی ئەمجارەش وە فریامان کەوە، خودا وە فریات بکەوێ، ئیشائەڵلا قەت بەردی ساردوگەرم وەڕێت نایە، خودا تۆ لە ئێمە نەستێنێ.
پوورەگوڵە دەم بە بزە و لەسەرەخۆ، گوتی:
ـ من قینم لە کەس نییە، حەمە و عەتا بە شەڕ هاتوون، قینم لە زوڵمە، عەتا زوڵمی کردووە و بە سزای خۆی گەییوە، دۆست و دوژمن جیاوازی بۆ من نییە، هەر کەس بێتە لام، بە یەک چاوتەماشای دەکەم، بە سەرچاو راوەستێ با دەرمانەکانم بێنم، لە کوێیە؟
ـ لە تازاوایە، بردیانەوە بۆ قەڵا.
ـ باشە، ئەوە دێم.
کوێخا سەری سووڕماوە! قەت پوورەگوڵەی ئاوا روو خۆش و لە سەرە خۆ نەدیوە! بە خۆی دەڵێ:
ـ ئەگەر عەتا لە حەمەی دابایە، ئێستا ئاوری دەکردەوە و دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکرد، بەڵام چون حەمە فایەقە، سووکنایی هاتووە، ماشاڵلا خودایە چ تاقەتێکت بەو ژنە داوە؟! خۆزگە بە خۆی.
پوورەگوڵە بە پڕیسکە دەرمانەوە لەبەر دەرگا سواری بۆرە بووە و کوێخا جڵەوی گرتووە، سوار و پیادە گەیینە کۆڵانی ماڵی فەیزە درێژ.
زارا و فاتم هەر دەنگیان دێ، نێونیتکە لە یەک هەڵدەدەن، زارا لە دوورەوە پوورەگوڵەی دی، خۆی باریک کردەوە و چووە ژوورێ، ئاش ئاوی کەوت!
حەوشە و ئەندەروونی قەڵا وەک شارە مێلوورە هەرجەمەی دێ، دەستەیەک دێ و یەک دەڕوا.
عەتا، بێ هۆش لە دیوەخان کەوتووە، کوێخا و پیاو ماقوولان مات و بێ دەنگ بە دیارییەوە دانیشتوون.

عەدلە خانم لە پشت سەری عەتاوە دەستی هەڵپێکاوە و لە سەرەخۆ فرمێسک هەڵدەوەرێنێ.

هەمزەبەگ بە نێو دیو و بەردەمی پیاواندا دێت و دەچێ ، دەکوژێ و دەبڕێ و جنێو دەدا، چاک و خراپ کەس هیچ نالێ.

حەوشە پڕە لە کوڕە جەحێلە و مێر منداڵ، بە دزییەوە سەریان وەسەری عەبە شێت ناوە و ئەویش جەفەنگیان بۆ لێدەدا. لە پڕ دەروازە کراوە، هەموو سەرنجیان دایە، پوورەگوڵە و کوێخا سوار و پیادە هاتنە ژووری. مەیتەر بە پیریانەوە چوو، بۆرەی لە کوێخا گرت و کێشایە تەویلە. پوورەگوڵە لە پێشەوە و کوێخا بە دوویدا، لە پلیکان وەسەرکەوتن.

دەرگا قەڵەشاوە و سەری پوورەگوڵە وە دەرکەوت، وێکڕا هەستان، بە رووییکی خۆشەوە سلاوی کرد. بێ وێستان، چووە لای عەتاوە و چاوێکی پێدا خشاند،چۆکی دادا و قۆلی هەڵماڵی، داوای ئاوی شیلەوگەرمی کرد.

عەدلە خانم ئەحمەد فەڕاشی بانگ کرد.

ئەحمەد ئاوی هێنا.

پوورە گوڵە خوێن و خۆلی دەم و چاوی عەتای شتەوە، سەری لە سێ لاوە شکاوە، دەور و بەری برینی بە مقەست هەڵپاچی، بە هەنگوین و زاخ برژاندییەوە، زەردە چێوەی بەسەر برینەوەکرد و بەستی.

کەوا کراسی لەبەر عەتا داماڵی، چاو لە شانی دەکا، شکاوە. پشتی لە چەند لاوە بووە بە کەوکەمانە، تێغەرەی پشتی، بە قەدەر قەفی گۆچان خوێنی تێزاوە، پەنجەی تێچەقاند و هێزی دایە، گوتی:

ـ برینی سەری هیچ نییە، شانی زوو دەگیرێتەوە، پشتی خراپە! سێ مۆرەی قەڵەشیوە، دەزوولەی نەپسابێ، چاکە؛ ئەگەر پسابێ، کاری من نییە، لەوانەیە کاری کەس نەبێ، فەلەج دەبێ، زوو بیبەنە شار، با حەکیمی شار چاوی لێکا.

هەمزەبەگ دەستی لە بەر پشتوێن ناوە و دێت و دەچێ، رووی لە پوورەگوڵە کرد، دەستی دەرهێنا، بە توندی رایوەشاند و گوڕاندی:

کوڕی من فەلەج دەبێ؟! دەبە خودا سەر و شانیشی چاک نابێتەوە! بە کێ دەڵێی؟ئەوە جێی گوڵلەیە گوڵلە! چۆتە نێو مێشکی، دەزانم، بۆ ئەوە وا دەکەی لە کۆڵی

حەمە ببمەوە، بە خودا لە کۆڵی نابمەوە، هەر بۆ ئەوەش هاتووی، دەزانم تۆ ئەو هەتیوەت پەروەردەکردووە، هەر تۆش هانت داوە، ئەو چەتەی کە ون بوو، بە دەستی تۆ بوو، تۆ دەرمانت کرد، ئەو چەکەش چەکی ئەو چەتەیە بوو، ئێستا کوڕی منی پێ پێکراوە، راوەستێ با رۆژ بێتەوە، بە خودای هەمووتان پێ دەور دەکەمەوە، راوەستێن، با رۆژ ببێتەوە.

پوورەگوڵە لە قیندا شین و رەش هەڵگەڕاوە، نێو چاوانی وێکهێناوە و هەموو بەندی لەشی دەلەرزێ، هەستا سەر پێ و لەو تووڕەتر گۆڕاندی:

ـ ئەوە دەڵێی چی هەمزەبەگ؟! پێتوایە منیش رەعیەتەکانی دیکەتم بەسەرمدا دەگوڕێنی؟ من ئەوان نیم، من گوڵەم، گوڵەی مام کەریم، لە رێی خودا هاتووم، کوڕی تۆ و گاوری بۆ من فەرقی نییە، من قین و کینەم لەو بریندارە نییە. دەڵێی حەمە دەست پەروەردەی تۆیە؟ بەڵێ. دەڵێی تۆ هانتداوە؟ بەڵێ. من گوتوومە مەیێڵە زوڵمت لێ بکەن، زوڵم مەکەن با واتان بە سەر نەیە. کوڕی تۆ زۆری بۆ ناموسی خەڵک هێناوە، بووە بە نێری وردەماڵ! سەر بە ماڵی هەموو کەسدا دەکا، هەر ماڵێ پیاوی لە ماڵ نەبێ، لە ژنەکانیان دەمرقێنێ و سواریان دەبێ. ئاکاری ئاوا، هەر دەبێ چاوەڕوانی وات لێ ببێ.

پوورەگوڵە وەک لۆک گەرم بووە، چاوی بەستووە و زاری کردۆتەوە، کەف دەچێنێ، ئەوەی نەدەبوو بیڵێ، گوتی. رووی لە کوێخاکەریم کردووە:

ـ هەموو خەتای تۆیە کوێخای ناکوێخا! ئەوانە بۆ ئەوە نابن، ئەوەی سەریان دەشکێنێ و ئەوەی دەرمانیان دەکا، هەربەچاوێ تەماشا دەکەن! هەستە بمبەوە، هەستە.

کوێخا هەستاوە لە بەری دەگەڕێ:

ـ پوورێگیان! قەیدێ ناکا، ئاغا دڵبریندارە، قینی هەستاوە، تۆ لە بەر ئێمە هاتووی، لە بەر دڵی عەدلە خانم.

عەدلە خانم دەستە ملانی بووە، ماچی دەکا، بە گریانەوە لێی دەپاڕێتەوە:

ـ جوابی هەمزەبەگ مەدەوە، تۆ من بناسە پوورێگیان، لەبەر من، لەبەر حەمە! بە خودای بەقەت عەتام خۆش دەوێ، حەمە و عەتا بۆ من فەرقیان نییە.

مام حەسەن و مەلا کەریم، هەمزەبەگیان بردۆتە دەرێ و بە سەریدا دێن، هەمزەبەگ خاو بۆتەوە و هاتۆتە ژوورێ و بێدەنگ دانیشتووە.

پووره‌گوڵه به‌دیار عه‌تاوه دانیشتووه و ده‌ست به کار بۆته‌وه.

عه‌تا زووزوو وه هۆش دێته‌وه و له‌سه‌رخۆ ده‌چێته‌وه. ئه‌وه‌نده‌ی دێته‌وه هۆش، به ناڵه و هاوار عالەم وه‌ره‌ز ده‌کا.

پووره‌گوڵه پرێسکه‌ده‌رمانی کۆکرده‌وه، داوای خامی نه‌شۆراو هێلکه و مێــو ده‌کــا. ئه‌وه‌ی داوای کرد، بۆیان هێنا. خامی به زه‌ردێنه شه‌لته کێشا و له شان و پشتی نا. مێــوی قاڵ کرد و خامی له نێودا موشه‌مادا و له سه‌ر شه‌لته‌وه له شکه‌سته‌ی به‌ست.

رووی کرده عه‌دله خانم و له‌سه‌رخۆ گوتی:

ـ ئه‌گه‌ر ده‌زووله‌ی نه‌پسابێ، شکسته‌کانی زوو یه‌ک ده‌گرنه‌وه، بۆ ئه‌رخه‌یانی بیبه‌نه شار، با حه‌کیم چاوی لێ کا، نه‌یخه‌نه پشتگوێ، به‌یانی بیبه‌ن. ئه‌وانــه‌ی راگه‌یانــد و بــێ مالاوایی وه‌ده‌ر که‌وت.

رۆژ له هه‌موو لایه‌ک ئــاوا بــووه. دوا بــه دوای پووره‌گوڵــه، هــه‌مــوو هــه‌ســتان. هه‌مزه‌به‌گ، کوێخا شه‌ریف و ره‌سووڵی نۆکه‌ر و کوێخاکه‌ریمی گلداوه، گوتی:

ـ به‌یانی هه‌رسێکتان به خه‌ڵکی ئه‌و سێ دێیه‌وه وه‌ده‌رکه‌ون و کێو ماڵێ له‌و هه‌تیوه بکه‌ن؛ دیتانه‌وه، لێی مه‌ده‌ن: خۆم ده‌چمه پاسگا شکایه‌تی لێده‌کــه‌م. لــه بیرتــان نــه‌چێ، سه‌رێ له دێ کۆن بده‌ن. ده‌ڵێن له‌گه‌ڵ عه‌به شێت نێوانی خۆشه.

ره‌سووڵ به په‌له گوتی:

ـ قوربان! ئه‌مرۆ عه‌به له‌گه‌ڵ خۆمان بوو، ئێستاش له حه‌وشه‌یه.

ـ که وابێ له‌وگه‌رێن، ده برۆن، به‌یانی زوو وه‌ده‌رکه‌ون.

کوێخاگــه‌ل وه‌ده‌رکــه‌وتن. کوێخــا شــه‌ریف بــه‌ره‌و کانییــه کــوێره رۆیــشته‌وه، کوێخاکه‌ریم، پووره‌گوڵه‌ی سوار کرد و بردییه‌وه بۆ کانی توو.

خه‌ڵک بلاوه‌یان کردووه. هه‌مزه‌به‌گ و فه‌یزه درێژ بــه دیــار عــه‌تاوه دانیــشتوون. فه‌یزه سه‌ری بردۆته بن گوێی هه‌مزه‌به‌گ و قسه‌ی بۆ ده‌گێرێته‌وه.

ئه‌و شه‌وه، ئه‌وه‌نده‌ی عه‌تا وه‌هۆش ده‌هاته‌وه، به هاوار و ناڵه، قه‌لای وه‌ســه‌ر خــۆی ده‌گێڕا و که‌س وه‌نه‌وز له چاوی نه‌چوو بوو.

ئه‌حمه‌د فه‌راش و حه‌ســه‌ن مــه‌یتــه‌ر لــه پــاش شــێو خواردنــه‌وه چــوون لــه دووی خوشکه‌کانی عه‌تا. ئه‌حمه‌د چووه بزوێ و حه‌سه‌ن چۆته کانی که‌روێشکه. رێی ئه‌حمه‌د نزیک بوو، ئه‌و هه‌ر شه‌وێ هاته‌وه. رێی حه‌سه‌ن دووره، نه‌گه‌راوه‌ته‌وه.

بەیانی بەر لەتاو کەوتن، ڕەسوولی نۆکەر بە خەلکی تازاواوە لـە دێ وەدەر کـەوتن. خەلکی سێ دێ، مال و پیاو وەشاخی کەوتوون و کێو مال لە حەمە دەگەڕێن.

تاووبان و بلاو بۆتەوە. حەسەن مەیتەر هاتۆتەوە. ئەحمەد و حەسەن و فەیزە درێژ لـە حەوشە خەریکی هەلبەستنی کەژاوەن، هەمزەبەگ بـە سـەریانـەوە وەسـتاوە.تەقـە لـە دەروازە هەستا. مام عەلی دەروازەی کردەوە. سێ سـوار و پیادەیـەک هاتنـە حەوشـە. ڕەشیدخان و ناسکێ خانم و سەعیدی نۆکەرە، پیاوێ دەستە جلەوی ماینەکـەی ناسـکی خانمی گرتووە. سوارە لە چارەوێ دابەزین.

ئەحمەد و حەسەن بە پرتاو چوون و هەر یەک چارەوێیـەکیـان گـرت و کێـشایانە تەویلە، جلەودار بە ماینەوە لە حەوشە وەستاوە.

هەمزەبەگ دوو سێ هەنگاو بە پیریانەوە چووە پێشێ.

ناسکێ بە بانگ و سەلا دەگری و خۆی دەڕنێ.

هەمزەبەگ وەپێشیان کەوت و چوونە سەرێ.

ڕەشید خان لە پەنجەرەوە بانگی جلەودار دەکا:

ــ کەریم! تۆ بڕۆوە.

کەریم بێ ئەوەی ئاو لە زاری وەردا، سەری ماین بوو بەرەو بژوێ گەڕاوە.

ئەحمەد و حەسەن و فەیزە کەژاوەیان لە ئەسپەڕەش هـەلـبەسـتووە و چـاوەڕێـی فەرمانی ئاغان.

هەمزەبەگ لە پەنجەرەوە بانگی کردن:

ــ وەرن عەتا بەرنە خواری با وە درەنگ نەکەوین.

هەر سێ چوونە ژوورێ، چوار دەستان عەتایان بـە دارەتـەرم هێنایـە خـوارێ و لـە کەژاوەیان خست. هەمزەبەگ و ڕەشید خان و سەعیدی نۆکەر سـوار بـوون. ئـەحمـەد جلەوی ئەسپە ڕەشی گ[illegible] [illegible] دەژاوەی عەتا رادەکێشێ. فەیزە و حەسەن تا سەر چـۆم کەژاوەیان ڕەواند [illegible]

عەدلە خانم و [illegible] [illegible] چوونەتە بەر دەروازە و چاویان بڕیوەتـە کـەژاوەی عەتا.

سێ سوار و پیادەیەک بەرەو دێ [illegible]. لەوبەری چۆم بە کەژاوە گەیشتن، هەموویـان دابەزین، تەنانەت هەمزەبەگیش! عەدلە خانم بە گریانەوە وتی:

ـ قادرخان و تەنکەیە. نازدار! تۆ بڕۆ بەلای نەهار سـازکردنەوە، مریـشکێ بگـرە و سەری برە.

نازدار رۆیی. عەدلە خانم چاوەڕێ وەستاوە. سوارە سوار بوونەوە، سوار و پیادەیـەک بەرەو دێ دێن. کەژاوە بەرەو شار وەڕێ کەوتەوە، دوو سوارەکەی دی کەوتنە تـەکی. سوار و پیادە، تەنکە و جلەو دارەکەی بوون.

نیوەڕۆیە. کەژاوە گەیوەتە شار، لـە بـەردەرکی مالـی عـەلی خـانی بـن ئـامۆزای هەمزەبەگ راوەستاوە. عەتایان چوار دەستان بردە ژووری.

ئەحمەد و سەعید و عەزیزی نۆکەری قادرخان هەر یـەک سـواری ئەسـپێ بـوون و یەکی ئەسپێکیان بە دووی خویاندا یەدەک راکێشا و بردیانە کاروانسەرا.

قاو لە شار بلاوە، زار بە زار دەگەڕێ: شوانێ لـە ئاغـای دزی!! دەلـێن کـوڕە ئاغـا هیلاکە! شوانە خۆی بە دەستەوە نەداوە، شوانی کانیتووە، کوڕی هەمزەبـەگـی داوە! دەلێن شوانە چەکی پێیە! ئاغای ئەو ناوە وەدووی کەوتوون. لە قسان کەس ناوێرێ خـۆ لە قەرەیدا! شوانە وەشاخی کەوتووە، دەلێن سوێندی خـواردووە ئاغـاوات لـە بەسـاتدا نەهێلێ!!

لە مالی عەلی خان شاندار شانی دەشکێ! دەسـە دەستە ئاغاوات لـە هاموشـۆدان. دوو دوو و سێ سێ لە دێهاتەوە، بە دەولەمەند و دەسکورتەوە هاتوون و دێن. مـال پـڕە لـە میوان. ئەحمەد فەڕاش لە پەستا چا تێدەکا و دەیگێڕێ.

هەمزەبەگ باسەکە دەگێڕێتەوە:

ـ خەلکی سێ دێم وەدووخستووە، لە ژێر ئەرز بێ، دەیخەنە سەر ئەرز، بیگرن، دەیدم بە دەستەوە، تا دەمرێ لە بەندا بێ، بە سەری ئەو مەجلیسە، بـۆ عالـەمی تـەنبێ دەکـەم، عالەمی پێوە تەنبێ دەکەم، کارێ دەکەم، هەتا هەتایە هیچ رەعیەتێ دەست لـە ئاغـاوات هەلنەهێنێتەوە.

ئاغایەکی چوارشانەی جوانچاک هەلیدایە:

کاک هەمزە! لە قسان ئەو کێشە و هەللایە لە سەر کچێکە! وەک دەلێن دلـی بـەو هەتیوەوەیە، راستە؟

ـ بەلێ، وا دەلێن.

ـ دەیجا لە خۆڕا پیاوت وەدوو خستووە، وای گورگە دەبێتە چەتە، بە من بێ، لە ئێستاوە پیاو دەنێرم بە خەڵک ڕاگەیێنێ، وازی لێ بێنن، دەیخەمە زاری خەڵک، ئاغا جەبەی کردووە، وڵات ئەهۆن دەکەمەوە، ئەهۆن بێتەوە، خۆی دێتەوە، شەوانە دێتەوە، دوو نۆکەر خۆی لێڕاخەن و بیگرن، ئەو دەم چت پێ خۆشە بیکە، بە من ئاوا دەکەین، ئاغاکان! ڕاتان لە سەر چییە؟ ئەو پێشنیارەتان پێ چۆنە؟

ڕەشید خانی زاوای هەمزەبەگ گوتی:

ـ ئەو فەرمایشەی کاک بوداخ جوانە، مامە هەمزەش خۆی باشتر دەزانێ، ئەگەر ئەوەی پێ باش بێ، من سەعید دەنێرم، هەر ئەوی بەسە.

قادرخانی زاوای و ئاغاکانی دیکەش سەلماندیان.

هەمزەبەگ مات بووە، بیری لێدەکاتەوە، پاشان گوتی:

ـ دەی باشە، ئێوە ڕاتان لە سەرە، منیش پێم چاکە، کە وابێ، شکایەتی ناوێ، دەیەوێ؟

بوداخ جوابیداوە:

ـ نەخێر، شکایەتی بۆ چیە؟ پاسگا و ئەمنییە بە خۆمانە، چۆنمان پێ خۆش بێ، وا دەکەین، بەڵام گەواهی دوکتۆر پێویستە، بۆ پاشە ڕۆژ چاکە، دوکتۆریش لە خۆمانە، دوکتۆر ئەمینی زاوای خۆمە و سەرپەرشتی نەخۆشخانەی شارە، بە کەیفی خۆمان بۆمان دەنووسێ، ئێستا دەچم لە دووی.

هەمزەبەگ ئەحمەد فەڕاشی بانگ کرد.

ئەحمەد لە حوزوورە.

هەمزەبەگ گوتی:

ـ بڕۆ سواری ئەسپە ڕەش ببە و بڕۆوە و هەواڵی عەتا بدە بە دایک و خوشکەکانی، بڵێ چاکە، بە هەر سێ دێکە ڕاگەیێنە، بڵێ ئاغا دەیفەرموو و واز لە حەمە بێنن، ئەو ئاغایانە تکایان بۆ کردووە وئاغاش جەبەی دەکا، بە کوێخاکان و ڕەسوولیش بڵێ، حالی بووی؟

ئەحمەد واقی وڕماوە و دەمی بە تاق وەستاوە!

ئاغا دووپاتی کردەوە:

ـ حالی بووی مردوو؟!

ـ بەڵێ بەڵێ.
ـ دەبڕۆ، بەیانی زوو بگەڕێیەوە.
ـ بەڵێ قوربان.
دوانیوەڕۆیەکی درەنگە. بوداخ دوکتۆر ئەمینی هێناوە، پاش موعایەنە، دوکتۆر رووی لە هەمزەبەگ کرد، گوتی:
ـ بە چی لێی دراوە؟
ـ نازانم، لە قسان بە دەمانچە.
دوکتور بە بزەوە چاوێکی لێ کرد و گوتی:
ـ دەمانچە لە گۆڕێدا نییە! بە دار لێیدراوە، لە دەمانچە خراپترە.
ـ نازانم، خۆ من لەوێ نەبووم، وا دەڵێن.
ـ درۆیە، برینەکانی کێ دەرمانی کردووە؟
ـ پیرێژنێ، خراپی دەرمان کردووە؟
ـ نا نا، زۆر باشە، سالیانی ساڵە خەڵک بەو دەرمانانەوە دەژین، زۆر جار لە هی ئێمە باشترە، قەدریان بزانن.
عەتا وە هۆش هاتەوە و چاوی هەڵێنا.
دوکتور لێی پرسی:
ـ چۆنی؟ وە بیرت دێتەوە بە چی لێی داوی؟
عەتا کاس و وڕە، دوکتور و بن میچ لەبەرچاوی دەخولێنەوە! چاوی وێکناوە، بیر دەکاتەوە، چاوی هەڵێناوە و گوتی:
ـ نازانم، هێند لە نەکاو بوو بە خۆم نەزانی، ئەوەندەم وەبیر دێ کەوتم و هیچی دی.
ـ دەڵێن بە دەمانچە لێی داوی، راستە؟
ـ دەمانچە؟! نا، تۆ کێی؟ من لە کوێم؟ ئێرە کوێیە؟
ـ من دوکتۆرم، ئێرە شارە و ماڵی عەلی خانە، کوێت زۆر بە ژانە؟
ـ هەموو لەشم، هەموو لەشم کفتەی کوتراوە دوکتورگیان، دەمێنم؟!
عەتا دڵی پڕ بووە، بەزەیی بە خۆیدا دێ.
دوکتور بە پەنجە دڵۆپە فرمێسکەکانی بەرچاوی عەتای سڕییەوە، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ خۆ هیچت نییە! بۆ نامێنی؟

ـ ئاگات لە دەردم نییە! تۆ نازانی، بۆیە دەڵێن: بە سەد حەکیم بە قەت دەردەداری نازانن، تۆ نازانی دوکتۆرگیان، تۆ نازانی!

ـ دەزانم، دەبێ خۆڕاگر بی، ئێستا دەرزیت لێ دەدەم ژانی لەشت دەشکێ، بەیانی لە نەخۆشخانە دەتخەم و چاک دەبیەوە. دەتوانی پێت کۆ وەکەی؟ دادەی بزانم.

عەتا لە خۆ دەنەوێ پێ کۆ وەکا، پێ بووە بە کێو و نابزوێ! بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد:

ـ پێم نەماوە! لە پشتوێنە بەرەوخوارم لەسمە! دەڵێی بە منەوە نییە! فەلەجم! من فەلەج بووم! دوکتۆر؟! ها؟ ها؟

دوکتۆر لێفەی لە سەر پێی فڕێدا، بە پەشۆکاوی گوتی:

ـ قامکەکەلەی پێت ببزوێنە، هێندێ غیرەتت بێ ماڵتە خۆ تۆ پیاوی!

عەتا بە هەموو تواناوە هێز لە پێی دەدا، بە ئاستەم قامکی دەبزوێ.

دوکتۆر بە مزگێنییەوە گوتی:

ـ بەڵێن دەدەم پێدەگریەوە، ماوەی دەوێ، دەبێ سەبرت بێ.

هەمزەبەگ وە جواب هات:

ـ چەندە دوکتۆرگیان؟ چەندە؟

ـ نازانم، تا نەیەتە نەخۆشخانە نازانم، ئێستا دوو درزەی لێدەدەم، یەکیان هی خەوە، ئەویدی ژانی دەشکێنێ، بەیانی زوو بیهێنە، خۆم راسپێری دەکەم زوو نۆرەی دەنێ.

دوکتۆر دەرزی لێدا و رۆیشت. پاش ماوەیەک عەتا خەوی لێکەوت.

بەیانییە، حەوشەی نەخۆشخانە پڕە، فەیتوونێ وەستاوە ودە دوازدە ئاغا دەوریان گرتووە.

هەمزەبەگ و بوداخ خان لە دیوی دوکتۆر هاتنە دەرێ. بوداخ لەبەر دەرکەوە دەستی لە فەیتوونچی هەڵتەکاند.

فەیتوون بەرەو دەرکی نەخوشخانە وەڕێکەوت و ئاغاکان بەدوویدا.

فەیتوون قوونی نا بە دەرکەوە و چوار دەستان عەتایان بردە ژوورێ.

نزیکە و نیوەڕۆ دوکتۆر لە دیوی عەمەل هاتە دەرێ و چووە دیوەکەی خۆی.

هەمزەبەگ و بوداخ خان چوونە ژوورێ.

هەمزەبەگ بێ ئۆقرە گوتی:

ــ دوکتۆر گیان! چ بوو؟

دوکتۆر هێندێ درەنگ جوابی داوە:

سێ مۆرەی ستوونی فەقەراتی قەڵەشیون، نوخاعی زەدە بووە. بەختەوەرانە پێ دەگریتەوە، بەڵام دەبێ بە سەبر بێ، رەنگە شەش مانگ تا ساڵێ وەخت بەرێ. مانگێ مانگ و نیوێ دەبێ لە ژێر چاوەدێری خۆمدا بێ. ئێوە دەتوانن برۆن.

هەمزەبەگ بە چاو ئاماژەی کردە بوداخ.

بوداخ تێڕادیوانە بە دوکتۆری گوت:

ــ گەواهی بۆ نانووسی؟

دوکتۆر دەستی دایە قەڵەم و سێ مانگ پشوودانی بۆ نووسی.

بوداغ بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ هەر ئەوە؟! بنووسە بە دەمانچە لێی دراوە! کاک هەمزە دڵی بەوی خۆشە.

ــ دەمانچە؟! دەمانچە لە گۆڕێدا نەبووە، بە گۆچان لێی دراوە، دەمانچەی چی؟

ــ دەزانم، کاک هەمزە وای پێ خۆشە.

ــ با ئەویش وای پێ خۆش بێ، ئەوە تاوانە، خەیانەتە، خەیانەتە بە عیلمی پزیشکی، ویژدانی پزیشکیم ئەو ئیزنە بە من نادا، با ژن براشم بێ.

نامەکەی چوار قەت کرد و دایە دەستی.

هەمزەبەگ و بوداغ خان، بە تۆراوی، بێ ماڵاوایی لە دیوی دوکتۆر ئەمینی وەدەرکەوتن.

## ١٧

تاریکە شەوە. هەور پەستا پەستا دەگرمێنێ. وەختا وەختێکە دەبارێ، خوناوکە بارانە. ئاو لە زەوی هەڵنیشتووە، هەقە پەڵەی پاییزە.

دڵۆپە لە چەند لاوە دایداوە، ئاو و قورم وەک دۆشاوی خەست، بە لێشاو دەخوشێتە نێو سوێنە و سوێنەکلە و جامە مسەوە.

عەبە بە بیانووی دڵۆپە رشتنەوە، تاو نەتاوێ دەچێتە دەرێ چاو بە ولاتدا دەگێرێ، دێتەوە ژوورێ، دەڵێ:

ــ ولات بێ هەست و خوستە، ئێژی زینە رۆح نەمایە! ئەرخەیان پالی لێبەرەو، ئاغا و کوێخا خۆمانین، تۆ خوا چتێ بێژە، بۆ چ هیچێ نایژی؟ ئەمە سێ شەو و رۆژە های لێرە، دوو قسە و نەکردیە لە تەکما، بۆ چ وا ئەکەی؟ بەو جۆرە خەفەت بخۆی، خەفەت داتئەقنێن، ئەترسی؟ فرە ئەترسی؟ خۆ لە حەزرەت غەوست نەدایە! لە بەتاڵپایکت دایە. ئەوان بەم رۆژگارە لە مەردم ئەدەن. دەی قەیچە ئەکا. با رایەکیش لێ بدرێین، خۆ دنیا ئاخر ناوێ. ئاخر ئەوێ؟ نە بە خوا. ئەترسی بووگرن؟ مەترسە، چۆن تێلم، بۆ چ عەبە مردییە؟ بە خوا مەگەر وەبان لاشەما بێنە ژوورەو، لاوە، تو خوا چکێ گاڵتە بکە با چکێ بکەنین.

حەمە پەشێوحاڵ و لێوبەبار، دەستی لە ئەژنۆ هەڵپێکاوە، سەری هەڵێنا و بە وەرەزییەوە جوابی عەبەی داوە:

ــ لەوە زیاتر دەوام ناهێنم، مانگ بێ دەڕۆم، مانگ نەهاتووە عەبەگیان؟

عەبە چاوە بچووکەکانی لێ زیت کردەوەو بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەڕوی؟! ئەچی بۆ کوێنە؟ ئەوگرن بەوبەخت! تۆگوێچکە نایتە میمکە گولەیـش؟ دوێکە ئەیوت بە فێڵ وتگیە حەمە جەبە ئەکەم، ئەیوت بـە حەمـە بێـژە دە پـانزە ڕۆژێ نەیەتە دەشتەو، کەوێش وای ئەوت، منیش ئەقڵم وا بۆی ئەچێ، خۆ تۆ لە گشتمان ژیرتر نی، ژیرتری برا؟ بە خوا ناهێڵم بڕۆی.

ـ نا عەبەگیان، لە ئێوە ئاقڵتر نیم، ناچارم، دەبێ بڕۆم، دێمەوە، ئەگەر کـرا ئەمەشـەو، نەکرا، سبەی شەو دەگەڕێمەوە، هاتمەوە هەموو شتێک پێ دەڵێم، دەبێ یارمەتیم بدەی.

ـ دەی وەبان چاو، چەم لەدەس بێ، دریخ ناکەم، هەسم جفتێ جوانەگا و کـەرێ، بـە خوا بۆتی بەخت ئەکەم، خوا بکا تۆ لەم مەخمەسە قوتاریت بێ، من هیچم گەرەک ناوێ، ئێستا ئەچیتە کوێنە؟

ـ راوەستێ، با بێمەوە، پێت دەڵێم.

ـ دەی خاسە، هۆشت بە خۆتەوە بوێ.

شـەو درەنگـە، بـاران بـەر بـەس بـووە، هـەورگـەواڵ گـەواڵ ئاسمـانی رازاندۆتەوە،کەشەورە. مانگ کز و لاواز لەکەل وەدەرکەوتووە، بیستی مانگە.

حەمە خەیالاوی بەرەو ترۆپکی هەزار ئەشکەوت، کێوبڕ، کێوبڕ، کێوپارەی گرتوتـە بەر. خەیاڵ بووە بە پەلەوەر، باڵێکی لە باکوور وئەوی دی لە باشوورە، باڵی گرتۆتەوە و لە ئەرز بەرز بۆتەوە و هەرێمی ئاسمانی بیری دەپێوێ. سەر لە هـەمـوو کـەلێنی ژیـنی داهاتووی خۆی و کەوێ دەدا، لە هەر کەلێنێ پەڕی شاباڵی دەوەرێنێ، لـە ئاکامـدا بـێ دەسکەوت، لە دەشتی قاقڕی بێ دەسەلاتیدا لە فڕین دەکەوێ و ڕێسەکەی دەبێتەوە بـە خوری.

بیر و خەیالی کاڵ و نەکولیو، بێپسانەوە بە مێشکیدا دێـن و دەڕۆن و چـەواشـەیـان خستۆتە رووباری دەروونی.

هەلوێستەکان زۆرن، نازانێ کامیان هەلبژێرێ و لە سەری سوور و بە سەر بیریدا زاڵ و سوار بێ. بەڵێنی بە کەوێ داوە هەلیگرێ؛ هەلیگرێ، بیباتە کوێ؟ داهـاتووی کـەوێ چۆن دەبێ؟ بلێی نەبێتە هۆی رۆژەڕەشی؟ خۆی لە هەموو لایەک دەحاوێتەوە، بـە نانـە ڕەق، تەنانەت بە بنەگیا ژیوار دەکا، لە سەر بەرد هەلدەکا، ئەرز رادەخـا و ئاسمـان دەدا بە خۆیدا، بەلام کەوێ چی؟ ئەو لە نێو ناز و نێعمەتا پەروەردە بووە، بـڕوا ناکـەم بـەو چەشنە بتوانێ ژیوار بکا، دەی گریمان کردی، تۆ چۆن دلت دێ و چـاوت بـەرایی دەدا

خۆشەویستەکانت لە ناز و نیعمەت دوورخەیەوە و تووشــی ڕۆژەڕەشــی کــەی؟ ئــەوە خۆشەویستی پــێ نالــێن، خۆشــەویــستی وا نییــە، دەبــێ بــەختــەوەری ئــەوت بــوێ، خەتەوەریکە. بە من دەکەی؟ وازی لێ بێنە بــا مێــرد بــە عــەتا بکــا، هــەر ماوەیــەک ڕەحەت دەبێ، خۆ نامری، گریمان مردی! دەی بــا بمــری، تــۆ ئــەو ڕۆژەی لــەدایک بووی، مردی! تۆ چیت؟ کێی! ئەوە نییە لە حەوت ئاسمان ئەستێرەیەک شــک نابــەی؟ ئەوە نییە لەو هەموو ئەرزە جێ قەبریکت نییە، بمری لە کوێت دەنێژن؟ کێت هەیە بۆت بگری؟ وازی لێ بێنە، هەر ماوەیەکە، وردە وردە سای دەخەوێ و لە بیرت دەچێتەوە. بە قسەم بکە، بگەڕێوە و عەبەی لێ ڕاسپێرە.

ڕاوەستاوە. باڵندەی خەیاڵ باڵی لێ ڕواوە.

کەوێ ئەو دەمەی کەلێک هەڵبڕان، هاتەوە بەرچاوی، وتــە و گریــانی لــە گوێیــدا زرینگایەوە.

ـ بۆ کوێ دەچی؟ منیش دێم، منیش لەگەڵ خۆت بەرە، لە بیرت نەچێ، سوێندخۆری یەکین! منیش بەرە، منیش دێم.

حەمە لە سەر پانییە وەرسووڕاوە و ڕێی پێشووی گرتەوە بەر، بە پێکەنینەوە بە خــۆی دەڵێ:

ـ بەختەوەری کەوێ ئەوەیە لەگەڵ من بێ، بە جێی بێڵم، عەتا بــە زۆر ڕایدەکێــشێ، ئەو کەوێ ببا، من دەمرم، من دەیبەم، با عەتا بمرێ، ئەرێ دەبێ ئەو بمرێ، بــەو لێدانــە نەمرد، دەبێ بەوە بمرێ، بمرە، بمرە، کەوێ هی منە.

بە کرژی هەنگاوی توندکردەوە، خەیالاوی و چەواشە کێوبڕی گرتەوە بەر. هەست بە بوون و مان ناکا، زەمان و مەکان، شەووڕۆژ، تەنانەت خۆشی لە بیر نییە.

بێ ئەوەی هەستیپێ بکا، لە هەزارئەشکەوت وەسەرکەوتووە و چووەتە خــوارێ، لــە چۆم پەڕیوەتەوە، کێوی چلپەری بە جێ هێشتووە و چووەتە نێو قوڕووی دۆڵــی دزان، لە شیو پەڕیوەتەوە، سینگی ناوە بەلێژ و گڕانە بەردی بەر حەوت کانیانــەوە. لــە نــەکاو خرمەی سمێ، وەک خرمەی سوارێ، بە چەشــنی بوومــە لــەرزە حەمــەی ڕاتــلەکانــد! عەبەساو، لە جێی خۆی وشکبوو! تەزوو و مچوڕکێکی بە سام هەموو لەشــی گرتــە بــەر، تەزوو لە سەریەوە هات و لەپێیەوە دەرچوو. ویستی هەڵێ، خرمە هێند نزیکە دەرەتــانی ئەوەی نەدایە.

سەرنج دەداتە نێو گڕانەبەرد، تاپۆیەک بە چاو دەکا، بە رەو لای دێ! مانگ چۆتە نێو پەڵە هەورێ، هیچی بۆ دەرناکەوێ، بوومەلێڵە.

ماوەیەکە وەستاوە و بیری بـۆ ناکرێتـەوە، وردە وردە بـە سـەر ترسـی دەروونیـدا زاڵبووە.

ـ نابێ وردە لە دەست دەم، دەبێ پیاوی ئاغا بێ! با هەرای کەمێ و ماوڵی لێ ببرم، نا نا، نە وەک چەکی پێ بێ.

گا بەردێکی بەدیکرد و لە چاوترووکانێکا خۆی هاویشتە پەنای، بە توندی دەنگی دا:

ـ کێی؟ کوڕە کێی؟ ئەو سەرەڕێیەت بۆ لێ گرتووم؟

بە دەنگی حەمەوە، تاپۆ تونـدتر بـەرەو لای دێ، نزیکتـر و گـەورەتـر دەبێتـەوە، دەپرمێنێ و لووشکەی دێ! لووشکەی لە گوێـدرێژ دەچـێ! بـە تـرس و دوو دڵـییەوە سەرنجی دایە.

هەور بەری مانگی بەر داوە و وڵات روونترە. هەر دوو گـوێی قـوت لـە سـەر نێـو چاوانی تیژ راگرتووە و سەبر سەبر کلکـی رادەوەشـێنێ، نێرەوڵاخێکـی رووت و بـێ کۆپانە!

حەمە لە پەنا گابەرد لێی راستەوە بوو و بە کەیفی خۆی یەک گۆچانی لـە تیغـەرەی پشتی راکێشا و زگی نایە ئەرزێ، دیسانەوە لێی راساوە، بەڵام رەحم و بە زەیـی دەسـتی پێ شلکردەوە. بە خۆی پێدەکەنێ:

ـ گۆر ئەوەیە بتتۆپێنم، خۆ منت نیوە گیان کرد! رەنگە لە گاڕان بە جێ مابی، وەرە وەرە با سوارت بم و بتبەمە کانییەکوێرە، دەنا مامە گورگە سەرت دەتاشێ.

لەقان لەقان بە سواری گەیبوەتە دەوری دێ. سەگی کانییەکوێرە هەستیان بە غـەوارە کردووە، ئاوایی پڕ بووە لەدەنگی سەگوەڕ، یـەک یـەک و دوو دوو رووەو رێ دێـن. حەمە گوێدرێژی لە سەر رێ بە جێ هێشت وخۆی لە سەگەل دزییەوە، دزانە روەو ماڵـی مەحموود شوان وەڕێکەوت.

چووەتە حەوشە، لە پشتی دەرگای ژوورەکە وەسـتاوە، سـەبرێ لـە چەپـەر دەدا و هەست رادەگرێ.

مەحموود شوان وەک کەروێشکی بازرە لە جێ دەرپەڕێ، چووە پشت دەرگـا و بـە ئەسپایی دەنگیدا:

ـ کێیە؟
ـ خاڵە! منم، حەمە شوان.
ـ ئەک بە خێرتی، تۆ حەمە شوان نیت! تازە تۆ حەمەشوان نیت، تۆ حەمە زێری! تـۆ شێری، شێری ئەم ناوەقەی، شێری منی.
شەوژەنی لە پشتی چەپەر لابرد، حەمە هاتە ژووری. مەحموود شوان لە ئامێزی گرت و گوتی:
ـ سێ چوار شەوە چاوەڕێتم، بۆ درەنگ هاتی بابەکەی بابم؟ ڕاوەستێ با ژن و منداڵ هەستێنم:
ـ نزە! نزە! نزاکەت! هەستە ژنەتیوە، میوانی خۆشەویست هات. کابان! کابان! هەستە کچەتیوە، ئەو وڵاتە کۆکەوە، دەی زوو بن.
ژن و منداڵ لە جێ دەرپەڕین، خۆکۆدەکەنەوە، گڕی لامپا هەڵدراو لە سەر کورسی دایاننا.
مەحموود شوان لە بەر شەوقی چرا لە حەمە دەڕوانێ. کەوش و گۆرەوی، پـووزەوان و پاتۆل، لە ئەژنۆ بەرەو خوار لە ئاو و قوڕدا خووساوە، بانگی کابان دەکا.
ـ ڕۆڵە! ئەو دەستە کەوا و پاتۆڵەی من بێنە با شێرەکەم ئەو جلکە تەڕانە بگۆڕێ، هـا زوو بە.
کابان دەستە کەواوپاتۆلی هێناوە، حەمە چۆتە تەویلـە و بـەرگـی گۆڕیـوە و جلـە تەڕەکانی، کابان پێچاویەتەوە بەیانی بیانشوا.
میوان و خانە خوێ لەبەرجێی سەرووی کورسییەوە دانیشتوون. خاوەنماڵ، یـەک بـە یەک، بە گەرمە بەخێرهاتنیان لە میوان کرد. مەحموود شوان لە خۆبابیانە گوتی:
ـ کابان گورجێ نان و چایەکی سەر هەمبەندی سازکە، بە ڕێـدا هـاتووە، مانـدووە، گورج بە گورج، دادەگیان.
کابان سوورهەڵگەڕاوە! وەک تینوو و تامەزرۆ، چاوەکانی پڕن لە پێکەنین و تاسە و میوان دەدوێنن.
حەمە بە پێچەوانەی کابان، چـاوی شـەرمـەزاری بەرداوەتـەوە و ئارەقـەی شـەرم دەڕێژێ. بە پرسیاری مەحموود شوانەوە ڕاپەڕی:

ـ دەی شێرە پیاو؟ ئەو ماوەیە لە کوێ بووی؟ بۆ دەسبەجێ نەهاتیتــە ئێــرە؟ دەبــێ تۆش راتبواردبێ، شێوەت وام پێدەڵێ، خەفەت مەخۆ، خاڵی خۆت نەمردووە، کــارێ تــۆ کردووتە، جێی شانازییە، بارەکەڵلا، رچەت شکاندووە، تۆ رچــەشــکێنی، رچــە شــکێن قارەمانە، قارەمانی نەتەوەکەیەتی، بوویە هۆی سەربەرزی ئێمە، شانازیت پێوە دەکــەین، پیرۆز بێ ئەو ناوە «شێر محەممەد»، پێت وا نەبێ بە ریا وا دەڵێم، بە راستی وایە. من چــم لەدەست دێ؟ لە شێری چۆلەکەوە بگرە تا رۆحی ئادەمیزاد!!

ـ خودا خۆشت کاو تۆ لە من نەستێنێ خاڵەگیان، نێو نیشانی کەسێکم پێیە، دەیگوت رەش لاچێ، سپی وەدەردەکەوێ.

مەحموود شوان قاقا پێکەنی و گوتی:

ـ لەگەڵ گەورە پیاوان کەین و بەینت هەیە! ناونیشانی کاک تــاهیرە، بەڵــێ وایــە، کارت چیە؟ بڵێ بزانم؟

ـ جێم دەوێ، ئەوەی راستی بێ...

حەمە بە شەرمەوە قسەکەی قووت داوە.

ـ شەرم مەکە، ئەوەی لە دڵت دایە بیڵێ.

سەری لە خاڵە بردە پێشێ، وا کە خێزانی حاڵی نەبێ، گوتی:

ـ دەمەوێ کەوێ هەڵگرم! جێم بۆ ئەو دەوێ.

ـ بۆ چ ماوەیەک؟ دەتەوێ چەند رۆژ لەوێ بێ؟

ـ نازانم، تا دەستم بە کاک تاهیر دەگا، خۆت باشتر دەزانی.

ـ کەی دەست بەکار دەبی؟

ـ لە سبەی شەوێوە، هەر دەم تۆ بڵێی، هەرچەند زووتر، باشتر. خۆت ئاگاداری، ئاغــا حەوتەیەک ماوەیبە کوێخاکەریم داوە، بیدا بە دەستەوە چاکە، نەیدا، بە زۆر رایدەکێشێ، ئەوەت بیستووە؟

ـ بەڵێ بەڵێ، خۆم لەوێ بووم، ماڵێ پیاوێکی ئەو سێ دێیەی لێ بوو، ئەو رۆژە بــوو تۆ لە عەتات دابوو، نازانی ئەو خەڵکە چەندەیان پێ خۆش بوو، سەر زارەکی قسەیان پێ دەگوتی، لە نێو خۆیاندا، بە دزییەوە شایی لە دڵیاندا دەگــەڕا، دۆعــای بــە خێریــان بــۆ دەکردی، تاریف، تاریفی تۆ بوو، بەڵام بەو قسانە تووشی هەڵە نەبی! فریو نەخۆی، خــۆ نیشانی کەس مەدە، ئەوانە جێــی بــە قــانین، وەک نیــسکــوان، بەروپــشتیان بــۆ نییــە!

قازانجیان لە چیدا بێ ئەوە دەکەن. باسەکەمان دوورکەوتەوە، باشە بە چاوان من بەیانی پیاو دەنێرم بۆ شار، ماڵی حاجی رەشید زۆر بێشکە.

ـ حاجی رەشیدی قاوەچی؟

ـ ئەرێ، خۆ تۆش دیوتە، ئەویش تۆ دەناسێ.

ـ جا جێی باوەڕە؟!

مەحمود شوان بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ تۆ دەبێ وردە وردە ئەوانە بناسی، تۆ باوەڕپێکراوی کاک تاهیری، وتەی «رەشی لاچێ، سپی وەدەردەکەوێ» وتەی نهێنی ئێمەیە، ئەوە بە هەر کەس لە ئێمە بڵێ،ئەوەی من دیکەم، ئەویش دەیکا، تەنانەت بە کوێخا شەریفیش بڵێی، هەر منە! بەیانی ئەو دەنێرم.

حەمە بەسەرسوورمانەوە، بێ باوەڕانە گوتی:

ـ ئەو کوێخا شەریفەی کانییە کوێرە؟!

ـ ئەرێ، ئەو و زۆری وەک ئەو، تۆ پێت وایە تاهیر بە تەنیا تاهیرە؟ تۆ بیستووتە من کوڕێکم هەیە بە ناوی کاوە و ئێستا لە ئێراقە؟ کاوە لە کابان گەورەترە، نۆبەرەمانە، بۆ شوینە گومکێ ئەوەمان وەدووخستووە، لەگەڵ کاک تاهیرە؛ عومر باقی بێ، خۆت دەیبینی. ئەوەی لەگەڵمانە نابێ گومانی لێ بکەی، کوێخا شەریف باوەڕپێکراوە، سەدجار تاقیکراوەتەوە.

حەمە ماتبووە، سەیرە لە کوێخا شەریف چۆن دەتوانێ باش بێ؟! ئەگەر بەو جۆرە بێ کە باسی دەکا، دووڕووە؛ دووڕوو ناتوانێ باش بێ، پیاو نابێ دووڕوو بێ، یان دەبێ ئاڵ بێ، یان دەبێ قووڵ بێ. زۆر سەیرە!! کوێخا شەریف بەو رۆژگارە ئازاری خەڵک دەدا، کەچی لایەنگری ئەو کەسانەیە کە لایەنگری خەڵکن! من باوەڕ بە پیاوی وا ناکەم، سەری هەڵێنا و گوتی:

ـ خاڵە! من حەز ناکەم کوێخا شەریف لە کارم ئاگادار بێ، من هاتووم بۆ لای تۆ، خۆت پێت دەکرێ دەستم بگرە، پێت ناکرێ، هیچ.

مەحموود شوان دیسان پێکەنی و گوتی:

ـ لەو دووشکی؟ باشە باشە خۆم دەچم، ئێستا هەستم بڕۆم؟ هەر دووکیان قاقایان کێشا و بێ دەنگ بوون.

کابان نان و چای سازە، کەولی لە سەر کورسی راخست و نانی دانا.

ـ حمموود شوان بۆ خانە خوێیی، لەگەڵی دەخوا.

کابان چاو لە حەمە ناترووکێنێ، بە چاو، چاوی حیز کردووە، سەری پێ بەرداوەتەوە و لە شەرمان سوورهەڵگەڕاوە و نانی پێ ناخورێ.

نان و چا خوراوە. جێ کۆوە کراوە و راخرایەوە. جێی حەمە لە بەرە کورسی سەرەوەیە. حەمە ·· شەرمەوە گوتی:

ـ لە ژێر کورسی نانووم، فێری سارده جێم.

کابان نمەدی لە دووری کورسی بۆ راخست، لێفە و سەرینی لە سەر دانا، حەمە خزایە نێو جێ، دەمانچەکەی عەتا و شمشاڵەکەی لە باخەڵ دەرهێنا و خستییە ژێر سەری، بە ترس و دو· دڵییەوە خەو ـ لێ کەوت.

بە دەنگی کەڵەباب، مەحموود شوان لە جێ دەرپەڕی، چووە تەویلە و گوێدرێژی جل کرد و دەریکرد. بانگی حەمە دەکا:

ـ من دەڕۆم، هیچت پێویست نییە بۆت بێنم؟

حەمە چاو خەواڵوو، بە دەنگی گڕەوە جوابی داوە:

ـ نا خاڵەگیان، زوو وەرەوە.

ـ.. باشە باشە، نەچییە دەرێ؛ کاری ئاوت بوو، بچۆ تەویلە، چیت پێویست بوو، بە کابان بڵێ، شەرم نەکەی.

دەرگای پێوەدا و بە هەچە هەچە لە حەوشە چووە دەرێ، دوا بە دوای ئەو، مەلا بانگی ی فەرموو، بە دەنگی بانگ، خات نزاکەت راستەوە بوو و کابانی هەستاند و خۆی بۆ دەسنوێژ چووە حەوشە.

کابان کوانووی کردەوە، کتری وەسەر ئاور ناو دەستی بە کۆکردنەوەی جێوبان کرد.

حەمە خۆی کردووەتە خەو. دوو سێ جار ئاگای لێ بوو کابان لێی نزیک دەبۆوە!ئەوەندە نزیک، هەستی بە دەنگی هەناسەی دەکرد! نە حەمە دەیوێرا چاو هەڵێنێ، نە کابان لە رووی هەڵدەهات بیدوێنێ. جیڕەی گرێژەنەی چەپەر کابانی چلەکاندەوە و رەوەی کرد.

خات نزاکەت بە قوڵ و باڵی تەڕەوە، ورتە ورت وە ژوور کەوت، هەر دەیگوت:

ـ ئەللاهومەسەلی ئەلا سەیدینا محەمەد...
بەرمالی راخست، دوو رەکات نوێژی خوێند، چواری عیشای بە قەزا گێڕاوە.
حەمە لە جێ هاتە دەرێ، بەرەو دەرگا وەرێکەوت.
کابان گوتی:
ـ بۆ کوێ؟ بابم نەیگوت مەچۆ دەرێ؟ راوەستێ ئاوت بۆ دێنم.
حەمە سەری بەرداوە و لە جێی خۆی وێستا.
کابان مەسینە ئاوی هێنا و بە بزەوە دایە دەستی.
حەمە بە شەرمەوە مەسینەی وەرگرت و چووە تەویلە.
ئەو رۆژە راو راوی قسە بوو، لە هەموو بارێکەوە دوا بوون، هەموو دەروا و بوارێ بە تاقی کرابۆوە. دوو سێ جار کابان دابووی بە گوێی حەمەدا، بۆ دەست لە کەوێ هەلناگری؟ خۆت بۆ لەو مەخمەسەیە رزگار ناکەی؟ خۆ کەوێ فەروخ لەقا نییە!
دایکی دەیگوت:
ـ خۆ دایکی کراس رەش نەمردووە! چی زۆرە، ژن، کەوێ ناو یەکی دی، هەموو کچێ قوڕاوخۆرە مێرد بە تۆ بکا، کوڕی وەک تۆ بۆ ژن دادەمێنی؟ ئەوە ئێمە کچمان هەیە، بە دەمی خۆم نەبێ، نەبێتە باری خۆهەلکێشان، قابیل بە کوڕی شایە، هەر کەس داوای بکا، دەیدەمێ، بەو مەرجە خۆی قایل بێ.
هەر ئەوان لەو بابەتەوە دەدوان و حەمە باسەکەی دەگۆڕییەوە سەر قسەیەکی دی، کەمتر خۆی لەو دارەتە دەدا، ئەو رۆژە بەقەدەر مانگێ لە حەمە درێژ بۆتەوە و رۆژ ئاوا نابێ.
رۆژ گەییوەتە رۆژپەڕ. حەمە هیوای گەڕانەوەی مەحموود شوانی لە دەست داوە، لە بیری رۆییندایە:
ـ مانەوەم لێرە ناحەزە، ناکرێ لە لای ئەو دوو ئافرەتە بنووم، شەو دابێ دەڕۆم، سبەیشەو دێمەوە.
لەو بیروڕایەدا بوو. گوێدرژەکەی خالە سەری نا بە چەپەرەوە و هاتە ژوورێ، بە دووی گوێدرێژدا خۆشی بە هێندێ کەلوپەلەوە، وە ژوورکەوت، دەم بە پێکەنینەوە گوتی:
ـ شێرەکەم! لە تەنیایی وەرەز نەبووی؟

حەمە لە خۆشیان بزە زایە سەر لێوی لە جێ ڕاپەڕی.

ـ چاک کەوتییە عەزاب خالە، ماندوو نەبێ.

ـ چ عەزابێ؟ من بۆ ئەو کارانە دروست کراوم، جا وەرە بۆت بگێڕمەوە! بەر لە هەموو، حاجی سلاوی دەگەیاندی، کارەکەت جوورە، دیوێکی بۆ کەوێ تەرخان کردووە و چاوەڕێیە بووک و زاوا بچن.

دەستی بە باخەڵیدا کرد و چەپکێ ئەسکیناشس دەتمەنی دەرهێنا وگوتی:

ـ ئەوەش دیاری ئەوە، پێشکەشی کردووە بە کەوێ، دوو سەدتمەنە.

ـ جا پوولم بۆ چییە؟ ئەویش ئەو هەمووە؟!

حاجی پیاوێکی کارامەیە، دنیای قوونەکەو کردووە، دەیگوت لە تەنگانەدا پووڵ لە برای هاوپشتە چاکترە، ڕاستە، بیگرە.

حەمە بە شەرم و دلگەرمییەوە پوولی لە باخەڵ نا، دەستی لە دەمانچەکە کەوت، دەری هێنا، گوتی:

ـ خالە! ئەم کۆلە ئاسنە لاسەنگی کردووم، بێ گوللە بە کاری چ دێ؟ گۆچانەکەی خۆم لەوە چاکترە، با لە لای تۆ بێ.

مەحموود شوان دەمانچەی وەرگرت، ئەمبارەو ئەو باری دەکا، هەناسەیەکی هەلکێشا، گوتی:

ـ چەک و چارەوێ خاوەنیان نییە، بە دەستی هەر کەسەوە بن، هی ئەوە، ئەم دەمانچەیە تاوەختایەک بوو بە دەستی کەسێکەوە بووە زۆری بە سەر خەلکا دەسەپاند، ئێستا بە دەستی کەسێکەوەیە دەیەوێ زولمی پێ لە نێو بەرێ، دەمانچەی ئاخنییە بن جێ و بان، گوتی:

ـ دەی، لەوەی گەڕێ، دەتەوێ چ بکەی؟ کەی چاوەڕێت بین؟

ـ من هیچ نازانم، چۆن دەڵێی وا دەکەم.

ـ خۆت مالی حاجی نازانی، دەزانی؟

ـ نەوەڵلا.

ـ باشە، من سبەی شەو لەدەوری شار چاوەڕێت دەبم.

ـ ئاخر.

ـ ئاخری ناویێ، کارەکە وایە، نە بە تۆیە، نە بە من، با ئەوە راپەڕێنین، پاشان هەمــوو کاری دەکریێ.

هەر دوو دەستیان کرد بە پێکەنین.

رەنگی حەمە گۆڕاوە، باری سەر لێوی پەڕیوە سوورایی تێکەوتووە.

چاوی گەش بوونەتەوە و پرشنگ دەپێکن. خـەم و پـەژارە لـە روخـساریدا بـەدی ناکریێ و لە پێستی خۆیدا جێی نابێتەوە، وەک ژانکردوو لەسەرجیێ هەر ئەمباروئەوباریە.

شێو خوراوە، شەو درەنگە، حەمە گەرمەژانی رۆین دەستی داوەتیێ و خـۆ نـاگریێ، بـێ ئۆقرە گوتی:

ـ خاڵە! وەختی رۆینە، من دەڕۆم.

مەحموود شوان بۆ ئەرخەیانی چووە دەریێ. پاش ماوەیەک هاتەوە و گوتی:

ـ ئاوایی یەک بەش و دوو بەش بووە، دوو بەشـی نوسـتوون. مـن دەڕۆم و تـۆ بـە دوومداوەرە، لە هەر کویێ کۆخیم، خۆت حەشار دە. کابان! دوو سیێ نانی بۆ لـە شـتێک بخە با پێی بیێ، نان بۆ رێبوار لە ئاوەدانی باشترە.

کابان چاوێکی لە حەمە کرد و رۆیی.

حەمە جلەکانی خۆی دەست دایە، چووە تەویلە و ئاڵ و گۆڕی کردن.

کابان چوار پێنج نانی لە پارچەیەکی تازە خستووە و تەمادار وەستاوە.

حەمە لە تەویلە هاتە دەریێ، کەواوپاتۆلەکەی خاڵەیدا بە کابان و نانەکـەی لەدەسـت گرت، چاویێ لە نانبێنەکە دەکا، سەرنجی کراسەکەی کابانی‌دا، نانبێن لـە کراسـەکـەی بەری بوو! حەمە بزەیەکی خستە سەر لێو، سەری داخست و وەدووی مـەحموود شـوان کەوت.

لەو لای دێوە مەحموود شوان و حەمە لە یەک جـویێ بوونـەوە. دوو سـیێ هـەنگـاو دوورکەوتنەوە، خاڵە ئاوڕی داوە گوتی:

ـ سبەیشەو لەدەوری شار چاوەڕێتم.

ـ باشە، مەگەر رووداویێ رووبدا. وەبزانە لەوێم.

حەمە رووە و دێکۆن. مەحموود شوان بەرەو ماڵ، لە یەک دوورکەوتنەوە.

وەختاووەختیێ رابردووە، عەبە بە نوێنەری حەمە چۆتە کانی توو، لەگەڵ کەویێ قەرار و بڕیەی داناوە، قەرار دوای شێوە، حەمە بچێتە سەربان و کەویێ ئاگادارکا. نەخدینەیەک

که لای پووره‌گوڵه بوویه‌تی، عه‌به بۆی هێناوه، سه‌د و په‌نجاتمه‌ن پووڵه. بریاره له ده‌رفه‌تا چاله گه‌نمه‌که‌شی بۆ ده‌رهێنێ و بیکا به پووڵ و بۆی بنێرێ، به‌ڵام پووره‌گوڵه له هه‌ڵگرتنی که‌وێ بێ هه‌واڵه.

ئێواره‌یه، ته‌نگی نوێژی شێوانه، سێره هه‌ڵگیراوه، دۆست و دوژمن لێک ناکرێنه‌وه. حه‌مه و عه‌به به له‌نته‌ره‌وه هاتنه کادێن. گه‌لاز به شه‌وقی له‌نته‌ره‌وه سه‌ری هه‌ڵێنا، حه‌مه‌ی ناسیوه‌ته‌وه.

گه‌لاز به په‌ته‌وه به‌ره‌و لای خۆی کێش کرد. حه‌مه به کووچی کووچی لێی چووه پێش. گه‌لاز به کلکه سووتێ له‌به‌رپێی که‌وت. پێی له سه‌ر ملی داناوه، به فیکه ده‌یلاوێنێ. ماوه‌یه‌کی زۆر تێی ده‌ڕوانێ! ده‌ڵێی بیره‌وه‌ریه‌کانی وه‌بیر هاتۆته‌وه، چاوی لێ ناترووکێنێ!

عه‌به به دیاریانه‌وه وه‌ستاوه، مته‌قی لێوه نایه!ره‌نگه ئه‌ویش وا بیر بکاته‌وه نه‌کا حه‌مه گه‌لازی نه‌داتێ! ئه‌گه‌ر نه‌یدا چی؟

حه‌مه پێی له‌سه‌ر ملی گه‌لاز لابرد، بێ ئاوڕدانه‌وه چووه ده‌رێ، عه‌به به په‌له و وه‌دوویکه‌وت.

له‌و لای که‌لاوه‌کان حه‌مه ده‌ستی کرده ملی عه‌به، مالاوایی لێکرد و گوتی:

ـ عه‌به‌گیان! ئه‌مانه‌تیت گه‌لاز بێ، نه‌یبه‌تلێنی! تازه سه‌گی تۆیه.

ئه‌وه‌ی گوت و بێ ئاوڕدانه‌وه، له تاریکی ئێواره‌دا ونبوو.

سه‌گوه‌ڕێکی قورس نێو دێی کانی تووی شڵه‌ژاندووه. سه‌گه‌ل به‌ره‌و کێوه به‌رداویله ده‌ڕۆن و ده‌ڕۆن، ده‌گه‌نه به‌ر کێو، بێده‌نگ ده‌بن! پاش ماوه‌یه‌ک سه‌گه‌ل بێ ده‌نگ بوون.

حه‌مه گه‌ییوه‌ته ده‌وری دێ، سه‌گه‌ل هه‌ستی ئه‌ویان کردبوو، هه‌ر سه‌گێ لێی نزیک ده‌بۆوه، به فیکه‌یه‌ک وه کلکه‌سووتێی ده‌خست و به‌ره‌و دوا ده‌بوونه‌وه.

له قوونه‌بانی ماڵی کوێخاوه، حه‌مه خۆی کێشایه سه‌ربان، بێ چرپه چووه سه‌ر کولاوکه، هه‌ستی ڕاگرت.

که‌وێ له چرپه‌ی سه‌ربان گوێ قولاخ وێستا و چاوی بڕییه کولاوکه، دڵی وه‌کوته کوت که‌وت.

حه‌مه سه‌ری له کولاوکه برده پێشێ، سه‌بری گوتی:

ـ کەویتگیان! سازی؟

کەویٚ بەندی لەشی وەک بنی ئاو دەلەزیٚ، بەدەم چەقوچۆوە گوتی:

ـ ئەریٚ، ئەوە هاتم.

حەمە لە گوێسوانەوە دەستی کەویی گرت و کێشایە سەریٚ، بە جووت لە قوونە بنەوە بازیان دایە خواریٚ، بازدان و خرەی چەخماخی تفەنگی برنو و دەنگی تفەنگچی یەکیٚ بوو:

ـ راوەستە بیژوو!!

حەمە و کەویٚ دەست لە نێو دەست وشکبوون!حەمە دەنگی تفەنگچی ناسییەوە، دەنگی رەسوولی نۆکەر بوو! دووسیٚ هەنگاو کەویی کێش کرد، ویستی رەسوول بدوێنیٚ.

دیسانەوە گوڕاندی:

ـ مەبزوو بیژوو، لەشت دەکەم بە رووی بێژنگ، راوەستە.

دوو چەکدار لە بنی دیوار دەرپەڕین.

حەمە وەک پاڕانەوە گوتی:

ـ پیاوی چاک بە کا رەسوول، چ لە من دەکەی بیکە، کەویٚ با بڕواتەوە، ئافرەتە با ئابرووی نەچیٚ، تکات لێدەکەم!

رەسوول بەدەنگێکی بەرز و زولاڵ بە چەکدارەکەی دیکە دەڵیٚ:

ـ کا سەعید! تۆ دەڵێی چی؟ چۆنە وازیان لیٚ بێنین بڕۆن؟ ئەو پیاوە تکا دەکا! خوداگیریان دەبین! لەیلیٚ و مەجنوونن!

سەعیدی نۆکەر دەزانیٚ رەسوول بە تەوسەوە وا دەڵیٚ، بیٚ دەسەڵاتانە گوتی:

ـ کەیفی خۆتە! چۆن دەڵێی وادەکەین، کارەکە بە تۆ سپێردراوە، بە من بیٚ، ئەو ئافرەتە بڕواتە ژووریٚ، تۆش کەیفی خۆتە.

رەسوول وەک تیری ساردەکەوان دەرپەڕی و لوولەی تفەنگی نایە سەر سینگی حەمە، پڕ بە گەرووی گوڕاندی، وا کە هەموو خەڵکی دیٚ گوێیان لێبوو.

ـ وەرەوەپێش کەوە بیژوو، کا سەعید! وەرە بە پشتوێنەکەی خۆت دەستی ببەستە،دەرفەت بێنیٚ، چەکمان دەکا! ئەوە ماری بیٚ ئیجازەیە، وەرە بیبەستەوە.

چڕەو گوڕەی ڕەسووڵ، کوێخاکەریمی لە ماڵ دەرپەڕاند. خەڵک لە سەربان و گوێبانەوە، دوورەپەرێز سەیریان دەکرد، کەس نەیدەوێرا خۆ لە قەرەیاندا.

سەعید دەستی حەمەی بەست.

کوێخاکەریم لە دەرگاوە هاتە پشت قوونەبان، بە شکەوە گوتی:

ـ ئەوە چ باسە؟

ڕەسووڵ بە تەوسەوە گوتی:

ـ لە کچەکەت و زاوا زێڕینە بپرسە!

کوێخا کەڕولاڵ، وشک دەڕوانێتە کەوێ! بێ قسە و باس دەستی گرت و بردیە ژووری.

ڕەسووڵ و سەعید، باڵ بەسراو حەمەیان وەپێش داوە و لە ماڵی فەیزە درێژ نزیکبوونەتەوە. ڕەسووڵ بانگی کرد:

ـ کا فەیزوڵلا! ئەسپە ڕەش و گوریسێ بێنە، زوو بە زوو.

فەیزە بە گوریس و ئەسپەوە هاتە دەرێ.

ڕەسووڵ و سەعید حەمەیان سوار کرد و لە ژێر زگی ئەسپەوە هەردوو پێیان بە گوریس شەتەکدا. ڕەسووڵ لەغاوی لە فەیزە وەرگرت و گوتی:

ـ بڕۆ ئەسپەکەی کا سەعید دەرکێشە.

فەیزە ئەسپی هێناوە، سەعید سوار بووە، ڕەسووڵ دەستە جڵەوی گرتووە و لە پێشەوە دەڕوا. دوو سوار و پیادەیەک، وردە وردە لە کێوی بەر دوایلە وەسەر کەوتن.

شەو لە نیوە لای داوە. دەنگی سمی چارەوێ هێدی هێدی بێ دەنگی کپ و خامۆشی دۆڵی دزان دەشکێنێ، کەروێشکی شەو گەڕ لە قەراخ کوێرەڕێ خرپە دەکا و رادەخوشێ.

مانگ زەردە و لاواز لەکەل وەدەرکەوت، لە زەردیدا سوور دەنوێنێ، ئەرز لەبەر تیشکی کەم تەوژمیدا زەردێکی مەیلەو سوورە.

حەمە وەک پەیکەرەیەک بە سەر ئەسپە ڕەشەوە چاوی بڕیوەتە دوور و بێ تەکانە. لەو دەمەوە وەڕێکەوتوون، دوو لێوی نەبزواندووە، نەسکالا، نەپاڕانەوە، نەویست و داوایەک. تەنانەت ناڕوانێتە دەوروبەری.

سەعید شانبەشانی دەڕوا. جار نە جارێ بە بەزیەوە تێی دەڕانێ و سەری بێ دەسەلاتی بەر دەداتەوە.

ڕەسووڵ باوێ هەنگاوی خۆشە! جلەوی ئەسپەڕەشی گرتـووە و گـورج گـورج ڕێ دەبڕێ و لە بیر و خەیاڵێکی قووڵدا نوقمە.

سوار و پیادە گەیوونەتە بەر دەروازەی قەلا. ڕەسووڵ لە خۆباییانە دەروازەی داوەتـە بەر شێلنگی تەقڵباب.

مام عەلی دەرکەوان، خوودار لە مالۆچکەکەی دەرپەڕی، پەشۆکاو دەنگی دا:

ـ کێیە؟! کێیە؟! ئەوە هاتم. دەروازەی کردەوە، سوا رو پیادە هاتنە حەوشە.

ڕەسووڵ بەرەو تەویلە جلەوی کێشا، لەبەر دەلاقەی میانە بانگی حەسەن مەیتەر دەکا:

ـ حەسەن! حەسەن! هەستە وەرە ئەو ئەسپەی کا سەعید بکێشە تەویلـە و بـە دوومـدا وەرە، زوو بە، زوو.

چرەو گورەی ڕەسووڵ، نووستووانی نێوقەلای هاشەدار کرد، لە پەنجەرەوە سـەریـان دەرهێنا.

عەدلە خانم دەنگیدا:

ـ چ بووە بەو نیوە شەوە ڕەسووڵ؟

ـ میوانم بۆ هێناوی خانم! قاتلەکەی عەتابەگە، ئاغا نە هاتۆتەوە؟

ـ دەستت خۆش بێ، ئاغا لە ماڵ نییە، لە کونە ڕەشی کەن، دەست و پێی ببەسـتە تـا ئاغا دێتەوە، خۆتان وەرنەسەرێ، بە ئەحمەد دەڵێم چاتان بۆ سازکا. ڕەسووڵ و سـەعیـد، حەمەیان لە دیوێ خست، پێیان دەگوت کونـە ڕەش، کونـە ڕەش دیـوێکی تاریـک و تنۆک، بێ دەلاقە و پەنجەرەیە، بەندیخانـەی قەلایـە، بـە گوریـسەکە دەسـت و پێیـان شەتەکدا و لە دیوی دەرێوە دەرکەیان لە سەر هەڵپێکا.

ڕەسووڵ ئەسپە ڕەشی دا بە حەسەن مەیتەر و گوتی:

ـ زینی لێ مەگرەوە، لە سەر ئاخوڕی حەوشە بیبەستەوە و کا وجـۆی بدەیـە، تێـری کە، من دەڕۆم.

حەسەن مەیتەر ئەسپە ڕەشی لە سەر ئاخوڕ بەستەوە، کا وجـۆی لەبـەرکرد و چـۆوە میانە، لەبەر دەلاقەوە حەوشەی خستە ژێر چاوەدێری.

به فەرمانی عەدلە خانم، ئەحمەد فەڕاش سەماوەری تێ خستووە. ڕەسوول و سەعید چوونە ژووری. عەدلە خانم و ناسکێ و تەنکە و نازدار لە دەوریان کۆ بوونەتەوە. ڕەسوول بە شانازییەوە باسی گرتنی حەمە دەگێڕێتەوە، ئەوانیش بە خۆشی و بە شارەتەوە پێدەکەنن. ئەحمەد و نازدار بە دزییەوە تەماشای یەک دەکەن، بە ئاماژەی چاو هەڵوێستەکانیان بە یەک ڕادەگەیێنن، سەر زارەکی وێڕای ئەوان پێدەکەنن.

دوو دەور چا خوراوە، ڕەسوول هەستایە سەر پێ، گوتی:

ـ کاک سەعید! من دەڕۆم بۆ شار و مزگێنێ دەبەم بۆ ئاغا، تۆ چای خۆت بخۆ و بنوو، تا ئاغا تەشریف نەهێنێتەوە، کەس نەچێ بە لایدا، دەرگای لێ نەکەنەوە!

ئەوەی گوت و بە پەلە ڕۆیشتە خوارێ. لەغاوی کردەوە بە سەر ئەسپەڕەشدا، سوار بوو و لە دەروازە چووە دەرێ.

ڕەسوول لە مێژە ڕۆیوە. جێی سەعید لە دیوی ئەحمەد ڕاخراوە، ئەوان نووستوون. ناسکێ و تەنکە چوونەتەوە دیوی خۆیان، پرخەی خەویان دێ.

نازدار ئیستیکانی ئاوکێشاوە، ئاوی سەماوەر و خۆڵی ڕەژی خاڵی کردووە، چووەتە دیوی خۆی، کەڵێنی بە دەرکە داوە و خۆی کردووەتە خەو.

بێ دەنگی شەو حاکمانە قەڵای گرتۆتە ژێر دەسەڵات و دەڵێی زیندەواری تێدا نییە! عەدلە خانم خەوی زڕاوە. وەک مار گێنگڵ دەخوا. ئەمشان و ئەوشان لە سەر جێ خۆ ناگرێ! ڕاستەوە بوو، لە سەر جێ دانیشت، هەستایە سەر پێ، چووە بەر پەنجەرە و سەرنجی حەوشە دەدا، هاتەوە سەر جێ و دانیشتەوە.

هەستایەوە، بە نێو دیوەکەدا دەگەڕێ، وەک ژانگرتوو گەرمە ژانییەتی! بە دەم هاتوچۆوە بەرەژانی بیرەوەرییەکانی ڕابردووی دەبژێرێتەوە، کچێنی ئەو دەم کە دڵی بە مەحموودی حاجی برایمەوە بوو، هاتۆتە بیری.

نەسروڵڵابەگی بابی، کۆنەبەگ و چەکمە ڕەق، کوڕی عێزەتوڵڵابەگ بووە. بە هۆی دەست کورتییەوە، عێزەتوڵڵابەگ، تازاوای بە بابی هەمزەبەگ فرۆشتووە و لێ کەوتوون. بەڵام بە لیر و کردەوە هەر ئاغا بوون. کەمتر لەگەڵ ڕەعیەت هاموشۆیان بوو، دانوویان قەت لەگەڵ خەڵک نەدەکولا.

ئەو دەم کە عەدلە کچ و ئەوەڵی دڕ دوک و پیاڵەی بوو: ماڵی حاجی برایم لە تازاوا بوو، مەحموودی بابی حەمە، لاوێکی قیتوقۆزی بە دیمەن و پێکەوتوو بوو. عەدلە و

مەحموود هۆگری یەک ببوون. دلداری ئەو جووتە بە چەشنێ بوو بە بێ یەک ئۆقرەیان نەبوو. حاجی برایمی بابی مەحموود دوو سێ جار ناردییە خوازبێنی، تکا لە تکاخانە بڕا، نەسرولڵابەگ نەیدایە، لە جوابدا دەیگوت: کچی من بۆ ڕەعیەت نابێ! کەوش و کلاش نابن بە ویلاش. ڕاستە حاجی دەولەمەند و بنەچەک دەولەمەندە، بەلام ڕەعیەت سەری بگا بە ئاسمان، هەر ڕەعیەتە، من لەگەڵ ڕەعیەت خزمایەتی ناکەم! لە دیزەیەکمان خەن، پێکەوە ناکولێین؛ کچی من دەبێ مێرد بە ئاغاوات بکا. ناو بانگی جوانی عەدلە زار بە زار دەگەڕا.

ئەو دەم هەمزەبەگ خەجیجی دایکی ناسکێ و تەنکەی خێزان بوو. خەجیج کچە ڕەعیەت بوو. هەمزە بەگ دایمە لەگەڵی بەدهۆ و لێی لە بیانوو بوو. بیستییەوە کە نەسرولڵابەگ وای گوتووە، خەجیجی دەرکرد، ناردییە خوازبێنی عەدلە. نەسرولڵابەگ بە زۆر عەدلەی لێ مارە کرد، مارەیی عەدلە، تازاوایە. دوا بە دوای مارە کردن، هەمزەبەگ مالی حاجی برایمی ناردە کانی توو. بەوەش دلی نەحەساوە، پاش دوو سێ سال، ئەو دەم حاجی نەمابوو، مەحموود ژنی هێنابوو. خێزانی زگی بە حەمە پڕ بوو، شەوێ پیاوی نارد و مەحموودیان هێنایە قەلا، بە وتەی ئەوانەی کە ئاگایان لێ ببوو، ئاغا بۆ لە ناو بردنی هێنابوویە ئەوێ.

بیست و پێنج سال ڕابردووە. مەحموود بۆ ساتێ، تەنانەت بۆ ماوەی چاوترووکانێ لە بیری عەدلە خانم ناچێتەوە. ئەوەندەی حەمە دەبینێ، بیرەوەرییەکانی زیندوو دەبنەوە و وەک خۆرە دەیخۆنەوە.

عەدلە خانم دوو دلە! جەرگی بووە بە دوو کوت! عەتا لەتێ لە جەرگییە، حەمە لەتەکەی دیکەیەتی! حەمە لە جەرگی داوە و برینداری کردووە! هەمزەبەگ کۆنە قینی لە حەمەیە، بێتەوە دەیکوژێ، حەمە بکوژێ، مەحموود دەکوژێ! خۆشەویستی مەحموودی ناوە بە حەمەوە، حەمەی بەقەد مەحموود خۆش دەوێ.

شەو زۆری بە دەمەوە نەماوە، دەرفەت کەمە، لە سەر هیچ ساخ نەبۆتەوە، بێ ئەوەی ڕای هێنابێتە سەر شتێک، پێی بەرەو دەرکە کێشای.

بێ چرپە هاتە پێشخانە. هەستێکی ڕاگرت. یەک بە یەک بە دیوەکاندا گەڕا. کەلێنی دەرکی دیوەکەی نازداری جووتکرد و بە پلیکاندا چووە خوارێ.

نازدار بێ جیرە دەرگای کردەوە و وەدوویکەوت، دوورونزیک چاوی لێیە.

عەدلە خانم چووە بەر دەرگای کونە ڕەش، بێ تەقە ئەلقەڕیزی هەلگرت و چووە ژووری.

نازدار خۆی گەیاندە پشت دەرکە و گوێی گرت.

عەدلە خانم بە سرتە گوتی:

ـ حەمە! دووری؟ دەنگم دەبیسی؟

ـ ئەریَ ئەریَ؟ تۆ کێی؟

ـ شەو درەنگە، کارت بەوەی نەدایێ من کێم، رەسوول لە مێژە روییوە بۆ شار، ئێستا دەگەڕێتەوە، بگەڕێنەوە، ئاغا دەتکوژێ، خودا غەزەبت لێ گرێ بۆ کارت! دەست و پێت دەکەمەوە و ڕێت نیشاندەدەم هەڵێ لەم هەردومەکانە مەمێنە.

ـ باشە، تۆ کێی؟ نازداری؟

ـ هەیهۆ هەیهۆ! من دەڵێم نێرە، ئەو دەڵێ بیدۆشە! تۆ کارت بەوە چییە من کێم؟

عەدلە خانم چەقۆی دەرهێنا، بە تاریکی دەست دەگێڕێ، گرێی گوریسی دۆزییەوە و هەڵیبڕی. دەستی حەمەی گرت، بە بەلەدی لەگەڵ خۆی بردی. بە ئەسپایی گوتی:

ـ ئەوە دەرگا کۆنە، بە خشت هەڵچنراوە و ماڵە سواخ کراوە. دەچم پاچت بۆ دێنم بڕووخێنە و دەرباز بە، مەترسێ، کەس نازانێ، رووە و چۆم و چۆلیە، پاچەکەت لە بیر نەچێ! لەگەڵ خۆت بیبە و لە جێیەک بیشارەوە.

بە چرپەی پێی عەدلە خانم. نازدار لە پشت دەرگا رەوی کردو خۆی شاردەوە.

عەدلە خانم هاتۆتە حەوشە، بەرەو ژێر خان دەڕوا، چووە ژێر خان، هاتەوە دەرێ و بەرەو کونە ڕەش گەڕاوە، پای خستە ئەو دیو، دەرگای هەڵپێکاوە و بە کرژی رۆیشت، گەیشتە سەر پلیکان و دەنگی کۆخەیەک ئاوری پێ داوە!

دەنگی کۆخە لە ئانقەست دەچوو! عەدلە خانم بەرەو دەرگای تەویلە وەرسووڕاوە و سەرنجی دایە.

تاپۆیەک لە بەر تیشکی کەم تەوژمی مانگە شەو دیارە! عەدلە خانم بە شک گوتی حەسەن مەیتەرە، بایەختێکی نەدایە و لە پلیکان وەسەرکەوت.

دوا بە دوای عەدلە خانم، نازدار لە پەنا دیوار هاتە دەرێ، بە ئەرخەیانی وەسەرکەوت، چووە دیوەکەی خۆ وی بە دڵنیاییەوە خەوت.

## ١٨

لەگەڵ گزنگی هەتاو چوار سوار لە ڕێی شارەوە بەرەو تازاوا دێن. بە وێڵغار لە چۆم پەڕینەوە، سینگیان ناوە بە لێژی قەڵاوە.

عەدلە خانم لە پەنجەرەوە چاوی لێیە، پەنجەرەی کردەوە، بانگی دەرکەوان دەکا:

ـ مام عەلی! ئاغا تەشریفی هێناوە، دەروازەکە بکەوە، هۆی حەسەن! وەرە بڕۆ چارەوێکانیان لێ بگرە.

ناسکێ و تەنکە بە دەنگی عەدلە خانمەوە هاتنە بەرپەنجەرە، هەر سێ لە پەنجەرەوە هاتنە سەرسەرا دەڕوانە سواران، هەمزەبەگ و ڕەشیدخان و قادرخان و ڕەسوولی نۆکەری.

مام عەلی دەروازەی خستۆتە سەرگازی پشت و دەستەونەزەر وەستاوە.

حەسەن مەیتەر لە تەویلە دەرپەڕی، ئەحمەد فەڕاش لە پلیکانەوە هاتە خوارێ.

حەسەن دەم بە بزەوە رووی کردە ئەحمەد:

ـ ئەمشەو دزم گرت! نانم لە ڕۆندایە!

ـ دزی چی؟!

ـ خۆ گێل مەکە، دەکرێ نازدار شتێک بزانێ و تۆ نەزانی؟! ئاسمان کوڵەکەی دەوێ ئەوەڵ وەمزانی نازدارە، بە وردی سەرنجم دایە، خانم بوو، ماوەیەکی زۆر چووە کونە ڕەش نەهاتە دەرێ، پاشان هاتەدەر و چووەوە ژوورێ و خێرایەکی گەڕاوە. گەیشتە سەر پلیکانەکان، بۆ ئەوەی بزانێ من زانیومە، کۆخیم، ئاورێکی داوە. پێم منی دی، بەڵام وەسەرکەوت. من بە تەواوی ئەرخەیان نەبووم خانم بێ، ئەو چووە سەر، دوا بە دوای نازدار لە پەنا دیوارەوە دەرپەڕی، ئەمجار ئەرخەیان بووم ئەوەی ئەوەڵ خانم بوو. پاشان

چوومە کونە ڕەش، تەماشام کرد حەمەی لێ نەمابوو! بە ڕاستی نازدار بۆی نەگێڕایــەوە؟ پاچەکەشی لەوێ فڕیدا بوو! بۆ ئەوەی نەبێتە بەڵگە، هێنامە دەرێ.

ـ بابا بۆی گێڕامەوە، جارێ باسی مەکە، دیزە بەدەرخۆنە سەری بنێوە.

ـ حەیە حەی! تۆ دەڵێی چی؟! بە خودا خۆ ناگرم، باز لە بەرەگە نەیگری بە کار نایە،ساڵێ جارێ شتی وام بۆ ڕێ دەکەوێ، تا گەرمەبرینە پێی دەڵێم، کـۆن کـەوێ جـوابم ناداتەوە و هیچم گیرناکەوێ.

ئەحمەد و حەسەن بە دەم قسەوە گەیونەتە بەردەروازە. شانبەشانی مام عەلی وێستان.

سوارە گەیینە بەر دەروازە و پێیان لە ئـاوزەنگی دەرهێنـا. هـەمـوو دەم بـە بـزە و بەرزەدەماخن. فەڕاش و مەیتەر و دەرکەوان بە کڕنۆشەوە چوونە پێشێ و چارەوێیان لـە دەست گرتن و کێشایانە ژووری.

هەمزەبەگ بێ وێستان، دەم بە بزەوە بەرەو کونەڕەش وەرێکەوت و ئەوانی دی بـە دوویدا.

عەدلە خانم و ناسکێ و تەنکە و نازدار و سەعید بە پێکـەنین و ترپـق و هـۆڕ هاتنـە خوارێ و چوونە لای ئاغاکان. ئەحمەد و حەسەن لە تەویلە هاتنە دەرێ و بە پێکەنینـەوە گەیشتنێ، هەموو چاوەڕێن ئاغا دەرگای کونە ڕەش بکاتەوە.

هەمزەبەگ ئالقە ڕێزی هەڵگرت و دەرگای کردەوە، سەری بردە ژووری. چاوێکی کردووە بە چوارچاو و بە دیودا دەیگێڕێ! گێژومەنگ سـەری هێنایـەوە دەر، بـە سـەر سووڕمانەوە چاویان لێدەکا! چاوی پڕە لە پرسیار و یەک بە یەک تێیان دەڕوانێ.

ئاغا و خانم، نۆکەر و مەیتەر، فەڕاش و کلفەت هورۆژمیان کردە دیو؛ بـەڵام کونـە ڕەش ئیتر تاریک و تنۆک نییە! دەرگای روو بە چۆم کراوەتەوە و پڕە لـە روونـاکی و شنەبا.

هەموو عەبەساو دەڕواننە یەکتر! مـاوەیـەک هـەمزەبـەگ بـێ قـسە لەبەردەرکـە هەڵتروشکاوە و سەری گێژی ناوەتە نێو هـەردوو دەسـتی و دەیگوشـێ. هـەمـوو بـە پرسیارەوە چاو لە یەک دەکەن! کەس ناوێرێ بە زار لە کەس بپرسێ! بە چاو لە یـەکتر دەپرسن، بەڵام کەس وەڵامی پێ نادرێتەوە.

عەدلە خانم بێ قسە قۆڵی ئاغای گرت و هەڵیساند، وردە وردە بردییە سەرێ.

دوا بەدوای ئەوان، یەک یەک و دوو دوو، بەرەودوا وەسەرکەوتن.

رەسوولی نۆکەر وشک و بێتەکان وەستاوە و بیر دەکاتەوە:

ـ دز کۆشکەی بووە! کاری کێیە؟ هەر کەس بێ، زۆر بێ ترس و ئازایە! ئەحمەدە؟ نازدارە؟ حەسەنە؟ مام عەلییە؟ خۆ دایک و خوشـکەکانی کـاری وا ناکـەن! نـا ئەوانـە هیچیان کاری وا ناکەن؛ ئەی کاری کێیە؟ بلێی کاری سەعید نەبێ؟ ئـەو دەم گرتمـان زۆری بەزەیی پێدا دەهات، بەو بوایە بەرەڵلای دەکرد، ئەی داوەشێم! دەبـوو لـە رێـوە زانیبام، ئەرێ ئەرێ کاریەتی، ئەی ناپیاو، بە خودای ئاوای ناخوا.

لە جێی راپەڕی و یەک تەکان وەسەرکەوت.

هەمزەبـەگ وەک کۆسـکەوتە ئـەژنۆی لـە بـاوەش گرتـووە و ئـەوانی دی بـە دەوریەوەن.

رەسوول چووە بن دەستی و سرتاندی بە گوێیدا، ئاغا وەدەرکـەوت و رەسـوول بـە دوویدا.

پاش ماوەیەک هاتنە ژووری.

هەمزەبەگ ئەو حاڵەتەی پێشووی نەماوە! سوورایی کەوتۆتە لێو و چـاوی گەشـترە! دەڵێی هەواڵێکی خۆشی بیستووە! بە روویەکی خۆشەوە گوتی:

ـ بۆ بۆی داماون؟ خۆ دەست نییە لە گۆزەدا مابێتەوە! لە مێژ نییە هەڵاتووە، هەر لـەم دەوروپشتەیە، رەسوول و سەعید سوار بن بڕۆن بیگرنەوە، خۆ سمایل ئاغای سمکۆ نییـە! شوانێکە، وشووی لێ بکەی دڵی دەتۆقێ. دەبێ چووبێتە هەزار ئەشکەوت، ئەو بەلـەدی ئەوێیە، رەنگە ئەو چەند رۆژەش هەر لەوێ بوو بێ. بە جوانی بگەڕێن، وریا بن، دەبێ لە پیاوی خوێری زۆرتر بترسێی تا پیاوی ئازا، دەمانچەکەی عەتای پێیە، شینم لێ نەکەن بـە دوان! بە پاسگاشم راگەیاندووە، هاکا سەریان هەڵدا، بێن؛ ئەوانیش وەدووتان دەخـەم، دە بڕۆن، دەست بە تاڵ نەیێنەوە، بیگرنەوە بە سەری بابم خەلاتی باشتان دەکەم.

سەعید تەماشای رەشید خان دەکا، لەوە دەچێ دڵ لەدوا بێ!

رەشیدخان بە ئامـاژەی چاو دەڵێ بڕۆ.

سەعید نابەدلانە فیشەکدانی لە خۆی دا و تفەنگی پێنج‌تـیری کردەشـان و بـە دووی رەسوولدا رویشت.

دوو سوار چەک بەشان لەدەروازەی قـەلا بەپـرتاو وەدەرکـەوتن و کێوبـڕ بـەرەو هەزارئەشکەوت رکێفیان لێدا. سەعید دوو دڵە! لەوە دەچێ لە رەسـوول زەنـین بـێ! لـە رۆیندا وەپێشی ناکەوێ، سیلەی چاوی لە سەریە و لێی خافڵ نییە.

رەسوول لە دەروونی سەعید ئاگادارە، گوتی:

ـ تۆ هیچ ئاگات لێیە چ پەندێکمان پێ دەدەن ئەو حیزبابانە؟ وەک بەردەقۆچـەقانی هەر تاوێ بەرەو لایەک تووڕمان دەدەن. ئێستا لە کوێی بدۆزینەوە؟ وەڵـلا لـە رۆحـی خۆم بێزارم، شەوێ وەنەوزم نەداوە، ئـەوە کـوێر دەبم، بـە مـن دەکـەی هێنـدێ خـۆ دەخلافێنین و دەڕۆینەوە، تۆ دەڵێی چی؟

سەعید ئەوەندەی ئازا و نەترسە، ئەوەندەش ساویلکەیە، بە کەوچکێ ئـاو دەکەوێتـە مەلە، بەو قسانەی رەسوول خەل و خەش لە دڵی برا، گوتی:

ـ کەیفی خۆتە، چۆن دەڵێی من وادەکەم.

دوو سوار بە قسەو دەردە دڵەوە گەییونەتە نێو شاخی پڕ زەردومای هەزار ئەشکەوت.

هەزار ئەشکەوت ناوی خۆی بە خۆیەوەیە. شاخێکی پڕ شیو و دۆڵ و زەردومایە. نێـو هەر دۆڵێکی دەیان کۆلانپێچە، هەر کۆلانپێچێ، رەوەز و زەرەدێکی پڕ لە ئەشـکەوت و کون دەمیان کردۆتەوە و لە دوور رەش دەکەنەوە، ئەو شیو و دۆڵـە ئەسـتەمە، ورە لـە پیاوی ئازا و بە جەرگ دەستێنێ و کەم کەس دەوێرێ بە رۆژی روونـاک، تـەنیا پێیـدا بڕوا.

هەر دوو شانبەشان چوونەتە نێو جەرگەی کێو، قامک لە سەر پەلەپیتکەی تفـەنگ و بە پارێزەوە چاودەگێڕن ودەچنە پێش. گەینە دوو شیوانێ، سەعید بـە دەسـتە راسـتیدا و رەسوول بە دەستە چەپدا لە یەک هەڵبڕان.

سەعید نەدیو کەوت و لە چاو ونبوو.

رەسوول لە ئەسپ دابـەزی، دەسکەوسـارەکەی بەسـت و بـە بنـە چاڵـووکێکەوە، توندوتۆڵ بە کێودا وەسەرکەوت، لە بـەرزایی کێـو ئەمدیوئـەودیوی لـێ دیـارە. لـە بنەبەردێ خۆی مڵازدا.

سەعید وردە وردە بە شیودا وەسەردەکەوێ، دیـت و دیـت و دیتـە پێـشێ، نزیـک بۆتەوە، هاتە سێرە.

ڕەسووڵ قامکی لە سەر پەلە پیتکەی بڕنووە! قۆنداخی لە شانی ڕاست توندەو چاوی چەپی نووقاندووە. دڵی بە توندی لێدەدا! قامکی لە سەر پەلە پیتکە دەلەرزێ، گەرووی وشکە و مچۆڕک بە لەشیدا دێ! چاوی لە سەر سێرە لابرد، قۆنداخی تفەنگ شل بۆوە و شانی بەردا، تفی زاری قووت دایەوە و گەرووی پاراو کردەوە، خۆی لۆمە دەکا:

ـ ئەی جەرگت خرا بێ! ئەوە بۆ دەلەرزێی؟ غیرەتت سەگ بیخوا، دەرفەت لەوە باشتر؟ خۆ گوللە پیاوی ئازا و خوێڕی ناناسێ، هەر ئەو گوللەیە دێمە کار، نەیپێکم تازەکارم تەواوە؟

قۆنداخ لە شان توند بۆوە، چاو چۆوە سەر سێرە و قامک لە پەلە پیتکە توندە، تەختی نێو چاوانی سەعید لە ژێر سێرەدایە، هاڕەی بڕنوو پڕ بە دۆڵی هەزار ئەشکەوت، لە هەزار لاوە ئەشکەوتەکان دەنگیان دایە دەنگی یەک کێوەکان ئەمبەر و ئەوبەر جوابی ڕەسولیان داوە و تێکەڵ دەنگی نالەی سەعید بوون.

سوار گلا، تفەنگ پەڕی، سەعید لە خوێن گەوزا، ئەسپ بە زین و لەغاوەوە سەر بەرەوە ژێر بە لەسەی شیوودۆڵ بوو.

ڕەسووڵ لە بنەبەرد تاساوە، ناوێرێ سەرهەڵێنێ، چاوەڕوانی جوابە، ماوەیەک دڵەکوتە مەجالی لێ بڕی، جواب نییە. لە کەلێنە بەردەوە سەر دەکێشێ، لاشەی بێ گیانی سەعید کەوتووە. لە بنە بەرد هەستا و دووسێ هەنگاو چووە پێشێ، ترس و دوو دڵی ئەژنۆی بێ هێز کردووە، پاشە و پاش کشایەوە و دوورکەوتەوە. بۆ جوابی پاشە ڕۆژکەوتە بیری فێڵ و تەلەکە.

لە سەر بەردێ دانیشت. کەوش و گۆرەوی پێی ڕاستی داکەند. گوللەی خستە بەر تفەنگ. بە دەستی ڕاست نەرمایی و پێستی کەلەکەی بە کەوا وکراسەوە پڕ بە چنگ گرت قۆنداخی تفەنگی لە ئەرز دانا. بەدەستی چەپی لوولەی تفەنگی نایە سەر کەلەکەی و لەنگەری گرت. قامکە کەلەی پێی ڕاستی نایە سەر پەلە پیتکەی تفەنگ و هێزی دایە. تفەنگ هاڕەی کرد و ڕووەو پێست کەلەکەی سمی و خوێن هەڵقولی. لەش لە خوێن شەلالە، خۆی لە خۆڵ وەردا و تەواوی لەشی بوو بە خوێن و خۆڵ. هەستاوە و دەستیکرد بە تەقە، دوا گوللەی تۆقاند. لە کێو هاتە خوارێ و سوار بۆوە.

ئەسپە ڕەش وەک باڵدار دەفڕێ، دەشت و کێو لە ژێر سمیدا وێک هاتوتەوە. گەییوەتە ژێر لێژی قەلا، لووتی نا بە دەروازەوە دەپڕمێنێ.

سوار بە سوارییەوە، شپرێو لە دەروازەی دا. دەرکەوان دەروازەی کردەوە و عەبەساو دەروانێتە رەسووڵ! سوار بێ وێستان رکێفی لێدا و چووە حەوشە.

حەوت چارەوێ لە حەوشە بەسراونەتەوە و سەریان لە ئاخوڕ ناوە. ئەسپەڕەش دەحیلێنێ و رووەو ئەسپی غەوارە بە کوڕژنەوە دەڕوا. رەسووڵ لە غاو دەکێشێ. دیسانەوە دەحیلێنێ و لە سەر پاوە دەخولێتەوە. حیلە و کوڕەی حەوت هەشت ئەسپ دەنگیان دایە دەنگی یەک، هەمزەبەگ سەری لە پەنجەرەوە هێنایە دەرێ، رەسووڵ خوێناوی و شپرێوە! گوڕاندی:

ـ چ بووە رەسووڵ! بۆ خوێناویت؟! سەعید کوا؟!

بە پرسیاری هەمزەبەگەوە دانیشتووانی نێو قەڵا هاتنە بەرپەنجەرە. سەر و کڵاوی ئەمنییە وەدەرکەوت، تەزوو و مچوڕکێ بە لەشی رەسووڵ وەک هەورە برووسکە هات و تێپەڕی، خۆی هێنایە حاڵی جاو! حەسەن مەیتەر لە مێژە لە رەسووڵ دەڕوانێ، پێ پێ لێی چووە پێشێ، بێ پرسیار دەستە جڵەوی ئەسپەڕەشی گرت و رەسووڵ دابەزی. حەسەن ئەسپی کێشایە تەوێلە و هاتەوە دەرێ.

ئاغا ئەحمەد فەڕاشی ناردە خوارێ. حەسەن و ئەحمەد رەسووڵیان بردە ژوورێ. دیو حەشیمەتێکی زۆری لێیە، هەمزەبەگ و رەشیدخان و قادرخان و حەوت ئەمنییەن. هەموو شلەژاو و پەشۆکاو دەوری رەسووڵیان داوە. ئاغا بە سەر سوورمانەوە دەپرسێ.

ـ بۆ بریندار بووی؟!لەگەڵ کێ تێ هەڵچوون؟ ئەی سەعید کوا؟

رەسووڵ پێچ دەخوا و بە برینەوە دەناڵێنێ، بە دەم ناڵەوە گوتی:

ـ کوژرا! سەعیدیان کوشت!

ـ کێ کوشتی؟ لە کوێ؟

ـ لە بەردە دەنگدارەی هەزار ئەشکەوت کوتوپڕ کەوتینە نێو چەتەکان، لە یەکەم دەسرێژدا هەر دووکمان پێکراین، برینی من کاری نییە، ئەو لە سەریاندا، کەوتن و گیاندانی یەک بوو! بە بریندارێ و قوونە شەڕ، پاشەکشێم کرد. تا دوا فیشەک دەستم کردەوە، بەڵام ئەوان زۆر بوون، ناچار هەڵاتم.

ـ بڕوا ناکەم! سەعید چەند ساڵە نۆکەری خۆمە، چۆن بەو زووانە دەکوژرێ؟! ئەو بۆ دە کەس ئاوڕ ناداتەوە! دەبێ وا نەبێ! وا نییە، نەکوژراوە، تۆ بە چاوی خۆت دیت؟

ـ بەڵێ، شانبەشانی یەک دەڕۆیشتین، لە تەختی نێو چاوانی درا، ویستم دابەزم و هەڵیگرم و بیڕفێنم، منیش پێکرام و دەرفەتم نەبوو، هەڵنەهاتبام منیش دەکوژرام ئاغا.

( تۆ نەدەکوژرای، پیاوی خوێڕی قەت ناکوژرێ، حەیفە، حەیفە سەعید کوژرابێ و تۆ بمێنی، هەر کەس بێ، زۆر ناپیاوە سەعیدی کوشتووە! ناپیاویی منە! من ناپیاوم! سەعید بۆ ئەوەنەدە نەدەبوو نۆکەری من بێ! بە خوای حەیف، حەیف لە دەستم دەرچوو، دەستی شکاوم، پیاوی وام دەست ناکەوێتەوە. گوللە چەند بێوەفایە!کەس ناناسێ. دەبوو شەرمی لە سەعید کردبایە و لە حاندی سارد بایێتەوە!

ڕەشیدخان بەدڵپڕییەوە ڕووی وەرگێڕا ودەسرەکەی دەرهێنا.

هەمزەبەگ دڵسۆزانە دەستی خستە سەرشانی و سەبرێ سرتاندی بەگوێیدا:

ـ عەیبە! بۆ نۆکەرێ دەگریت؟! تازە کار وای لێ هاتووە، بە جێی ئەوە وەرە ئەو ئەمینانە ڕازی کەین بێ دەنگەی لێ بێنن، دەنا...

ـ دەنا چی؟ ڕەسووڵ دەگرن؟

ـ نا، خۆمان تووشی چەرمە سەری دەبین، ڕەسووڵ چاوی دەرێ، ئەو نا یەکی دی، چی زۆرە، نۆکەر، لە سەعید باشترت بۆ دەگرم، تازە ئەو ڕۆییوە، زیندوو نابێتەوە، پشتی من بەرمەدە، خۆم ئەوانە ڕازیدەکەم، ماڵ و منداڵی سەعیدیش بەئەستۆی خۆم، ئەوانیش قایل دەکەم لە سەری نەڕۆن و سەری بنێنەوە، ناهێڵم تۆ زەرەر بکەی، هەر چی بێ، سەعید من ناردوومە، بۆ کاری من خۆی بە کوشت داوە، خۆم هەموو زەرەر و زیانێ دەگرمە ئەستۆ، تۆ لە هەموو شتێک تەریک بە، هیچ مەڵێ، خەرجەکەم لێ گەورە مەکەوە! با خزمایەتییەکەمان نەچێ.

ـ جا بە کاری چ دێ؟ تازە من سەعیدم لە دەست داوە مامە هەمزە، چم لە دەست دێ؟

تف هەڵاوێم نێو چاوانی خۆم دەگرێتەوە، لەبەرتۆ چم پێ ناکرێ دەنا پیاوی وەک سەعید بۆ ئەوەی نابێ بخرێتە پشتگوێ، من لە هەموو لایەک شانازیم پێوە دەکرد. هەمووئاغاکان بەخیلیان پێ دەبردم، پیاوی وەک ئەو لە موکریان بێ وێنەیە، داخی بە جەرگم، تازە تا قیامەت نۆکەری وام گیر ناکەوێتەوە.

ئیستیوار رەزایی لە هیچ حالی نییە، هەر تەقەی گوێی دێ، هەمزە بەگ بردییە دیوێ، بە فارسی لە ئەوەڵەوەی بۆی دووپاتکردەوە، ئیستیوار رەسووڵ دەخوازێ. رەسووڵ لە حوزورە، ئیستیوار قەڵەم و کاغەزی دەرهێنا باس و خواس بنووسێ، گوتی:

ـ بۆ چوونە ئەو کێوە؟!

ـ سەر کار ئیستیوار! هەر وەک خۆت ئاگاداری، ئەو هەتیوە شوانە گیرابوو، خۆم گرتبووم، هەڵاتووە، شەوێ هەڵاتووە، ئاغا ئێمەی وەدووخست بیگرینەوە، لامان وابوو چووەتە هەزار ئەشکەوت، ئاخر ئەوێ زۆر چڕە، لەشکر تێی کەوێ ون دەبێ، گەیشتینە نێو کێو وەبەردەسرێژیان داین، ئەوەڵ سەعید پێکرا، من دابەزیم هەڵگرمەوە، منیش پێکرام، هەر ئەوەندەم توانی خۆ نەجات دەم.

ـ زۆر بوون؟

ـ زۆر و کەم نازانم، حەوت هەشت تفەنگ تەقەیان دەکرد، ئەوەی راستی بێ، من زۆر ترسام، جوان تێ نەفکریم.

ـ لێرەوە دوورە؟ رێی چەندە دەبێ؟

ـ دوورێکی وا نییە، رێی سەعاتێ، سەعات و نیوێ بە سواری دەبێ.

ئیستیوار مات بووە، ئەوەی نووسی و قەڵەم و کاغەزی نایە گیرفانی. چاوێکی لە هەمزەبەگ کرد، گوتی:

ـ ئاغا! تۆ دەڵی چی؟

هەمزەبەگ لای وایە ئەوەی رەسووڵ گوتویە راستە، چاوێکی لێدەکا، رەسووڵ بە بزەیەک ئاغای تێگەیاند، بۆ شوێنە گومکییە چەتە لە گۆڕێدا نەبووە.

هەمزەبەگ گوتی:

ـ تۆ چۆن دەڵێی من وادەکەم سەرکار ئیستیوار. پیاو بنێرم تەرمەکەی بێننەوە؟

ـ چۆن وا دەبێ؟ ئەی بە پاسگا راناگەیێنی؟

هەمزەبەگ دەستی کرد بە بەخەڵدا، دەریهێناوە و کردی بە گیرفانی ئیستیواردا، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ بێ بەلا بی پاسگای بۆ چییە؟ ئەوە تۆ پاسگا، دەڵێی چی؟ چەتە کوشتوویە شکایەت لە کێ دەکەی؟ خۆم ژن و منداڵی رازی دەکەم، ئەگەر تۆ رازی بی، ئەوەش

دەم شیرینی بوو، خستمە گیرفانت، پێنسەد تمەنە، دەمی ئەوانی دیشم بۆ شیرین کە، پاشان قەرەبووی دەکەمەوە، بە سەر خۆمیەوە ناهێلم، من کارم بە تۆ دەبێ، تۆش هەروا.

دەستی ئیستیواری گرت و چوونەوە لای ئەوانی دی.

پاش وتوویژێکی زۆر، رایان هێنایە سەر ئەوەی ئیستیشهاد بنووسن. ئیستیوار ئیستیشهادی نووسی. ئەوانەی لەوێ بوون مۆر و ئیمزایان کرد. ناردیان بە دووی خەلکی نێودێدا و حەوت کەسی نێو دێش مۆریان کرد. ئەو ئیستیشهادە بۆ هەلاتنی حەمە شوان بوو، باسێ لە کوشتنی سەعید لە گۆرێدا نییە.

دوانیوەرۆیە، نیوەرۆژە خوراوە، ئەمنییە لە دێدا نەماوە. ئەحمەد فەراش چووەتە شار بۆ خەلاتی.

لە نێو دێ قاو بلاوە، دەلێن چەتە هاتووە! هەزار ئەشکەوت پڕە! سەعیدی نۆکەری رەشیدخان کوژراوە! رەسوولی نۆکەر بریندارە! لەوانەیە ئەمشەو بێنە سەرمان، کێ چی هەیە قایمی کا.

ئامینی خێزانی رەسوول بە گریان و خۆرنین بە بەرگەرەکدا رووەو قەلا دێ و ژن و پیاو، گەورە و بچووکی تازاوا بە دوویەون. چوار پێنج سەرە ژن و کەیخواداژن قۆلیان گرتووە و دلخۆشی دەدەنەوە و پێ بە پێی گەیونەتە دەرکی قەلا.

دەروازە کراوەتەوە و حەوشە پڕە لە ژن و پیاوی رەعیەتی. ئامین بە دەست و پلەوە بەند نابێ، هاوار دەکا و دەگری.

بە دەنگی ئامینەوە، عەدلە خانم هاتە خوارێ، ئامین و ژنانی بردە سەرێ، رەسوولی نیشان ئامین‌دا، چاوی پێیکەوت، ئۆقرەی گرت و بێ دەنگ بوو.

بە دەستووری ئاغا، پازدە بیست پیاوی قۆچاخ چوون و تەرمی سەعیدیان هێناوە. حەوشەی قەلا جەنجالە. دەستەیەک ئاو گەرم دەکەن. چەند کەسی لێزان و بە دین لە سەر تاتەشۆر تەرمی سەعید دەشۆن. برینی سەری وەک کانی خوێنی لێ هەلدەقولێ، لۆکەیان لە ولات بڕیوە و لە برینیان ئاخنیوە، خوێن بەربەست نابێ!دلۆپ دلۆپ بە تاتە شۆردا دەتکێتە خوارێ و تێکەلی ئاوی جۆگەی حەوزەکەی حەوشە دەبێ و لە خوار دێوە دەچێتە نێو زەوی و سەدان بنەگیا و درووی تینو پاراو دەکا بەهاری داهاتوو پێنج بەستنەوە بالا بەرزکەنەوە و تۆوی بە ولاتدا بلاو بێتەوە.

دەنگی گریان لە دیوی ژنانەوە دەگاتە، حەوشە، دلی پیاوانی وەکوڵ هیناوە، ناسکێ خانمی خێزانی رەشیدخان شیوەنگای داناوە و شین دەگێڕێ، بە دەنگـی بـەرز سـەعیـد دەلاوێنێتەوە:

وەی رۆ وەی ڕۆ
گەورە نۆکەری رەشیدخان ڕۆ
شێرە پیاوەکەی موکریان ڕۆ
ئازا و بە جەرگی قەلای رەشیدخان
برای هاوپشتم تۆ بووی سەعیدگیان
بۆ بە جێت هێشتین بەو دەس و بردە؟
کوا وادەی کۆچ بوو؟ مندالت وردە.
وەی رۆ وەی رۆسەعیدی ئازا و
مندال وردم ڕۆ.

ناسکێ هێندە بە سۆز سەعید دەلاوێنێ، ئەوەی گوێی لە دەنگییەوە، بێ ئیختیار بانگی گریان هەلیدەدێرێ.

عەدلە خانم لە ناسکێ بە کولتر دەگری: خۆ بە تاوانبار دەزانێ و زاتی نییە تاوانەکەی بدرکێنێ، کولوکۆی دەروون بە قولپەی گریانەوە دەرئەدا.

دەما دەمی عەسرە، ئەحمەد فەڕاش لە شار هاتۆتەوە خەلاتی بۆ سەعید هێناوە. کفـن بە بالای بڕدرا و کرایە بەری. خوێنی سەری ناوێستێ، کفن بە خوێن گوڵ گوڵە.

دارە تەرم لە چارەوێ هەلبەسرا. هەمزەبەگ و زاواکانی سوار بوون. خەلکی تـازاوا، بە دەستووری ئاغا، مال و پیاو، سوار و پیادە بۆ بەڕێ کردنی تەرمی سـەعید سـازبوون، ژن و پیاو، ئاغا و رەعیەت لە حەوشەی قەلا تێکەلن.

ناسکێ لە نێو حەشیمەت رووی هەلمالی و بە دەنگی بەرز بانگی رەشیدخانی مێـردی کرد:

ـ بلێ چارەوێم بۆ زینکەن، منیش لەگەل سەعید دێمەوە.

رەشیدخان بێ ئەوەی قسە لە قسەی ناسیکدا بکاتەوە، بانگی حەسەن مەیتەری کـرد و فەرمانی سازکردنی چارەوێی دایە.

حەسەن مایینی زین و لەغاوکراوی هێنایە دەرێ، ئەحمەد فەڕاش چووە یارمەتی حەسەن مەیتەر و مایینەکەیان بردە بەر ئاخوڕی حەوشە، ناسکێ خانم چووە سەر ئاخور و پێی لە ئاوزەنگی نا و سوار بوو. ئەحمەد جڵەوی مایینی گرت و بوو بە جڵەوداری ناسکێ.

تەرمی سەعید لە دەروازەی قەڵاوە چووە دەرێ و سوار و پیادە وەدووی کەوتن. ڕەشیدخان بە سوارییەوە لە حەوشە وەستاوەو تەماداری هەمزە بەگە.

چارەگە سەعاتێکە هەمزەبەگ چووەتە لای ڕەسوولی نۆکەر، سرتوخورت سەریان ناوە بە سەری یەکەوە و دەچپێنن بە گوێی یەکدا.

ڕەشیدخان بێ ئۆقرە بانگی کرد:

ـ مام هەمزە! جەنازە ڕۆیشت، هەر ئێمە ماوین.

هەمزەبەگ ڕەسوولی بە جێ هێشت و بە پەلە هاتە حەوشە. کوێتەی لە دەستی حەسەن مەیتەر گرت و سوار بوو، بە جووت وەدووی تەرم کەوتن.

ئاوایی خەوتنە. نێو دێی بژوێ شڵەژاوە. ئەوەی دەستی دار بگرێ و پێی ڕۆینی هەبێ، وەدەرکەوتوون و دەنگیان یەک و تێکڕا دەگرین، شیوەن ئاوایی گرتۆتە بەر. تەرمی سەعید لە مزگەوتە. قورعان خوێن بە گریانەوە لە سەری دەخوێنن، هەمزەبەگ و ڕەشیدخان و قادرخان لە بەر مێحرابەوە شانبەشانی مەلا دانیشتوون، ڕەشیدخان بە کوڵ دەگری. قەبرکەن چوون بۆ قەبران.

ناسکێ خانم چووەتەماڵی سەعید، ژنانی بژوێ تێڕژاون، شین و گریان و قوڕپێوانە. خێزانی و کچەکانی ڕوومەتیان بە نینۆک شێو بڕیوە و دادڕ دادڕیان کردووە و پەلکەیان بڕیوە. مەلێعای خێزانی بە دەم گریانەوە دەڵێ:

ـ دەبوو هەر پاش نیوەڕۆ زانیبام سەعید کوژراوە! ئەسپەکەی بە زین و لەغاوەوە، بێ سوار هاتەوە بەر دەرگا، ئەی کوێر بم بۆ نەمزانی؟ دەبوو زانیبام.

ژنان ئەوندە گریاون هیچی نووزەی دەرنایە. منداڵە وردەکانی سەعید بە دەستی ژنانەوەن و دەیانبەنە ماڵی خۆیان.

شەو لە نیوە لای داوە. قەبرکەن خەبەری تەواو بوونی قەبریان ناردەوە. تەرمی سەعیدیان لە تابووت خست. بۆ چاوپێکەوتن و ماڵاوایی یەکجاری، بردیانەوە بەر دەرکی خۆیان، ژنان تابووتیان لەدەست پیاوان دەرهێناوە، تەرمی سەعید لە نێو ژناندا

ونبووه، به پاڕانەوە، جار جار بە قسەی ناخۆش، پیاوان تابووتیان بەدەستهێناوه و رفاندیان بۆ قەبران. نزیکه و بەیان تەرمی خوێناوی سەعیدیان بە خاک سپارد.

سبەینێ پاش تاوکەوتن، ئاغاکان هاتنەوه مزگەوت. سەماوەر و ئیستیکان، چادان و قەند و چا لەماڵی ڕەشیدخانەوه هێنرایە مزگەوت. خەڵکی بژوێ کۆ بوونەوە، دێهاتی دەوروبەر بۆ پرسە هاتوون. قورعان خوێن لە چەند لاوه قورعان دەخوێنن. فاتیحا لە سەر فاتیحا دادەخرێ. سەماوەری ڕەژی قوڵتەقوڵت دەکوڵێ. چاپەز چا تێدەکا، چا بە نێو خەڵکا دەگێڕن، دەستەیەک دێ و دەستەیەک دەڕوا. حەسەن مەیتەر خۆی کرد بە مزگەوتدا، دوای فاتیحا هەمزەبەگ بانگی کرد:

ـ حەسەن! یانی چی؟! خێرە؟

حەسەن لە خوارەوه قوت هەستایە سەر پێ، هەر لە جێوه توند گوتی:

ـ قوربان! ئەمشەو چەتە داویە بە سەر دێدا، ئەوەی وەبەردەست کەوتبێ، بردوویانە، وەفریاکەوه.

خەڵکی تازاوا وه جموجۆڵ کەوتن، چاویان لە ئاغایە.

هەمزەبەگ بە دەنگێکی بەرز گوتی:ـ نەدامەت خۆی چاکە! قورتەکانی خراپە. لە لایەک جەرگم براوه و کوڕم هیلاکە، لە لایەکی دی سەعید پشتی شکاندووم! ئەوەش یەکی دیکە. خەڵکینە! هەموو گوێتان لێبێ و شاهید بن، سەعید لە ملکی مندا کوژراوە، تا بە ڕۆح زیندوو بم، ساڵی دە تەغار گەنم لە لایەن منەوه مەختەوی ماڵ و منداڵی ئەو بێ، بە پیاو و ولاخی خۆمدا بۆی دەنێرم، خەرج و موخاریجی پرسە و نانی قەبرکەن بە ئەستۆی من.

دەستیکرد بە گیرفاندا و هەزارتمەنی دەرهێنا و دایە دەستی مەلاکەی بژوێ، گوتی:

ـ مامۆستا! خۆت بیاندەیە، بە پیاوی خۆمدا ئازووقەی تا بەهاریان بۆ دەنێرم، ئەوه خەرجی پرسە و میوانەکانە، لە لایەنی منەوه سەرەخۆشییان لێ بکە، کارەکە وایە، دەبێ بڕۆم دەنا خۆم دەچوومە لایان، ئەوەی پێویستە تۆ پێیان بڵێ.

چاکە و پیاوەتی هەمزەبەگ زاری بە خەڵک کردەوە! ڕەشیدخانی زاوای شانازی پێوه دەکا، سەبارەت بە کوشتنی سەعید هیچی لەدڵدا نەماوە.

هەمزە بەگ هەستایە سەر پێ، هەموو دانیشتووانی مزگەوت هەستان و وەدووی کەوتن. لەو لای دێوە، خەڵکی بژوێ گەڕانەوە، تازاوایی وەدووی هەمزەبەگ کەوتن، سوار و پیادە رووەو تازاوا کەوتنە رێ.

ئاغا چووەتە قەڵا. پیاوی ناردووە لە دووی رەسووڵ. نۆکەر لە حوزوورە:

ـ دەی رەسووڵ! چت کردووە بە چی؟ تۆڵەی ئەو هەموو خەرجەت کردووەتەوە؟ ئەو دوو سێ رۆژە پەستا پەستا گیرفانم هەڵتەکاندەوە.

رەسووڵ لە خۆباییە، بە بزەوە گوتی:

ـ نەغدینە وەگیرناکەوێ ئاغا، ئەو دێیەمان سەنگ و شووژن داوە، چوار هەزارتمەن پووڵ و هێندێ مت و مورووی قیمەتیمان گیرکەوتووە! هەزاریم داوە بە کوێخا شەریف و فەیزە، ئەوەش سێ هەزار مورووەکە.

پووڵ و مورووی لەبەردەستی ئاغا دانا.

هەمزەبەگ بە پێکەنینەوە هەڵیگرتن، هەزارتمەنی دایەوە بە رەسووڵ، گوتی:

ـ ئەمڕۆ من زۆر ماندووم، تۆش شەوێ نەنوستووی، ئەمڕۆ هیچ، بەیانی زوو وەرە دەچینە کانی توو، بەڵێنم بە عەتا داوە بەر لە هاتنەوەی دەبێ بووکم بۆ دابەزانی. ئەو هەتیوە شوانە هەر وا بێ ئارەق لەدەستمان دەرچوو، ئەوەی هەیبێ هی منە، بە تالان دەیهێنین، لە بیرت نەچێ، زوو وەرە.

رەسووڵ ماتڵی ئەوە بوو ئاغا قسەکانی تەواو کا، بە پەلە گوتی:

ـ قوربان، لە بیرم نەبوو عەرزت بکەم، فەیزە دەیگوت کوێخا کەریم هیلاکە! شەپلە لێیداوە و لایەکی چووەتە لاوە! دەیگوت لەو شەوەوە کە ئەو رووداوە روویداوە، کەس قسەی لێ نەبیستووە، لەوانەیە بمرێ.

ـ دەمرێ چاوی دەرێ، ئەو نا و کەسێکی دێ، با جارێ کچەتیوەکەی مارەکەم، پاشان چ دەبێ بە توون.

ماڵی کوێخا کەریم جەنجاڵە. دەستەیەک دێ و دەستەیەک دەڕوا. دوو شەو و دوو رۆژە کەس قسەیەکی لە کوێخا نەبیستووە. لای راستی چووەتەلاوە و لەسمە. تا ئێستا سێ جار یاسینیان خوێندووە. پوورەگوڵە گوتوویە چاکبوونەوەی ئەستەمە، زۆری مەدوێنن، شەپلە لێیداوە.

مام حەسەنی خەزووری و مەلا کەریم و حاجی قادر و مام ڕەسووڵ و سۆفی مینە بە دیارییەوە دانیشتوون. نازەنینی خێزانی کوێخا سەماوەری تێ هاویشتووە و لە بەری دانیشتووە و فرمێسک هەڵدەوەرێنێ، چاو یەکە و فرمێسک هەزار!

کەوێ خوی کێشاوەتە نێو ماڵەکە، دوو شەو و دووڕۆژە دایکی نەبێ، کەس نەیدیوە، دوو سێ جاریش مینای حاجی قادر چووەتە لای. لەو دەمەوە زەوادی نەبڕیوە و هیچ نەچووەتە دیوای دەروونی. تەنانەت لەگەڵ میناش نەدواوە! پاڵی داوە بە دیوارەوە و دەڕوانێتە کولاوکەی سەربان. دایکی جار و بارێ بۆ کارێ دەچێ، کەم و زۆر ناوێری بیدوێنێ! مینا پێی گوتووە حەمە هەلاتووە، ئەویش عەبە بۆی گێڕاوەتەوە، بەلام کەوێ بایەخێکی بە قسەی مینا نەداوە، تەنانەت چاوی لە کولاوکەکە نەترووکاندووە! ڕەنگە لە حەمە قەڵس بوو بێ، یان باوەڕی بە مینا نەکردبێ! کەس نازانێ.

قاوەڵتوونێکی درەنگە. دوو سوار لە کێوە بەر داوێلەوە دێنە خواری، گەییونەتە دەوری دێ. هەمزەبەگ و ڕەسووڵی نۆکەر. خەڵکی کانی توو بە پێشوازییانەوە چوون. بەر لە هەموویان فەیزە درێژ گەیشتێ. ئاغا ڕووی لە فەیزەیە:

ـ فەیزە! لە پێشەوە بڕۆ بە ماڵی کوێخا بڵێ ئاغا دێ بۆ ئەوێ، زوو بگەڕێوە، ئەو ئەسپانە بەرە تاقەتیان کە.

فەیزە بە لۆقە لۆق وەجامبازە کەوت، خۆی گەیاندە ماڵی کوێخا، لە دەرگاوە خەبەری دانێ و بەرەو دوا گەڕاوە.

مەلا و حاجی و کەیخودا لە ماڵی کوێخا دەرپەڕین، چوونە پێشوازی ئاغا، بە گەرمە بەخێرهاتنیان لێکرد، جەماوەر وەدووی کەوتن و چوونە ژووری.

دیوەخان پڕە، زۆر بەیان بە پێوەن. هەمزەبەگ چووتە ژوور سەری کوێخا و لە حاڵی دەپرسێ:

ـ چۆنی کوێخا کەریم؟ بۆ خۆت هێناوتە حاڵی جاو؟! تۆ قەولتدا کەوێ لە عەتا مارەکەی، لە قەولەکەت پەشیمانی؟ دەیدەی، یان نایدەی؟

کوێخا حاڵی بووە، جوابی پێ نادرێتەوە، بە دەست ئاماژەی کرد بۆ مام حەسەنی خەزووری و دەڵێ ئەو وەکیلە.

هەمزەبەگ پاڵی داوە، ڕووی قسەی کردە مام حەسەن:

ـ تۆ وەکیلایەتی دەکەی؟

مام حەسەن چاوێکی لە خەلکەکە کرد، گوتی:

ـ چت عەرزکەم ئاغا؟ کوڕ و کچ بە یەک رازی بن، من دەلێم چی؟ هەر مەبارەک بایی دەوێ، خزم لە تۆ زاوا لە عەتابەگ چاکتر؟ شەرت کچ و کوڕە.

ـ رازی، یان ناڕازی، بە سەری بابم دەبی مارەبکرێ، ئەوە هیچ. بەیانی دێین و مارەی دەکەین، پاش دوو رۆژ دەیگوێزینەوە. لەوە گەڕێن، ئەمڕۆ بۆ سێ کار هاتووم، خوازبێنی و جەریمە و تالان و سووتانی مالی حەمە هەتیو! جەریمەتان دەکەم بۆ ئەوەی پیاوی وەک حەمە هەتیوتان تێدا هەلکەوتووە! بۆ ئەوەی کەسێکی دی پێ لەو شکۆیەوە نەنێ و دەست لە رووی ئێمە بەرز نەکاتەوە، مالی دوو سەد تمەن جەریمەتان دەکەم، مەلا و گولەی مام کەریم و کوێخا کەریمی لێ دەرچێ، ئەوانی دی خۆسازکەن.

مەلا و کوێخا کەوتنە تکا و پاڕانەوە:

ـ ئاغا! ئەوندە زۆرە! بۆ کەم کەس بوود دەبێ، سندووقە سەری عەتابەگ کەمی بکەوە، مالی وامان هەیە نان و تووی خۆی نەبووە، دووسەدتمەن بەکێ بوود دەکرێ؟! خودا غەزەب لە حەمە بگرێ، مالی ئەو کەسە کاول بێ حەزی بەو کارە کردبێ، ئێمە بلێین چی! ئێمە بۆ دەبێ بە ئاوری ئەوەوە بسووتێین؟ ئاغا! گەورەیی بکە، جووتبەندە سەد تمەن و رەشایی پەنجاتمەن جەریمەمان کە، چی لە مالی حەمە دەکەی بیکە، کەیفی خۆتە، حەوتەیەک مەودا بدە، خۆمان کۆی دەکەینەوە و دەیهێنینە خزمەتت.

هەمزەبەگ ماتبووە. سەری هەلێنا گوتی:

ـ لاتان وا نەبێ من ئاغایەکی خراپم، خراپتان نەدیوە! لە هەندەران رەعیەت دەست لە ئاغا بەرز کاتەوە، بەوانە کار کۆتا نابێ! بەلام من دل حیزم، دلم زوو نەرم دەبێ، ئەوە کردم بە خاتری ئێوە، قسەتان ناشکێنم، جووتبەندە سەد تمەن، رەشایی پەنجا تمەن، بەیانی هاتمەوە بۆ مارەکردنی کەوێ، دەمەوێ، لە تۆم دەوێ مامۆستا! لە فەیزە و فەتاحی مەستێنە، فەتاح لێرەیە؟

فەتاحەکوێر لەبەردەرکەوە هەستا و گوتی:

ـ لە خزمەتام ئاغا.

ـ لە رۆییندا بتبینم، کارم پێتە، گوێت لێبوو گوتم جەریمەت نەکەن؟

ـ بەلێ ئاغا! خودا لە گەورەییت کەم نەکات، سایەت لە سەرمان کەم نەبێ.

بە جەماوەری گوتیان: ئیلاهی ئامین.

هەمزەبەگ بەرەسوولی نۆکەر دەڵێ:
ـ برۆ بۆ ماڵی ئەو هەتیوە چی بە کار دێ بیهێنە دەرێ، بیانبە ماڵی فەیزە، ما باقی بە ماڵەکەوە ئاوری دە، با بنەماڵەکەی بلە جواڵ شوێنەواری لە ملکمدا پاک بێتەوە، هیچی نەهێڵی، فەیزە و فەتاحیش لەگەڵ خۆت بەرە.
مەلا کەریم چاوێ بە خەڵکەکەدا دەگێڕێ، جگە لە رەسووڵ و فەیزە، فەتاحە کوێریش هێندێ، ئاسەواری پێ خۆشبوون لە روخساری کەس بەدیناکرێ! ئەمجارەیش بە تکاوە رووی لە هەمزەبەگ ناوە:
ـ ئاغا گەورەیە، گەورە خاوەن دەسەلاتە، بکوژ و ببڕ خۆیەتی، کەس ناتوانێ دەست بێنێتە رێی، تکایەکی دیکەم لە خزمەتی ئاغادا هەیە، گەورەیی بکا و تکام بگرێ، ماڵ سووتان شوومی باش نییە، موسوڵمان دەبێ بە سەر دەروونیدا زاڵبێ و قینی خۆی بخواتەوە، چاوپۆشی لە تاوانی بچووک نیشانەی گەورەیی گەورەیە، لە سووتمان چاوپۆشی بکە ئاغا، ئەوە خۆی گیراوە، چۆنی بە سەلاح دەزانی، وا تەنبێی کە، خودا عەوێزی چاکەت بداتەوە.
هەمزەبەگ سوور هەڵگەڕاوە، بە گوڕەوە گوتی:
ـ مامۆستا! هەر تاوانێ دەبێ تۆڵەیەکی هەبێ، تۆ دەڵێی خۆی گیراوە؟ بەلام ئەو هەر شەوی ئەوەڵ هەلاتووە، ئەمڕۆ سبەی وەشاخی دەکەوێ و لێمان دەبێتە چەتە و ئەوانی دیکەش چاو لەو دەکەن و بشێوێنی دەکەوێتە ولات، بشێوێنی لە ولات بکەوێ ئێمەی ئاغاوات بەرپرسین، هەر رووداوێ رووبدا، ئێمە بەرپرسین، لێمان دەکۆڵنەوە. تا ئێستا وا بووە مەعمووری دەولەت چووبێتە دەرگای ماڵە رەعیەتێ؟ رەعیەتێ چووەتە پاسگای ئەمنییە؟ کەس رێی پاسگا دەزانێ؟ کەس دوو قرانی بە ئەمنییەیەک داوە؟ چەتەیەک تا ئێستا توانیویە دەرگاتان پێ بگرێ؟
دوێشەو لە ماڵ نەبووم، هاتوونە سەر تازاوا و خەڵکیان تالان کردووە، سەعیدی نۆکەری رەشید خان کێ کوشتی و منداڵی زەرد و سووری هەتیو کەوتن؟ چ مەعلووم حەمەی ئێوە نەیهێنابێتە سەرمان! دەبێ ئەوانە تەنبێ بکرێن و ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ هی وەک حەمە هەتیو، ئێوە چ دەزانن؟ هەر ئەوە دەزانن کە لەبەرچاوە، بیری پاشەڕۆژ ناکەنەوە، خۆم دەزانم چ دەکەم، کەیخودام ناوێ. بە توورەییەوە خوڕییە رەسووڵ:
ـ لە خودات دەوێ بڵێم مەچۆ؟ دە برۆن، زوو وەرنەوە.

ڕەسووڵ و فەیزە دریژ و فەتاحە کوێر وەدەرکەوتن.

قاو کەوتۆتە نێو دێ: ئاغا دەستووری داوە ماڵەکەی حەمە شوان دەسووتێنن!! وەرنە دەرێ. وەرن. ژن و منداڵ کردوویانەتە سەربان، دەستی بێ دەسەلاتی دەدەن بە سینگ و رووومەتا و بەرۆک هەڵدەگوشن، چاوی پڕترسیان ئەسرین دەبارێنێ. کوڕ و کاڵی دێ لە دور ویستاون، بە هەناسە و حەسرەتەوە، لە دەروونداخۆ دەخۆنەوە. عەبە شێتیش لەوێیە.

ڕەسووڵ و فەیزە و فەتاح گەییونەتە ماڵی حەمە. لە دیوارەوە چوونە حەوشە. پاش ماوەیەک کەلوپەلی بایەخداریان هێنا دەرێ و بردیانە ماڵی فەیزە دریژ. لە گەڕانەوەدا، فەیزە لە جێی خۆ وشک ویستا! بەسەرسوورمانەوە گوتی:

ـ ئەی بابەڕۆ! ئەوەتا! ئەوەی من لێی دەترسام لەوێ وەستاوە! چ بکەین کا ڕەسووڵ؟ پوورەگوڵە دەستی ناوەتە کەلەکەی و لە سەر چاڵە گەنمەکەی حەمە دیت و دەچێ ئەوانی دیوە، بەڵام ئەنەهوو نەیدیون، رووی وەرگێڕا.

ڕەسووڵ و فەیزە و فەتاح بێ ئەوەی چاوی لێ کەن، خۆیان باریک کردەوە و بە پشتیدا چوونە ژوورەکەی حەمە. ماوەیەک مانەوە، پاشان هاتنە دەرێ، بێ ئەوەی باسێ لە چاڵەگەنم بکەن. گۆلکێش بەرەو ماڵی کوێخا ڕۆینەوە.

دووکەڵ لە کوولاوکە و دەلاقەوە وەک باخە گیا سەر دەکەوێ، قرچە قرچی دارودەستەک و کاریتە دەگاتە ئەوپەڕێ گەڕەک، ژنان بە قرچەی دەروونەوە خۆ دەکەنەوە بە ماڵدا، کوڕە جەحێڵەی دێ خۆ ناگرن، توانای ویستان و سەیری ماڵەکەی حەمەیان نییە، بلاوەیان کرد. عەبە شێتیش لە دێ وەدەرکەوت.

پوورەگوڵە بێ قسە و باس چووەتە ژووری. ترسی لە چاڵە گەنمەکە بوو دەری هێنن، ئەوان کە باسی چاڵەکەیان نەکرد، ئەویش هیچی نەگوت.

نێوەڕۆیەکی دەرنگە. ڕەسووڵ و فەیزە و فەتاح لە حوزووری ئاغا ویستاون. هەواڵی تالان و سووتانی ماڵی حەمەیان دایە، بەڵام باسێ لە چاڵ و پوورەگوڵە نەکرا.

هەمزەبەگ هەستا، بە جەماوەری هەستان. هەموو هاتوونە حەوشە. فەیزە و فەتاح چوون ئەسپ بێننە دەرێ. هەمزەبەگ رووی کردە مام حەسەن:

ـ سبەینێ دێینەوە مارەی دەکەین، خانم و ژنانیش دەهێنم یەکجاری دیاری و شیرنی بخورێ، خۆسازکەن، بێ ئەوەی جوابێ ببیسێ، سوار بوو و وەڕێ کەوتن. خەڵک

دووورونزیک تا ئەو لای دێوە رەوانەیان کردن. فەیزە و فەتاح شانبەشانی ئاغا دەڕۆن. فەتاح گوتی:

ـ قوربان! فەرمووت کارم پێتە، دەفەرمووی چی؟

ـ چاک بوو وەبیرت هێنامەوە، لەگەڵ فەیزە شەوانە چاوتان لە سەر کەوێ بێ، بە نۆرە قەرەوڵ بن، شەوێ بە رەسووڵدا چەکتان بۆ دەنێرم، بۆتان قەرەبوو دەکەمەوە، ئێوە وەسەر منی ناخەن.

فەیزە و فەتاح بە جووت گوتیان:

ـ لە خزمەتی ئاغادایین.

سوارە لە کێوە بەر دوایلە وەسەرکەوتن. لە بەرزایی کێو ئاوڕیان داوە. کانی توو لە دووکەڵی ماڵەکەی حەمەدا ونە. گڕ لە نێو دووکەڵدا جار جار بڵێسەی وەسەردەکەوێ. بۆنی سووتمان، تا لووتکەی کێو هەوای پڕکردووە.

## ١٩

بەیان ئەنگووتووە، بوولێـلە ئاوێتـەی زوقـم و شـەختەی پـاییزە، زەوی زیوپۆشـە. تەڕیکەوتووە و ئەرز بەستەلەکە، قوڕ بە پێوە کلاشە ناکا.

ئاسۆی خۆرهەلات بزەی لە سەر لێوە، مزگێنی رۆژی پێیە. قـەلای شـەو رووخـاوە شەو لە پاشەکشێیە.

هەوارساردە، ئاور خۆشبووە، بەرگی هەژار دڕاوە، عەبە بە پێیی خووخدەی لە خـەو هەستاوە. سووتەمەنی هێنا و تەنووری داخست. دیو پڕ بووە لە دووکەڵ و ڕێی پـشووی بڕیوە، بە پەلە لە دیو دەرپەڕی، گەلازی کـردەوە و وەدووی خـۆی خـست و چوونـە سەرکانی. ئەمرۆ لە رۆژان زووتر هاتۆتە دەرێ، رەنگە لە خۆشی گەلاز بێ!

گەلاز نامۆیی ناکا. شانبەشانی عەبە لە چیمـەنی پـشت کـانی مەیـدانیان دانـاوە و هەلدێن. عەبە سەر و دلخۆش لەگەل گەلاز کایە دەکا، دەلێی بـە ئـاواتی لـە مێژینـەی گەییوە! رەنگە واش بێ، ئاخر لە مێژ بوو بەو ئاواتەوە هەناسەی هەلدەکێـشا، ئەوەنـدەی دەیدی وەک ژنی دووگیان مەگیرانی پێوە دەکرد ئاواتە خوازی ئەوە بوو رۆژێ گەلاز سەگی ئەو بێ، ئەمرۆ بە ئاواتی خۆی گەییوە.

بە دەم هەلاتنەوە چنگاوشی یەک دەبن، عەبە خۆی بۆ دەخا، گەلاز سـواری سـەری دەبێ، هەلدەستێتەوە و هەلدێ، بە دەم هەلاتنەوە راوێچکە دەکا، عەبە رەپێـی دەکـەوێ، پاشووی دەگرێ، گەلاز وەردەسووڕێ ودەستی دەبا بە دەمدا، بێ ئـەوەی ئـازاری بـدا، بەری دەداتەوە و هەلدێ، عەبە دەیگرێتەوە و سواری سەری دەبێ، یەکتر دەگەوزێـنن، دەلێی دوو لفن. عەبە وەژێرکەوتووە، گەلاز قەپی لێدەگرێ و رایدەوشێنێ، بەلام ئێـشی پێ ناگەیێنێ. لە پڕ عەبەی بەرداو رووەو کێو بە وەڕینەو رۆیی!

سەلتەیەکی قۆچاخ لە ئاسۆگی پەچەخرەوە بە کرژی خۆی بەرداوە. گەلاز گەییوەتێ، دارەڕۆچکەی بووە! دەڵێی کایەی لەگەڵ دەکا! ئەرێ کایە دەکەن! سەلتە و گەلاز بە کایەوە هاتنە خوارێ، نزیکبوونەوە. عەبە ناسییەوە، حەمەیە.

عەبە بە سەر سوورمانەوە گوتی:

ـ ئەمە تۆی گەوجە پیاو؟! بە لای خۆمەوە ئەموت ئێستا لە حەفت کێف تێپەڕ بووە! بۆ چ تەنیای؟! کەوێ ها لە کوێنە؟

حەمە بە پەشێوییەوە گوتی:

ـ هەر باسی مەکە! پیس قەوماوە عەبەگیان!

ـ هەڵبەت کەنیشک براگەماڵ لە تەکتا نەهاتییە! واسە؟

ـ بریا ئەو نەهاتبا و من بە ئەستۆی شکاوم نەچووبام، ئەو هات، بەلام لێیان سەندمەوە، گیرام! ئەمشەو لە کونە ڕەشی قەلا بووم، نازانم کێ بوو! بوو بە فریشتە و رزگاریکردم، ئەوەندە دەزانم ئافرەت بوو، زۆرم هەوڵدا بزانم کێیەر بەلام راستی نەگوت، بە نازداری تێگەیشتم، ئەو نەبوو، ئەو بایە دەیگوت. نەرم و شلی دەستی،بۆنی سمڵ و مێخەکی لە خانم دەچوو! بڵێی عەدلە خانم بووبێ؟! ئاخر چۆن ئەو کاری وا دەکا؟ هەرچی بیر دەکەمەوە ئەقڵم بڕ ناکا، دەڵێی خەونم دیوە! ئاخر بە سەر هاتی ئەمشەوی من بە قەت دە ساڵە! زۆرتر لە سەر گورشتە دەچێ، خۆم باوەڕ ناکەم! تۆ باوەڕ دەکەی عەبەگیان؟

عەبە بۆ دڵەنوایی دەستی خستە سەر شانی و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ لەوەتی تۆم دییە درۆت لەگەڵما نەکردیە، بۆ چ باوەڕ ناکەم؟ هەڵبەت واسە، بیوە. دەی خاس، کەوێ چەی پێ هات؟

ـ باسی ئەو مەکە شەرمەزاری بووم، بوومە هۆی ئازار و ئابڕووچوونی، تازە رووی دیتنی ئەوم نییە، رووی لای کەسم نییە، تەنانەت تۆش، ئێستاش بۆیە هاتووم هەواڵم بە کەوێ بدەی، بێتوو نەزانێ من هەلاتووم، دیق دەکا، عەبەگیان!

لە تۆ زیاتر کەس شک نابەم، ئەمجارەش زەحمەتەکە وەبەر تۆ دەدەم، کەوێشت نەدی، مینا ببینە و بەو بڵێ، ئەو پێیدەڵێ. لە لایەن منەوە مالاواییان لێبکە.

خەم و خەفەت بۆ عەبە داباری، شادی و خۆشی بە تالان چوو، دەستی کردە ملی حەمە و بەرەو ماڵ بوونەوە، گەلاز بە پێی ئاوان دەڕوا، سەری بەرداوەتەوە و کلکی خەواندووە، دەڵێی هەستی بە دڵتەنگی ئەوان کردووە!

تاو بان لە گەلایەک کەوتووە. عەبە، حەمەی تەنیا لە دیودا جێ هێشتووە و لە دیـوی دەرەوە دەرگای لە سەر هەڵپێکاوە.

باریکە ڕێی دێکۆن و کانی توو کوێر بۆتەوە، هاموشۆی کەسی بە سەرەوە نییە، جار و بارێ عەبەی پێدا دەڕوا، یان بە ڕێکەوت هـەڵـکەوێ کەسـێ ڕێـی بکەوێتـە ئـەوێ باریکەڕێ وەک توولە مارێ بەنساری هەزار ئەشکەوتدا لابڕوپێچ پێچ وەسەرکەوتووە و بە خۆرەتاوی بەردە دەنگدارەی هەزار ئەشکەوتدا قۆرت قۆرت و مارپێچ دەڕواتە خوارێ و بەشیوودۆڵدا دەچێتە کانییە بەردینە، لەوێڕا بە بـەر مێرگـە گـەورە و گـوێی چۆمـدا دەچێتە کانی توو.

قاوەڵتوونە، عەبە لە نسارەوە ئاوای خۆرەتاو بووە، گەییوەتە بەردە دەنگـدارە و بـەر ئەشکەوتەکان. دوو سوار دوور وەدەرکەوتن، گەییونەتە کانییە بەردینە، بە شیو و شـیودا بەرەو لای تێهەڵگەڕان. سوارە هەر دێن و نزیک دەبنەوە. عەبە لە کەڵێنـە بـەردا خـۆی حەشار داوە. سوارە بە بەر چاوی عەبەدا تێپەڕ بوون، هەر دووکیان چەکـدارن، یـەکیـان ڕەسووڵی نۆکەرە، عەبە ئەوی دی ناناسێ، بـە وتـەی حەمـە، دەبـێ ئـەویش سـەعیدی نۆکەری ڕەشید خان بێ.

سوارە بە دۆڵی بەردە دەنگدارەدا تێهەڵبوون، لە پێچی شیو ون بوون.

عەبە لێیان دووشکە! پەناپسکێ و ماتەمات بە کێودا هـەڵـگەڕاوە. چـووە بـڵێندایی، جێیەکی وا کە بە تەواوی نێو دۆڵی بەردە دەنگدارەی لێوە دیار بوو، لە پەنا بەردێ خۆی مات کرد و سوارەی خستە ژێر چاوەدێری.

سوارە گەییونە دووشیوانێ، هـەر یـەک بـە دۆڵـێکدا جیـا بوونـەوە. یـەکیـان لـە چارەوێکەی دابەزی و بە پەلە هەڵگەڕا، چووە بنـە بـەردی بـەرزایی کێـو و دانیـشت. سوارەکەی دی گەییە بەرانبەری، لە نەکاو تەقە لە تفەنگەوە هات و سوار گلا! عەبـە لـە جێی خۆی بە چەشنی دا تروسکا، هەستایە سەر پێ و خۆی بۆ نـەگیراوە، سـەر بـەرەو خوار رایکرد. ئەو ڕاکردنە کە رایکرد، تا سەر ئاوەکەی کانییە بەردینە ئـاوڕی نـەداوە، هێندێ ئاوی خواردەوە و ڕێی گرتەوە بەر.

عەبە زۆر ترساوە! هەر دەڕوا و ئاوڕ دەداتەوە، جار لەگەڵ جار بـاوی لاقـی تونـدتر دەکا. گەییوەتە مێرگە گەورە و سەرچۆم، ئاوایی کانی توو دیارە، هەست بـە ئـاوەدانی

دەکا، وردە وردە ئەهۆن بۆوە و ترسی وەلا نا. تەقە دەستی پێ کردەوە! تەقەیەک، یەکی دی، تا سی تەقەی ژومارد و کۆتایی پێ هات.

عەبە گێژ و مەنگ بووە! نازانێ کامیان بوو ئەوی دی کوشت! سەری سورماوە! بۆ کوشتی؟ هەرچی بوو زۆر ناپیاوانە کوشتی. هەر وا لەو گێژاوەدا بوو، لە نەکاو هەستی بە دەنگە دەنگی ژنان کرد! سەری هەڵێنا، گەییوەتە دەراوی چۆم و بەرانبەری ئاوایی دەستە ئافرەتێ لەوبەر، لە سەر دەراو حاجەت و پەڕۆوپاڵ دەشۆن.

جاران لە دوور عەبەیان دیبا، بە پیریەوە دەچوون و جەفەنگیان لەگەڵ لێدەدا، کایە و چنگە پلماسکێیان لەگەڵ دەکرد، دەیاندا بە ئەرزیدا، تا ماندوو و توورەیان دەکرد، توورە دەبوو وقسەی ناحەزی پێ دەگوتن و دەتۆرا. کچان دەستیان لە مل دەکرد و دڵیان دەهێناوە جێ و ئاشتیان دەکردەوە. ئەمجار وا نین؟ مرومۆچ، بێ دەنگ، بە کاری خۆیانەوە خەریکن، کەس پێناکەنێ! ماتەمیان لێ دەبارێ! دەڵێی رووداوێ رووی داوە! تەماشای عەبە دەکەن، وەنەبێ نەیاندیبێ، ئەی بۆ نایدوێنن؟! عەبە لە پردەباز پەڕیەوە، وەکو جاران لێیان چووە پێشێ:

ـ سەلامەلێ دادەگەڵ! بەلا دوور بێ! چەس؟ بۆ چە خەمینن! ئا تۆ خوا وە منیچ بێژن با چکێ بگیرم!

لە نێو کچاندا، مینا جوابی داوە:

ـ خودا گریان نەدا عەبەگیان، راوەستێ حاجەتەکانم کۆوەکەم، بە دەم رێوە بۆت دەگێرمەوە.

مینا دەزانێ عەبە دڵسۆزی حەمەیە، هەر نەبێ هەواڵێکی دەزانێ، قاپ و کەوچکی کۆ کردەوەو رێکەوتن.

ـ قەوماوە عەبەگیان! شەوێ حەمە هاتبوو کەوێ هەڵگرێ، پیاوی ئاغا پێیان زانی و گرتیان، لەو دەمەوە بێ سەروشوێنە،کەس نازانێ چی بە سەر هاتووە. لەو دەمەشرا کە کوێخای بابی کەوێ زانیویە، بێ سەروزمان کەوتووە، پوورەگوڵە دەڵێ شەپلە لێیداوە! هیلاکە! لایەکی چووەتە لاوە، لە مردنە، کەوێش وەک شێتی لێ هاتووە! کەس ناوێرێ توخونی کەوێ، دووجار چوومەتە لای، لەگەڵ منیش قسە ناکا! تەنانەت چاویشم لێ ناکا! یا خودا کەس وای بە سەر نەیە عەبەگیان، کوێر بم بۆ ئەو چارەنووسەیان.

مینا بە لۆی دەسماڵەکەی چاوی سڕی.

عەبە گوتی:

ـ بێژی لە تەک منیچا قسە نەکا؟ ئاخر من خەوەر خۆشم ها پێ! ئەگەر بێژم پـێ لـە خۆشیا باڵ ئەگریتەو! مزگانیم ها پێ!

مینا سەرسام لە جێ وەستاوە! بە پەلە گوتی:

ـ خۆش مزگێن بی عەبەگیان! من لە بری ئەو مزگێنیت دەدەمێ، چییە؟

ـ بە لای کەسەوە نایژی؟

نەبە خودا، چییە؟ دەبیلێ دلم تۆقی!

ـ حەمە ئیمشەو دەرچیوە، ئێسە ها لە دێ کۆنا، ئەو منی ناردیە خەوەر بەم بە کـەوێ و میمکەگوڵە؛ وتی، ئەگەر چاوو نەکەفتە کەوێ، وە مینا بێژە، ئەو پێ ئێژێ، ئەچی؟ مینا لە خۆشیان ئاو بە چاویدا دیتە خوارێ و زاری وێک نایێتەوە، بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ ئەی ناچم؟! لە خودام دەوێ، لە بەر تۆ و حەمە نەبایە، پـڕ بـە زارم ئێـستا هـاوارم دەکرد، دەمگوت حەمە هەڵاتووە، لە ئێوارەوە خەڵکی ئەم دێیە دەڵـێی مردوویـان لـێ مردووە، ئێستا دەچم، چۆن ناچم عەبەگیان؟

مینا و عەبە گەیینەتە نێو دێ، مینا بەرەو ماڵی خۆیان عەبە بەرەو ماڵـی پوورەگوڵـە لەیەک جیا بوونەوە.

لە وای ئێوارەوە، لەو دەمەیرا دەنگی رەسووڵی نۆکەر بەرز بۆوە و حەمـەی گـرت، یەک وچان پوورەگوڵە بە نێو ژوورەکەیدا دێت و دەچێ، مەگەر ئەو دەمـەی کـە زۆر شەکەت و ماندوو ببوو و خەو بردییەوە، دەنا پێی وەبەر خۆی نەداوە و هەر دێتو دەچێ. تووڕەیە، ئاوڕی لـێ دەبێتـەوە، کـەس نـاوێرێ خـۆ لـە قـەرەی‌دا، تەنانـەت ژنـانیش نەیناتوێراوە دەرگای لێ بقەڵشێننەوە و هەواڵی حەمەی لێ بپرسن! ئەو دەمەیکە چبـووە لای کوێخاش، کەس نەیوێرا بوو باسی حەمە بکا. ئێستا هەروا بە نێو ژوورەکەیدا دێت و دەچێ. لە دەرکەیان دا! تەقەی دەرگا بۆ ماوەیـەک رایگـرت. دیـسان کەوتـەوە سـەر رەوتی رۆینی، دیسان لەدەرکەیان داوە. بە تووڕەییەوە دەرکـی ژوورەکـەی کـردەوە، هەر لەوێوە دەنگی دەدا:

ـ کێیە؟ وەرە ژوورێ، دەرگا دانەخراوە.

عەبە شڕەبار و کزەلۆک خۆیکرد بە ژووردا:

ـ میمکەگیان! سەلامەلێ، بێمە ماڵەو؟

ـ وەرە بزانم دەڵێی چی شەل و شێتە؟

عەبە وەژوورکەوت، بە زمانێکی خورپخەرانەوە گوتی:

ـ خەوەرێ فرە خۆشم ها پێ! مزگانی خاسم گەرەکە، ئەگەر خاس نەوێ نایژم پێت.

ـ مزگێنی چی شێت و وێتە؟ تەواو بوو، مانگا مرد و دۆ برا! ئەوەی تۆ باسی دەکەی شەوێ گرتیان، باسی چم بۆ دەکەی؟ گاڕانی دێیان بە تالان بردبوو، هەوالی مانگا بەلەکیان دەپرسی؟! تۆش وات بە سەر هاتووە.

ـ ئەمە توو ئێژی چ میمکە؟! مانگای چە و گاڕانی چە؟ من ئێژم خەوەرێ خۆشم ها پێ، مزگێنیم گەرەکە، خەوەر حەمەم ها پێ! ئیمشەو دەرچووە! ئیسەها لە دێ کوِن، ئەو منی هەناردیە خەوەرت بەم پێ، توو چەم بۆ ئەگەڕ نیتەو؟

پوورە گوڵە بە چەشنی ڕاپەڕی و بەرەو عەبە هات، عەبە لە جێ داترووسکا و دوو سێ هەنگاو پاشەکشێی کرد!

هەموو لەشی پوورەگوڵە وەلەرزین کەوتووە، چرچولۆچ لە نێو چاوانی بەدیناکرێ، لێوە چرچۆلەکانی سوور هەڵگەڕاون و پڕ بوون لە بزە، چاوە سیسەکانی گەش بوونەوە و ئەستێرەی گەلاوێژیان تێدا بەدیدەکرێ وخوڕ خوڕ ئەسرینی شادییان لێ دەبارێ، عەبەی لە ئامێز گرتو ڕایمووسی، بێ باوەڕانە گوتی:

ـ درۆ ناکەی سەگە شێت؟! ئەگەر وا بێ مزگێنیت دەدەمێ، مزگێنی باش.

ـ درۆ بۆ چە؟ ئەگەر درۆ بێژم خوا بمکوژێ.

ـ دوو لە تۆ، خودا نەکا، ئەمشەو ناسبەی شەوێ دێم بۆ لای، مەیەلە بڕوا با چاوم پێی بکەوێ، ئەگەر ڕۆیشتەوە وەرە ئێرە هێندێ نان و پێخۆر بەرە، کەی دەڕۆیەوە؟

ـ چکێ ناو دێ ئەگەڕم و ئەچمەو.

مینا قاپ و کەوچکی لە ماڵی خۆیان دانا و بە بیانووی کارەوە چوو بۆ ماڵی کوێخا. بەر دەرکی ماڵی کوێخا جەنجاڵە. دەستە دەستە ژن و پیاو بۆ ئەحواڵپرسی لە هاموشۆ دان. مینا گەیبە حەوشە و کوێخا ژن بە ڕوویدا هات، بە گریانەوە گوتی.

ـ مینا گیان! چم لێ دەکەی؟ کچەتیوەکەم لە دەست دەردەچێ، بە قوربانت بم، ڕەنگە ماری بە تۆ بگیرێ، زوو زوو سەری لێدە بەڵکو بێتەوە سەر ڕێ و لە کەری شەیتان دابەزێ!

ئەحمەدی مام حەسەن لەبەر هەیوانە. مینا سوور هەڵگەڕاوە و لە شەرمان جوابی نازەنینی خوشکی ئەحمەدی پێ نادرێتەوە. ئەحمەد بەو هیوایە کە دەرفەت بێنێ و بە ئارەزوو لەگەڵ مینا بدوێ، خۆی هاویشتە تاریکایی نێو دالان، مینا بە پەلە خۆی کرد بە دالاندا، وەک هەورە برووسکە تیژ بە شانی ئەحمەد تێپەڕی. ئەحمەد هەر ئەوەندەی دەرفەت بوو بڵێ:

ـ میناگیان! شەوێ درەنگ بنوو، دێمە سەربان.

مینا بە تاقە بزەیەک جوابی داوە، خۆیکرد بە دیوەکەی کەوێدا و پشتی دەرگای خست.

کەندووە ئاردێکی زەلام نیوەی بەدەنە دیواری نێوماڵەکەی گرتووە. بەرزایی کەندووەکە پیاوی بالا بەرز دەستی نایگاتێ. وێنەی دوو دار و گوڵ بە هێڵی لار و وێر بەمبەروئەو بەری زارکەکەیدا پێچ پێچ وەسەرکەوتوون. لە مابەین دار و گوڵەکەدا، لە خوار زارکەکەیەوە دوو هێڵ چەپ و ڕاست بە سەر یەکدا کێشراون، وێنەی سەلیبێ دەنوێنن.

لەو لای کەندووەکەوە، ئاگردان پڕە لەئاور و پۆلووی گەشاوە، سکڵ لە ئاوردانەدا سوور و زەردە، جار جار گڕێکی مایلە و شینی لێ دەبێتەوە و تا بن کترییە ڕەشەکەی سەر ئەستێولکەکە وەسەردەکەوێ و بەم لاو ئەو لای کترییەکەدا بڵاو دەبێتەوە.

کەوێ لە مابەتینی دار و گوڵدا پاڵی داوە بە کەندووەکەوە، سەلیبەکە بە تەواوی لە سەر سەریەوە دیارە، بێ ڕۆح، دەڵێی بە سەلیب کێشراوە! کز و لاوازە، زەرد زەردە، دەڵێی زەردووی گرتووە! لێوی باری لێ نیشتووە و توێژ توێخی هەڵداوە و بە سەر ددانییەوە وشک هەڵاتووە. سەر ڕوومەتە خڕوپڕەکانی سوورایییان لێ بڕاوە و بە چاڵدا چوون، دەڵێی ددانی لە زاردانییە! لووتی لە جاران باریک و درێژتر دەنوێنێ، چاوە گەش و پاراوەکانی دەڵێی گوڵی دوورە ئاون، سیس بوون، بێ تەکان بڕیویەتە سکڵ و نایانتروکێنێ، دەڵێی ئەو گڕ و پشکۆ و سکڵە بەشێکە لە ئاواتەکانی، یان دەڵێی ئاواتەکانی لەو ئاورەدا دەسووتێ ودوا دێتنییە! مینا لە بەرانبەری وەستاوە. کەوێ لە نێو گڕ و ئاوردا نوقمە و چاو هەڵنابڕێ. مینا بە ئەسپایی هێور هێور دەیدوێنێ.

ـ کەوێگیان! گوێ بگرە، هەواڵێکی خۆشم پێیە! عەبە هێناویە، دەڵێ حەمە هەڵاتووە! ئێستا لە دێ کۆنە، ئەو عەبەی ناردووە. چاو لە من کە، دڵت لای منە؟ لەگەڵ

تۆمە، گوێ شل کە، دەڵێم حەمە هەڵاتووە، عەبە درۆ ناکا، حەمە ناردوویە، لە بەر تۆ ناردوویە کچەتیوە، ئەی خودا بتکوژێ، تۆ بۆ وا دەکەی؟ کەویێگیان! تەماشاکە، چت لەو ئاورەدا دیوە؟ سەروەرسووڕێنە، کەوێ! کەوێ! کەوێگیان! قەزات لە من بۆ وا دەکەی؟

مینا بە دەم پرمەی گریانەوە دەرپەڕیە دەرێ، لە کۆلان بەرنگاری عەبە بوو. عەبە بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ دادە مینا! چەس؟! بۆ چە ئەگیری؟

مینا بە هەنیسکەوە جوابی داوە:

ـ کەوێ تازە ئەو کەوییەی جاران نییە! ئاوێتەی گڕ و ئاور بووە! سووتاوە! بووە بە گڕ!

مینا لەوە زیاتر خۆی نەگرت، بەدەم گریانەوە هەڵات.

عەبە لە جێی خۆی عەبەساوە! بیر لە قسەکانی مینا دەکاتەوە:

ـ ئەمە چەس؟! چەتیوە شێت بیوە! ئەو شێت بیوە یا من هیچێ حالیم ناوێ؟ گڕ و ئاگر چەس؟! ئەمانە چە ئێژن؟! تا زووە دەرچم، وەئێللا منیچ ئەسووزم و ئەومە قاقناز. بە خوا من سەر لەم حەیس و بەیسە دەرناهێرم، ئەشێ هەر خۆیان بزانن.

دوانیوەڕۆیە. عەبە بە کۆڵێ نان و پێخۆر و کۆڵێ خەم و پەژارەوە بەرەو دێ کۆن گەییوەتە نزیک کانییە بەردینە. لە داوێنی هەزار ئەشکەوت حەشیمەتێ بەرەو کانییە بەردینە بە ڕێوەن! عەبە باوی بەپێیدا، هاوکات گەیینە سەرکانی:

ـ مانی نەون! ئوغرەتان خێر وێ، ئەچنە کوێنە؟

خەڵکەکە بە جەماوەر جوابی عەبەیان داوە. کەریم ناوێ گوتی:

ـ خۆزگە بە خۆت عەبەگیان، ئاگات لە هیچ نییە! قەوماوە! چەتە هاتووە! سەعیدی نۆکەری ڕەشید خان کوژراوە! ڕەسوولی نۆکەر بە برینداری هەڵاتووە، دەچین تەرمەکەی کا سەعید بیەینەوە، وەک ڕەسوول باسی دەکا دەبێ لە بەر دەدەنگداره بێ. عەبە تاساوە، ناوێرێ بڵێ ڕەسوول کوشتوویە، ترسی پاشەڕۆژی هەیە. لە دڵی خۆیدا دەڵێ:

ـ وا خاسه خۆم کەمە گێل، ڕەسووڵ بزانێ من زانیمە، شەو تێتە جەستەم ئـەمکوژێ، چەم دائەبەم حەیس و بەیسەو، بنگووسێ ڕێ بێ و خۆمی پیا برۆم، بە مـن چـە. دەنگـی هەڵێنا و بۆ شوێنە گومکێ گوتی:

ـ بێمە قورواں کردەی کەرمەت خوا، سوح من لەم حانەو هـاتم، خاسـوو چاویـان نەکەفت پێم، ئەی ماڵ هەژارم! جا چە بکەین؟

عەبە وێڕای خەڵک چوونە سەر تەمی سەعید. تفەنگەکەی دوور پەڕیبوە سەر بەردێ. سەعید لە لاشیوێکی نەرمان، لە سەر پشت کەوتووە. خوێن گۆمیلکەگۆمیلکە لە قووڵک و چاڵ بووە بە حەوز وەک لەتە جەرگ جەڵغەی بەستووە.

خوێن ئەوەندە زۆرە دەڵێی کەڵ سەر براوە! پێچوکڵاو لە سەری پەڕیـوە، کاکۆڵـی خوێناوی بە نێو چاوانیدا بڵاو بووەتەوە و لە بەر تیشکی هەتاوا تڕووسکە تڕووسک هەر تاڵێ لە ڕەنگێ دەنوێنێ. جێی گوللە بە تەوێڵەوە بە قەدەر نووکە شووژنێ مۆر دەکاتەوە و لە پشتی سەریەوە پچڕیویە، کۆترە باریکەی پێدا دەچێ، خوێن وەک زناو زنە دەکـا، چاوەکانی گەش گەش دەڕوانێتە خەڵکەکە، لێوی بە ئاستەم کراوەتـەوە و ددانی وەک سەدەف دیارە، دەڵێی بزەگرتوویە! لـەش و لاری کـەڵـەگەت و چوارشـانەی سـەعید، تەزووی خستۆتە لەشی ئەو پیاوانە و بێ ئیختیار دەگـرین. عەبـەش وێـڕای خەڵـکەکە، لەوان بە سۆزتر دەگری! ئەوان بۆ جوامێری و قەڵافەتی دەگرین. عەبە بۆ ئەوە دەگـری بە چاوی خۆ دیویە کوژراوە و ناوێرێ بیدرکێنێ، وەکـو خـۆرە دەروونی دەخواتـەوە. دوو سێ جار هاتە سەر زمانی بڵێ ڕەسووڵ کوشتوویە، بەڵام لـە خەڵـکەکەی ڕانـەدی، قووتی داوە.

تا درەنگانێ بە دیار سەعیدەوە وێستان پاشان دارە تەرمیان ساز کـرد و تـەرمیان لـە چارەوێ هەڵبەست، تفەنگەکەیان لەسەر تەرمەکەی دانا و بەرەو تازاوا وەڕێکەوتن، عەبە چاو بە فرمێسک و دڵ پڕ لە خەم، بەرەو دێ کۆن، بە کێـودا هـەڵـگەڕا. ئـەو ڕۆژە بـە درێژایی ڕۆژ، لەو دەمەیڕا کە عەبە وەدەرکەوتووە، حەمە یەک وچان خەوتووە و نازانێ دنیا بەری بە کوێوەیە.

عەبە گەییوەتەوە، دەرگـای کردۆتـەوە و چووەتـە ژووری، لـە کـادین بـە دیـار گەلازەوە وەستاوە. پاش سەرنجدانێکی زۆر، چووە ژوورەکە، حەمە وەخەبـەر نـەهات. بانگی دەکا:

ـ کاکە حەمە! حەمە گیان! حەمە! ئەی خوا بو کووژێ، ئەوە مردیە؟ نەحلەت لە باوک کوێخا بۆ کەنیشکی! ئەو ماڵ کاولە وا ئەزانێ دلی ها وە ئەرسەلان رۆمییـەوە! هـەلـە خواگرتگ. حەمە گیان! لالو گیان!

حەمە لەم شان کەوتە سەر ئەو شان و خەوی لێ کەوتەوە. عەبـە لێفەکـەی لـە سـەر فرێدا و سواری سەری بوو.

حەمە خەو بەریداوە، چاوی سوور و خەوالووی هەلدەگـلۆفی، بـە دەنگـی گـرەوە گوتی:

ـ هاتوویەوە؟ رۆژ چ وەختە؟

ـ رۆژئاواس، خاس ئەرخەیانی! ئێژی لە گوێچکەی گا خەفتی! بـەو بـەخـت ولات شێویائە! دار وەبان کوچکەوە نەمایە!

حەمە رەنگی پەڕی، بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

- چ بۆ؟ هەواڵێکت لە کەوێ زانی؟

ـ تویچ هەر هایتە بیر کەوێی ماڵ ڕمیاگا، ئەرێ، هەواڵ ئەوم زانییە، گوێچکە بـە، لـە نووکەو بۆتی بگەڕێنمەو، سەعی نۆکەر کوژیا! رەسووڵ وەبەرچاو منەو کوشتی! حەمـە لە جێ راپەڕی، عەبەی گرت و رایوەشاند، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ بە گەوجم دەزانی؟!

ـ نە بە خوا راس ئێژم، سوح گەیمە بەر دەدەنگدارە، دوو سوار بە ڕووماهـاتن، خـۆم شاردەو، رەسووڵ و سەعی بوون. لێیان دووشک بووم، لـەوە ئەترسـیام بـە شـوێن تـوا بگەڕن، هەر چاوم وەبانیانەو بوو. گەیشتنە دووشیوانی بەردە دەنگـدارە، هـەر کـام بـە دۆلێکا لێک جیا بوونەوە، دوو بوو، بۆم مەعلووم نەبوو، کامیان بوو، چووەبـان کێـف و ئەوتری کوشت، فرە ناپیائانە دای لێ، دواجار تازاواییەکان وتیان سـەعی کوژیائـە. ئـەو ناپیائە کوشتنی سەعی نیائە مل چەتەکانا، وتییە چەتـە کوشـتییانە، نـازانم چـۆن خـۆی زامارکردییە؟ خۆی هاوردییە حاڵ جاو! وتییە منیچ زامار بیوم!حەمە بـەو هـەواڵـە وەک ژێی کەوان وێک هاتۆتەوە، مات سەری گرتۆتە نێو دەستی و ریکی دەگوشی. لە مێـژە ناوبانگی ئازایەتی و جوامێری سەعیدی بیستووە ئەو شەوەێ کە ئەویان گرت، لـە گـوڵ کالتری پێ نەکەوتبوو، بە سەعید بایە نەیدە برد بۆ قەلا و هەر لەوێ بەرەڵلای دەکرد!

عەبە بە هەواڵێکی ناخۆشتر هەودای خەیالی حەمەی پساند:

ـ باوک کەوێ شەپلە داییە لێ! هەی چەقۆ هەی چەقۆیەسی! هاکا مردا!

حەمە چاوی لێ زەق بۆوە و بە سەرسوورمانەوە دەڕوانێتە عەبە! بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەو بۆ؟!

ـ من چە ئەزانم، ئەویچە هیچ، کەوێ مائەسەو ئەو.

ـ ئەو چییە؟ دیت؟

ـ نا، چاوم کفتە مینا، ئەیوت کەوێ بووەسە گڕ و ئاگر! لەتەک کەسا قسە ناکا! راسو گەرەکە! من هیچێ حالی نەووم، ئەو کەنیشک برا گەمالە هەر ئەگیریا، ئەونە وەحینچکە ئەگیریا، حالی نەوم چە ئێژێ، خۆت ئەزانی من سەر لەو حەیس و بەیسانە دەرناهێرم، مەگەر رایێتر بچمەو، ئەم ڕا ئەچمە بنجوبناوانی، سوح ئەشێ بچەمەو ئاخر میمکەگولە ئەیوت حەز ئەکەم چاوم بکەفێتە حەمە، ئەشێ بچم بێرم، ئەمڕا ئەچمە بنجوبناوانی و گشت قسەکانی ئەگرمە مێشکم و بۆتی ئەگێرمەو، خاسە گێلە؟

حەمە بە تەوسەوە گوتی:

ـ ئەی بەخێر بێیتەوە برا! هەواڵ هەر دەبێ تۆ بیهێنیتەوە! کار هەر دەبێ بە تۆ بسپێردرێ! ئەی داوەشێی بۆ هەواڵت.

عەبە دەزانێ حەمە بە تەوسەوە وا دەڵێ و زۆر قەڵس و تووڕەیە، بۆ دڵنوایی گوتی:

ـ دەی خاسە، دار رایێ بەری نەگرت ئەشێ بیوڕی؟ ئەم ڕا کارم خراو کردییە، ئەویش بچینە دەشتە و چکێ هەوا با لێمان، شەوەکی گشتی مەعلووم ئەکەم، دە هەڵسە تۆ خوا.

عەبە لایەک زۆر و لایەک پاڕانەوە، حەمەی هێنا دەرێ و گەلاز بە دوایاندا؛ چوونە سەرکانی.

ئێوارەیە، تاریکانە، ئەستێرەیەک یەک وەدەرکەوتوون. دێ کۆن چۆلوهۆڵە. حەمە دڵتەنگ و خەفەتبارە، دەڵێی ئەو دێ کۆنە بە سەر ئەودا کاولبووە و دەرەتانی ڕۆینی نییە.

عەبە بە قسەی خۆش و جەفەنگەوە دڵنوایی دەکا. حەمە لە ڕەوتی خۆی ناکەوێ، ئەو چەشنە سەری داخستووە، هەڵی ناهێنێ، ئەنەهوو هەر لەگەڵ ئەویشی نییە! عەبە زۆر قینی هەستاوە! هەست بەوە دەکا حەمە ڕێز بۆ کەسایەتی ئەو دانانێ و بە چاوی سووک تەماشای دەکا. لێبڕاوانە لە بەرانبەری حەمە وەک سنگ چەقی، دەیەوێ خۆی بەو

بناسینێ و دیوی ڕاستەوانەی نیشان‌دا پێی بسەلمێنێ ئەو چەشنەی ئەو بیر دەکاتەوە. و نییە. نێو چاوانی وێک هێناوەتەوە، بزە لە سەر لێوی تاراوە، بە نرکە و هەیبەتێکی پیاوانەوە گوڕاندی:

ـ تۆ پیایی! پیا واسە؟ بەلا وەسەر پیا تێ، ناشێ بۆی ئەو کارە بووچکە خۆت خەفەکەی، هێشتا های لە کوێنەی کارا! ئەمە ئەوەڵ کارە. تۆ ئەزانی وەگژ کیا چیوی؟ دوژمنەکەو فرە کولفتە، کێفە! کار حەزرەت فیلە، وەگژ ئاغا و دوەڵەتا چیوی، کەل لە حان ئاغا واتا بە موو گیرە. فکر ئەکەیتەوەو من هیچێ نازانم؟ با، فرە ئەزانم، فرە هاتییە سەرما! بە سەرهات خۆمت بۆ بگەڕێنمەوە دەمت ئەوێ وە تاق چرا! بۆ چە فکر ئەکەیتەو کەس وەک تۆی بە سەر نەهاتییە؟ ڕوودا و لە پیا ڕوو ئەدا، دڵی کار ناحەساوی هەڵناگرێ، ئەلبەت پیا حەساوی و دڕکدار، پیا دڕکدار وەسە کۆتەی ئاوە سوو، کۆتەی ئاوە سوو بە هیچێ ناشکێ، هۆرە و پواز ناوا و ناقەڵشێ، تۆ ئەشێ بەو جۆرەویتە، خۆ ناوێ هەر چکێ خەفەت ڕووی لێت کرد، تۆ بۆی بمری؛ کاروە خەفەت جۆر ناوێ. ئەشێ وەک کێف شان بەیتە بەری، بۆ کەنیشکێ ناشێ خۆت لە دەس بەی، پیا وەپیا. بۆچە ئێژی لۆتیت و مەیموونەکە و تۆپییە؟ ئەزانی من لە کەیەوە وەک مەیموون تێمە دەورتا و تۆ ناکەنی؟ کاسە پڕ بوو، ئەڕژێ؛ ئیتر کاسەم پڕ بیوە و لەمە زیاتر سەورە نەمائە، بە خوا بەیتە قینما ئەڕم و تازە چاوم بە چاوت ناکەفێ.

حەمە بەو قسانە گۆڕی گرتەوە و گۆڕاوە، بە پێکەنینەوە دەستی خستە سەر شانی عەبە و بەرەو ماڵ بوونەوە.

شەو داهاتووە، درەنگانە، حەمە کەسەری وەلا ناوە، هەر نەبێ لای عەبە خۆیو نیشاندەدا. کەولی نان ڕاخرا، چارەکە نانی پوورەگولەیان کردەوە. جامە مسێکی گەورەی بندار لە نێو نادا وەدەرکەوت. نانیان لادا، مریشکێکی سوورەوە کراو لە نێو جامدا، مەدەی هەر دووکیانی کردەوە، ئیشتیایان ساف بوو.

شێو خوراوە، ئاوی ساردیان بە سەردا کردووە. حەمە حەسایەوە و عەبە ماندووە. حەمە ڕوویکردە عەبە:

ـ دەیکاکە! ئەمجار نۆرەتە، بەو قسانەی ئێوارە ڕا دەبێ بەسەرهاتێکی دڵتەزێنت بێ! بەو قسانەی تۆ ژیامەوە، ئالوگۆڕێکی سەیر لە دەرونمدا ڕوویدا، تەواو کاری تێکردووم، دەبێ دیوی ڕاستەوانەت وەدەرخەی، تا ئێستا من تۆم نەناسیوە! بە چاوێکی دیکەوە

تەماشای تۆم دەکرد، لە ئێستاوە بە چاوێکی کراوەتر تەماشات دەکەم. ئەوە پێنج ساڵە بە ئاواتەوەم بزانم تۆ کێی، تۆ هەر نەتگوت، ئەمشەو دوا دیدار و ئەوسەری مەیدانە، ئەوەشت پێ بڵێم، مەگەر گڵ لێم بیسێ. ئەوەی بە سەرت هاتووە. بیگێڕەوە.

عەبە بە وەڕەزیەوە گوتی:

ـ لاوە تۆ خوا واز بێرە، زام کۆنم مەکوڵێنەو. تازە بە کار چە ئەخوا؟

ـ نا، وا مەڵێ، لە هەر ئەقڵێ خەسارێ، ئەگەر زووتر بەسەرهاتی خۆت گێڕابایێتەوە، چ مەعلووم من تووشی ئەو رۆژە دەهاتم؟ چووزانی نەدەبوو بە پەند و ئامۆژگاری بۆ من؟ بیگێڕەوە، بە کاری رۆژێ دێن.

عەبە مات بووە. دەڵێی بیر لە رابردوویەکی دوور دەکاتەوە! جار لەگەڵ جار نێو چاوانی گرژ دەبێ و وێکدێتەوە! رەگی لا ملی ئەستوور بوون! چاوەکانی لە مۆنەوە دەچن. سوور سوور، بوون بە گۆمی خوێن! مووی سمێڵی راستەوە بوون و بوون بە درەوشە! رەگی دەستی بوون بە خەریتە و وەفرتە فرت کەوتوون. لێوی لە ئاستی خۆی وەلەرین کەوتوون! دەڵێی قسە دەکا و دەنگی دەرنایە! یان دەڵێی ژنی دووگیان تاتە بە ژانەوەیە و لێ نابێتەوە. زمان بوو بە مامان و بەری منداڵدانی گەرووی تەڕو پاراو کرد، کۆرپەی راز لە گەرووی ترازا:

ـ لە کوێنەو دەس پێ کەم؟ چەو بۆ باس کەم؟ ژیانێ پڕ لە مەراقم هەس! تاڵ تاڵ، وەسە کلکەمار، حەز ناکەم خۆێچم بیژنەوم. بەر لە گشتی ئەوە بێژم، ناوم شامحەمەوە، بۆ شوێنە گومکڵ ناو خۆمم گوڕییە، ئەهل ئەتراف هۆوە تووم. برام بە تۆ بێژم، دە ساڵ بەر لە ئێسە بۆ خۆم کەسێ بووم، خاوەن ژن و ماڵ و جفت و گاو پەز و پاتاڵ. دارای برا وکەسوکار، مەردم حەساویان لێم ئەورد، وەپیایان ئەشناسیم، وەک ئیسە نەووم پێم بێژن عەبە شێت. کۆڵەوار و ماڵ کاول دەس ئاغام. تازە سێ ساڵ بوو ژنم هاوردوو. خێزانم ناوی گەوەر بوو، فرە دڵمان بە یەکەو بوو، پێک بڕیاین و دایان پێم، شەیتان وتی چەق! نۆکەرێک و قەرەواشێ تۆمان بوو کەنیشکەکە ناوی جەمیلە و تازەدارە دارە ئەڕێتە ڕیا، کوڕە ناوی ساحەو وی، بەرمەمکانە وی. ژیانێ فرە شیرین سەر و دڵ خۆشمان بوو، چەرخ چەپەڵ پێمانی رەوا نەدی و لێمانی شێویان. باوک بە رەحمەت خوا چوو، ساڵی تێ وەرنەگەڕیا، دایکیچ تۆ خۆش.

ـ خودا لێیان خۆش بێ.

ـ خوا دایک و باوکت عەفوو کا. دوو برا لە خۆم گـەورەتـر، خـاوەن ژن و منـاڵ، بەیەکەو بووین. ژنییەل تەک یەکا ساز نەبوون، دایم شەڕ و شۆڕوشەڕە چەلەحانیان بـوو. وتمان وا خاسە برایەتییەکەمان نەچێ، جیا بینەو خاسە، جیا بووینـەو، بـەڵام لـە زەوی و زارا هەر بەیەکەو بووین، ئاغا ناتێلێ زەوی کوت کوت کەین، گشت بەیەکەو کارمـان لە بان ئەکرد و حاسڵمان ئەکرد بە سێ کوتەو.

ساڵی تێوەر گەڕیا. هەر کەس لە ماڵ خۆی. گەورەی خـۆی بـوو، گـشت سـەر و دڵخۆش. مانگێ لە بەهار چوو، پامان نیا ناوەڕاست مانگ بەهار، بـەهار کـێڵ کریـاوو، شیناوەرد لە خەم رەخسیاوو، ئەوەی بوومان، کڕیاوو وەزەویەو تەمادار حاسڵ بووین.

رۆژێ گزیر ئاغا هاتە دریا و وتی ئاغا کاری ها پێت. چوومە قەڵا. مەنـسوور خـان وتی:

ـ شا محەمەو! ئەشێ گەوەر بنێریتە قەڵا و کارەکەر خانم وێ!

هەرچی من وتم ئاغا! کار وا ناوێ، خۆم پەز و پاتاڵ و مناڵ و دەشتەوانم هەس، ئـەو نەیژنەفەت، ئیسەرەم ئەشێ بێ، یان ئەشێ لە ملکم بارکەی. چوومـەو ماڵـەو، لـە تـەک گەوەرا رامان هاوردە سەر ئەوە تا خەلەوخەرمان کۆ ئەکەینەو، بچێ؛ چارە نەوو، یا ئەشیا بارمان کردایە، ئەویشە نەئەکریا.

ژانە سەرو حەواڵە نەکەم، گەوەر چووە قەڵا. چوار مانگ تێپەڕی. بە رۆژ کار قەڵای ئەکرد، بە شەو کار ماڵەو.

ئەو چوار مانگە، ئەگەر بێژم وەچوار ساڵ لە من تێپەڕی، تۆ بێژە وە چل ساڵ! گـشت رۆژێ بانگ سوح گەوەر ئەڕووی و بانگ خەفتن ئەهاتەو؛ تا ئەهاتەو، سەد کفـنم زەرد ئەکرد و هەر پەلێکم وە دەس ئێزرایلێکەوە بوو، وەخۆم نـەوو، هـەزار غاییلـە وە دڵـما ئەهات، ئاخر گەوەر فرە قەشەنگ و پێکەفتە و، وەنەوێ دلپیسی لەو بکـەم، خـوا نـەکا کەس وە ئاوانی بزانێ، تەنیا دڵخۆشیم ئەوەوو، لەو باوەتەو ئەرخەیان بووم. فـرەی نـەماوو نۆخشە هەڵێ، رۆژم وەئەنگووس ئەژمارد.شەوێ گەورە هاتەو فرە مات و خەمین بوو. وتم:

ـ گەوەرگیان! چەس؟ بۆ چە خەمینی. وەگیریانەو وتی:

ـ راسو گەرەکە؟ ئاوڕووم ها لە خەتەرا! مەنـسوورخان زۆری بۆم هاوردیە! گرشـت سـوحێ ئەچمە گەوڕ مانگا بدۆشم، تەماحی لە ناموسم کردیە! هـەر رایـەک وە بیـانێکی خـۆم رزیـار ئەکەم، دوو سێ رۆژە هام لە حەیزا، ئەمڕا بیانک نییە! شا محەمەو! چاوەڕوان تـۆم، تـۆ شـووی

منی، من nاموس تۆم، نامووست ها لە خەتەرا، چارەیەک بدۆزەو، ئەر تۆ دەربایس نیست، مـن چارەی خۆم ئەکەم! بەر لەوە دەسی لێم بکەفێ، خۆم ئەکوژم.

حەمەگیان! باوەڕت بێ ئیتر نەمزانی شەوە یا ڕۆژە! دنیا لە بەر چاویەلم ئـەخولیاوە، هیچـێکم نەئەدی و نەمەژنەفتو خنجێرێ دەوان خاسم بوو، دەسم دا خنجێر و گەوەر دەسی گرتم، وتی:

ـ چە ئەکەی؟ خۆت ئەیتە کوشت؟ تۆ زۆرت بەو ناگەیێ، بەر لەوە چـاوت پێـی بکـەفێ، ئەتکوژن، بێ بەیەکە و راوێژ بکەین.

ئەوەڵ رامان هاوردە سەر ئەوە گەوەر خنجێرەکە تەک خۆیا بەرێ و لـە دەرفـەتا لێـی بـا. دواجار بیرم کردەو ئەمە ئافرەتە و زۆری وە پیا ناشکێ. رامان گۆڕی و هاتینە سـەر ئـەوە مـن جلەکانی بکەمە بەرم لە جیای ئەو بچمە ژوورەو.

ئەو شەوە، شەویار کردی و ئێمە کردمان، نەخەفتین. بەر لە بانـگ مـەلا بـەرگـم گـۆڕی. گەوەرم حالی کرد منالەکان بەرێتە دەشتەو و بچێتە کێف پـشت ئـاوای و مـن خۆمیـان پـێ بگەیێنمەو و بەیەکەو راکەین.

فانۆسم هەڵگرت و وە جل ژنانەو چوومە قەڵا. لە دریام دا و دریاوان دریـای کـردەو، مـنی نەشناسی. چوومە تەویلە و فانۆسەکەم بردە لای مانگاکان و لە بان ئاخور دامنیـا و خـۆم بـەرەو دریا گەڕیامەو. لە پشت دریای تەویلە دەس وە خنجێر وێسیام و چاوەڕوان ئاغا بووم.

جیڕە لە دریا هەڵسیا و مەنسوورخان هاتە ناوەو، گیفـرکی دا لـە خـۆی و بـەرەو فـانۆس روویێ. لە دواوە رامکرد. تا هێزم لە لەشا بوو، دام لە کورتە کەلەکەی. سێ‌ڕا تا دەسـک خنجـەر لە کەلەکەی نوقم بوو. بۆڕەی ئاغا وڵاتی هەشەدارکرد. دریاوان وە دەنگ ئاغاوە، دریـای جـێ هێشت، لەو دەرفەتا رام کردە دەشتەو، راسەوخۆ چوومە ئەو شـوێنەی کـە لـە تـەک گـەوەر دیاریمان کردوو، بەڵام داخ گرانم، هەریز چاوم پێیان نەکەفت!

شا محەمەد بێ دەنگ بووە. کوڵی گریان لـە ناخـەوە رایـدەتـڵەکێنـێ و شـان و سـەر هەڵدەبەزنەوە.

حەمە چاوی بە مۆڵەق وێستاون، سەرسام سەرنجی داوەتێ. پاش ماوەیەک گوتی:

ـ گەوەر چی بەسەر هات؟ بۆ نەهاتبوو؟

ـ گەوەر دێر جوولیاووەو چووە ماڵ باوکی چاوی بکەفێتە ئەوان، تا جوولیاووەو پێیـا ئاغـا رژیاوونە دەشتەو ئەویان گرتوو. شەو وە دزیەو چوومە ئاوایی، پیان وتم راکـە و لـەم حاشـە و حەواڵە دوورە بکەفە، پیا ئاغا هان وەدواتەو. دنیام لێ ووە چەرم مەلیچک و لە هیچ شوێنێ جـێم

نەوو، داروکوچک کێفەکانم لێ‌ووە پیا ئاغا! ئەو راکردنە رامکرد تا ئەو دیـو نەویـسیام. پـەنج ساڵ لەوێنە مامەو. دوای پەنج ساڵ گەڕیامەو. شەو بە دزییـەو چوومـە مـاڵ براکـانم. کاشـکە نەچوام! ئەوەی من لێ ئەترسیام، ئەو مەژنەفت! گـەوەر تـەحوێڵ دەوڵـەت دریـاوو، دوای دوو ساڵ بەند، لە دار دریاوو، ئاخر لە مەحکەمە و تووی مـن ئاغـام کوشـتیە! بـەڵام کوڕیـەل ئاغـا باوەڕیان بەوە نەکردوو، چوونە لای براکانم و سۆراخ منیان گرتوو.

دوو سێ شەو لەوێ مامەو، جەمیلە و ساحەو گەورەبـوون، منیـان نەئەناسـییەو منـیچ خـۆم ئاشکرا نەکرد، بێ ئەوە بزانن من باوکیانم، جێم هێشتن و سەر خۆم هەڵگرت و پـەڕوازەی ئـەم ناوەقە بووم، ئەمە پەنج ساڵە هام لە خمەت توا و تۆش ئەوە جێم تێڵێ.

بە سەر هاتی عەبە بە چەشنێ کاری کردبووە سەر رەوانی حەمـە، ئـەو شـەوە هـیچ قسەیەکی پێ نەکرا. بە بیری رابردووەکانی عەبەوە خەوی لێکەوت.

## ٢٠

شەو ولاتی لە چارشێوی رەشیەوە پێچاوە. نێو دێی کانی توو کرو کپە. دەڵێی ژیان لەوێ مردووە! یان گەڕی گەردوون لە گەڕان وەستاوە! تەنانەت سەگ و پشیلەش لە هاتوچۆ کەوتوون. تەنیا دیاردە بۆ ئاوەدانی، شەوقی کز و لاوازی دەلاقەی ماڵانە.

کۆمایەکی گەورەی ئاور لە نێوڕاستی دێوە هێور هێور خەرمانەی داوەو دەوروبەری رووناک کردۆتەوە. ئاور لە نێوڕۆوە بێ ئامان دەسووتێ و جار لەگەڵ جار پەرە دەستێنێ. هەلاش و چرپی ئاوری دزیوە و تەویلە و کادێنی گرتۆتەبەر و یەک پتوون ماڵەکەی حەمە بووە بە کڵپەی ئاور و ئاسەواری بنەماڵەی حاجی برایم پاکتاو لە رووی بساتی لادەبا.

قرچە و قرمەی کاریتە و کۆڵەکە و دەستەک لە ئاورداتا ئەوپەری گەرەک دەڕوا، سەگەلی ئاوایی وەچەق ولوور خستووە وێکڕا دەلوورێنن.

ژیان دیسان بووژایەوە. کۆلان پڕە لە جوولانەوە و هاتوچۆ. بن دیوار و قوونەبانان بوونەوە جێ راوگەی لاوانی شەوگەڕ، کەلێن و قوژبن پڕە لە سرتەو خورتە وکەس بە کەس نازانێ.

دوویاساوڵ لە دەوری ماڵی کوێخا کەریم دێن و دەچن. تاقمێ ژن و پیاو، لەنەتەر بە دەست گەیینە کۆلانی ماڵیکوێخا، یاساوڵەکان خۆیان هاویشتە پەنا دیوار و لە تاریکیدا ونبوون.

تارماییەک لەدەرکی ماڵی پوورەگوڵە هاتە دەرێ، بەبن دیوار و دیوار دا، بێ چرپە و دزانە رووی کردە پشت ماڵان.

چەق و لووری سەگەل پەرەی سەندووە و ئاوایی کەوتۆتە سەر زەلالەت، دەڵێی کاسەی قەرەچی ئاو بردوویە! عەبە لە پشتی دێیە، بۆ ئەوەی بەدشوومی لوورەی سەگەلی

لێ بە دوور بێ، تایەک لە پێلاوەکانی داکەندوە و سەرەونخون لە سەر ئـەرز داینـاوە و تەماداری هاتنی پوورەگولەیە.

بەر لە ئاوردانی ماڵەکەی حەمە، عەبە و پوورەگولەکات و شوێنیان دیاری کردبـوو. کات دوای شێوە و شوێن پشت ماڵانە. عەبەکاتی خـۆی بـە گوێـدرێژەوە لـە شـوێنی دیاریکراو چاوەڕێیە. تاپۆیەک لە پشت ماڵانـەوە دیاریـدا. عەبـە خـۆی بـە ئـەرزەوە نووساندووە و بە وردی تێی دەڕوانـێ. تـاپۆ دێـی جـێ هێـشت. هـەر دێ و نزیـک و گەورەتر دەبێتەوە، بە تەواوی قەلافەتی بۆ عەبە ئاشکرا بوو، دەنگیدا:

ـ میمکە! تۆی؟

پوورەگولە سەبرێ جوابیداوە:

ـ دەنگ هەڵمەهێنە، فەیزەدرێژ و فەتاحە کوێر یاساوڵن گوێیان لێ دەبێ، زوو بە بـا بڕۆین.

عەبە گوێدرێژی هێنا پێشێ و پوورەگولەی سوار کرد، شەوی تاریک و کوێرەڕێیان گرتە بەر و لە دێ دوورکەوتنەوە.

لەو دەمەیڕا عەبە چووە دووی پوورەگولەدا، حەمە گەلازی بـەرداوە و کردوویەتـە دەرێ. بێ حەجمان پێیەکی لە دەرێیە و یەکی لە ژوورێ.

گەلاز لە سەربانەوە دوو سێ جار مڕاندی، بە دەم مڕەوە دەوەڕێ. حەمـە گـوێی بـۆ شێوەی وەڕین هەڵخستووە، لەوە دەچێ بە کەسـێ دەوەڕێ، حەمـە دەرپـەڕێیـە دەرێ، گەلاز لە سەربانە پەڕییە خوارێ و ڕووەو ڕێ بە وەڕینەوە ڕۆیشت. حەمە دوور ونزیـک وەدووی کەوت، لارێ بووە و دوورەپارێز چاوی بڕیوەتە ئاسۆگی ڕێ.

دوو تارمایی لە ئاسۆگی قەبرانەوە ئاسۆگیاندا. گـەلاز گـەییوەتێ، دەنگـی فیکـەو کووچی کووچی بێ دەنگی کرد. حەمە دەنگی عەبەی ناسییەوە، هاتەوە سـەر ڕێ و بـە پیریانەوە چوو، لە دوورەوە دەنگیدا:

ـ کاکە عەبە! پوورێت لەگەڵە؟

ـ بێرەو، هاوردیمە.

حەمە باوی پێی خۆشکرد و خۆی گەیاندێ، پوورەگولەی بـە سـوارییەوە لـە ئـامێز گرت:

ـ پوورەگیان! چاک بوومە هۆی ئازارت.

پووره‌گوڵه به سوارییه‌وه ده‌سته مڵانێ بوو و رایمووسی:

ـ خۆم حه‌زم کرد بتبینم قه‌زات له من.

عه‌به له پێشه‌وه و پووره‌گوڵه ده‌ستی له سه‌ر شانی حه‌مه‌یه، شانبه‌شانی ده‌ڕۆن. گه‌یبونه‌ته به‌ر ده‌رگا. حه‌مه پووره‌گوڵه‌ی له باوه‌ش کرد و له گوێدرێژی هێنایه خوارێ و چوونه ژوورێ. عه‌به گوێدرێژی له ته‌ویله کرد و چووه ژوورێ. گه‌لاز له پشته‌وه چووه سه‌ربان و له‌وێ که‌وت.

هه‌ر سێ له ده‌وری یه‌ک کۆوه بوون. پاش حه‌سانه‌وه، پووره‌گوڵه پرێسکه‌یه‌کی کرده‌وه، مێوژ و کاکڵه گوێز وه‌ده‌رکه‌وت، به ده‌م چێوک هه‌ڵبژاردنی مێوژه‌ووه سه‌ری قسه‌ی کرده‌وه:

ـ به‌ڵێنم به دایکت دابوو جێی ئه‌و بۆ تۆ بگرمه‌وه، ئه‌وه‌ی له ده‌ستم هاتبێ سه‌باره‌ت به تۆ کردوومه، له‌مه و به دوا خۆت گه‌وره‌ی خۆتی و که‌س نییه ده‌ست بێنێته رێت. قه‌ت کارێ مه‌که کرده په‌شیمان بی، هه‌ر کارێکت کرد، به‌ر له کردنی هه‌ڵیسه‌نگێنه، زانیت له کردنی دوودڵی، مه‌یکه، چون کارێ به دوودڵییه‌وه بکرێ، په‌شیمانی له دووه، په‌شیمانیش بایه‌خی نییه.

تا ماوی خوێڕی مه‌به، خوێڕی له پیاندا سه‌رشۆڕه، پیاوی سه‌رشۆر زوو ده‌شکێ. داری لار به‌رانبه‌ری بای به قه‌وه‌ت خۆ ناگرێ و زوو سه‌ری له ئه‌رز ده‌که‌وێ. داری راست خۆ گره، بشچه‌مێ،ئه‌وه‌نده ده‌نه‌وێ سه‌ری له ئه‌رز نه‌که‌وێ. من تۆم وه‌ک داری راست بار هێناوه، به‌و بایانه نانه‌وێ، باره‌که‌ڵلا! منت رووسوور و سه‌ر به‌رز کرد، کارێ تۆ کردووته که‌س نه‌یکردووه! ئه‌و چه‌شنه من عه‌تام دیوه، ئه‌سته‌مه بێته‌وه به عه‌تاکه‌ی جاران! به‌وه ده‌ڵێن کاری پیاوانه، جا چت به سه‌ر دێ، با بێ. به‌رخی نێر بۆ سه‌ر بڕین چاکه! له‌و ده‌مه‌وه له عه‌تات داوه، دڵم حه‌ساوه‌ته‌وه! شه‌وانه تێر ده‌نووم، جا ئه‌وان چ ده‌که‌ن با بیکه‌ن، ماڵ ده‌سووتێنن، تالان ده‌که‌ن، پیاو ده‌کوژن، جه‌ریمه ده‌که‌ن، که‌وێ ماره ده‌که‌ن، که‌یفی خۆیانه، گوێ به‌وانه مه‌ده، خۆت «بۆمه مه‌که، کاره‌که‌ت زۆر ره‌وا و پیاوانه‌یه، بشتکوژن هه‌ڵگریه‌تی، ده‌زانی له کێت داوه؟!»

ئه‌و قسانه‌ی پووره‌گوڵه وه‌ک نه‌خشی کارگه له مێشکی حه‌مه‌دا نه‌خش ده‌به‌ستێ، وره و وزه له ده‌روونیدا وه‌ک کارگ هه‌ڵده‌تۆقێ، سوور هه‌ڵگه‌ڕاوه و له پێستی خۆی جێی نابێته‌وه، وه‌جموجووڵی خستووه.

عەبە دەستی ناوەتە ژێر چەنەی و مـاق دەڕوانێتــە دەمــی پوورەگوڵــە و تــەزوو و مچۆڕک بە لەشیدا دێ.

ـ حەمەگیان! کوڕم! هەڵبەت عەبە بۆی باسکردووی، دەڵـێن بـەیانی کـەوێ مـارە دەکەن! بـا بیکـەن! ماڵـەکـەتیان سـووتاندووە! سـووتاوە بـە تـوون! لـە قـەدیمـەوە گوتوویانە:«پیاوی ڕەند ماڵی بۆ چییە، پیاوی گەند ماڵی بۆ چییە؟» تـۆ ڕەنـدی، پیـاوی ڕەند ماڵی هەر دەبێ. هیچ خەفەت مەخۆ، کار لە پیاو ڕوو دەدا، بە دڵی منـت کـردووە، وات نەکردبا دیقم دەکرد. شووشە گوتوویە: بشکێم نە وەک بزرینگێم، پیاو بمـرێ نـە وەک سەرشۆڕ بێ، سەر دانەواندن یەک جارە، جارێ سەر دانەوێنێ هەتا هەتایە قـزەبـار دێ، دەستت خۆش بێ، خۆت لۆمە نەکەی! نەکەی لـە دڵـەوە بـڵێی دەبـوو کـاری وام نەکردبایە! ئەگەر وا بیر بکەیەوە لە ورە و پیاوەتیت کەم دەکاتەوە. من شـانازیت پێـوە دەکەم، لە بار هێنانت پەشیمان نیم، شانازی بە خۆم دەکەم، خۆ بەسەربـەرز و ڕووسـوور دەزانم، ئەوەی ڕەنجم بە تۆوە کێشاوە وەک شیری دایکت حەلاڵت بێ. دەستی کـردە ملی حەمە و پڕ بە دڵ نێو چاوانی ماچ کرد.

حەمە لە دەروونەوە ئیحساسێکی سەیری تێدا بەدی هاتووە! هەست بە شـادی دەکـا، دڵی پڕە! لێوی بە بزەوە دەلەرزێ، ئەسرین لە چاویدا شەپۆل دەدا، شادی و شین تێکەڵە، نازانێ دەگری، یان پێدەکەنێ؟ بە گریان و پێکەنینەوە گوتی:

ـ پوورێگیان! تۆ چۆن ئادەمیزادێکی؟! من لام وابوو لـێم دەدەی و بـە لۆمـەوە پـڕ جنێوم دەکەی، دووبەشی لەتۆ دەترسام، هەر خەمی ئەوەم بوو، ئێستا دەبیـنم وا نییـە، بـە دڵنیاییەوە سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم، دڵنیابە لـە هـەر شـوێنێ بگیرسـێمەوە بـێ هەواڵت ناکەم، بەلام تۆ خودا پوورێگیان! هۆشت بە عەبەوە بێ، خافڵی مەکـە، وەبزانـە منم، پێی لێ مەبڕە، بۆنی من بنێ بەوەوە.

دوو دڵۆپ فرمێسک لە قۆلکی بەرچاوی پوورەگوڵەدا قەتیسە، بە لۆی چارەکەکـەی چاوی سڕی، بۆ دڵنەوایی حەمە بەڵێنیدا:

ـ عەبە خۆشەویستی تۆیە، هی منە، دڵنیابە بۆنی تۆ دەنێم بەوەوە. ئەرخەیان بە، بیر لە هیچ مەکەوە، لە هەر ولاتێ گیرسایەوە بێ هەواڵمان مەکە.

دەستێکی لە مێوژ و گوێز وەردا و لاوێچێکی کردە زاری، حەمە و عەبـەش وێـڕای ئەو دەستیان پێکرد.

پاش خواردنی شەوچەلە، حەمە گوتی:

ـ دەی پوورێگیان! دەنگ و باسی نێو دێ؟

ـ لە چ دەپرسی؟ باس باسی تۆیە، هەموو سەرت بە قوربان دەکەن، بۆت بە خەمن، لایان وایە تۆ گیراوی، ئاغاش کووتوویە هەلاتووی، بەلام باوەڕیان پێی نەکردووە. دەلێن درۆ دەکا. دەلێن چەتەکان سەعیدی نۆکەری ڕەشید خانیان کوشتووە، خەلکی تازاوایان تالان کردووە. دەبێ عەبە ئەوانەی بۆ باس کردبێتی، بیستووتە؟ ـ بەلێ ئەوانەم بیستووە، خۆ لە لایەن ئاغاوە کەس هیچی بە تۆ نەگوتووە؟

ـ کێ دەتوانێ بێتە دەرگام؟ هەرکەس بێ سەگی پێوە دەنێم، چۆن دەتوانن بێنە دەرگام. ـ فەیزە درێژ دەبێ ئێستا چ بکات؟ ئەو شەوە ئەویش لە گرتنی مندا دەستی بوو، وێڕای ڕەسووڵ هەلدەسووڕا،ئێستا کەیف کەیفی ئەوە، وا نییە؟

ـ لە هەر کوێ ئاشە کەچەل فەڕاشە، ئەو بۆ ئەو کارانە دروست کراوە، هەلبەت دەبێ وا بێ، بێستان و بێ سەرەخەر؟! داخی فەیزە لە دلی مندایە، هەر لێی گەڕێ، ئێستاش لەگەل فەتاحەکوێر بوونەتە تفەنگچی و یاساولی کەوێن، هەر وای ناخۆن، پەلە مەکە، کار بە پەلە ناکرێ، دەلێن قازانی مێردان بە چل سال دێتە کول، ڕۆژێ دەبێ گۆڕ بێننە گۆڕخانە و گیان بەدەستەوە بدەن.

عەبە لە مێژە تەمادار بوو پوورەگولە قسەکانی تەواوکا، بە پەلە هەلیدایە:

ـ میمکەگیان! وەزات خوا هیچ کامتان بەقەو من قینتان لەو براگەمالە نییە، من فرە لێ ئەترسم، سال وە هەزار چووێ وە دەس فەیزەو ئەچم، فرە قینی لە منە، ئێژی من دوو شاخم هەس و ئەیکەم وە چاویا، ئابێژە من چەم کردییە؟ ئاخر زلمم لێت کردیە؟ وە نانتم؟ وە ئاوتم؟ منی هەڕگ وەسەر چەم؟ بۆ چە شاخت گیرانەسە شاخم؟ بە خوا هەر دەمایەکی من کوژیام، فەیزە منی کوشتییە، حەمەگیان خوێنم گوم نەکەی، بۆیە ئەموت گەلازم بە پێ، لە ترس فەیزە بوو. لەوەتی گەلازم هەس، ئەرخەیان پالم لێ داگەسەو، ئەزانی قین چەی ها لە من؟ ئێژێ دێ کۆن ملک منە و تۆ زەوتت کردیە! ئا تو خوا میمکە تۆ بێژە؟ هی ئەوە؟ ئەر هی ئەوە تا چۆلی بکەم، هی ئەوە؟

ـ ئەوڵلا، بە بیرەوەری من ئێرە هی کەس نەبووە و هەر چۆل و بێخاوەن بووە. ــ دە خاس، دەبێژە براگەمال تۆ چەو گەرەکە؟

پووره‌گوڵه و حه‌مه دایان له قاقای پێکه‌نین. پاش ماوه‌یه‌ک سه‌رنجدان، عه‌به‌ش وێرای ئه‌وان قاقای کێشا.

پاش ماوه‌یه‌ک پێکه‌نین، پووره‌گوڵه باسه‌که‌ی گۆڕی:

ـ حه‌مه‌گیان! دنیا مردن و ژیانی له دوایه، تۆ سه‌دوپه‌نجا تمه‌نت پووڵ له لای من بوو، به عه‌به‌دا بۆم ناردی، پێت گه‌یی؟

ـ به‌ڵێ پێی داوم.

ـ ئه‌وه ئه‌وه‌ت. چاڵه‌کانت چه‌نده‌یان گه‌نم تێدایه؟

حه‌مه چاوه‌کانی زه‌ق بوونه‌وه! به سه‌ر سوورمانه‌وه گوتی:

ـ گه‌نمی چی؟! بۆ به تالانیان نه‌بردوه؟

ـ نا ڕۆڵه‌گیان، بۆ من مردووم، که‌یفم بێنایه نه‌مده‌هێشت ماڵه‌که‌شت بسووتێنن! به قه‌ست باسم نه‌کرد. بیستبووم فه‌یزه گوتبووی ده‌چمه خانووبه‌ره‌که‌ی حه‌مه، بۆ ئه‌وه‌ی به‌و ئاواته نه‌گا، گوتم با بیسوتێنن. چاڵه‌کانت ده‌ستی لێ نه‌دراون، چه‌ند ته‌غاریان تێدایه؟

ـ شه‌ست ته‌غار، چاڵه کۆنه‌که بیست و پێنج ته‌غار گه‌نمی پاره، ئه‌وه‌ی دی سی و پێنج ته‌غار گه‌نمی ئه‌مساڵه.

ـ پووڵت پێویسته بۆت بفرۆشم؟

ـ نه وه‌ڵڵا، پووڵم بۆ چییه؟ خۆم کۆڵێ پووڵم پێیه، ده‌ستی به باخه‌ڵیدا کردو پووڵه‌که‌ی ده‌رهێنا، سه‌د تمه‌نی گلداوه و ئه‌وه‌ی دی له پێشی پووره‌گوڵه‌ی دانا.

ـ من ئه‌و سه‌د تمه‌نه‌م به‌سه، ئه‌وه‌ش دووسه‌د و په‌نجا تمه‌نه، هه‌ڵیگره لای خۆت، عومر باقی بێ یه‌ک ده‌بینین، پێویستم بێ لێت وه‌رده‌گرمه‌وه. گه‌نمه‌که‌ش ده‌فرۆشی بیفرۆشه.

ـ نا ڕۆڵه گه‌نم بۆ فرۆش نابێ، ئه‌گه‌ر پێویستت پێی نییه، بۆ بیفرۆشم؟ نایفرۆشم. ـــ ئاخر گه‌نم ئه‌وه‌نده له چاڵدا بمێنێ ئه‌سپێ لێی ده‌دا، له حه‌رام ده‌گه‌ڕێ، بیفرۆشه و پووڵه‌که‌ی بده به داماوێ.

ـ نا کوڕم، گه‌نم له پووڵ باشتره، تۆ ته‌نگانه‌ت به سه‌ر نه‌هاتووه، گرانیت نه‌دیوه، من دیومه، دوو ده‌وره گرانی و قاتوقڕیم دیوه، رووسه‌که‌ی ئه‌وه‌ڵ پیاو پیاوی ده‌خوارد، گۆشتی سه‌گ و پشیله و که‌ره‌تۆپیو وه‌ئه‌رز نه‌ده‌که‌وت، منداڵ له برسا ده‌مرد دایک و بابی گۆشتیان لێ ده‌بڕی وده‌یانخوارد! ده‌وره‌یه‌کی دی، ئه‌وه زۆر له مێژ نییه، ده‌بێ ئێوه

لە بیرتان بێ، ساڵی عەزیزەڵلا کە بوو، تۆ ئەودەم منداڵ بووی، دەبێ عەبە زل بووبێ، وەبیرت دێ عەبە؟

ـ کامەوو میمکە؟ ئەوەووە عەجەمەکە وە وڵاتا هات؟ ئەر ئەوە بێژی، من زل بووم، گالەوەڕێن بووم، وە ئەزانم دوێکەس.

ـ ئەرێ ئەوە بوو، لە وڵاتی خۆمان دەوڵەمەند گەنم و جۆی بوو، فەقیر و نەدار گاڵ و هەرزنیان دەخوارد. قاتوقڕی کەوتە نێو عەجەمان، ماڵ و حاڵیان بە جێ هێشتبوو و کەوتنە وڵات، بە دووی زگیان کەوتبوون، ڕۆژ نەبوو دە دەستە نەیێنە دێی ئێمە، بە ژن و منداڵەوە دێ بە دێ دەگەڕان و داوای نانیان دەکرد. لە خێر دەرنەچێ و لای خودا ون نەبێ، کەس دەستی لە ڕوویانەوە نە دەنا، لە زۆر زۆر و لە کەم کەمیان دەدانێ و بێ بەشیان نە دەکردن. زۆر لێقەوماو بوون، کچی ئازەبیان دەدا بە نان، زۆر کەس لە ڕاهی خودا مارەی دەکردن، گوڵزار عەجەم و سوراحی عەجەم لە کانی توو وێنەی ئەو ساڵەن، وێنەی وەک ئەوان لە زۆر دێ هەن. خودا ئەو ڕۆژە نەهێنێ وکەس نەیبینێ، قاتوقڕی دەردێکی گەورەیە، برسیەتی ڕەگی هاری پێوەیە، پیاو هیچی نەبێ و برسی نەبێ، گەنم لە هەموو شتێک چاکترە، من گەنم نافرۆشم، دەیدەم بە قەرزی گەنم بە گەنم، تۆ نەتدیوە، من دیومە، دنیام قوونەکەو کردووە. تۆ کارت بەوەی نەبێ، خۆم دەزانم چ دەکەم، بۆت دەدەم بە مەزاری گەنم بە شەست تەغار گەنم و دووسەد و پەنجا تمەن پوولت لە لای منە، بۆت بدەم بە کێ؟ـ ئیشاڵلا سەد ساڵ دەمێنی پووری گیان، ئەگەر خودا نەخواستە یەکمان نەدیتەوە بۆم بدە بە ئەحمەدی مام حەسەن.

ـ باشە، ئەو پیاوی چاکە، تایەفەی مام حەسەن ماڵخۆری کەس نین، بە وتەی ژنان دەڵێن بڕیارە دەستی ژنی بۆ دەگرن، داوای مینای حاجی بۆ دەکەن، لەم وەختەدا دەستی تەنگە، دەستی دەگرم.

پوولەکەی لوول کرد و لە لۆی پشتوێنەکەی خست و گرێیدا و هەستایە سەر پێ. حەمە و عەبەش هەستان.

عەبە لە پێشەوە چووە دەرێ. گوێدرێژەکەی دەرکرد و لە بەر دەرگا ڕایگرت. حەمە و پوورەگوڵە هاتنە دەرێ. گەلاز لە سەربانەوە چاوی بە حەمە کەوت و پەڕیە خواری و لەبەردەمی حەمەدا کەوت و دەستی کرد بە کلکە سووتێ. حەمە بە پێ کایەی لەگەڵ دەکا، هەرچەند پوورەگوڵە هەوڵیدا حەمە نەچێ، نەیبیست.

شەو لە نیوە لای داوە، ئاوایی دەستی خەوی کردووە، زیندەوار بە دەرەوە نییە، بۆنی سووتمان دەوروبەری دێی پڕ کردووە، ئاوری ماڵەکەی حەمە هەر دەگڕێ. گڕ و ئـاور لە سەربانەکان وەسەرکەوتووە و شەوقی داویە لە دەورو پـشت و سـەربـان و کـۆلانی رووناک کردووە، گڕەمشقەڵان دەڕوا بە ئاسماندا.

سوار و پیادە بە چۆم پەڕیونەوە، لە دەوری دێن. پوورەگوڵە دابەزی، حەمە بەرانبەری وەستاوە. پوورەگوڵە پێ‌پێ لێی نزیک بۆوە، سینگی نا بە سینگییەوە، ئامێزی بۆ گرتـەوە و دەستە ملان لە ئامێزی گرت، وەک تامەزرۆیەک بە خۆیەوە گوشی و هەڵیمژی. ئـەو ئامێز و بە خۆوە گوشین و هەڵمژینە حەمەی بردەوە سەر دەمی منداڵی و دایکـی وەبـیر هێناوە، لووتی پڕ بوو لە بۆنی دایکی و هەست بە لێدانی دڵی ئەو دەکا. باوەشی کرد بـە نێو قەدیدا و رێکی گوشی، بێ ئیختیار بە دڵپڕییەوە بە زاریدا هات:

ــ دایە! دایەگیان!

ــ حەمەگیان! قەزات لە من.

ماوەیەکی زۆر لە ئامێزی یەکدان، دڵ بەرایی نادا یەکتر بەردەن. عەبە بە دیارییانـەوە وەستاوە و سەری بە هەنیسکەوە هەڵدەکەنـدرێ. حەمـە و پوورەگوڵـە بـێ هـەسـت و خوست یەکتر هەڵدەگوشن و هەڵدەمژن. دەست لە مل و نێو قـەد شـل بـۆوە، دەم لـە روومەت و تەوێڵ کراوە و کەلێن کەوتە بەینی سینگیان، پوورەگوڵە رووی وەرگێـڕا و بێ ماڵاوایی، بە پەلە و تالووکە دوورکەوتەوە و لە کۆلان ونبوو.

حەمە عەبەساو چاوی بڕیوەتە تاریکـانی کـۆلان، دەڵـێی چـاوەڕێـی گەڕانـەوەی پوورەگوڵەیە! لەبەر خۆیەوە دەدوێ:

ــ زۆرت زەحمەت بە منەوە کێشا کچە پیرێژن! خۆزگە جـارێکی دی دەمدیتـەوە و تێرت جنێو دەدامێ، جنێوی تۆ لە قسەی خەڵک خۆشترە، گەلێ خۆشترە.

عەبە لێی چووە پێشێ:

شەو دێرە، وەشوێنێ ناگەی، ئەشێ لەم حاشییە و حەواڵە دوور بکەوفیتەو، بێ بڕۆین، ریەت کوێنەس؟

ــ هەر لێرە لە یەک جوێ دەبینەوە عەبەگیان، زۆرم ئـازار داوی، رزگـارم کـە، تـۆ رزگارم نەکەی، رزگاریم نایە.

ــ بە هە! وەڵڵا خاسە! ئەمە چە ئێژی؟ چەم کردیە؟ ئەشێ تۆ من رزیارکەی.

دەستیان کردە ملی یەک و یەکتریان ماچ کرد، نەک جاریّ، چەندین جار یەکیان لە ئامیّز گرت، یەکیان بەر دەدا و دیسانەوە ئامبازی یەک دەبوونەوە، هەر دوو دلّیان پڕە، هیچیان لە ترسی گریان ناویّرن بدویّن. حەمە بە سەر دەروونیدا زالّبوو و گریانی خواردەوە:

ـ عەبەگیان! کەویّ، یان مینات دی، بلّیّ حەمە دەیگوت، کەویّ دایکی حەوت کور بیّ هەر بە تەمایم، لە شایی ئەحمەد و مینادا بەشداری بکە، لە بری من تۆ بچۆ، بمیّنم سەرت دەدەم، هۆشت بە خۆتەوە بیّ، گەلازت لەدەست دەرنەهیّنن، ئەمانەتت گەلاز بیّ.

پشتی هەلّکرد و بە توندی عەبەی بە جیّ هیّشت.

زۆری نەخایاند لە کیّوە بارداویلە وەسەرکەوت. لە سەر تروّپکی کیّو ئاوڕی داوە، لە سەر بەردیّ دانیشت و چاوی بڕییە نیّو دلّی ئاوری مالّەکەی، تەواوی بیرەوەریەکانی بۆی زیندوو بوونەوە و یەک بە یەک لە ئاوردا دەهاتنەوە بەر چاوی.

کاکلّە هەوریّ وەبەرچاو نایە. تاووبان لە هەموو لاکەوتووە. هەتاو دەلّیّی لە پشتی شووشەوە تیشک دەهاویّژیّ، خۆری پاییز تینی تیژە.

ئەسپەڕەش داهیّزراو ریّ دەبڕیّ، پاشووی بە دوویدا کیّش دەکا، دەلّیّی وەفەیەتی! دەستی لە ئەرز بەرز نابیّتەوە، ڕەنگە باغە و قەرەقوشی گرتبیّ! ئەحمەد فەڕاش لە سەرە خۆیە، ئاوزەنگی لیّنادا و پەلەی لیّ ناکا.

سوار لە کیّوەبەرداویلەوە هیّور هیّور دیّتە خواریّ، گەییوەتە دەوری دیّ. دەستەیەک کوڕە جەحلّیە لە دەوری کانی ویّستاون. سوار گەیشتە بەرانبەریان، بە ئاماژەی دەست سلاوی کرد. ئەوان بە زمان جوابیان داوە:

ـ بە خیّر بیّی کاکەحمەد، فەرموو بچینە مالیّ.

ـ خۆش بن برا، دەچمە مالّی کویّخا.

ئەسپ لەقان لەقان گەیشتە دەرگا، سوار لەغاوی کیّشا و پیّی لە ئاوزەنگی دەرهیّنا، لەغاوی کرد بە قولّدا و لە سەرەخۆ لە دەرکەی دا.

ئافرەتیّ جوابی داوە:

ـ فەرموو، دەرگا دانەخراوە.

ئەحمەد دەنگی ناسییەوە، دەنگی کوێخاژن بوو:
ـ خات نازەنین! ئەحمەد فەڕاشم لە تازاوا هاتووم، پەیامی ئاغام پێیە، بێ زەحمەت.
کوێخاژن بە تالووکە بە دەنگییەوە هاتە دەرێ:
ـ فەرموو وەرە ژوورێ.
ـ ئاوەدان بێ،لێرە بە شک نیم، ئاغا دەیفەرموو دێین کەوێ مارە دەکەین، خۆ سازکەن، منی لە پێشەوە ناردووە هەواڵتان دەمێ.
کوێخا ژن گێژ و مەنگ دەڕوانێتە ئەحمەد، بە پەشۆکاوییەوە گوتی:
ـ راوەستێ بزانم کوێخا دەڵێ چی.
بە پەلە رۆیشتە ژوورێ، پاش هێندێ لە بەر هەیوانەوە بانگی ئەحمەدی کرد:
ـ کوێخا دەڵێ بێتە ژوورێ.
ئەحمەد ئەسپەڕەشی کێشایە ژوور و لە سەر ئاخوڕی حەوشە بەستییەوە و چووە دیوەخانی کوێخا.
کوێخا بە دەست و غلدەغلدە بەخێرهاتنی لێ کرد و ئیزنی دانیشتنی دایە، رووی کردە خێزانی، ئەو لێی حاڵی دەبێ:
ـ برۆ بابت بانگ بکە با جوابیان بداتەوە، نان و چایەک بەو پیاوە بدە جا برۆ.
سەماوەر دەکوڵێ. کوێخاژن چای لە پێش میوان دانا، کەوڵی نانی راخست و پەنیر و ماست و رۆنی زەنگی بۆ لە سەر دانا و وەدەرکەوت.
ئەحمەد بە بنەوەش بەر قەنەی خوارد، چووە بەر سەماوەر و چای بۆ خۆی تێکرد. سێ چوار چای خواردەوە، مام حەسەن و کوێخاژن وەژوورکەوتن.
مام حەسەن بێ پێشەکی و قسە پێچانەوە و دایمەزراند:
ـ ئەحمەد! کوڕم! ئەگەر چوویەوە بڵێ مام حەسەن عەرزی دەکردی کەوێ کەنیزی خۆیەتی، ئاغات ساحەب ئیختیارە. بەڵام ئێمەش کاری خێرمان بەدەستەوەیە، پێوەین داوای کچی حاجی قادر بکەین بۆ ئەحمەدی کوڕم.
ـ خودا مەبارەکی کا مامەگیان.
ـ عومرت درێژ بێ، نوخشەش بێ لە تۆ. عەرزی بکە، یان ئاغا بۆمان داوا کا، یان دەستمان لێڕاگرێ، بڵێ مام حەسەن ئەرزی دەکردی، ئەگەر بۆمان دەستێنێ

ئەمڕۆ تەشریف بێنێ، دەنا دەست ڕاگرێ خۆم خەبەری دەدەمێ، جوان حالی بووی کوڕم؟

ـ بەڵێ حالی بووم. ئیزن دەفەرمووی من بڕۆم؟

مام حەسەن بە دوو سێ وچان ڕاستەوە بوو. ئەحمەد هەستایە سەر پێ، مام حەسەن تا دەرکی حەوشە ڕەوانەی کرد و خۆی گەڕاوە ژوورێ.

ئەحمەد سواری ئەسپەڕەش بوو و بە وێلغار لە دێ چووە دەرێ.

دوانیوەڕۆیە. سێ سوار کشایە نێو دێی کانی توو، هەمزەبەگ و قادر خانی زاوای و ڕەسوولی نۆکەر.

سوارە گەییونەتە سەرکانی. ژنان لە سەر ئاو بە لۆی دەسماڵ بەر دەماخیان هەڵدا و دەم و کەپۆیان داپۆشی و ڕوویان لە ئاغا وەرگێڕا، ئەوە نیشانەی ڕێزدانان بۆ ئاغایە. تاقمێ کوڕە جەحێلە لەو بەری کانییەوە خۆیان گیڤ هەڵداوە و خەریکی چاوەبڕکێن، بە چاوپێکەوتنی ئاغا خۆیان باریک کردەوە و دەرەدزەیان دایە.

لە مەیدانی ئەوبەری کانی، سێ چوار دەستە کوڕوکاڵ خەریکی مێشێن و گۆردێن و دووقامکەن. جەنگەی کایەیە. لە ناکاو کایە شێوا، هەر کەس دەستی دایە مەڕمەڕ و میتەی خۆی و دوورە پەرێز مەیدانیان جێهێشت.

منداڵان لە چەند لاوە هەلووکێن و باتڵێن و جگێن دەکەن. لەولاترەوە کچانی بچووک خانووچکەیان بە بەرد دروست کردووە و بووک بووکێن دەکەن. کوڕان دار و هەلووک و باتڵ و جگیان فڕێدا و هەر یەک بە کۆلانێکدا دەرباسبوون.

کچان بووک و ئالا بووکیان لە نێو خانووەبەردینەدا بە جێ هێشت و لە قوژبنی دیوار خزین و دەستیان گرت بە سەر چاویانەوە.

لە خۆرەتاوی بن دیوار کۆڕە ژنێ بە قسەوە پێچراون. ژنێ خوری بە شانەوە دەکا، ژنێ کولووی دەکا، دوانی دی هەڵیدەپێچن. سێ ژن بە پێوە وێستاون و تەشی با دەدەن، خاوکان و جاجمان و باریکان دەڕێسن. کوتوپڕ خوری لە شانە درا و کولوولە کۆش خرا و پێچکە خوری لە دەستەوە هالا، بەن هەڵکرایە سەر تەشی و ژنان بە دیوارەوە وشکبوون.

بن دیواری مزگەوت ژاوەی دێ لە پیاوان. مەلا و حاجی و سۆفی و کەیخودا پەلیان هەڵخستووە. دەستەیەک سەریان کردووە بەیەکدا، چرە و گورەیانە، یەک دەڵێ ئەو داشەی بدەیە، ئەوی دی دەڵێ بیداتێ ئاغا دەکا ئاغاکەش دەبڕێتەوە، مەیدەیە،مەیدەیە. لە پڕ هەموو سەریان بەرەو کانی وەرگێڕا و هەستانە سەر پێ، داش و ئاغا بە دەم پێوەتێکەڵ بوون و دامە شێوا، مەلا و حاجی و سۆفی و کەیخودا خێزەرەیان کردە خوارێ و چوون بە پێشوازی ئاغاوە.

سێ سوار لە پێشێ و حەشیمەتێ لە دواوە گەیشتنە دەرکی مالی کوێخاکەریم. سوارە پێیان لە ئاوزەنگی دەرهێنا.

فەیزە درێژ و فەتاحەکوێر و حەمەی نەنە خەجێ هەریەک پەلاماری لەغاوی چارەوێیەکیان دا و کێشایانە حەوشە. ئاغا لە پێشەوە و کەیخودا بە دوویدا چوونە ژووری، پاش ئەحوالپرسی کوێخا، هەمزەبەگ رووی لە مام حەسەن کرد:

ـ وەدیارە بیانووم پێ دەگری! ئێستا بیانووت دەبڕم.

چاوێکی بە خەلکەکەدا گێڕا، حاجی قادر لە نێوانی مەلا کەریم و سۆفی مینە دانیشتبوو:

ـ حاجی! لێرەی؟

ـ بەڵێ لە خزمەتام ئاغا

ـ دەزانی دەبینە خزم؟!

ـ چۆن قوربان؟!

ـ ئەوە نییە کەوێ دەبێتە بووکی من، ئەحمەی مام حەسەن خالی کەوییە، دەبێتە زاوای تۆ! ئەو عالەمە لە ژن و ژنخوازییەوە بوونە خزم، دەبێ کچەکەت بدەی بە کوڕی مام حەسەن.

حاجی سوور هەڵگەڕا، سەری داخست و متەقی لێوە نەهات، وە دیارە لە دڵەوە زۆری لە بەرگرانە.

ـ بۆ هیچ نالێی؟ خزمایەتی مام حەسەنت پێ خۆش نییە؟ دەبینە خزم!

ـ نەخێر مەتلەبم ئەوە نییە، خزمم لە مام حەسەن باشتر ناوێ، ئەحمەدیش کوڕی چاکە، بەلام....

ـ بەلام چی؟ بە سەری بابم قسەی لێ ناکەی، دەبێ بێدەیتێ.

مام حەسەن لە بەلامی حاجی حالییە، نەیهێشت جوابی ئاغا بداتەوە.

ـ قوربان! من و حاجی ماری کوێنێکین، خۆمان پێکدێین.

ـ نەخێر نەخێر، دەبێ هەر ئێستا بلێ دەیدا، یان نایدا.

ـ عەرزم کردی، من خزمم لە مام حەسەن باشتر ناوێ، پێشکەشە، بەلام خۆم مالم هەیە، خۆ کاوڕ و مەڕم لێ ناکرن!دانیشتووان تێکڕا گوتیان مەبارەک بێ.

هەمزەبەگ قسەی لە زاری خەلک بڕییەوە.

ـ قسە هیچی تێناچێ، قەراروبڕیە قسە دەبڕێتەوە وکار کۆتا دەکا، چی لێ دەستێنی؟ مارەیی چەندە بێ؟

مام حەسەن دیسانەوە پەڕییە نێو قسە:

ـ ئاغا! لەوی گەڕێ، شەوێ چوار کەیخودا هەلدەگرم و دەچمە مالێ و کۆتای دەکەین، لەوەی گەڕێ.

ـ نەخێر دەبێ هەر ئەمڕۆ و هەر لێرە دوایی پێ بێ.

مام حەسەن چاوێکی لە حاجی قرتاند. حاجی دەست بە جێ حالی بوو:

ـ بەلێ قوربان، هەر چۆن ئاغا دەفەرمێ. جارێ کاری خۆتان یەکلا بکەنەوە، من لە دەست دەرناچم، دەیدەمێ.

هەمزەبەگ دوولایی لە سەر حاجی هەلگرت و خستییە سەر مام حەسەن:

ـ ئەوە بووکی تۆ، نۆرەی منە، تۆ دەلێی چی؟

ـ چت عەرزکەم؟ کاری من و حاجی لەگەل کاری منو تۆ جیاوازی زۆرە، من وەکیلی کوێخام، وەکیلایەتی گرانە، با قسە لە مارەیی بکەین.

ـ باشە بابم، لە سەرچەندە دەلێی مارەی دەکەم.

ـ ئێمە رەعیەتین، رەعیەت بەنی ئاغاواتی پێ با نادرێ، ئەگەر کچ لە من دەخوازی، من دەلێم مارەیی کەوێ دەبێ کانی توو بێ، رێورەسمی خۆتان چییە و چی بۆ بووک دەکرن، من نازانم؛ خۆتان باشتر دەزانن، بەلام کانی توو دەبێ بکەیتە مارەیی. هەمزەبەگ مات دەڕوانێتە بەردەمی خۆی. سەری هەلێنا:

ـ جا ئەوە خزمایەتییە؟ تا ئێستا کێ ملکی کردووەتە مارەیی تا من ببمە دوان؟ وەکیلایەتی وایە؟

مام حەسەن فڕی سوارە، بێ پێچانەوە گوتی:

ـ من بەر لە سێلاو بناوانی خۆم قایم هەڵدەبەستم، لە قەدیمەوە گوتوویانە بەد ببینی بەدخانە بەیاد دەکەی؛ دیومە، خۆم دەستە شکاو ناکەم، ژنە کۆنەکەی خۆت ئەگەر مارەیی ملکێ بایە تەلاقت دەدا؟ ئەگەر مـن وەکیـل بم، وا نـەبێ مـارەی ناکەم، کەسیش کیسەی هەڵنەدرووە بۆ مارەیی، ئەگەر بە نیازی کەوێ بووکت بێ و بۆ هەتا هەتا بێ، بۆ دەترسێی؟ ئێستا من داوای کچی حاجی دەکەم، لە سەر چی مارەی دەکا بیکا، لێی ناپاڕێمەوە، لە قەدەر حالی خۆم حازرم، چونکە بەتەما نیم بۆ ماوەیەک بووکم بێ، بۆ هەتا هەتایە.

هەمزەبەگ بە تووڕەییەوە رووی لە مام حەسەن کرد:

ـ بەڵێنم بە عەتا داوە بەر لە هاتنەوەی، کەوێی بۆ بگوێزمەوە، دەبێ ئەو بچێتە پێشوازی؛ باش، کانی تووی دەکەمە مارەیی، مامۆستا! فەرموو مارەی کە.

مام حەسەن وەجواب هاتەوە:

ـ ئەی بێ بەلا بی، چۆن زاوا لە هەوێڵدا نەبێ بووک دەگوێزرێتەوە؟! بۆ کێی دەگوێزییەوە؟! کێ بەرەو پیری بووک دێ و عەتری لێ دەدا و لە سەربانەوە سێو و سەرەقەندی بۆ دەهاوێ؟ بووک بۆ زاوا دەچێ، خۆ بۆ تـۆی ناگوێزنـەوە، نانـا کاری وا نابێ، ئابڕوومان دەچێ، بووکی بێ‌زاوا، ئێمە بە توون، دەڵێن رەعیەتن و بێ دەسەلات، ئابڕووی تۆ دەچێ، هەر خزمەکانی خۆت بەردت لێ هەڵدەگێڕنەوە! بۆ تۆ بووک دەبەی، یان دیل؟ نەخێر من کاری وا ناکەم، لەوەدا لەگەڵت نیم، هەر دەمایەکی عەتابەگ بە سەلامەت هاتەوە، بووکی خۆت بگوێزەوە، دەست ناهێنمە رێت.

لەو دەمەوە کە هاتوون، قادر خانی زاوای هەمزەبەگ قوڕوقەپ قسـە لـە دوو لێوەی دەرناهاتووە، هەڵدایە:

ـ بە ئیزنی مامە هەمزە، قسەی مام حەسەنە، بووک بۆ زاوا دەگوێزرێتەوە؛ زاوا لە هەردا نییە، ئیشاڵلا بە سەلامەت لە نەخۆشخانە هاتەوە، بۆی دەگوێزینەوە، خۆم عەتابەگ رازی دەکەم، فەرموون مارەی کەن، کاری خێر بۆ چەنە بە چەنـە نابـێ وەدرەنگی مەخەن، فەرموو مامۆستا.

مەلا کەریم گوتی:

ـ کوڕ و کچ بە یەک ڕازین؟ شەرعەن دەبێ ئەوان ڕازی بن، ڕازی نەبن مارەی نایە، ئێمە بە شەرع موسلمانین.

هەمزەبەگ یەک بە خۆی گۆڕاندی:

ـ هەهوو هەهوو! نۆرەی تۆمە! لێم قووڵ مەکەوە مەلا! وەر مارەی کەو ئاو بکە بە ئاوردا، تۆش مارەی نەکەی دەنێرم بە دووی مەلا برایمی تازاوادا، ئەو دەستم ماچ دەکا!

مەلا کەریم هاتە نێوانی مام حەسەن و هەمزەبەگ چۆکی دادا، دەستیانی نایە نێو دەستی یەک، کەوێی لە عەتا مارە کرد. هەمزەبەگ وەکیلی عەتایە، مام حەسەن وەکیلی کەوێ و کوێخا، مارەیی کەوێ، کمانی‌تووە.

پاش مارەکردن و مەبارەک بایی، دوو دەور چا خوراوە، ئاغا هەستا و خەڵک بە جەماوەری هەستان وەدووی کەوتن. سوارە لە دەرکی حەوشە سوار بوون، کەیخودا و مەلا تا ئەو لای دێ ئاغایان ڕەوانە کرد. مام حەسەن حاجی قادری لە خەڵکەکە دوور خستەوە، سرتوخورت دەچپێنێ بەگوێیدا، دەبێ باسەکەی ماڵی کوێخا بێ.

ئێوارەیە. ماڵی مام حەسەن وەخۆکەوتوون، ژن و پیاویان سەریان جەنجاڵە، ئەحمەد بە نێو دێدا دەگەڕێ! ماڵی کەیخوداکان یەک بە یەک دەچێ!

پوورەگوڵە لەوگەڕان و ماڵ بە ماڵەی ئەحمەد ئاگادارە، یەک دوو جار ئەحمەد بە لایدا تێپەڕی، بەلام پوورەگوڵە خۆی لەو داراتە نەدا، ئەنەهوو هیچ نازانێ.

تەنگی نوێژی شێوانە. نوێژ بە جەماعەت خوێنراوە. مام حەسەن لەگەڵ تاقمێ کەیخودا و مەلا لە مزگەوتەوە بەرەو ماڵی خۆیان دەڕۆنەوە، کەیخوداکانی کانی‌توو بۆ شێو لە ماڵی مام حەسەن کۆوە بوون، شەوێ بڕیارە بچنە ماڵی حاجی، داوای مینا دەکەن بۆ ئەحمەد.

وەختی شێوە. دەستەیەک کوڕە جەحێڵەی نێو دێ هاتوونەتە یاریدەی ئەحمەد و لە دانانی شێودا یارمەتی دەدەن. لە لایەک خەمبارن، لە لایەک بە کەیف و شادن، کەیف سازن بۆ ئەوە ئەحمەد و مینا بەیەک براون وهیوای داوە بەوان بە مرادی دڵیان دەگەن. خەمبارن بۆ ئەوە حەمە دەربەدەر بووە ولەگەڵ کەوێ پێک نەبراون و ئەوانیش بە مراد ناگەن.

کەوڵ ڕاخراوە، دەستەوارە نـان نـردوو نـردوو ودەسـت بەدەسـت دەڕواتـە دیوەخان، چێشت مەجموعە مەجموعە دەچێتە ژوور و بە دوو کەس قاپـێ، قـاپی مەلا بە جیاوازە.

جەنگەی شێو خواردنە، هەموو بێ قسە و باس پـاروو بـادەدەن. لـە ناکـاو لـە دەرکەی حەوشەیان دا. هەموو چاوی پرسیاریان بڕییە یەک؟

ئەحمەد بە دەنگی تەقـەوە چـووە بـەر دەرگـا، دەرکـی کـردەوە، بـە سـەر سووڕمانەوە گوتی:

ـ فەرموو پووریگیان! خێرە بەو شەوە؟

ـ خێر دەبێ، نەعلەت لە شەڕ، کارم بە بابتە.

ـ میوانمان هەیە کارەکەت چییە؟ بە من ناکرێ؟

ـ دەزانم میوانتان هەیە، مەبارەکت بێ، منیش سەبارەت بەوە هاتووم، شـێویان نەخواردووە؟

ـ ئەوە شێو دەخۆن، فەرموو وەرە ژووری.

ـ باشە، من دەچمە دیوی ژنان؛ شێو خورا، پێم بڵێ، پێم خۆشە لای ئەو خەڵکە پێی بڵێم.

شێو خوراوە، نیعمەت بە زیاد بێ. ئەحمەد چووە دیوی پیـاوان، لـە دەرگـاوە گوتی:

ـ بابە! پوورەگوڵە هاتووە، دەڵێ کارم بە مام حەسەن و کەیخوداکانە.

کەیخودا و مەلا بە سەرسووڕمانەوە چاو لە یەک دەکەن! هاتنی پوورەگوڵە بۆ هەموو جێی پرسیار و مەترسییە! مەلا لە هەموویان پتر دەترسێ.

مام حەسەن گوتی:

ـ لە کوێیە؟ ئەی بۆ نەهاتە ژووری؟

ـ ئەو دەم ئێوە نانتان دەخوارد، خۆی گوتی دەچمە دیوی ژنان تـا پیاوەکـان شێو دەخۆن، شێو خورا پێم بڵێ، گوتم هەواڵت دەمێ، پێی بڵێم بێ؟

ـ ئەرێ، بڵێ بێ.

پوورەگوڵە چووە دیوی پیاوان، ڕوو گرژ و لێو بە بارە، نێو چاوانی کـرێوەی لێ دەبارێ.

دەڵێی شەڕی بەدەستەوەیە! دانیشتووانی دیوەخان هەموو لە خۆ دووشکن و لە دڵەوە لە خۆ دەپرسن:

ـ بڵێی چ روویدابێ؟ خۆ من هیچ تاوانێکم نەکردووە! ئەی بڵێی بۆ کێ لارەوە بێ؟ پوورەگوڵە توندوتیژ سلاوی کرد و پەڕییە نێو پیاوان.

بە مەلا و کەیخوداوە قرچە پێ هەستان، یەک دەنگ گوتیان:

ـ فەرموو پورێگیان! فەرموو وەرە سەرێ.

یەک بە یەک بە خێریان هێنا. دواى ئەحوالپرسی و سەبا خێـری، پوورەگوڵـە گوتی: ـ مام حەسەن! کەیخوداکان! هەموو دەزانن حەمە خۆم گـەورەم کـردووە، دارونەداری لای منە، ئێستا هەموو دەزانن ئاوارە و دەربەدەرە، خۆشتان من دەناسن، ناترسێم، من لە کەسی ناشارمەوە، دوێشەو چوومە لای حەمە و چاوم پێی کـەوت، حەز دەکەن ئێستا برۆن بۆ هەمزەبەگی بگێڕنەوە. حەمە شەست تەغار گـەنمی لـە چاڵـدایە، دووسـەدوپەنجاتمـەن پوولـی لای منـە، وەسـیەتی کـردووە پـووڵ و گەنمەکەی بدەم بە ئەحمەدی مام حەسەن، ئێوە هەموو شاهید بن من بەیانی گـەنم و پوولی دەدەم بەماڵی مام حەسەن، هەر دەم خۆی هاتـەوەو داوای کـرد دەبـێ بیدەنەوە، گەنم بە گەنم و پووڵ بە پووڵ، بەیانی پیاو بنێرە چاڵی خۆت دەربێنە و پوولی خۆت وەرگرە، لە ئێستاوە ماڵی تۆن.

کەیخوداکان هەموو ڕەحمەت بووی دایک و بابی پوورەگوڵـە دەکـەن، مـام حەسەن گەنم و پوولی قەبووڵ کرد، بە شاهێدی ئەو شاهێدانە هەر دەمایەکی حەمە داوای بکا، شەست تەغار گەنم و دووسەدوپەنجا تمەن پوولی بداتەوە. ئەحمەد بـە گریانەوە دەرپەڕییە دەرێ و لە حەوشە دەرچوو.

## ٢١

شەو لەوپەڕی تاریکیدا قەلای مێردانە و گەلێ ئاواتی تێدا بەدیدێ.

شەوە. لە سەر ترووپکی حەوتەوانەوە شەوقی چرای ئاوایی کانییە کوێرە کز و کەم تەوژم سۆلەی دێ، لە گوێن بەشێ لە ئاسمان رووخابێتە خوارێ و ئەستێرە لەو خڕودۆلە خزیبێ، یان مێگەلە مەڕی پەچەیە و لە بەر شەوقی چرا چاویان شەوق ئەداتەوە، زریوە زریویانە.

لە سەر دوندی کێو، حەوت تاپۆ داوەڵیاندا. بێ هەست و خوست، چەشنی ماری شەوگەڕ لە تەلان و هەلدێر، بێ سەرەنگرێ خوشینە خوارێ، بەرەو کانییە کوێرە دێن.

تاهیر پێشڕەوە. سارۆ و مینە و رەشۆ و نامیق و قادر و کاوە بە دووی یەکدا ریچکەیان بەستووە. لە شاخ و هەلدێر هاتوونە خوارێ و گەیبونە دەوری دێ. تاهیر لە پێشەوە لارێ بوو، بە ئاماژەی دەست سارۆێ تێگەیاند برِوا. سارۆ رێی گرتە بەر.

کاوە دوا کەسە، گەیشت بە تاهیر. تاهیر سەبرێ گوتی:

ـ کاوە! تۆ بەلەدی دێی، وە پێش کەوە، روو لە مالی کوێخا شەریف کە، دەچینە ئەوێ، پاشان دوو بە دوو دەچینە مالی بابت، وا برۆ کەس نەمانبینێ، ئاشکرا بوونمان هۆی ژانە سەرە، راکە، خۆ بگەیێنە پێشێ.

کاوە بێ قسە و باس، بە تەکان خۆی گەیاندە پێشێ. حەوت چەکدار لە پشت مالانەوە چوونە نێو دێ و سەگەلی ئاوایی پێیانی زانی.

سەگوەڕ هەر دێ و پەرە دەستێنێ. مەحموود شوان لە مال دەرپەڕی. گوێی بۆ شێوەی سەگەوەر هەلخستووە. لە دلەوە خۆ دەدوێنێ:

ـ لەوە دەچێ غەوارە لە دێدا بێ! بلێی ئەوان بن؟! خۆ هێندە نییە هەوالی هەلاتنی حەمەمان بۆ ناردوون!

دوو شک، وردە وردە و بە پارێزەوە بە کۆڵاندا تێهەڵگەڕا، رووە و پشت ماڵان. لە تەنگە بەری کۆڵان هەستی بەخشپەی پێ کرد، سەرنجی لە تاریکایی تیژ کرد، تارمایی چەند کەس بە حاڵ هاتنە بەر چاو، بە ئەسپایی دەنگی دان:

ـ کێن کوڕە؟

کاوە لە پێشەوە زوو دەنگی مەحموود شوانی ناسییەوە:

ـ بابەگیان! ئیمەین، هەڕای کردێ و بابی لە ئامێز گرت.

تاهیر لە دواوە دەنگی مەحموود شوانی گوێ لێبوو، باویدا بە پێی، دڕی بە دەستەدا و خۆی گەیاندە پێشێ:

ـ وەدیارە گوڕت تێدا ماوە پیرە! وەمزانی لێکەوتووی.

مەحموود شوان دەستی لەئەستۆی کاوە کردەوە و بە ئامێزی ئاواڵەوە بەرەو تاهیر هەنگاوی هەڵێنا:

ـ ئێستاش کێوا و کێو لەگەڵت دەڕۆم. بە هیوا نەبووم وا زوو بگەنێ! یا خوا بە خێر بێن.

یەکە یەکە، بە ریز ماچی کردن. گەڕاوە سەر تاهیر:

ـ دەی، فەرموون.

ـ کوێخا شەریف لە ماڵە؟

ـ لە ماڵە، ئێوارە دیتم، وەرن، خۆم دەچم لە دووی.

ـ نا، خۆمان دەچین، حەوت کەسین، ماڵی ئێوە هێندێ بەر تەنگە، ئەو کوڕانە ماندوون، دوو سێ شەوە بەڕێوەن، دەبێ بحەسێنەوە، من و کاوە دێینە ئەوێ. تاهیر رووی لە کاوە کرد:

ـ کاوە! وە پێشکەوە.

هەشت کەس بە کۆڵاندا وەڕێکەوتن. سەگەل لە گوێسوانەوە لەوانەیە بپەڕنە کۆلیان. لە دەرکی ماڵانەوە خەڵک سەر دەکێشنە دەرێ و ملە تاتکێیانە، بێ ئەوەی خۆ ئاشکرا کەن، دەرگا پێوە ئەدەن و وەک وشتری‌نێو پەموو چاو دەقووچێنن و خۆ گێل دەکەن، ئەنەهوو کەسیان نەدیوە.

دەستە بە بەر گەڕەکا گەیینە بەر ماڵی کوێخا. لە سەر بانیشەوە کەسێ دەنگی دان. مەحموود شوان دەنگی کوێخا شەریفی ناسی، سەبرێ جوابیداوە:

ـ ئەو سەرە بۆ چووی؟ وەرە خوارێ، میوانت هاتوون.
ـ میوان؟ کێن ؟
ـ حەز دەکەی کێ بن؟ خۆ گێل مەکە، یانی تۆ نازانی؟!
کوێخا بێ دەنگە، بیر دەکاتەوە.
مەحموود شوان لە دڵەوە دەڵێ:
ـ رەنگە بترسێ! ئەی جەرگت خرابێ خوێڕی، حەمە چاکی ناسی، ئەقڵ بە گەورەیی و چکۆلەیی نییە، دەنگی هەڵێنا:
ـ کاک تاهیر و ئەوانن، دەرکە دەکەیەوە، یان بڕۆین؟
کوێخا بە پەشوکاوییەوە جوابیداوە:
ـ ئا ئا،ئەوە هاتم، ئەوە دێم، ئەوە هاتم، هاتم، بەخێربێن، بەخێربێن.
دەرگا کراوە و هەموو چوونە حەوشە. کوێخا لە تاهیرەوە یەک بە یەک ماچی کردن، تەنانەت مەحمود شوانیش، گەڕاوە سەر تاهیر، دەستی گرتوو بەرەو دیوەخان کێشای:
ـ فەرموون.
ـ نا کاک شەریف، من و کاوە دەچینە ماڵی خاڵە، لە بەر دڵی دایکی کاوە دەچینە ئەوێ، پاشان دێمەوە.
رووی وەرسووڕان، چاو بۆ مینە دەگێڕێ، بانگی دەکا:
ـ مینە! من و کاوە دەڕۆین، تۆ بەرپرسی، نێوی شەو هەڵۆیە، کێشک دابنێ، یەکەم کەس قادر دانێ، من بخە ئاخر، ئەوانی دیش کەیفی خۆتە.
مەحموود شوان بە پەلە گوتی:
ـ من لە بری کاوە دانێن، دوای قادرم، کوێخای بانگ کرد، سرتاندی بە گوێیدا، دەستی گرت و لەوانی دوور خستەوە:
ـ ئەوانە ماندوون، من و تۆ لە ئاوایی خەوتنەوە دەچینە سەربان و کەس هەڵناستێنین، با ئەوان بنوون، تاقەت دێنی؟
ـ ئائا، وەک تۆم پێ ناکرێ؟ ئەوە هیچ نییە. خاڵە! خۆ کەس نەیدیون؟!
ـ نا نا، روبەروو کەس نەیدیون؛ مەگەر، چووزانم، دیبێتیشیان، کەس نازانێ ئەوانە کێن، نیگەرانی ئەوەی مەبە، بۆ نیگەرانی؟ خۆ تۆ جاران وا نەبووی، دەترسێی؟

ـ کێ؟ من؟ من و ترس؟ حەیە حەی!!

مەحموود شوان رووی وەرسوڕاند، لە تاریکیدا سەری راوەشاند و بەرەو تاهیر و کاوە گەڕاوە کوێخا ئەو سەر راوەشاندنەی نەدی.

لەو دەمەیڕا مەحموود شوان بە دەنگی سەگوەڕەوە لە ماڵ وەدەرکەوتووە، کابان و دایکی لە بەر دەرگای حەوشە شین بوون، ماوەیەکە سەگەل بێ دەنگن و نێو دێ دەڵێی ئاشە وئاوی کەوتووە.

خات نزاکەت دڵی وەقرتوفرت کەوتووە! دەڵێی هەواڵێکی بە نهێنی دراوەتێ! دوو دڵ رووی لە کابان کرد:

کچەکێ! دڵم حەجمانی لێ بڕیوم! دەڵێی هەواڵێکی خۆشم پێ دەدرێ. خۆشم نازانم چییە! دوێشەو تا رۆژ لەگەڵ کاکت بووم! ئەم بەیانییە کە هەویرم دەشێلا، دووسێ جار هەویرەکە پەڕی! لە نێوڕۆوە هەر چاوم دەفڕێ! قشقەرەکەش هەر دەیقڕاند! یا خوا خۆش خەبەر بێ. ئەو کابرایەش نەهاتەوە، بابت دەڵێم.

کابان وەک وڕێنە گوتی:

ـ دایە! تۆ شێوەی کاکمت لە بیر ماوە؟ بە خودای سێ ساڵە، لەو دەمەیڕا کە رۆیوە، بە خەونیش نەمدیوە، هەرچی زۆر بۆ مێشکم دێنم، شێوەیم نایێتەوە بیر. دایە، دایە! ئەوە سێ کەس بەرەو ئێرە دێن.

ـ کوان؟

ـ ها ها، لەو بنە دیوارەوە دێن، وەرە بڕۆینە ژوورێ.

کابان خۆی دانەواند، سەری کرد بە نێو دەرگا نەوییەکەی حەوشەدا و دەنگی کۆخەی بابی سەری پێ گێڕایەوە دەرێ.

مەحموود شوان خووی خێزانی دەزانی، دەزانێ کاوە ببینێ دەیکاتە هاتوهاوار و خەڵکی وەسەر دەگێڕێ، لە دوورەوە دەنگی لێ گڕ کرد:

ـ ئەوە بەو شەوە لە دەرێ چ دەکەن ژنەتیوە؟ بڕۆن، بڕۆنە ژوورێ، دەی یاڵلا!

نرکەی دەنگی هێند دلێرانە هات، نزاکەت وکابان خۆیان لە بەر نەگرت، بە جووت خۆیان کرد بە حەوشەدا.

تاهیر و کاوە لە حەوشەن. مەحموود شوان رەنگ پەڕیو و کەیف ساز چووە ژوورێ.

خێزانی لە ڕواڵەتی گەییوە:

ـ چ بووە پیاوەکە؟! ئەو سەگوەڕە چ بوو؟ ئەو دوو کەسە کێ بوون لەگەڵت؟ بۆ هێندە تووڕە بووی؟ ڕەنگت گۆڕاوە! تو خودا چییە؟

ـ هیچ، هیچ، هیچ نییە ژنەکە، کاک تاهیرهاتووە.

نزاکەت لە جێ ڕاپەڕی، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ کوا؟! لە کوێیە؟ کاوەی لەگەڵە؟ خۆ ئەمجار قەولیدا، ئەگەر بێتەوە کاوەش لەگەڵ خۆی بێنێتەوە، درۆی لەگەڵ کردم؟

ـ دەنگ هەڵمەبڕە ئافرەت، خەڵکمان تێ مەگەیێنە، فەرقیان چییە؟ ئەوانیش هەر کاوەن، هەواڵی ساخی و سلامەتی ئەویان پێیە، ئەویش ئەمڕۆ دێتەوە، ئەگەر بێتەوە چی؟ وا هەیە لێمان نەکەیە هەڵلا؟

ـ ئەشا ئەو پیاوە! بۆ من منداڵم؟ بە گەوجم دەزانی؟

ـ نا، بە گەوجت نازانم، بە دەم دڕاوت دەزانم، دەترسم بیبینی و لە هاواری بدەی،دەزانی بزانن کاوە لەگەڵ ئەوانە چمان بە سەر دێنن، بە سەر وماڵەوە تێدا دەچین، سەر و ماڵییە ئافرەت، سەر و ماڵی، دەبێ زۆر لەسەرەخۆ بی، دێتەوە، لەوانەیە ئەمشەو سەر هەڵدا.

نزاکەت وەک شێت نووسا بە بەرۆکی شووەکەیدا و ڕایوەشاند:

ـ تۆ خودا بە ڕاستیتە پیاوەکە؟ خودا دەکا ئەو دێتەوە، بە خودای هیچ نالێم، ئەی کاک تاهیر لە کوێیە، کوا؟ بۆ نەهات؟

ـ ئەوەتام خات نزاکەت، ئەوەتام، وەرە کاوە، وەرە ژووری.

کاوە بە دووی تاهیر دا هات. کابان بەر لە دایکی ڕاپەڕی و کاوەی لە ئامێز گرت.

دایکی بەرەو تاهیر چوو و ئەوی گرتە باوش.

ماوەیەکە نزاکەت دەستی لە ئەستۆی تاهیر کردۆتەوە، تەمادارە کابان کاوە بەردا. خوشک و برا بە چەشنێ تێک هاڵاون دەڵێی گیانێکن و لە یەک جەستەدان! بێ قسە و جووڵانەوە، سەریان ناوە بە شانی یەکەوە و پێلووی چاویان لە سەر یەک داناوە و خوڕ خوڕ ئەسرین دەبارێنن.

دایکیان وەک دەروێش جەزبە گرتوویە! لە جێوە هەڵدەبەزێ، ددانی وەددان ناگا، دەڵێی نەخۆشی دم پاوە چەق هەڵیدەچۆقێنێ! پەنجە تێکهەڵدەپێکێ و هەڵیاندەگولۆفێ،

لە خۆ دەنووسێ، خۆ دەکێشێتەوە. کووڕ کووڕ دەبێ، ڕاست ڕاست دەبێتەوە. ئەمپێ و ئەو پێ دەکا، پێ لە ئەرز دەگوتێ، دەڵێی میزە چورتییەتی!! بابیان بە زار پێدەکەنێ و بە چاو دەگری و تێیان ڕاماوە. تاهیر هەر تاوێ سەرنجی یەکیان ئەدا، دەڵێی ئەویش دڵی پڕە! ڕووی وەرگێڕا و چووە دەرێ.

قەنەکێشیکە تاهیر لە حەوشە دێت و دەچێ. خەیالاوی لە سەر بەردەخوێی ناوەڕاستی حەوشە دانیشت. قۆنداخی بڕنووی لە نێوان هەر دوو پێی دانا و لوولەی نا بە شانییەوە ونێو چاوانی نایە سەر دەستە تێک هەڵپێکراوەکانی و چووە ناو دەریای خەیاڵەوە.

زۆر، یان کەم، خۆشی نازانێ لە کەنگێوە ئەسپی خەیاڵ هەڵیگرتووە. لە ناکاو هەستی کرد دەستێ شانی دەگوشێ، دەستی مەحموود شوان چووە ژێر باڵی و لە سەر بەردەکە هەڵیساند و بردییە ژوورێ.

کاوە لە نێوان دایکی و خوشکی دانیشتووە، دەستی لەئەستۆیان بووە بە هەڵقە و هەر جارێ یەکیان ماچ دەکا. سەری تاهیر لەدەرگا وە دەرکەوت، هەر سێ لە جێ ڕاپەڕین.

مەحموود شوان بە ئاماژەی چاو لەگەڵ کابان دەدوێ.

کابان لە بابی حالییە. خۆی باریک کردەوە و چووە تەویلە. پاش هێندێ قیژە لە کولانە مریشکەوە هەستا و بە قیرە قیر بارۆکەیەکی چیتینی هێنایە دەرێ، لە دەرگای تەویلە چاو لە بابی دەکا.

مەحموود شوان دەستی لە گیرفان ڕۆ کرد، چەقۆیەکی دەسک شاخی ڕەشی دەرهێنا و بەرەو کابان توڕی هەڵدا.

کابان دەم بە بزەوە داهاتە چەقۆ و چووە حەوشە. دەنگی بارۆکە هەر دێتە گوێ.

دەنگی گۆڕا، قیڕەی وەک هاوارێ دەچێ، لە پڕ لەوەش کەوت.

هەموو خوێنڕێژێ خوێنی تالە و نێو چاوانی گرژە، کابان بە چەقۆی خوێناوی و لاشە و سەری بڕاوی بارۆکە وەدەم بە بزە و ڕەزاسووک هاتەوە ژوورێ و کەلاکی لای کوانووەکەوە ڕاکێشا و چەقۆی خوێناوی لە سەر دانا، خەریکی کوانوو کردنەوەیە. کوانووگری گرت. بارۆکە تا هێندێ لەوە بەر بەدەست مەرگەوە پەلە قاژێ و قیرەقیری بوو، ئێستا ئاوەڕووت کراوە و لە نێو ڕۆن و تاوەدا هەڵدەقرچێ و بۆنی ماڵەکەی پڕ کردووە و کۆلان و کۆلان بە گەڕەکدا بلاو بۆتەوە.

کاوه دایکی له بەرەجێیەکی کورسییەکەوە دانیشتوون و سەریان ناوە بە یەکەوە و بە تامەزرۆیی قسە دەکەن.

لە بەرەجێی سەرەوە، تاهیر و مەحموود شوان ئانیشکیان لـە سـەر پاڵپـشت داداوە و دەستیان کردووە بە کۆلەکەی سەریان، پچ و هۆڕ مەحموود شوان دەپچێنێ بـە گـوێی تاهیر دا:

ـ خاڵە بە قوربانت بێ، ئەو لێدانەی حەمە لە عەتای دا، ،عەرەب لە حوشتری نـەداوە. ئێستا لە نەخۆشخانەی شار کەوتووە و مەعلووم نییە چی بە سەر دێ؛ ئەوە هـیچ، شـەوێ پەیدا بوو و گوتی: خاڵە! دەمەوێ کەوێ هەڵگرم، جێم دەوێ، دەی باشە، جێم لە شار، لە ماڵی حاجی بۆ ساز کرد.ئەو شەوەی قەرار بوو بیهێنێ، من لە دەوری شار چاوەڕێی بووم، تا رۆژ لە سەر رێ قەتیس و پڕ بووم و بابم هاتە بەر چاوم، ئەو هـەر نـەبوو. هاتمـەوە، خەبەر بڵاوە بۆوە حەمە گیراوە، ئەی خودا، ئەو شەوە مردووی قەبرستان سـرەوت، مـن نەسرەوتم. ئەوەش هیچ؛ شەوێ دواتر قـاو کەوتـە وڵات، حەمـە لـە کونەڕەشـی قـەڵا هەڵاتووە. خۆشی گوتم دێ بۆ ئێرە، سێ چوار شەو چاوەڕێی بووم، پێیەکـم لـەدەرێ و یەکم لە ژووری، ئەو ون بوونەی ونبوو، ئێستا و ئێستاش نەمدیتەوە، دەڵێی قەترە ئاوێک بوو بە ئەرزدا چووەتە خواری، دەڵێم نەکا بەڵا یەکی بە سەر خۆی هێنابێ! ئاخر کـەوێیان لە عەتا مارە کرد، تۆ دەڵێی چی؟

ـ نا، حەمە کاری وا ناکا خاڵە، بڵێی بەڵا یەکیان بە سەر نەهێنابێ و بۆ شوێنە گومکێ نەیانگوتبێ هەڵاتووە؟ کێ ئەوی دیوە؟ چوویە لای پوورەگوڵە و عەبە؟

ـ نەوەڵڵا، هیچیان بۆ ئەوەی نابن، عەبە شێت و گوڵە شێت؟ حەیە حەی!

ـ ئەوە بەڕاستە خاڵە؟! چۆن دڵت دێ بەوانە دەڵێی شـێت؟ خۆزگـە هـەمووکـەس وەک ئەوان دەبوون، خۆم بەیانی دەچمە ئەوبەر و هەواڵی بە دەست دێنم، لەوێ گەڕێ، هەواڵی دێ چییە؟ ئەمنییە و مەمنییە واوە نەهاتوون؟ کەس نەگیراوە؟

ـ کەس نەگیراوە، چەند رۆژ لەمەوبەر، ئەو رۆژەی حەمە هەڵاتبوو، هەمزەبەگ پیاو وەدووی حەمە دەخا بیدۆزنەوە، دەگەنە هەزار ئەشکەوت، دەکەونە بەر دەسڕێژی چەتە، دەستبە جێ سەعیدی نۆکەری رەشید خـانی بـڕۆێ دەکـوژرێ و رەسوولـی نۆکـەری هەمزەبەگ بە برینداری هەڵدێ. هەر ئەو رۆژە تەرمی سەعید دەبەنەوە بۆ بڕۆێ، شەو بە

سەر دا دێ، چەتەکان دێنە سەر خە ڵکی تازاوا، ئەوەی بەر دەست دێ، لە پووڵ و مت و مووررووی قیمەتی دەیبەن و دەڕۆن.

تاهیر مات بیر دەکاتەوە:

ــ چوو بوونە قەلا؟

ــ نا، ئەوێ نەچوو بوون.

ــ درۆیە! چەتە نەبووە! کاری خۆیانە، داخوا سەعید بەر هەڵسیان وەستاوە! چەتەبان دەچوونە قەلا، چەتە بۆجەستەی ئاغاوات چەتەیە، هەر چەتەیەک نەچووە سەر ئاغا، ئەو چەتەیە ئاغایە؛ دەردەکەوێ، بەیانی ئەوەش روون دەکەمەوە.

خانە خوێ کەیفی لە خانە خوێی بێ، میوانی درەنگ وەخت گلەیی خۆی لە سەر خۆی نابێ کابان کەوڵی نانی لە سەر کورسی راخست و مریشکی سوورەوە بووی لەسەر دانا و خۆی دووررەپەرێز وێستا و چاوی بڕییە کاکی. شێوەی جارانی هاتەوە بیر! جاران، بەر لە رویشتنی، کز و تیشکەڵە بوو، ئێستا خۆی دارِشتووە، قەوی و قوڵ و لە سەر یەک دیارە، هەر دەڵێی کاوەکەی جارانیش نییە، کابان بە دەنگی بابی لە جێ راپەڕی:

ــ کابان، ئاوی سارد، کترییەکەت وەسەر ناوە؟

ــ بەڵێ، ئەوە دەکوڵێ.

کابان چووە دەرێ و بە گۆزەڵە ئاوەوە هاتەوە.

شەو درەنگە، ئاوایی خەوتنە. شێو خوراوە و چا بە شوێن شێودا خوراوە. تاهیر هەستا، رووی لە کاوەیە:

ــ ئەمشەو لە ماڵێ بە، ئەگەر حەز دەکەی بەیانیش مەیە، لەو سەر گەڕاینەوە دێمە دووت.

کاوە گرژ بوو:

ــ بۆ نەیێم؟ ئەگەر ئێستا نەیێم، بەیانی بە جێم مەهێڵە، خۆم وەدووتان دەکەوم.

ــ باشە، ئەمشەو لای دایکت بە، بەیانی دێمە دووت.

دوو تاپۆ لەبەر گەڕەکەوە، بن دیوار و دیوار بەرەو ماڵی کوێخا هەر دێن و نزیک دەبنەوە.

قادر لە سەربانەوە چۆکی دادا. خڕەی چەخماخی برنوو و نرکەی پیاوانەی یەکیان گرت:

ـ کوڕە کێن؟

ـ هەڵۆ. قادر! لە سەربانەوە بانگیان کە دەرگا بکەنەوە.

قادر تاهیری ناسییەوە، لە کولاوکەوە حاڵیکردن. مینە نەیهێشت کوێخا بچێ. دەرپەڕییە دەرێ، دەرگای کردەوە، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ چ بووە!

ـ کورە خۆ بە قسە هیچی نەهێشتۆتەوە! دەبێ تۆ ئاوی بە دەستداکەی، کوڕە خۆ مێشکی خواردین،وەرە خۆت جوابی بدەوە.

مەحموود شوان گوتی:

ـ ئەوە ئێوە نایناسن! راوەستێ، دەبێ تەمبێی کەم، لای من لالە، هەر لە حەوشەوە بانگی کوێخای کرد:

ـ کوێخا! نەنووستووی؟

کوێخا پێخاوس سەری لە دەرکەوە دەرهێنا:

ـ پیرە! تۆ نەنووی، من چۆن دەنووم؟ وەرنە ژوورێ وەرن.

ـ وەرە دەرێ وەرە، ئەو پیاوانە ماندوون، لێیان گەڕێ با پشوویەک بدەن، وەرە بڕۆینە سەربان.

کوێخا ئاوڕێکی داوە و چاوێکی لەوانی ژوورێ کرد، کەسێ نەبوو رووی خۆش بێ، نەبەدلانە کەوشی لە پێ کرد و هاتە دەرێ. دوو کێشکچی بێ چەک چوونە سەربان.

شەو لە نیوە لایداوە و زرینگاوەتەوە، ولات چۆڵ و بێ دەنگە. بایەکی سارد و گورچوو بڕ هەڵیکردووەتێ و کوێخا شەریفی کردووە بە ژێی کەوان و لە بن گیشە گیا هەڵیتووتاندووە. خەو و سەرمایەکیان گرتووە و برستیان لێ بڕیوە.

خالە چوست و چالاک بە گوێسوانا دێت و دەچێ، کۆلان و دەوروبەری دێی خستۆتە ژێر چاوە دێری و نازانێ خەو و سەرما چییە.

لە مێژە کوێخا هەست و خوستی نییە، وەک سیالە کۆنێ لە بن گیشە گیادا رەش دەکاتەوە. خالە رووی تێکرد، سەبرێ گوتی:

ـ کوێخا! کوێخا! ئەوە نووستووی؟ مەنوو، سەرما دەشکێتە گیانت.

ـ ئەی چ بکەم؟ بە خودای ئەوە لە سەرمان شێت دەبم، ئەوندەشم خەو دێ ئەوە کوێر دەبم، تۆ سەرمات نییە؟

ـ نەوەللا، هەستە بگەڕێ، بگەڕێی سارد نییە.

ـ ناتوانم، وەختە لە سەرمان تۆق بکەم.

ـ دە هەستە بڕۆ خوارێ.

ـ ئا! بە راستیتە؟ وەللا نۆکەریت دەکەم، بڕۆم؟

ـ ئا ئا بڕۆ، بوون و نەبوونت فەرقی چییە؟ بڕۆ، بەلام ئەوان وەخەبەر مەهێنە، بچۆ لای ژن و منداڵت.

کوێخا کیفە کیف و کوورە کوور لە بن گیشە هاتە دەرێ، لە سەربان چووە خوارێ. زۆری پێ نەچوو، جیرە لە گرێژەنەی دەرگاوە هەستا و تەپەی پێوەدانی گەیشتە سەربان.

شەوگاری پاییز بێ کۆتایە و نابڕێتەوە. لەو دەمەوە خالە هاتۆتە سەربان، بێ وێستان و پشوودان دێت و دەچێ و پێی بەر خۆی نەداوە، ئەژنۆی شل و پێلووی چاوی قورسن. هێندێ هەلترووشکا. سەرما و وەنەوز زۆری بۆ هێنا، غیرەت بە سەر سەرما و خەودا زالبوو و راپەڕاند و خستییەوە سەر رەوتی رۆینی خۆی.

ماوەیەکی زۆرە دێت و دەچێ. چاوێ لە ئاسمان دەکا. کۆ و تەرازوو لە ئاوا بوونە، کاروان کوژە بەرزە، نزیکە و تلووعە، مانگ وەک لەتە داسێکی دەمپان لە سەر مالانە. ئەوەڵ کەلەباب هیچ، دووهەم کە خوێندی، لە سەربان چووە خوارێ، بە پەلە تاهیری هەستان و گورجێ وەسەرکەوتەوە.

تاهیر لە جێ دەپەڕی، فیشەکدانی لە خۆی بەست و دەستی دایە تفەنگ و چووە حەوشە:

ـ مینە! مینە! وەرە خوارێ، ئەوە هاتم

خالە لە گوێسوانەوە سەبرێ گوتی:

ـ مەحموودم؛ مینە نووستووە، هەلیانسینە، درەنگە.

تاهیر بێ قسە و باس گەراوە ژوورێ، یەک بە یەک هەلیساندن، دەستی لە هەر کامیانەوە دەنا، وا رادەپەڕین بچنە سەر کێشک.

تاهیر گڕی لامپای هەلکێشا، بە بزەوە گوتی:

ـ وا دیاره ئەمشەو، قادر نەبێ، کەس نەچووەتە سەربان! منیش وەک ئێـوە نـەچووم. خالە مەحموود و کوێخا کێشک بوون، فێڵیان لێ کردووین، کەسـیان هـەڵنەسـاندووە. خۆکۆکەنەوە، شەوی زۆر نەماوە.

هەموو لە جێ دەرپەڕین، فیشەکدان و کۆلەپشتیان لـە خـۆ بەسـت، دەسـتیان دایـە تفەنگ، یەک یەک و دوو دوو هاتنە حەوشە، تـاهیر دواکـەس بـوو. ڕووەو سـەربـان سەبری بانگی کرد:

ـ خالە! کاک شەریف! وەرنە خوارێ، ئێمە سازین.

مەحموود شوان هاتە خوارێ.

تاهیر چاوی لە گوێـسوانە، چاوەڕێیە کوێخا بێتە خوارێ:

ـ خالە! کوا کوێخا؟

ـ کوێخای چی؟ حەح؟ ڕەنگە چاوەڕێ بی بێتە خوارێ؟ کوڕە هەر ئێـوارێ لەوانـە بوو لە سەرمان ڕەق هەڵێ، ناردمە خوارێ و نووست، هەڵیـسێنم؟

ـ ماڵتە تۆ بۆئێمەت هەڵنەساند؟ بە تەنیا چۆن دەبێ؟

ـ بۆ نابێ؟ ئەوە نییە بووە؟ لەوێ گەڕێ، هەڵیسێنم؟

ـ ئا ئا، ئەو هەستێنە و بڕۆ کاوەشمان بۆ هەستێنە، لەوە دەچێ درەنگ بێ.

خالە چووە بەر دەرکی دیو و سەبر سەبر لێیدا.

کوێخا ژن جوابیداوە:

ـ کێیە؟

ـ براژن! منم، مەحموود شوان، کاکم هەستێنە، ئەو پیاوانە دەڕۆن.

خالە ئەوەی گوت و لە حەوشە چووە دەرێ.

کوێخا شەریف بە باوێشکەوە دەرگای کردەوە، هێشتا سەرمای سەربـانی لـە لەشـدا ماوە و لە قەڵافەتی بەدیدەکرێ، لە جاران وێکهاتووتر دێتە بەر چاو. چـاو خـەوالـوو و شەکەت خۆیکێشاوە:

ـ ئەوە چ دەکەن؟ بەو شەوە خۆ دەرکراو نین؟! هێـشتا دوو قـسەمـان نـەکردووە؟

تاهیر جوابی داوە:

ـ هەڵیگرە بۆ جارێکی دیکە. ئێستا بە پەلەیـن، بـڕۆ هێنـدێ نـان و پێخـۆر بێنـە و ماڵاواییمان بۆ لە براژن بکە، زۆرمان ئازار داوە.

ـ بە سەر چاو، ئێمە ساحێب ماڵ نین، لە گەڕانەوە سەرمان بدەن، پێی گەورە دەبم، گەورەتان کردم، خێزان قەرەواشە وخۆم نۆکەر.

پاش ماوەیەک کوێخا بە چارەکە نانەوە هاتە دەرێ. سارۆ نانی لێ وەرگرت. تاهیر لە پێشەوە و ئەوانی دی بە دوویدا و کوێخا لە دوای هەموویانەوە، لە حەوشە چوونە دەرێ.

خالە وکاوە بەرەو روویان هاتن. کوێخا و مەحموود شوان تا ئەو لای دێ لە گەڵیان چوون. دوای یەک ماچکردن و مالاوایی، تاهیر و دەستەکەی روەو چۆڵی، خالە و کوێخا بەرەو دێ لە یەک جوێ بوونەوە.

ئەستێرەکەی رۆژ دوو سێ هۆگان لە کەل هاتۆتە سەر. دەنگی ئەڵلاهو ئەکبەر لە سەربانی مزگەوت هەستا. شەو لە شک دەرچووە، رۆژی پاکە.

کوێخا شەریف وەک ماری شەل لە جێدا ئەمشان و ئەوشان گێنگڵ دەدا و خەوی لێ زڕاوە! بیری جۆراوجۆر بە مێشکیدا دێ و دەڕوا و هەست و رەوانی قتیلکە دەدەن.

خێزانی لە لایەوە وە دەنگ هات:

ـ چییە؟ بۆ کێچ کەوتۆتە کەولت؟

ـ ئامین! دەزانی کەسێ ئەوانەی دیبێ هاتوونە ئیرەچمان بە سەر دێ؟! بە سەر وماڵەوە بەقوڕدا دەچین! هەر ئاغا نان بڕاوم دەکا! ئەو بەلای ناگەهانە چ بوو لە من پەیدا بوو؟ چارە چییە؟ چ کەردەن؟

ـ خەتای خۆتە، مریشک خۆی خۆڵ بە سەر خۆیدا نەکا، کەس ناتوانێ خۆڵی وەسەرکا، بۆیە رفێقی مەحموود شوان! ئەو بەرەڵلا و بێکارە چی و تۆ چی؟ ملک و ماشت نییە؟ پەزو پاتالت نییە؟ ئاغا و کوێخا هەر خۆت نیت؟ ئاخر لە چت کەمە؟ بۆ بە قسەی ئەم و ئەو دەکەی؟ هەرکەس بلێ کاسەم، تۆ کەوچکی و بە کەوچکێ ئاو دەکەوییە مەلێ! چەند جارم گوت وەدووی کلاوی لار مەکەوە؟ ئەوە وەدوی کلاوی لار کەوتنە، چوار دەم رووت کەوتوونە ئەو دەشتە و یەکی قالۆرەیەکیان لە شان کردووە و دەیانەوێ دەولەت بڕووخێنن! دەولەتی شا بەوانە دەڕووخێ؟! من لە تۆ ناگەم! بوویە سووری دووگر! خوداشت دەوێ، خورماشت دەوێ! دوو لا بە تۆ ناگیرێ، یان ئاڵبە، یان قوڵبە، من تێت ناگەم! لە لایەک چۆماخ بە دەستی ئاغای! لە لایەک

لەگەڵ ئەوانەی! کەیفی خۆتە، چ دەکەی بیکە، هەر لەو دوو چۆلەکەم بە دوور بێ، هــەر بەلا یەکت بە سەر بێ بۆ خۆت بێ.

ئامین رووی وەرگێڕا و پشتی تێکرد.

کوێخا لە جێ راستەوە بوو و دانیــشت. ملـە ئەســتوورەکەی بــەرداوە، بەرخەبەبــەی شۆڕەوە کرد و لە چەناگە قوولەکەی رەتبوو. کاکۆڵی بە نێو چاوانە پان و ســپییەکەیــدا پەریشان و تاڵ تاڵە، تا سەر برۆ رەش و پەیوەستەکانی شۆڕەوە بوون. نێوانی هــەر دوو برۆی گرتووە رێکی دەگوشێ. ماوەیەکی زۆرە بەو چەشنە، بێ تەکان بیر دەکاتەوە. لــە پڕ لە جێی دەرپەڕی! خۆی کۆ کردەوە و وەدەرکەوت.

ئامین بە دوویدا دەرپەڕی، دوور و نزیک وەدووی کەوت.

کوێخا چووە تەویلە، ئەسپە شێی دەرکێشا و هێنایە حەوشە، زیــن و لــەغاوی خــستە سەر و رایکێشایە دەرکی حەوشە.

ئامین بە پارێز و پێ پێ لێی نزیکبۆوە.

ــ بۆ کوێ؟ قەرار نەبوو ئەمڕۆ بمانبەی بۆ کانی توو؟ ماڵی مــام حەســەن شــاییانە و لێیان گێڕاوینەوە، عەیبە نەچین! خۆ هەموو رۆژێ کــابرا ژن ناهێنــێ، لــە ســالان و لــە مانگان ئەمجارەیە.

کوێخا ئاوزەنگی لە سەر زین ئەمتا و ئەوتا خــست بەمــدیو و ئــەو دیــودا، پێــی لــە ئاوزەنگی نا، چالاکانە پەڕییە پشتی ئەسپەشێ و رکێفی لێدا، بە دەم رۆینەوە ئاوڕیداوە:

ــ ئەگەر مەحمووود هات لە دووم، بڵێ ئاغا ناردبووی لە دووی و چوو بۆ تازاوا، بڵێ دەیگوت ئەو بڕوا بۆ کانی توو، ئەگەر کرا خۆم دەچم.

ئامین بۆڵە بۆڵ لەگەڵ خۆی دەدوێ:

ــ لە سالان و لە مانگان ئەمجارە خۆم لە دەسک نابوو بۆ شایی، ئەوەشم چــوو. خــودا دەزانێ بۆ کوێ دەچێ و کەنگێ دێتەوە.

تاو بان لــە گایــەک کــەوتووە. عەبــە هێنــدێ لــە جــاران کــۆک و پۆشــتەتر لــە کاولاشەکەی هاتە دەرێ. دەرگای دەرەوەی هەڵپێکا. گەلازی وەدووی خست و بــەرەو کانی تووە وەڕێ کەوت. خەیالاوی و چەواشە، بە سینە کێش و ســەرو ژووری نــساری هەزار ئەشکەوتدا وەسەردەکەوێ. خۆشی نازانێ بیر لە چی دەکاتەوە! لە پڕ گەلاز وەڕێ ودەنگێ لە پەنا بەردی قەراخ کوێرەڕێ وەک بوومە لەرزە رایتلەکاند:

ـ عەبەگیان! کاکە عەبە! منم، تاهیرم. دوو چەکداری سەر تاپا بۆر راستەوە بوون و بەرەو لای وەڕیکەوتن!

گەلاز بە وەڕینەوە هێرشی بردنێ. عەبە پەشۆکاو شپرێو لە جێ وشکبووە! بیری بۆ ناکرێتەوە! گەلاز تەپی داوەتە سەریان و کۆ ناکا.

سارۆ داهاتە خرە بەردێ. تاهیر لە خافلان و پەشۆکاوی عەبە گەییوە، دەنگیداوە:

ـ عەبەگیان! من تاهیرم، نامناسییەوە؟! بانگی سەگەکەت کە.

عەبە وەک گەشکەدار لە جێ راپەڕی و بە هاوارەوە بانگی گەلازی کرد:

ـ گەلاز نەکەی، گەلاز خۆمانەن، بێرەو، بێرەو، ئەمە خۆتی؟! لە کوێنەو پەیات بوو گولەپاییزە؟! فرە چاوم رۆشن.

بە هەلاتنەوە رووی تێکردن، تاهیری لە ئامێزگرت، پەیتا پەیتا ماچی دەکا.

تاهیر لەو کەلەگەتترە، لە باوشی کردووە و بە دەوری خۆیدا هەلیدەخولێنێ و ماچی دەکا. هەر دوو لە ماچ و مووچ ماندوو بوون، تاهیر عەبەی دانا، عەبە روویکردە سارۆ:

ـ ئەم برامە کێیە؟

ـ ئەوە رفێق و خۆشەویستی منە، سارۆیە.

ـ ئا بێرەو ماچو کەم بیم وەساقەو، چکێ خۆو دانەونە! پێو راناگەیێم.

سارۆ خۆی دانەواند و یەکیان ماچ کرد.

عەبە هێشتا نەهاتۆتەوە سەرخۆ! خەجلا و پەشۆکاو رووی لە تاهیرە:

ـ ئەمە خۆتی؟! بە خوا باوڕ ناکەم! ئێژی خەو ئەوینم! بە زات خوا ئیسە لەو حانەوە ئەهاتمە بان لە بیر تواوم، ئێژن دڵ ئایی لە دلە، راسە، دەی برا؟ بۆچە ئەونە دێر هاتیتەو؟ ئەمە های لە کوێنە؟ فرە تاسەتم کردوو، رۆژنەو لە تەک حەمە باست نەکەین، دەس شکیاوم بۆ حەمە! تۆ ژنەفتیتە لێرە رایکردیە؟ دوو شەوە جێی هێشتووم، باوەرت بوێ ئێژی کۆسم کەفتیە، ولات چۆڵ و هۆڵ! بێ کەس و ماڵ کاول هەر منم، دەی بێن برووینەو.

تاهیر دەستی خستە سەر شانی:

ـ نا عەبەگیان، وەدیارە تۆ سەفەریت، ئێستا بۆ لای تۆ دەهاتین، لە دوورەوە تۆمان دی، گوتمان نەوەک نەناسیاو بێ، چووینە پەنای ئەو بەردە، ئێستا کە تۆمان دی،

دەگەڕێینەوە، بۆ هەواڵی حەمە هاتووم، ئێستا کە تۆ دەڵێی ڕۆیشتووە، دڵم حەساوە. نەتگوت بۆ کوێ دەچی؟

ـ ئەچمە کانی توو، لەوێنە زەماوەنە، لە قەسانەی برازاوام! لە بەر دڵ حەمە ئەچم، تا ڕۆیی، دەس وە داونم و من بە جیات ئەو بچمە زەماوەن ئەحمەدی مام جەسەن، ئەنیا من چە و زەماوەن چە! ئەشێ بچم، لێم ئەڕەنجێ، قەولم داگە، لە قسانی پیاگم. دەخۆتان بچنە ماڵەو.

ـ نابێ، زۆرێن، تۆ بڕۆ، بەڵام زوو وەرەوە، کارم پێتە، ئەمشەو بە یەکەوە دەبین. چوویە کانی توو، پوورەگوڵە ببینە، سلاوی منی پێ بگەیێنە، بڵێ دەیگوت حەز دەکەم چاوم پێی بکەوێ، لە کوێ ببینم؟

تاهیر و عەبە دەستەملان و بە قسەوە گەڕانەوە. سارۆ لە دواوە گوێیداوە بەو قسە خۆشانەی عەبە و لە ژێرەوە پێدەکەنێ.

گەییونەتە دۆڵی بەردە دەنگدارە، تاهیر و سارۆ بە شێودا تێ هەڵگەڕان. عەبە و گەلاز، سەر بەرەو خوار بە دۆڵدا ڕۆیشتن، هێشتا نەدیو نەکەوتوون، تاهیر ئاوڕی داوە:

ـ پوورەگوڵەت لە بیر نەچێ، ئەگەر هاتییەوە بەم شیوەدا وەرە سەرێ، ئێمە لە سەر کانی بەر حەوت کونە کەین.

عەبە بە دەم ڕێوە جوابیداوە:

ـ خاس، خاس. لە بیرم ناچێ، لە بیرم ناچێ، تێم تێم.

## ٢٢

نێو دێی کانی توو پڕە لە برازاوای خۆ دێیی و هەندەران، دەرکی ماڵی مام حەسەن چرنە و پڕنەی تێرژاوە و شانی شانداری تێدا دەشکێ! ڕەشبەڵەکە. دوو کوڕە جەحێڵە بە نێو شاییدا دێن و دەچن، کیژ و کوڕ بە هەوای چەپی دەچنە حەوا و دێنەوە خوارێ.

ژن و منداڵ دەوری شایی و سەربان و گوێبانیان تەنیوە، هەموو کەیف ساز و دەم بە بزەن.

کوڕ و کچ خۆیان ڕزاندۆتەوە و لە گەڵای دار دەدەن، ناسینەوەیان ئاستەمە! تەنانەت خۆشیان خۆ ناناسنەوە!

کوڕ پێنچ قیت و ڕیش ساف و سۆڵن. سۆرانی سپی بە شلێکەوە لە قۆڵ هالاوە، هەر قۆڵی لفکەیەکیان لێ بەرداوەتەوە. پشتوێن لە نێو قەدا جەڕ دراوە، دەسرەی هومایی ڕشوەگولینگی گوڵدۆزیکراو، بە لای چەپی پشتوێنەوە وەک قەبزە نووشتە قولینچکێکی هاتۆتە دەرێ و سپی دەکاتەوە، قنج و قیت لە جێوە هەڵدەپەڕن و بە سیلەی چاو دەڕوانە دۆکانیان. کچ شەدەلار و چاوەڕەشن، سیخمەی دراوی سپی، گوێ زیو و زەرد، پلپلە و گوارە و کرمەک، بازنە و خڕخاڵ و بەرموورویان لە خۆداوە و لەبەر تیشکی خۆر چاویان لەبەر هەڵنایە، بە شانی کوڕان هەڵدەپەڕن و بە بزەیەک جوابی سیلەی چاویان دەدنەوە، خرینگ و هۆڕگوێی گوێداران کەڕ دەکا. بۆنی عەتر و سمڵ و میخەک پشوو بە تازە هاتووان سوار دەکا و بۆ ماوەیەکی کورت هەناسە دەوێستێنێ.

عەبە تازە گەییوەتە دەوری شایی. دوو سێ جار پشووی بردەوە بەر خۆی و دەری داوە، چاوێکی گێڕا.

زاوا بە نێو شایی و برا زاوادا دەگەڕێ و سەرپەرشتی دەکا. عەبە بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ خوا موارەکی کا، پیر و غەڕەون.

ئەحمەد برازاوا و شایی بە جێ هێشت، بە پێکەنینەوە بەرەو عەبە هات، دەستە مـلان ماچی کرد:

ـ عەبە گیان! بۆ دەرنگ هاتی؟ بێ تۆ ئەو شاییە تاڵە.

ئەوانەی لە دەوری شاییەکە وێستابوون، دوو دوو و سێ سێ سەیریان بە جێ هێشت و روویان لە عەبە کرد. عەبە بە قسەی خۆش و جەفەنگ، جار جار جنێو بەوانەی وا لەوەبەر شەڕە جنێویان بوو، بە پلووتکەوە دەیهاویشتنێ.

شۆخی و گاڵتەوگەپ هەر دێ و پەرە دەستێنێ. وردە وردە دەوری شایی تەماشاچی لێ نەما. ئەوانەی وا لە گەڕی شاییدا بێ دۆ بوون، یەک یەک و دوو دوو بەریان‌دا و هاتنە لای عەبە.

ئەحمەد زانی وێستانی عەبە دەبێتە هۆی شێواوی شایی، دەستی گرتو بردییە دەرگای حەوشە:

ـ کاک عەبە! کەیخوداکان لەو دیوەن، فەرموو بڕۆ ئەوێ، چایەک بخۆوە با ماندوویت دەرچێ، فەرموو بڕۆ ژوورێ.

حەوشە جەنجاڵ و سیکەنە سەرخانە! چێوی خومی تێدا ناگەڕێ! لە سێ چوار لاوە کوچکاور کراوەتەوە و مەنجەڵی گەورە و بچووکیان لە سەرە و قوڵتە قوڵت دەکوڵێن. سێ چوار ژن، دەست بە کەوگیر و کەوچکەوە بە دەوری ئاور و مەنجەڵدا هەڵدەسووڕێن، پێنج شەش کچە عازەب لە بەر دەستیاندا دێن و دەچن.

لە قولینچکی دەرگای حەوشەوە دەپازدە دۆ خەریکی خۆ رێک کردنن، مشقە مشقی ئەوەیانە بڕۆن بۆ گەڕی شایی.

عەبە سەری بردە حەوشە و کچان گرتیان! هەر یەک لە لایەکەوە دەیکێشن و دەڵێن وەرە بڕۆێن هەڵپەڕین دەبینە دۆت.

عەبە بە قسەی ناخۆش و جەفەنگییەوە. دەست لە سینگ و بەرۆکیان دەکوتێ، ئەوان زۆر و ئەو تەنیا، دەرەقەت نایە. کچان دەست و پێیان لە ئەرز بڕی، چوار پەلیان گرت و مەشکە ژەنێی پێدەکەن. عەبە بە هاوارەوە روو لە ژنانی دەوری ئاور دەکا:

ـ بێ دین یەلە! بۆچە هیچێ نایژن؟! بۆ رەزای خوا وەچنگ ئەم گڕ گرتیانەو رزیارم کەن.

ژنان دەست بە کەوچک و کەوگیر و دەم بە پێکەنینەوە ئامبازی کچان بوون. دەنگی قریشکە قریشکی حەوشە گەیشتە دیوی ژنان. پوورەگولە دەنگی عەبە هاتە گوێی! کۆشی کرد بە لادا دەرپەڕییە دەرێ. لە دەرگاوە سەری وەدەر نا، بە تووڕەییەوە لە کچان خوڕی:

ــ ئەوە بۆ وای لێدەکەن دێلە بەکەلانە؟! ئەو هیچی لێ هەڵناوەرێ! ئەشا ئەو هەموو کەلەگایە لەدەرێ! بڕۆن بۆ لای ئەوانە، وەرە عەبە گیان، وەرە بۆ ئێرە.

کچان بە بیستنی دەنگی پوورەگولە، عەبەیان بەردا و دەرپەڕینە دەرێ، هەر یەک خۆی کرد بە بەینی دوو کوڕدا.

ژنانی کەوگیر بەدەست دەستەملانی عەبە بوون.

ــ وەرە عەبەگیان، وەرە بڕۆ بۆ لای پورێ.

عەبە خۆی راپسکاند:

ــ لاوەن، ئێوە خاسن؟! ئەویەک لە دۆ وێ، برای کەشکە! ئێوە چ بۆ ئەوە هاتن ئازارم بەن، دەس لە یەقەم کەنەو.

ژنان دەوریان چۆلکرد. بە سەر پوورە گولە بانگ دەکا. پوورێ پێ پێ لێی نزیک بۆوە، چووە پەنای.

ــ سلامەلێ میمکەگیان! خەوەرێ خۆشم ها پێ! چوومە ماڵەو، نەوی، گەلازم لە حەوشە بەستەو، وتم میمکە ها لە ماڵ مام حەسەن.

ــ جا حەوشەت بۆ برد؟ ولاتم لێ گلاو دەکا شەل و شێتە.

ــ ئەمە تۆ چە ئێژی؟! گەلاز فرە ماقوولە میمکە! بەخوا لە بان قالی بیخەفنەو دە رۆژ مەیکەرەوە، ئەر جێی تەر کرد بە لەم باڵمە بیوڕە! ئەی چەی پێ کەم لە ناو دێ بروەلا بێو سەیەلی تێکەن قزە وێ؟ دەی خۆ ماڵ برای باوکم نییە لێرەوە بیوەمە ئەوێ! ئەشێ هەر بیێرمە حەوشەکەی تۆ، بە خوا خۆشت وێ و تاڵت وێ، ئەونەی بێم، هەر ئەیهێرمە ئەوێنە.

ــ باشە شێت و وێتە! خەبەری چت پێیە؟ ئەوەم بۆ بگێڕەوە، خۆش خەبەر بی.

ــ ئەها، لە بیرت بردمەوە! کاک تاهیر هاتییەسەو! فرە سلامتی ئەگەیان، ئەیوت فرە حەز ئەکەم چاوم وە میمکە بکەفێ، لە کوێنە بتوینێ؟

پوورەگولە رەنگێکی هێنا و برد! چاوێکی گێڕا، بە پەلە گوتی:

ـ درۆ ناکەی؟

ـ نە بە خوا، درۆ بۆچە؟

ـ لە کوێیە؟

ـ ها لە دۆڵ بەردە دەنگدارە، ئەمڕا فرەن، ئەشێ من بچەمەو لای و هەواڵ تۆی بەم پێ، ئێژی چە؟

ـ حەمەیان نەدیوە؟

ـ نا، لەوە گەڕیێن، وە دیارە زانیگییە حەمە رای کردییە، دوا نیمەڕۆ ئەگەڕمەو، چەی پێ بێژم؟

ـ بڵێ ئاوایی خەوتن بێتە ماڵێ، تۆش لەگەڵێ وەرە، کەس نەتانبینێ! کارت بە من نییە! ئەگەر قسەت نەماوە بڕۆ.

عەبە وەرسووڕا. پوورەگوڵە شێوا و ئاڵۆز، بەڵام رەنگ گەش و روو خۆش چووە دیوی ژنان.

عەبە روو بە دەرکی حەوشە دەڕوا، لە پڕ کەوێی هاتە بەر چاو! لێو بە بار و رەنگ پەڕیو، لە نێو ژناندا خەریکی کارە، لە جێی خۆ وێستا و چاوی بڕییە کەوێ، وا کە کەوێ سەرهەڵێنێ، سەری هەڵێنا و عەبەی دی.

عەبە بە حاڵ سەری بزواند و بانگی کرد. کەوێ زوو حاڵیبوو، بە بیانووی ئاو ڕشتنەوە، بەرەو دەرگای حەوشە هات، گەییە لای:

ـ دادە کەوێ! کارم ها پێت! لە کوێنە پێو بێژم؟ ئەشێ هەر خۆمان بزانین! فرە مەحرەمانەس!

ـ چییە عەبەگیان! هەر لێرە بیلێ، کەس دلپیسی لە تۆ ناکا، هەرچی هەیە بیلێ. ـــ دوو شەو لەمەو بەر حەمە لە تەک منا ووا! خواحافیزی لێت ئەکرد، وتی وە کەوێ بێژە، دایک حەفت کوڕ وێ، هەر وەتەمایم.

کەوێ بەدەم لەرزینەوە گوتی:

ـ قسەم لە سەر دادەکێشی؟

ـ نەوەزات خوا، ئەو شەوە وا رایکرد، هاتە لای من، فرە دڵ لە دوای تۆوو، ئەیوت کەوێ باوڕ ناکا من رامکردوێ، وە منی وت پێت بێژم، ئەیوت ئەر باوڕی وە تۆش نەوو، بەو ناونیشانەی ئەر میناماں لە بەیناوو، بۆچە باور ناکەی؟ ئەیوت دەرفەت بوو،

تیمەو، من حەمەم ناسیوی، تێتەو، ئەر بێتەو، تێتە لای من، خۆم تیم پێت ئێژم، تـەمادار وە، بـە خوا بێتەو، تێم، خاس خوێشک برا؟ ئەر مینا شو دی، پی بێژە، بێژە حەمـە خواحـافیزی لێـت کردیە، ئەر کارو نییە، برۆ، کارت بوو وە برای خۆت بێژە.

کەویێ چاو بە فرمێسکەوە گوتی:

ـ باشە عەبەگیان، قەزات لە من، خودات لەگەڵ، کارم بێ، پێت دەڵێم.

نیوەڕۆیە و جەنگەی نیوەڕۆژەیە. شایی بێ‌پسانەوە دەگەڕێ، دەستە دەستە، بە نۆرە نـەهار دەکەن و دێنەوە شایی. سێ ڕوژە شاییە، ئاخر ڕۆژە و دوانیوەڕۆ بووک دێ. ڕوژێ پێشەکـی حەسەن مەیتەر گیسکێک و تایەک برنجی لە قەلاوە هێنا بـوو. هـەمزەبـەگ بـە حەسـەندا خەبەری ناردبوو تا خۆم نەیێم، نەچن بۆ بووک.

مام حەسەن زوو زوو دێتە دەرێ، چاوێ لە کێوە بەرداویلـە دەکـا ودەچێتـە ژووریێ،دوو سێ جار بە ئەحمەدی گوتووە: ئاغا لە کێو هاتە خوارێ، خەبەر بدە.

شایی گەرمە و جار لەگەڵ جار گەورە دەبێتەوە هەوای ڕۆینەیە و دوو سـێ چـین قـەفی خواردەوە، کەس لە بیری بووک هێناندا نییە.

ئەحمەد سەر قالە؛ بیری مردنی بێ، ڕاسپێرییەکەی بابی لە بیر نیـیە! لـە نـەکاو ڕممـەی سمی دوو چارەوێ، ئاوڕی بە سەر چۆپی تاگاوانی داوەو شایی بەربوو و دەستی گـەرمی دۆ ساردەوە بوو! دۆ هەر یەک بەلایەکدا خۆیان لە حەساری مالان و کەل و کون خست!

هەمزەبەگ بە سوارییەوە گوڕاندی:

ـ بۆ بەرتاندا؟ خۆ من گورگ نیم بتانخۆم! بیگرنەوە، بە سەری بابم دەبێ لـە شـاییەکەی عەتاشدا ئاوا هەڵپەڕن! حەوت شەو حەوت ڕۆژ، بـە تەقـەی دەهـۆڵ و زوڕنـا شـاییتان پـێ دەگێرم؛ بیگرنەوە، زووبن، برۆن ئەو کچەتیوانەش بێننەوە.

دوو کەس چوونە پێشێ و دەستە جلەوی کوێتە و ئەسپەڕەشـیان گـرت. ئاغـا و نۆکـەر دابەزین.ئەسپیان کێشایە ژووریێ و خەبەریان بە مام حەسەن دا.

مام حەسەن و کەیخوداکان هاتنە دەرێ،یەک بە یەک بە کڕنۆشەوە بـەخێر هاتنیـان لـە ئاغا و نۆکەر کرد. کوڕانی مام حەسەن کورسی و لیفەیەکی تازەیان هێنا، لە جێیـەکـی بـەر جەوەن خۆشی دەوری شایی، کورسی دانرا و چوار قەد، لیفـەیـان لـە سـەر ڕاخـست، ئاغـا دانیشت، نۆکەر و کەیخودا بە دەورییەوە بە چیخ! شایی سەر لە نوێ گیراوە، دۆ یەک یـەک و دوو دوو هاتنەوە شایی گەرم بووە.

مام حەسەن سەری بردە بن گوێی هەمزەبەگ:
ـ قوربان! دەرنگە، نەچین بـۆ بـووک؟ بـاوەڕ دەفـەرمووی سـەربان و گوێبانیـان لـێ نەهێشتووین، ژن و منداڵ هەموویان هێناوەتە خوارێ.
هەمزەبەگ سەعاتەکەی دەرهێنا:
ـ زووە مامە! ڕۆژی زۆر ماوە، پەلەی چتە؟ بووک لە دێدایە، سەعاتێکی بەسە.
سەعاتەکەی لە باخەڵ ناوە، پێی خستە سەر پێی وچاوی لە شایی بڕی.
عەبە لەو بەرەوە، بەرانبەر بە هەمزەبەگ پاڵیداوە بە دیوارەوە و کەسی لە دەور نییە!مـات چاوی بڕیوەتە هەمزەبەگ و ئەوانی دەوروبەری! بە چەشنێ بە خەیاڵدا نوقمە، دوو سـێ جـار زاوا بە لایدا ڕۆیی و دواندی، نە خۆی دی، نە گوێی لە قـسەیەوە بـوو! ماوەیـەکی زۆر بـەو چەشنە تێیان ڕوانی. لە پڕ پشتی لە دیوار کردەوە و بە کرژی، سـەرەو خـوار، بـەرەو ماڵـی پوورەگوڵە، لە شایی دوور کەوتەوە، پاش قەنەکێشێ، بێ ماڵاوایی و گواسـتنەوەی بـووک. گەلازی وەدووی خست و لە دێ دەرچوو.
دەمادەمی عەسرە، لە سەر کانی بناری دۆڵی بەردە دەنگدارە، تاهیر و هاوڕێکانی خۆیـان هەڵخستووە و هەر کەس خەریکی کارێکە، تاهیر تفەنگی لە بەریـەک دەرهێنـاوە و پـاکی دەکاتەوە.
کاوە لە بڵندایی کێوی پشت حەوت کونەکە قەرەوڵە، بانگی کرد:
ـ کاک تاهیر! کەسێ بە شیو و شیودا بەرەو ئێرە دێ، چوار پێیەکیشی بە دواوەیە، دەڵێی چی؟
ـ هیچ، ئەوە عەبەیە، لێیگەڕێ با بێتە ئێرە.
تفەنگەکەی تێکخستەوە، وردە وردە بە شێودا، بەرەو پیری چـوو. لـە سـێ پێچـی شـیو ڕۆیشتە خوارێ وعەبە وەدەر کەوت.
لە لاشیوێک وەستاوە، هەر دادەنشێ و هەڵدەستێتەوە! سیغار کێشێ وێستا! وەڕێ کـەوت، هەر دێ و ئاوڕ دەداتەوە! دەڵێی تەماداری کەسێکە! یـان لـە شـتێک دەگـەڕێ، گـەلازیش وێڕای عەبە، لەگەڵ ئەو، دەوێستێ و ئاوڕ دەداتەوە. ئەو دەڕوا، ئەویش ڕێ دەکەوێ!
تاهیر لە پەنا بەردێ خۆی ماتکردووە و سەیری دەکـا. عەبـە گەیـشتە بەرانبـەری، زۆر پەشێو و خەمناک دیارە! تاهیر بۆ ئەوەی داینە چڵەکێنێ، سەبرێ کۆخی وخۆی نیشاندا.
گەلاز بە وەڕینەوە هاشاوڵی بردێ. عەبە گورجێ بەرەنگاری بوو و نەیهێشت:

ـ ئەمە لەم حانە چە ئەکەی؟! بوویە سەخری زینە!

ـ ماندوو نەبی عەبەگیان! هەر لە شایی و خۆشی بی.

ـ شایی چە و خۆشی چە؟! پیاگ تا خۆشییەک ئەوینێ، سەو تالی بـۆق ملـی ئـەگرێ و وەک گیسکەکەی هەیاس ئەیواتەو و دۆخەکەی خۆی.

ـ باشە، لەو لایە چت دەکرد؟شتێکت ونکردووە و لێی دەگەڕای؟ بۆ وێستابووی؟

ـ واز بێرە! هەر لێم گەڕێ، زەخم کونەم مەکولێنەو! لەو حانە وێستاوم، سێ چوار رۆژ بەر ە ئێستا پیاگێکیان لێ کوشت غاراج مەملەکەتێ وو، سەعی بە شەرت سەعی! داخ گـرانم بـۆ ئەو شێرە پیاگە! فرە ناپیاگانە دای لێ وەبەرچاو منەو کوشتی و وەک بەفرەکەی پـار چـوو! دەس شکیاگم، کۆڵێ منال زەرد و سووری لە دوا جێ ماگە.

ـ تۆ جوان حالیم کە، کێ کوشتی؟

ـ رەسووڵ نۆکەر،ئەو براگەماڵە.

ـ ئەی بۆ دەڵێن چەتە کوشتوویە؟

ـ چەتەی چە و چت چە خالۆ؟ بە خوا وەبەر چاو منەو دای لێ و کوشتی، بێرەو تا بـۆت باس کەم...

هەر لە ئەوەڵ تا ئاخر، عەبە بە دەم رێوە بۆ تاهیری گێڕاوە. تاهیر دەسـتی دەخاتـە سـەر شانی عەبە و دلنوایی دەکا:

ـ ئەو جۆرە پیاوانە لە ولاتی ئێمە زۆرن، ئەوانە سەر نایەنە ژێر باری زوڵـمی ئاغـاوات و ئەوانیش بە فێڵ دەیانکوژن، حەیفن، حەیفە خوێنیان ون بێ، عەبەگیان، دەبێ نەهێڵین.

ـ جا من چەم لە دەس تێ؟ بژنەفن من زانیگمە، شەو تێنە سەرم منیچ ئـەکوژن! بـە خـوا عەودولبەشەر نەیزانیگە، تۆ و حەمە نەوێ.

ـ چاکت کردووە، با هەر خۆمان بزانین، رۆژێ دێ تۆڵەیان بسێنرێ، کەنگر و ماست بـە وەختی خۆی لەوە گەڕێ، پوورەگوڵەت دی؟

ـ ئا، فرە خۆشحال وو، ناوی تۆی ژنەفت، ئەو وت رۆن قازی لێ دریاگە! ئەیوت ئێمـشەو و ئاوایی خەفتن بێنە ماڵەو،وتی تۆچ لە تەکیا بێ، بەیەکەو ئەچین.

هەر دوو بێ دەنگ رێیان گرتە بەر. عەبە پێ پێیەتی! جار جـار ئێـستێ دەوێـستێ! وەک ئەوەی شتێکی لە دڵدا بێ، وایە، لە جێ وێستا:

ـ خالۆ تاهیر!چتێک بێژم قەلس ناوی؟

ـ نا، چییە عەبەگیان؟

ـ ئیستا لە ناو دێووم، هەمزەبەگ لەوێوو، کوتو مت گەماڵ کۆن! لـە بـان کورسـییەو دانیشتوو، ئەونەمە قین هەڵسیاوو، دوو سێ را گەرەکم وو رایکەمێ و وەدیان هەڵیوچڕم، هـەر چیم کرد زاتم نەوو، ئەوانە بایس کوشتن و سەر لێ شـێویاگی و دەروەدەر بـوون مـەردمن، بۆچە ناچن بیتۆپنن؟ وە زات خوا ئێسە هەلیەسێ!

تاهیر بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەوانەی گوتت، هەموو راستە، بەلام کوشتنی کاری ئێمە نییـە، ئەگـەر هـەمـزەبـەگ بکوژین، دنیا پڕە لە هەمزەبەگ، ئەوە کاری ئێمە نییە، کاری ئێمـە تێگـەیانـدن و هانـدانی خەلکە، خەلک دەبێ بیانکوژێ، جارێ زووە، عومر باقی بێ، خۆت دەیبینی، خۆت بیکوژە.

عەبە مات بووە! وەدیارە قسەکانی تاهیری بە کەیف نییە. سەری هەڵێنا:

ـ ئەی ئێوە چە ئەکەن؟ بۆچە کەفتنە سە ئەم کێفگەلە؟ وەدیار گێرە نەکـەرن! لـە تـرس گێرە بوونەسە وشتر!

تاهیر قاقای کێشا:

ـ وەرە بڕۆین، جارێ زووە، خۆت حالی دەبی ئێمە چ دەکەین.

بە شەڕە موشەرعێن و مشت و درەوش لە دەستە نزیک بوونەوە، یەک بە یـەک لەگـەڵ عەبە یەکیان ماچ کرد.

عەبە بە جەفەنگەوە گوتی:

ئەم کوڕە خاسانەو لە کوێنەو دۆزیگە سەو خالۆ تاهیر؟ ئەی لە چاو بەد وەدوور ون!

تۆ ئەم کوڕە خاسانە و ها لە تەکا، ئەشێ لەو مفت خۆرانـە بترسـی؟ هـەر کـام غـەنـیم دەکەسن! رووی لە نامیقە:

ـ چاوکە! ئەو سمێڵ قیتە! بە خوا خاوەن خۆی بـوێ، بـۆ سـەو کـەس لا ناکاتـەو! داخ گرانم، لەو جێی ئاو هەس، زەوی نییە، لەو جێی زەوی هەس، ئاو نییە.

هەموو تێکڕا دایان لە قاقای پێکەنین. ئەو ڕۆژە تا ڕۆژئاوا، ڕۆژئاوا تا نیوە شـەو تـاهیر و هاورێکانی لەگەڵ عەبە لەو بارەوە شەڕە چەلەحانێ ومشت و درەوشیان کرد، عەبە دەیگـوت دەبێ ئەوەی زولم دەکا و خەلک دەکوژێ و زەڕی هەیە، بیکوژن. ئەوان دەیـانگوت دەبـێ خەلک ئەو کارە بکەن.نە عەبە وازی دەهێنا، نە ئەوان رازی دەبوون. تاهیر هەستایە سەر پێ:

ـ درەنگە عەبەگیان، ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا! هەستە با بڕۆین. کوڕەکان! من و عەبە دەچینە کانی توو و دەگەڕێینەوە، نێوی نەهێنی ئەمشەو، شەماڵە. کوڕینە! دنیایە و هەزار رووداوی نادیار روو دەدا، ئەگەر کارەساتێ روویدا، بلندایی بەر مەدەن، یەکتر خافڵ مەکەن، ئێمە هەلایسێنی شەڕ نین، ئەگەر دەرگای پێ گرتین، گوللە بە فیڕۆ مەدەن، لە دەور گێران و گوللە لێ بڕاندا، گوللەیەک هی خۆمانە، هەوڵی ئێمە ئەوە بێ دوژمن دەسبەسەر و فریو دەین تا شەو بە سەردا دێ؛ شەو داهات، ولات هی خۆمانە و دەرباز دەبین، شوێنی پاشەکشێمان حەوتەوانانە، هەوڵ بدەین بریندار، تەنانەت تەرمیش بە دەستەوە نەدەین، سارۆ قەرەولە، بیگۆڕن و ئەوانەشی پێ بلێن، نێوی شەوتان لە بیر نەچێ! بەویشی بلێن. عەبەگیان! وەرە بڕۆین.

دوێنەشەو ئەو دەمانە لە نێو دێی کانی توو دەتگوت کاسەی قەرچی ئاو بردوویە! ماڵی زاوا ژاوەی دەهات لە برازاوا، جۆرابێن و هاتوهاوار بوو. لە ماڵی بووک شایی و خەنەبەندان، دەنگی گۆرانی تا ئەو پەڕی دێ دەڕۆیی. ئێستا بووک گوێزراوەتەوە و ئاو بە ئاوردا کراوە. ئەمشەو ولات کپ و کڕە و دەڵێی ئاشە و ئاوی کەوتووە.

تاهیر و عەبە، بێچرپە گەیینە ماڵەکەی پوورەگوڵە. عەبە بە ئاستەم دەستی لە دەرگای حەوشەوە نا، دانە خراوە! کردییەوە و چوونە حەوشە.

لە جیرەی گرێژەنەی دەرگای حەوشە، پوورە گوڵە دەرپەڕییە دەرێ و دەنگی نێر کرد:

ـ ئەوە کێیە؟

ـ میمکە! نەخەفتی؟ عەودلام.

پووری پێ خاوس بە پیریانەوە هات، باوەشی بۆ تاهیر کردەوە لە ئامێزی گرت و ماچی کرد، نەک جارێ، چەندین جار رایمووسی و بە سینگییەوە کوشی.

تاهیر چەندین جار دەستی ماچ کرد و لە سەر چاوی دانا، هەر سێ چوونە ژوورێ. تاهیر و عەبە دانیشتن. پوورەگوڵە بەدەم شەوچەلە هێنانەوە گوتی:

ـ وەڵلاهی پڕ بە دڵ تاسەتم کردبوو، یا خوا بەخێر بێی. حەمە ماڵەکەی لێ چۆڵ کردووم، خەبەرت هەیە؟

ـ بەڵێ، بە سۆراغی ئەوەوە هاتووم، لەو دەگەڕێم، تۆ نازانی رووی لە کوێ کردووە؟ ـ نەوەڵلا، ئەو دەم رۆیشت، گوتی لە هەر شوێنێ بگیرسێمەوە، بێ هەواڵت ناکەم ئەوە جارێ بێ سەروشوێنە و منیش هەر چاوەڕێم.

جامێ کاکلەگوێز ومێوژی لە نێوانی تاهیر و عەبەدا دانا، بە بزەوە گوتی:
ـ خەم خواردنی ناوێ! دەستی خۆی وەشاندووە، پیاوانە وەشاندوویە، غەشی لە دڵم بڕیوە! چی بە سەر دێ، با بێ، بەرخی نێر بۆ سەر بڕین چاکە، دەی فەرموون.
ـ ئەو شەوە تا درەنگانێ سەبارەت بە حەمە و دەست وەشاندنی و هەڵاتنی، ماڵ سووتاندنی، مارەکردنی کەوێ و بێ سەروشوێنی حەمە دوان.
شەو درەنگە، تاهیر لە سەر ئیزنی پوورە گوڵە هەستا، ئەوانیش هەستان. پووریێ بەرەو ناندێنەکە ڕۆیشت. سێ دەستەوار نان و تاوەیەکی پێچراوە و جامێ پەنیری هێنا:
ـ کوتوپڕ عەبە هەواڵی هاتنەوەتی دامێ، لەوە زیاتر هیچم پێ ساز نەبوو، مریشکێکی سوورەوە کراوە. تاهیرگیان! تۆ ئەملا و ئەو لا زۆر دەچی، ئەگەر هەواڵێکت لە حەمە زانی، خەبەرم بدەیە، زۆری بۆ بە خەمم، قەت ئەملا و ئەو لا نەچووە، هیچ نازانێ، بزانم لە لایەک گیر سابێتەوە، خۆم دەچم.
تاهیر کڵاشەکەی لە پێ دەکا، سەری هەڵێنا:
ـ باشە پوورێگیان، لە هەر کوێ بێ، دەیبینمەوە، بە سەر چاو تۆش بێ هەواڵ ناکەم، چاوەڕێی دوعای بەخێرتم.
ـ خودات لەگەڵ بێ، دەستی خدری زیندەت لە پشت. دەستی لە ئەستۆی تاهیر کرد و دوو سێ جار نێو چاوانی رامووسی و تا دەرکی حەوشە ڕەوانەی کردن.
شەو یەک بەش و دوو بەش بووە، زۆری شەو نەماوە. تاهیر و عەبە لە دۆڵی بەردە دەنگدارە دەستە ملانێ یەک بوون. عەبە، گەلازی وەدووی خست و بە باریکەڕێدا، رووەو دێ کۆن، تاهیر بە دۆڵدا بەرەو بناری کێو، لە یەک جوێ بوونەوە.
مانگ تازە بە نیوەڵەتی وکەم هێز لە کەل سەرکەوتووە و لێڵەی خستۆتە دڵی تاریکی شەو. عەبە و گەلاز، بێ پەلە و لە سەر خۆ، سینگیان ناوە بە سینگی سەرەو ژووری کێوەوە، ئاهێکی نەماوە وەسەرکەون. گەلاز وێستا و یەک دوو جار مراندی! وەکو ئەوەی هەستی بە شتێک کردبێ وابوو! گوێی لە سەر نێو چاوانی قوت ڕاگرت و دیسانەوە مراندی! عەبە لە شانی گەلازەوە چۆکی دادا، دەستی خستە سەر ملی و لە مابەینی هەر دوو گوێیەوە، سەرنجی دایە شوێنی چاوی، چاوی لەبەر شەوقی کزی مانگ لێڵە دەکا، دەڵێی ئەویش جووڵانەوە دەبینێ! دەستی خستە چاوی و هێندێ هەڵیگلۆفی، زەینی داوە، هێندێکی دیکە دانەوەی و خۆی بە ئەرزەوە نووساند، ئاسۆگی بە تەواوی بۆ وەدەرکەوت، باوەڕ بە چاوی

ناکا، دیسان هەڵیگلۆفینەوە، دەستەیەک وەک مێگەل بە ئاسۆگ و ئاسۆگدا بەرەو ژوور هەڵدەگەڕێن، جار نە جارێ لە بەر شەوقی کز و لاوازی مانگ، بریقەیەک دەبریقێتەوە و زوو لە چاو ون‌دەبێ! ئەو بریقەیە عەبەی خستە گومانەوە و دڵ کرمێی کرد! جێ دەگۆڕێ، لەو روانگەوە بە تەواوی بۆی ئاشکرا بوو! حەشیمەتێ هەموو چەک بە شان و سەر تاپا بۆرن! ئەوەڵ گوتی رفیقەکانی تاهیرن. هێندێ بیری کردەوە، بە خۆی گوت، ئەوان شەش کەسن! ئەمانە فرەن! هەستایە سەر پێ، پەتەکەی ملی گەلازی گرت و سەرەو خوار بە شوێنی خۆیدا گەڕاوە. لابڕ و لاڕێ، بە هەڵاتن و هەناسکە هەناسک خۆی گەیاندە ئاخر پێچی بناری کێو. جار جار عەبە وەپێش گەلاز دەکەوێ، جار جاریش وەدوا دەکەوێ.

لە سەری پێچ، لەو شوێنەی تاهیر و ئەوان وەدەردەکەون، خرەی چەخماخ و نرکەی کەسێ تێکەڵ بوون و عەبەی داترووسکاند:

کورە کێی؟ دەنگی نامیق بوو. گەلاز شالاوی بردێ. عەبە بە پەشۆکاوییەوە جوابی دەنگ و گەلازی بە یەکەوە داوە:

ـ عەبەم، دۆستی کاک تاهیرم، گەلاز بێرەو. گەلاز گەڕاوە.

نامیق لەسەرەخۆ رووی کردە عەبە:

ـ بەو شەوە بۆ هاتووی؟

ـ کارم وە کاک تاهیرە، ها لە کوێنە؟ دەورتان گیریاگە بەو بەخت! زوو راکەن.

ـ ئەوە دەڵێی چی؟! کێ بەو شەوە دەوری گرتووین؟! داخوا چت دیوە! رەنگە ترسابێتی!

ـ ئەمە تۆ ئێژی چە؟! من رۆژ و شەو هام بەم کێفانەو، لە چە ئەترسم؟ ئەزانم چەن کوچکی ها پێوە، ترس چە؟ لە من حاڵی ناوی! کاک تاهیر ها لە کوێنە؟

تاهیر هێشتا نەنووستووە. گوێی لەو سرتوخورتەوەیە:

ـ نامیق! ئەوە لەگەڵ کێتە؟ دەنگی تاهیر وە گوێی کەوت، نامیقی بە جێ هێشت، بە دەم رێوە گوتی:

ـ عەبەم، بێ خوارەو.

تاهیر بە هەڵاتن بەرەو لای هات:

ـ بۆ گەڕایەوە؟! خێرە؟

ـ خێر چه و چت چه؟ دەورتان گیریاگە! زوو بجوولنه و ئیسه ئەڕژنـه ملتانـا، بـه خـو تاقەوارتان لێ ئەوڕن! فرەن، ئەو کیفه پڕە!

ـ تۆ جوان حالیم کە؟ چووزانی؟

ـ من لەو بان کێفه چاوم پیان کەفت، خاس وو من زوو ئەوانم چاو پێ کەفـت، گـەلاز بەر لە من زانی، ئەوان منیان نەدی، زوو بەرەودوا بوومەو، من هەوالم وە ئێوه داگـە، خـۆت ئەزانی، ئەوه رۆیشتم، ئەگەڕمەو کانی توو، هۆشتان وەخۆتانەو وێ، خواحافز.

عەبە دەم لەسەر پشت، گەلازی وەدووی خست و بەرەو دوا، بـه شـیودا گـەڕاوه، ئـاخر پێچی شیو، لەو جێیەی کانییە بەردینە وەدەردەکەوت، گەلاز وێستا و مراندی! عەبـه زوو بـێ دەنگی کرد، سەرنجی دایە سەر کانی و پاشە و پاش گەڕاوە، لە پـشتی بـەردە دەنگـدارەوە. چوونە ئەشکەوتێک و لەوێدا ماتبوون.

دوا بە دوای عەبە، تاهیر هەموویانی کۆ کردەوە:

ـ کوڕینە! عەبە لە خوڕا وا نالێ، خۆ کۆ کەنەوە دەڕۆیـن، نـان و پێخـۆر چمـان پێیـه. بەشیکەن، مەتارە پڕکەن لە ئاو، ئاسەوار لە خۆ بـه جـێ مـەهێـلن، بـەرەو ترۆپکـی هـەزار ئەشکەوت وەسەردەکەوین، زوو بن زوو.

بەیان ئەنگووتووە. هەلۆی سەر رەوەز و تاشەکان وە سیرەسیرِ کـەوتوون. بـێ پـەلـه و هەلە، حەوت کەس هێور هێور بە کەلێن وکۆلانە بەردی هەزار ئەوشکەوتـدا وەسـەرکەوتن و چوونە سەر ترۆپک.

دوندی کێو، سێ ترۆپکی هەیە، یەکیان دەڕوانێتە رووکاری چۆم و تـازاوا، ئـەو دووەی دیکە، یەکیان بە سەر دیوی کانییە بەردینە و بـەردەدەنگـدارە، تـا سـەر کـانی بەرحـەوت کونەکەدا سوارە و هەموو شیو و ماشیوێکی لێوە دیارە. ترۆپکی سێهەم، ئاوەڕۆی دەڕواتـەوە بە رووکاری دێ کۆندا. هەر سێ ترۆپکە کە پێشیان تاش و زەردە. لـه خـوار تاشـەکانـەوە، سینگەل و گۆڕاییە، دەلێی سەکۆیە. خوار سەکۆ گۆڕاییەکە، تەلان و هـەلـدێرە تـا دەگاتـه دوایێنی کێو.

تاقمێ سوار لە سەر کانییە بەردینەن. دوو قەرەیەخە، یـەکیان رەش سـوارە و ئـەوی دی سواری چارەوێیەکی شێیە و لە نێو بیست نیزامیدا وەک گای بەلەک دیارن.

دەستەیەکی دیکە لە رووکاری چۆم و تازاواوە گەییونەتە بناری کێـو، ئەوانـه پیـادەن و هێستریێ بە دووی خۆیاندا دەکێشن، ئەوانەش بیست نیزامین.

لە رووکاری دێ کۆنەوە، دەستەیەکی بیست کەسی ئاسۆگی پشت حەوت کونەکا و دێ کۆنیان گرتووە، دوو دوو، بە ماوەی پەنجا هەنگاو لە یەک دوورن، ئەوانیش پیادەن.

حەوت کەس لە سەر ترۆپکی کێو چاوەڕێی چارەنووسێکی نادیارن. تاهیر لێبڕاوانە و بەرپرسانە هەڵوێست دەگرێ:

ـ کوڕینە! ئێمە داخوازی شەڕ نین، دەرگای پێ گرتووین، ریش بوو بە ریشەوە، دەبێ شانەی بۆ هەڵگری. ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەڵاتی سەروان خودایی دایە، لێزان و شارەزای شەڕە، تا ئێستا دوو جار روو بە روو بووین، ئەمە جاری سێهەمە دەبێ، خۆ گورج کەنەوە، بە پارێزەوە تێوەچن، جێی ئێمە زۆر ئەستەمە، ئەگەر خۆ نەدۆڕێنین، سەر دەکەوین، مەجالی هاتنە سەرێیان مەدەنێ، هەر دوو کەسمان لە ترۆپکێ دادەنیشین، یەکمان دەمێنێ، ئەویش لە مابەینی هەرسێدا بێ، هەر لایەک پێویستی بێ، بچێتە ئەوێ، دوو دوو جیاوەبن، رووکاری دێ کۆن سەنگەری یەکە، دیوی کانییە بەردینە دووە، ئەوی دی سێیە.

رەشۆ گوتی:

ـ ئەو یەکەمنم. چاوم لە سەر ئەو هێسترە دەبێ، بارە فیشەکی پێوەیە! بۆ ئێمەیان هێناوە! ئێوە بڕۆن، من تەنیا دەبم.

مینە و قادر چوونە سەنگەری یەک، نامیق و سارۆ بەرەو دوو رۆیین. تاهیر و کاوە چوونە سێ رووکاری تازاوا.

تاهیر و هاوڕێکانی دامەزراون، دوو دوو، سێ ترۆپکی کێویان گرتووە و هەموو لایەکیان لە ژێر دەسەڵات و چاوەدێری گرتووە، مینە لە سەنگەری یەکەوە بانگی تاهیری کرد:

ـ هێزی سوارە بوون بە دوو دەستە، دەستەیەکیان بە شیوا دێن، ئەوی دیکەیان لابڕ تیرەگیان گرتووە و بەرەو جێگاکەی شەوێی خۆمان دێن، دەبێ فەرماندەی هەر سێ هێزەکە لە نێو ئەو سوارانەدا بێ، عەجەب نەقشەیەکیان رشتووە! عەبە نەبایە، کارمان کرابوو.

تاهیر گوتی:

ـ ئەوانە دوورن، قادر بە جێ بێڵە و وەرو بۆ ئێرە، بە نامیق و سارۆش بڵێ بێن، ئەمانە خەریکن وەسەرکەون، دەیانەوێ بە خەیاڵ بەرزاییمان لێ بگرن! زوو بە زوو! رەشۆ تۆش وەرە.

دەستەی ڕووکاری تازاوا لە نێو قـەدی کێـو بـە تالـۆکە وەسـەردەکەون، گەیینـە بـەر سینگەڵی و سەکۆ و ونبوون.

لوولەی شەش تفەنگ لە کەلێنە بەردەوە خۆیان کێشاوەتە دەرێ و قۆنداخیان بـە شـانەوە نووساوە، چاو چووەتە سەر سێرە و قامک لە سەر پەلەپیتکە، تەماداری کێشانەوەن.

دەستەی ئەمنییە لە سینگەڵەوە وەسەرکەوتن و بـە بـارێ فیـشەکەوە هاتنـە گـۆڕایی و بەرسێرە. هێستر لەوێدا پێی چەقاند.

تاهیر بەئاماژەی چاو فەرمانی دەسرێژیدا. شەش قامک بە یەک جار شەش پەلەپیتکـەی کێشا، هارەی تفەنگ دەشت و دۆڵی پڕ کرد، شەش گوللە سینگی شەش ئەمنییـەی بـڕی و خەڵتانی خوێن بوون.

تەقەی ناخافڵ و لە خوێن گەوزانی کوتوپڕ، سەری لە ئەمنییـە شـێواند و وره و وزەیـان لەدەستدا و سەربەرەوخوار، لە سەر چنگ و تلاوتل لە سینگەڵ چوونە خوارێ و لـە سـێرە و چاو ونبوون. ئەوەی وەبەرچاودەکەوت، کەلاکی شەش ئەمنیە و شەش تفەنگی لـە دەسـت پەڕیو و هێسترێ بە بارێ فیشەک و تەقەمەنییەوە بوو. هێستر سەر شێت و قوشقی، بـە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

ڕەشۆ وەک ڕەشمار دەرپەڕی و بە تاشە بەردا خوشیـە خوارێ. خەنجـەری هـەڵکێـشا و تەپی دایە سەر هێستر و لە نێو بارەوە گوریسی سندووقی هەڵبڕی، سێ سندووقە فیشەک بـەر بوونەوە. دوو گوللەی بە سەر هێستردا تەقاند. هێستر سەر شـێت و کـوڕەگـوی، بـەرەو دێ کۆن بە لەسە بوو. هەڕای کردە تفەنگی پەڕیوی ئەمنیەکان و هەر شەشی کۆکردنەوە و لای سندووقەکان دانان و تەپی دایە سەر کەلاک و فیشەکدانی لێ داماڵین.

کاوە و سارۆ هاتن بە یارمەتییەوە. سندووق و تفەنگ و فیشەکدانیان بردە سەرێ، دەسـتە ئەمنیەی ڕەو کردوو لە نسار چوونە خوارێ و دایان بە خورەتاوی ئەو بەردا، لە پەنا بـەردەوە خۆیان حەشار داوە و لە دوور تەقە دەکەن.

مینە چووەوە لای قادر. نامیق و سارۆ چوونەوە جێی خۆیان. تاهیر و کاوە جار نـەجارێ گوللەیەک دەنێن بە خورەتاوی ڕووبەڕوویانەوە. ڕەشۆ لە نەرمانی بەینی هەر سـێ ترۆپـک، سندووقە فیشەکی کردووەتەوە و بە حەوت بەشیان دەکا. هەر کەس بەشی خۆی دانێ.

مینە بانگی کردەوە:

ـ کاک تاهیر! سوارەکان گەیینە جێی شەوێی خۆمان، لە چارەوێ دابەزین، چارەوێکانیان لە دەوری کانی بەستەوە، یەکیان دانەبەزی، رەش سوارە قەرە یەخەکەیانە! ئەها! بەرەو دوا، بە شیودا تێی تووڕاند. نامیق! چاوت لە سەری بێ، بزانە بۆ کوێ دەچێ. رەنگە خەبەر بەرێ، یان دەچێ هەواڵێ لەو دەستەی ئەوبەر بزانێ، و نی نەکەی.

تاهیر لە پەنای کاوە هەستا:

ـ کاوە! من دەچمە لای مینە و قادر، ئەوانە تازە وا نەتۆقیون بێنە دەرێ، هەر لە خۆڕا تەقە دەکەن، هەر کەس سەری هەڵێنا، بێ سەری کە.

نامیق بانگی کرد:

ـ ئەوە رەش سوارەکە گەیشتە کانی و ئاوەکە، روو بە چۆم دەڕوا، گەیشتە سەر چۆم، بە بناری کێو دا دەڕوا، ئەوە لە من ونبوو.

تاهیر لە لای مینەیە، نامیق و سارۆی بانگ کرد، بە رەشۆ دەڵێ: ئەگەر کارت نییە، تۆش وەرە. کاوە نەبێ، هەموویان لە سەنگەری یەک کۆ بوونەتەوە. تاهیر گوتی:

ـ دەیانەوێ بلاو بنەوە و سەرمان لێ بشێوێنن، مەیێڵن، بیاندەنە بەر دەسڕێژ و کۆیان کەنەوە، ها یاڵلا، بەڵام دەست بپارێزن! مەیانکوژن، هەر لە بەر پێ و دەور و بەریان.

رێژنە بارانی گوللەیە! بریشکەی سەر ساجە! هەورە برووسکە و چەخماخەی بەهارە! لە ئەرز و ئاسمانەوە گوللە بارانە، چل تفەنگ لە خوارێوە بۆ سەرێ، شەش تفەنگ لە سەرێوە بۆ خوارێ قرمەیانە. شەشی سەرێ بە سەر چلی خوارێدا زاڵبووە و هەموویانی لە بنەبەردان خزاند و کۆی کردنەوە.

کاوە هاواری کرد:

ـ ئەوە تا رەش سوارکە، ئەوەتا! بە شیودا دەیەوێ بڕوا بۆ لای ئەوانە، چ بکەم کاک تاهیر؟

ـ سەر شێتی کە با نەگەڕێتەوە! لێی مەدە، هەر لە دەور و بەری. ئەوە قادریش دەنێرمە یارمەتیت، قادر! هەستە بڕۆ لای کاوە.

رەش سوار هەڵەشە و چەواشە، لە شیو وەسەرکەوت و دایە خۆرەتاو. قادر و کاوە، بە جووت چاویان خستە سەر سێرە، ئەمشان و ئەوشان و بەر و پشتی رەش سواریان دابێژا. سوار لە تۆزدا ونبوو تۆز لاچوو، ئەسپ بێ سوار، بە زین و لە غاوەوە، بەرەو تازاوا بەلەسە بوو.

سوار له سەر چنگ و چوار دەست و پێ خۆی گەیاندە کۆرە بەردێک و ماتبوو. قادر و کاوە مەودای ئەوەی نادەنێ سەرهەڵێنێ و خۆ بگەیێنێتە ئەوانی دیکە.

ڕۆژ نزیکە و نێوەڕۆیە، تەقە هەر بەردەوامە. کەس لە جێی خۆی نابزوێ. هەر سەرێ لە پەنا بەرد وەدەرکەوێ، گوللەیەک دەیکاتەوە و بە بنەبەردا.

ڕەشۆ وەجموجۆڵ کەوتووە، دەیەوێ هەستێ! تاهیر چاوێکی لێکرد:

ـ بۆ کوێ؟

ـ ئەمە شەڕە؟! من دەڕۆم، ئەمە کایەیە! دەچم لە لایەکی دیکەوە کایە دەکەم.

ڕەشۆ دەرە دزە و ڕێوی پێچکێکی دایە و دەوری کێوی داوە، دوو پێچ لە خوارکانی بەر حەوت کونەوە چووە نێو شیو. بە شیودا وەسەرکەوت، گەیشتە سەرکانی. تێری ئاو خواردەوە و دەموچاوی شوت. سەبرێ رووی لە چارەوێی بەسراوەی ئەمنییە کرد. تەنگە و قاشی شل کردنەوە، زینی یەک بە یەک ئاوەژوو خستە ژێر زگیان. خەنجەرێی هەڵکێشا و دەسکە و سارەکانیانی هەڵبڕی. ڕەوە ئەسپی وەپێش‌دا و بە دۆڵدا بردنییە خوارێ. دوو پێچ دووری خستنەوە. هەی لە ڕەوە کرد و ڕەواندنی. ئەسپ بە زینی ئاوەژووەوە، شێت و خوودار، لەو حاشیە و حەواڵە تار بوون بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ، ڕەشۆ گەڕایەوە لای هاوەڵەکانی.

ڕۆژ گەیوەتە ڕۆژپەڕ، هەموو ماندوو و وەڕەزن. نە ئەمان دەرەتانی دەرباز بوونیان هەیە. نە ئەوان دەرفەتی پاشەکشێ. تەقە تاق و لۆق هەر دەکرێ و چاوەڕێی ڕۆژئاوان. تەقە هەر دێ و کەمتر دەبێتەوە. ڕۆژ لە کەل ئاوا بوو. تاهیر بە بزەوە گوتی:

ـ ئێستا وەختی پاشەکشێیانە، خۆیان لێ گێل کەن با بڕۆن، تەقەیان لێ مەکەن، هەر ئەوەیان بەسە بە پیادە بڕۆنەوە، ڕەشۆ دەردێکی نەداونێ دەرمانی بێ! مینە! هەستە با چاوێ لە وڵات کەین بزانین لە کوێوە دەرباز بین. دەبێ کارێ بکەین سەریان لێ بشێوێ، ئەوە سەروان خودایییە و من دەیناسم! وە دوومان دەکەوێ و ژیانمان لێ تاڵ دەکا، بیر بکەنەوە، هەر کەس فێڵێکی باش دەزانێ بیڵێ.

مینە و تاهیر و نامیق هەستان و ڕوانینە دەرووبەر. نامیق گوتی:

ـ بۆ دەرچوون، لەم تیرەشانەوە دوو دوو دەڕۆینە خوارێ و خۆ دەگەیێنینە ئەو چۆم و دارە، بە نێو چۆم و چۆمدا تا نزیکی دێ دەڕۆین و خۆ دەگەیێنینە ئەو کێوەی بەرانبەری تازاوا، پێتان چۆنە؟ تا ئەوان لە کێو دێنە خوارێ، ئێمە لەوێین.

مینە گوتی:

ـ زۆر باشە، کاک تاهیر! تۆ دەڵێی چی؟ لات وایە وەدوومان کەون؟

ـ ئەری، من ئەو سەروانە دەناسم، دە رۆژ و دە شەو بەدوومانڈا بێ، ماندوو نابێ، چاو لە ئێستا مەکەن ئاوا لان زەلیلە! جێی ئێمە زۆر ئەستەمە، دەنا ئەو زۆر درە! ئەگەر پاشەکشێ بکا، بۆ ئەوەیە ئێمە هەڵکەنێ و برۆینە خوارێ، دەستمان لەم ترۆپکە بێتەوە، چەنە بەری ناکەین، دەبێ کارێ بکەین بە هەڵەی بەرین، ئەگەر ئێمە بەر لەوان لە تازاوا رەتبین، کار تەواوە، دەنا تووشی گێرەوکێشەمان دەکا! بیر بکەنەوە.

نامیق دەستی بە سمێلیەوەیە و بایدەدا. مینە بەینی هەر دوو برۆی دەکوشێ. پاش هێندێ گوتی:

ـ ئەو کەلاکانە چی؟ هەر وا بە جێی دێلن؟

تاهیر جوابی داوە:

ـ پێم وا نییە، رەنگ بێ بچنەوە تازاوا و خەڵکی بۆ بنێرن، بۆ چی؟

ـ ئەوە خراپە! دەنا دەگەڕاینەوە ئێرە! دەڕۆیشتین و لەو لای تازاواوە خۆمان ئاشکرا دەکرد، ئەوان وایاندەزانی ئێمە رۆیشتووین، بەرەو ئەولا وەدوومان دەکەوتن، با ئەونده بخولێنەوە تا سەرە گێژەیان دەگرت، دەترسێم ئەو کارە بکەین، خەڵک بمانبینن.

ـ ئەسقەزا ئەوە باشە! هەر ئەوەی چاکە بمانبینن! من زۆرم کار بە خەڵکی تازاوایە، کار لەوە باشتر هەر نابێ! لە دوو لاوە کەڵکی هەیە، یەکێ ئەوەیە من قسەی خۆم بەو خەڵکە رادەگەیێنم، ئەوی دیکەی لە دوو لاوە جەناب سەروان بە هەڵە دەبەین، زۆرکاریکی باشە، بارەکەڵلا بۆ پیلانت! زوو وەخۆکەون، دوو دوو برۆنە خوارێ، ئاخر کەس من دێم.

سارۆ بانگی کرد:

ـ کاک تاهیر! ئەوە خەریکن دەچنە خوارێ، تەقەیان لێ بکەم؟

ـ نا نا، با برۆن.

ـ ئەوە چوونە خوارێ، لە سەر کانی و ئاوەکەن، ئەوە تەماشای جێی چارەوێکان دەکەن! ئەوێشیان بە جێ هێشت، راست بە شیودا دەڕۆنە خوارێ، ئەوە لە چاو ونبوون.

هەوا تاریکە و ولات ئەهۆن و بێ دەنگ. هێزی ئەمنییە بە دۆڵی بەردە دەنگدارەدا بێ هەست و خوست هاتنە خوارێ. خرمەی پۆتین لە نێو دۆڵدا دەنگ دەداتەوە، ئەمبەروئەوبەر

ئەشکەوتەکان دەنگیان دایە دەنگی یەک، دەڵێی دەنگی هەزار پۆتین لە پێیە! خرمەی پـۆتین هەر دەڕوا و دووردەکەوێتەوە، ئیتر ناگاتە گوێ.

عەبە لە ئەشکەوت هاتە دەرێ و گەڵازی وەدووی خۆی خست، کەوتنە سەر کوێرەڕێـی پشت بەردەدەنگدارە و وردە وردە بەرەو دێ کۆن کەوتنە رێ.

شەو هەموو وڵاتی داپۆشیوە و قەڵای مێردانە. لە مابەینی تازاوا و هەزار ئـەشـکەوت دوو تەقە بێ دەنگی شەوێ لە بارودۆخ خست و شڵەژاندی! دوو تەقە لە خۆرە تاوی بـەرانبـەر بـە نساری هەزار ئەشکەوت جوابی داوە، رەمزی گەڕانەوە بۆ دێ بوو.دوا بە دوای ئەو، لە هێلانـە چەرخەی ئەوبەری تازاوا، حەوت تەقە جوابی دانەوە. ئەوەش نیشانەی دەرباز بوونە، تـاهیر و ئەوان بوون. هێزی ئەمنیە گەیـنە نێو دێ و تەقەیەکی دییان کرد. لە حەوتەوانـەوە حـەوت تەقە جوابی داوە.

شەو لە بەرانبەری شەوگەڕان بێ دەسەڵاتە و کڕنۆش دەباتە بەریان. تاهیر و هاوڕێکـانی لەمبەروئەوبەری تەرمی شەش ئەمنیەوە خۆیان ماتداوە و چاوەڕێـی هـاتنی خـەڵـکن. قـادر سەبرێ گوتی:

ـ لە داوێنی کێو دەنگ دێ! وەدیارە زۆرن.

تاهیر گوتی:

ـ خۆ ئاشکرا مەکەن، بزانین کێن، خۆم قسە دەکەم، ئێوە مەیێنە پێشێ، خۆ ماتکەن. بریـو بریو و سرتوخورت هەر دێ و نزیک دەبێتەوە. لە لێژ و سینگەڵ وەسەرکەوتن و هاتنە سـەر سەکۆ و گۆڕایی. تاهیر یەک بە یەک سەرنجی دان، هەموو خەڵکن و چەکداریان تێدا نیـیـە، شەش گوێدرێژیان پێیە، لە تەرمەکان نزیک بوونەوە. تاهیر دەنگی دان:

ـ کێن کوڕە؟ بەو شەوە لێرە چ دەکەن؟

ماوەیەک هەموو کەڕو لاڵ بوون و جوابیان پێ نادرێتەوە. تاهیر زانی زۆر ترسـاون، لـە پەنا بەرد هاتە دەرێ و رووی تێکردن.

مەترسێن! من ناوم تاهیرە، چەتە و پیاوکوژ نین، ئێمەش لە خۆتـانین، کـوڕی ئێـوەیـن، هەرچییان سەبارەت بە ئێمە گوتبێ، درۆیە، چەتە و مەتە لە گۆڕێدا نیـە، ئێمە دژی ئـەمنیـە و ئاغاوات دەجووڵێینەوە، کارمان، بە کەسی دیکە نییە، مەترسێن، پرسـیارێک دەکـەم، جـوابم دەدەنەوە؟ بەڵام بێ درۆ.

یەکیان گەرووی پاک کردەوە:

ـ بەڵێ، ئەوەی بزانین جوابدەدەینەوە.
ـ چییان پێگوتوون؟ ئەوەی راستە، ئەوە بڵێ.
ـ ئەوەی راستی بێ دەیانگوت ئەوانە چەتەن.
ـ ئێوە بەیانی، یان شەوێ ئەوانەتان دی؟ دەزانن کێن؟ دوو قەرەیەخەیان لەگەڵ بوون، ئەو دوو کەسە کێن؟
ـ ئەوانە ئەمنییەن و فەرماندەکەیان سەروان خوداییە و لە شارەوە هاتوون، ئەو دوو قەرەیەخەیە، یەکیان رەسووڵی نۆکەر بوو، ئەوی دی نازانم، نەهاتۆتە نێو دێ، ئەویان لەگەڵ نەبوو، ئێمە هەر رەسووڵمان دی و کەسی دی.
تاهیر هێندێ ماتبوو. پاشان گوتی:
ـ سەعیدی نۆکەر کێ کوشتی؟
ـ وەڵلاهی نازانم، دەڵێن چەتە، راست، یان درۆ، وایان بە ئێمە گوت، ئێمە لە تاریکیدابووین.
ـ درۆ دەکەن، سەعید رەسووڵ کوشتوویە! ئەو شەوەی کە هاتنە سەر ئێوە و بە ناوی چەتە تالانیان کردن، ئەوەش دەستی رەسووڵ و ئاغای تێدا بوو، باوەڕیان پێ مەکەن، چەتە لە گۆڕێدا نییە، ئەگەر ببێ، ئێمە دەزانین، خۆیان تالانتان دەکەن و دەڵێن چەتە بوو، راوی رێوی بۆ کەولە، دەیانەوێ ئێمە بە چەتە بە ئێوە بناسێنن، ئێمە چەتەین؟ نەوەڵلا، نە بە خودا، من تاهیرم، بە دووی حەمەدا دەگەڕێم، حەمە شوان، شوانەکەی کانی توو، ئەگەر چوونەوە، بە سەروان و ئاغاکەتان بڵێن تاهیر دەیگوت تا دەتوانن نێوی چەتە و پیاوکوژم وەدووخەن، ئاخری مەعلووم دەبێ کێ پیاو کوژە، هەق بە ناهەق نابێ و ناهەق بە هەق نابێ، بڵێن دەیگوت وەدوومان نەکەون، ئەو ئەمنییانە بە کوشت نەدەن، ئاخر ئەوانیش ژن و منداڵ و کەسوکاریان هەیە، ئێمە حەز بە پیاوکوشتن ناکەین، ئەوانە کە کوژراون، بۆیان بە خەمین، ناچارین بیانکوژین، دەنا دەمانکوژن، ئەوە بە سەروان بڵێن. بڵێن تاهیر دەیگوت وە دوومان نەکەون، ئەمجارە بەزەییمان پێیاندا هات دەستمان لێ پاراستوون، جارێکی دی تووشمان بن، دار بە دەستیان لێ دەبڕین، بە ئاغاکەشتان بڵێن، پیاو دەکوژێ و دەینێ بە سەر چەتەدا؟ بڵێن تاهیر دەیگوت کارێ نەکا بیکەینە پەڕۆی بۆسۆ. بە رەسووڵیش بڵێن تاهیر دەیگوت پێی لە بەڕە درێژتر کردووە! پێی دەبڕینەوە، تۆڵەی سەعیدی لێ دەستێنین، دەست هەڵگرێ و ئەو کارانە نەکا. دەوێرن ئەوانە بڵێن؟

ئەویەکەیان دەمڕاستی نێویانە لە تاهیر چووە پێشێ:

ـ ئەگەر باوەڕ بکەن، دەوێرم، ڕاسپاردەم، هیچم لە سەر نییە، بەلام باوەڕ ناکەن! چۆن باوەڕ بە ئێمە دەکەن ئێوەمان دیبێ؟

تاهیر بانگی کرد:

ـ قادر! کاغەز و قەلەمێ بێنە، یەکتان ئاورێ هەلکەن، کێ ئاوری پێیە؟

یەکێ لەو لاوە چەرخە نەفتینەی دەرهێنا، سێ چوار جار لێیدا و هەلیکرد. تاهیر لە سەر کاغەز چوار پێنج کەلیمەی نووسی و دایە دەستی:

ـ ئەوەیان بدەیە باوەڕ دەکەن، دەبڕۆن تەرم بارکەن.

پازدە کەس تەرمی شەش ئەمنییەیان لە گوێدرێژ هەلبەست و بە پەلە ڕۆیشتنە خوارێ، ئاخرکەسیان هێشتا لە سەکۆ نەترازاوە. تاهیر بۆ خاترجەمی گوتی:

ـ ئەوانەی گوتم، پیان بلێن، کاغەزەکەتان لە بیر نەچێ! بیاندەنێ.

ـ نا نا لە بیرمان ناچێ، دەیاندەینێ، دەیاندەینێ.

## ٢٣

غەریب هەی غەریب، غەریب دیارەن   جێگای غەریبان گـۆشە و کـەنارەن
هــەرکەسێ ماچۆ غەریبی خاســـەن ئەویش جە جوملەی خوا نەشناسەن

هەڵوەدای و رەبەنی، غەریبی و کەسنەناسی، ناشارەزایی بە شار و شەقام بە خەڵـک و زاراوەیان، بە پووڵ و پارە و نــرخ، نــامۆ و دووره پـەرێزیــان کــردووە و لـە قــوژبنی چایخانەکەی بلە ئێرانی، لە شاری سولەیمانی هەڵکورماوە و هەر دەڵــێی حەمــە زیـت و وریاکەی جارانی کانی تووش نییە.

کزوکەنەفت، رەنگ پەڕیو و لێو بە بار، زەق زەق دەڕوانێتە دارودیوار و لێیان مـۆن دەبێتەوە.

چایخانەکە گەورەیە. چوار کۆڵەکە، دوو کاریتە و سێ بەرەدەستەکیان گرتــووە بـە کۆڵەکەوە. بن میچەکە بە پارچەیەکی شین داپۆشراوە و دارودەستەکی بە دیارەوە نییـە. لە چوار لای بن میچەوە. چوار زنجیر شۆڕەوە بوون. سەری هەرکامیــان قــولابێکی تـێ هەڵکێشراوە، جێی هەڵواسینی چراتوڕن.

دوو بەدنی چایخانەکە یەک پتوون پەنجەرە و شووشــە بەنــدە. دەرگــای خۆرئــاوای دەچێتەوە سەر شەقام. لای خۆرهەڵاتی دەچێتەوە بازاڕ، جەنگەی جەنجاڵــی شــارە، نێــو چایخانەکە بە چوار دەور و نێوڕاستدا، مێز و کورسی ریز دانراوە، کۆلان کۆلانی چۆڵە، رێی هاموشۆیە.

لای سەرەوە، لە قوژبنی خۆرئاوایەوە، ریزە پلیکانێکی داریــن، بــە دە دوازدە پلیکــان وەسەردەکەوێ، لە سەر ئاخر پلیکانیان دەرکەیەکی شین دیــارە، نهــۆمی دوو هــەمــە و میوانخانە و جێ خەوە.

دوو سەماوەری ڕەژی زەرد و گەورە، لە سەر مێزێکی پان و بەرینی ئاسنی، لە بەر پەنجەرەی رووکاری بازاڕ قوڵت و هۆڕ دەکوڵێن، لەوانەیە باڵ بگرنەوە. مەنقەڵێک بە پۆلوە ڕەژی دامرکاوە و لەو لای سەماوەرەکان، لە سەر مێزەکە، دوو چادانی گەورەی چیمکۆی زەردی لە سەرە. کوڕە جەحێڵێک، بە تەمەنی بیست و یەک دوو ساڵە لەبەر شێرەی سەماوەرەکان وەستاوە. کۆمەڵێ ئیستیکانی لە تەشتێ ئاو خستووە و یەک بە یەک لە ئاوەکەیان وەردەدا و بە فۆتەیەک دەیانرسێ و سەرەو نخوون لە سەر مێزەکە ریزیان دەکا.

لەبەر پەنجەرەی رووکاری شەقامەوە، مەنقەڵێک بە شووشەبەندەکەوە نووساوە، کۆمایەک ڕەژی لە لایەکی هەڵدراوەتەوە، دوو سێ پۆلووە ئاور لە ژێرەوە بە دەم کزە باوە دەگەشێنەوە، لە حاندی مەنقەڵەکە، چاوەیەک لە شووشەبەندەکە دەرهاتووە.

لەم دیوەوە پیاوێکی کامڵ، تان وپۆ لە ریشی کەوتووە، قۆڵی هەڵماڵیوە و پڕ تەشتێ گۆشتی قیمەی لەبەر دەمە و زوو زوو دەستێ لە جامە ئاوەکە وەردەدا و پڕ بە چنگێ قیمە هەڵدەگرێ و لە شیشی ئەدا. لە شانی ڕاستی، لە سەر چوار چێوەیەکی دارین، ریز ریز لە سەر یەک هەڵیاندەچنێ.

لەو لای مەنقەڵەکەوە، کوڕێکی مێرمنداڵ تابلەمەیەکی پڕ لە ڕەژی، لە بنەوە دوو سێ پۆلووە ئاوری تێدایە، بە تێلێکی درێژەوە، بە دەوری سەریدا هەڵدەخولێنێ. لەگەڵ هەر سووڕێ، ڕەژی دەگەیشتەوە و پریشکە ئاور، قرچوهۆڕ بە چوار دەوردا بڵاو دەبنەوە. پاش گەشانەوە، تابلەمە ئاوری هێنایە ژووری و پێنج قلیاناوی ساز کرد و هەریەکەی لە بەر دەمی مشتەرییەک دانان، دەستیان کرد بە مژ لێدان و قوڵتەقوڵت.

لەگەڵ هەر مژێ، دووکەڵ وەک مارێکی بۆری ئاوی، پێچ پێچ بە شووشەدا تا سەر ئاوەکە دەڕواتە خوارێ و لە سەر ئاو پەپۆکەی دەخوا، ئەو دیمەنە سەرنجی حەمەی ڕاکێشا بۆ وێنەیەک کە بە بەدەنە دیواری پشت سەماوەرەکانەوە، بە چوار بزمارەوە هەڵواسرابوو.

وێنەی کابرایەکی ئەستوورەی ورگن و سمێل قەوی، قلیاناوییەک لەبەر دەمیەتی، سەری لوولەی قلیانەکە لە زاریدایە و سمێڵی، لوولەکەی داپۆشیوە و باریکە دووکەڵێ بەم لاوئەو لای سمێڵیدا، بە ئاستەم دەموچاوی داپۆشیوە. شاگرد چایچییەکی لەڕ و

باریک، بە ئیستیکانێ چاوە، بە کرنۆشەوە، دەستە و نەزەری وەستاوە. کاغەزی وێنەکە لە بەر کۆنی و دووکەڵ زەرد هەڵگەڕاوە.

لەو لای ئەوەوە، دوو وێنە، هەر یەک لە قەتحەیەک گیراون و بە دوو پەتەوە، بە دیوارەوە شۆڕ بوونەتەوە.

وێنەی یەکەمیان پیاوێکی بە هەیبەت و وێچوو و سکە جوانە. دەستێ کەواو پاتۆڵی ڕەشی لەبەر دایە، پشتوێندی بۆری تا بن هەنگڵ لە سەر گرێ چن کردووە. خەنجێری دەبانی دەسک ماهی لە بەر پشتوێند هەڵچەقاندووە. شەدەیەکی گەورەی بە لارەوە لە سەر ناوە، دەنکە دەنکە ڕشوە بە تەوێڵە پان و چین چینەکەیدا تا سەر برۆ گرژەکانی شۆڕ بوونەتەوە و لفکەی شەدەکە تا سەر پشتوێندە گۆزنگرێکەی هاتۆتە خوارێ و سۆرانی سپی کردووە بە قۆڵدا. لەگەڵ ئەوەی بزەی لە سەر لێوە، تووڕە و بە سام دەنوێنێ. سمێڵە ڕەش و ئەستوورەکەی، بەری گیراوە و قەیتانی لێوی سەرەوەی دیارە، ورە و وەزەی پیاوانەی لێ دەبارێ و مچوڕکی خستۆتە لەشی حەمەوە.

وێنەی دووهەمیان پیاوێکی خوێن شیرین و ڕەزاسووکە، ئەوەندە لە بەر دڵان و ڕوخۆش و دەم بە بزەیە، بێ ئیختیار حەمە بە دەمیەوە پێدەکەنێ. لە نەکاو کوڕە چاییچییەکی دەستی بەرەو رادیۆ ئەندەڵیاکە هەڵێنا و وێنەی لەبەرچاوی حەمە ونکرد:

ـ دەنگی رادیۆی ئێراقە بەشی کوردی لە بەغداوە.

دەنگی رادیۆ زەینی حەمەی بەرەو خۆی کێشا و بە تامەزرۆییەوە چاوی تێبڕی و گوێی بۆ شلکرد. لەوەوبەر، لەم و لەوی بیستووە رادیۆ هەیە، تا ئێستا بە چاو نەیدیوە و گوێی لێی نەبووە، چووە نێو خەیاڵەوە. هەموو دانیشتووانی چایخانەکە بێ دەنگن. لە پڕ یەکێ لە قلیان کێشەکان دەمی لە قلیاناوییەکە کردەوە، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ کەریمگیان! دەورێ چاییمان بەرێ، تۆزێ دەنگ بە رادیۆکەش بە، ئەوە سێوەیە گۆرانی ئەڵێ، دەنگی بەرێ:

سوارەی مەزنی، سەد جاران بە من مەزنی
سینگت لە پۆلای و سەرت لەئاسنی
ئەو ڕۆژەم تۆ بە مەردی دەدی
کە شیرت هەڵدەکێشا لە کالانێ
دەتبڕێ کەپۆ و لووتی عەلی بەگی داسنی

هەی سوار ئەمن چەندەم گاز کردیی مەڕۆ بە تەنێ
لەشکری عەبدوللای حەسۆی رەلەدی بەرازی
گەلێ گەلێ زۆرن برینانت دەکەن لە بەدەنێ
وەگەڕێ چووکەلە سوارێ وەگەڕێ

حەمە چاوەکانی وەک دۆدانە زەلیون و فرمێسکیان تێگەڕاوە، لە بیانوون بجوولێتەوە و بڕژێنە خوارێ. وەیدەزانی ئەو کەسی لەگەڵ سوارەیەتی، کەوێیە و سوارەش خۆیەتی و عەلی بەگی داسنیش عەتا بەگە. لە نەکاو بە زرینگەی ئیستیکانێ، کە کەریمی چایچی لەبەردەمی دانا، راپەڕی.

حەمە دەستی دایە کەوچک و دوو کەوچک شەکری لە چایەکە کرد و شێواندی. بە دەم چا خواردنەوە، چاوەکانی وەک دوو باشووی چێ، باڵیان گرتەوە و لە سەر وێنەی پەنای رادیۆکە لەنگەریان گرت، گێژ و مەنگ، تێی دەڕوانێ. دەستێکی هێنا بە چاویدا و زیاتز لێی ورد بۆوە! وەک ئەوەی باوەڕ بە چاوی نەکا، وابوو: دیسان هەڵیانیگلۆفیەوە، دڵی داخورپا و بە تەکان وەقرت و فرت کەوت! لە جێ هەستا، جێی گۆڕی، لەو روانگەوە تێی دەڕوانێ. وێنەکەش چاو لەو دەگێڕێ، لەگەڵی دەگەڕێ و بە دەمیەوە پێدەکەنێ! هانیدەدا زیاتر سەرنجی بدا، هەتا لێی ورد دەبێتەوە، زیاتر لە رەوانیدا نیشتەجێ دەبێ، ئەو شێوە و دروشمە هێندە لەبەرچاوی ئاشنایە، دەڵێی بە درێژایی تەمەنی لەگەڵی بووە! تا تەماشای دەکا، جار لەگەڵ جار دڵی توندتر لێئەدا و مێشکی دەهەژێ. نێو چاوانی نایە سەر لەپ و چاوەکانی چوونە سەر یەک و چووەنێو گێژاوی خەیالەوە.

بیری وەک گچکە تاژی تێبەرنەدراو بەدەشتی کورتی تەمەنیدا راوێچکە دەکا، لە بەردەلانی ناکامیدا سەرەنگرێ دەبەستێ و نینۆک هەڵدەوەرێنێ، بێ ئاکام هانا دێنێتەوە بەر خۆی:

ـ ئەوە کێیە؟ وەک کێ دەچێ و لە کوێم دیوە؟! ئاوێنە باخەڵییەکەی دەرهێنا، بە دزییەوە دەڕوانێتە خۆی! چاو لە وێنەکە دەکاتەوە، سەرنجی خۆی ئەداتەوە! چاو لەو دەکاتەوە! وێنەکە لە گوێێ ئاوێنەیەکی بالانوێن بێ و خۆی تێدا دیبێ!! هەر خۆی بوو! دو سێ جار خەریک بوو لە جێ راپەڕێ و پڕ بە زاری هاوار بکا و بڵێ:

ـ ئەوە، ئەوە... بەلام غەریبی و کەس نەناسی ئەو ئێزنـەی نـەدایـە، لـە جێـی خـۆی دایمرکاندووە، وەک ماخولیا، گێژ و وڕ چاوەکانی بوون بە جۆلاتەنە و رایەلـەیـان لـە سەر روخساری وێنەکە ناوەتەوە و پۆی خەیالی تێوە ئەدا.

گلێنەکانی وەکو دوو ماسی رەش، لە نێو گۆمیلکـەی چاویـدا، دەلـێی ژارماسـییان خواردووە، خۆ دەکەن بە بنە پەرچی مژولیدا و دێنەوە دەرێ، گێژ دەخۆنەوە.

نیوەڕۆیە وجەنگەی نیوەڕۆژەیە. دەستە دەستە حەشیمەت لە هەر دوو دەرگاوە دێنـە ژووری،چایخانە ئاخنرا. کەریم و کوڕە مێرمنداڵەکە پەیتا پەیتا کەباب و نـان دەگێـڕن. کەبابچییەکە دەست دەست کـەباب وەسـەر مەنقـەلـیە ئـاور دەخـا و بـە بـاوەشـێن دەیگەشێنێتەوە. لە کونی پەنجەرەوە هاوار دەکا:

ـ کەباب کەباب، کەباب بە نانی تازەوە، فەرموون، فەرموون.

بۆنی کەباب، بۆ چرووک و دووکەڵ، چایخانە و دەوروبەری پڕ کردووە و مـەدە و ئێشتیای رێبواران ساف دەکا و دەیانکێشێتە ژووری. هاتوهاواری کـەبـابچی و گرمـەی خەلک و دەنگی رادیۆ، دەنگیان داوەتە دەنگی یەک و کەس لە کەس حالی نابێ.

حەمە کاس و وڕ، چاوی لە سەر وێنەکەیە و لە زەریای رابروویدا وەک کەسێ مەلـە نەزانێ، پەل دەکوتێ. لە نەکاو دەستێ لە دواوە شانی گوشی و کەشـەفێ بـە سـێ نـانی تازەوە دەستێ کەبابەوە، خشایە بەردەمی. سەری وەرسووراند، کـەریمـی چـایچی بـوو، نانەکەی دانا و خەریکە بڕوا، حەمە، مەچەکی کەریمی بە کەشەفەکەوە توند گرت:

ـ کاک کەریم! پرسیارێکم هەیە، عەیب نییە؟

کەریم بە بزەوە گوتی:

ـ عەیبی چییە؟

ـ ئەو عەکسە کێیە؟

کەریم سەری بەرەو وێنەکان وەرسوڕاند:

ـ ئەوەی خەجەرەکەی بە بەروەیە، شێخ مەحموودی نـەمرە و ئـەوی تریـان وەسـتا برایمە، خاوەنی ئەم چایخانەیە دەیناسی؟

ـ خۆی کامەیە؟ عەکسەکەی زۆر ئاشنا دێتە بەر چاوم.

ـ خۆی لێرە نییە، چووەتە سەفەر، دوو سـێ رۆژیتـر دێتـەوە. وە دیـارە غـەریبی، ئێرانیت؟

ـ ئەریّ.
ـ تازە هاتووی؟
ـ ئەریّ، ئەم بەیانییە گەییومەتە ئێرە.
ـ بە خێر بێی، منیش ئێرانیم، ئەو کەبابچییەش ئێرانییە، وەستا برایمیش زوو خەڵکی ئێران بووە.
ئێستاش هەر بە بلەی ئێرانی ناوی ئەبەن، تا نەڵێی بلەی ئێرانی، کەس نایناسێ. کارم زۆرە، ئەبێ برۆم، دوایی ئەتبینمەوە، رەنگە شەویش لێرە بی، دێیەوە؟
ـ جێتان هەیە؟
ـ ئەریّ ئەریّ. جێی باشت بۆ دائەنێم، وەرەوە، جاریّ سەرم جەنجاڵە، ئەڕۆم. کەریم دوورکەوتەوە. حەمە لەبەر خۆیەوە ناوی خاوەن وێنەکە دووپات دەکاتەوە:
ـ بلەی ئێرانی! بلە ئێرانی! ئەو ناوە لەو ناکاڵێتەوە! دەبێ وا نەبێ!
دەستی برد بۆ کەشەفەکە، رێزە رێزە لە نانەکە دەپچڕیّ و بە قەدەر سەرە نینۆکێ کەبابی تێدەخا و نەبەدڵانە لە زاری دەنێ، بێ ئەوەی لێو بکاتەوە، پیرانە و چەواشە دیجوێ. چاوی وەک دوو پەرەسێلکە بە چایخانە و نێو خەڵک و سەر شەقامدا باڵ لێ ئەدەن.
داب و دەستوور و سەروبەرگی خەڵک، هاتوچۆی ماشێن و دووچەرخە بە شەقامدا، جەنجاڵی و حەشیمەت بە جەماوەر. ئەوانە هەموو بۆ ئەو تازە و نامۆیە. بێ ئەوەی خۆی بزانێ چاوی سووڕانەوە سەر وێنەکە. وەک قیبلە، ئەقرەبەی قیبلە نمای چاوی سوژدە و کڕنۆشیان بردەوە بەر شێوە و دروشمی و تێیدا دەتوێنەوە.
دوانیوەڕۆیە. حەمە لە چایخانە وەدەرکەوتووە و تێکەڵی جەماوەری خەڵکە. شاری سولەیمانی لەبەرچاوی دەریایەکی بێ سنوورە و ژاوەی دێ لە حەشیمەت، سەرسام وعەبەساوە! بە درێژایی تەمەنی ئەوەندەی خەڵک بە جەماوەری نەدیوە. گێژ گێژ، بێ ئەوەی خۆی بزانێ بەرەو کویّ دەچێ، بە شەقام و نێو حەشیمەتا دەخولێتەوە، بەڵام بەر لەوەی لە چایخانەکە دوورکەوتبێتەوە، مزگەوتی بازاڕ و پەنای چایخانەکەی کردووە بەنیشانە بۆ گەڕانەوەی.
شارە کوردنشینەکانی ئێراق، بە تایبەت شاری سولەیمانی لەو تافەدا قەڵا و مەکۆی پیاوانی سەربزێو و هەڵاتووی دەوڵەتە دراوسێکانە، بە تایبەت دراوسێ کوردەکان

قەدەغە و قۆرغ و بەرگیرەوەیان بۆ نییە، جێی کار و کاسبی وخۆشاردنەوەیە، بەهار و هاوین و پایز و زستان کەس بێکار نابێ، گەرمێنە.

ولاتە گەرمێنەکان، رۆژی گەرمە و شەوی فێنکە، شەو کە دەزرینگێتەوە، بایەکی سارد هەڵدەکاتێ و تەزوو دەخاتە لەشەوە، بە تایبەت لە پاییز و زستاندا.

ئاخر مانگی پاییز و سەرماوەزە، حەوت و هەشتی مانگە. شەقام و کۆلانی شار بە شەوقی کەم تەوژمی مانگ، رەنگی زیوێکی خۆڵەمێشی گرتووە بە خۆیەوە.

شەو درەنگانە. جار جار کزەبایەک لە پەنجەرە دوو دەرییەکەوە، کە رووەو قیبلە کراوەتەوە، دێتە ژوورێ. دیوەکە بچووک و یەک تەختییە، بە بایەک سارد دەبێتەوە، پەنجەرەکە پێوە دەی، گەرم دەبێتەوە.

حەمە مچورکێ بە لەشیدا هات، بێ ئەوەی قسەکانی کەریم ببڕێتەوە، سەبرێ هەستا و پەنجەرەکەی پێوەدا و هاتە سەر تەختەکە و لە شانی کەریمەوە دانیشت، جوابی پرسیارەکانی ئەداتەوە.

ـ ناوم محەمەدە، دایک و باب و کەسوکاریشم هەیە و خەڵکی چۆمی مەجید خانم، تۆ چی؟ کەس و کارت هەیە؟ خەڵکی کوێی؟

کەریم هەناسەیەکی هەڵکێشا، چاوەکاڵەکانی نایە سەر یەک، کڵاوە سپییەکەی راست کردەوە، پەنجە خەناوییەکانی نایە نێو یەک و سەبرێ گوتی:

ـ باوکم بە رەحمەتی خوا چووە، ئەو دەم کە لەوێ بووم، دایک و برا و براژن و خوشکم بوو، ئێستا نازانم کێ ماوە کێ نەماوە، خەڵکی سەرشیوی سەقزم، سێ ساڵە لەوێ رامکردووە و پەرِوازەی ئێرە بووم، لە ترسی سەربازی و ئاغا رامکردووە، تۆ سەربازیت کردووە؟

ـ نەوەڵلا، منیش وەک تۆ لە ترسی ئاغا و سەربازی هەڵاتووم. کا کەریم!بڵێی کارم دەس کەوێ؟

ـ چی زۆرە، کار. چی ئەزانێ؟

ـ هیچ لە کارێکی سووک دەگەڕێم، کاری قورسم نەکردووە، بڵێی کارێکی سووکم وەگیر کەوێ؟

ـ کار زۆره، کەس بۆ کار دانەماوه، شاگرد قاوەچییەک، شاگرد کەبابچییەک، چووزانم، لەبەر دەستی تاجر و تۆجارێ، ئێره لەو کارانەی زۆره، کەمتر خەڵکی ناو شار لەو کارانه ئەکەن، زۆرتر خەڵکی هەندەران بۆ ئەو کارانه ئەگرن، وەستا برایم نییه لە ماڵۆ، بێتەوه، رەنگە کاری تۆی بێ، چەن رۆژ لەمەوبەر چایچییەک لێره کاری ئەکرد، ئەو رۆیشت، لەوانەیه بێتەوه تۆ لە جێی ئەو دانێ، بێتەوه خۆم پێی ئەڵێم، بەڵکوو لێره دامەزرێی، ئەی دامەزرایەی! به خوا خۆش دەبوو.

لەودەمەوه کەریم قسه دەکا، به دەم قسەکانییەوه پەنجەکانی دەخا بەم دیووئەودیودا و هەڵیاندەگولۆفێ.

حەمه به سەر سوڕمانەوه سەرنجی داوەته پەنجەی خەناوی، به شەرمەوه پرسی:

ـ کا کەریم! عەیب نەبێ! دەستت بۆ داوه لە خەنه؟!

کەریم سەرنجی دەستوپەنجەی خۆیدا، به بزەوه گوتی:

ـ به ناشکوری نەبێ، بووین به کچ! ئەونە ئاوی کولاتووی پیا ئەڕژێ، ناسکی کردۆتەوه، کاری قاوەچییەتی ئەوەیه، ئیشاڵڵا دەسی تۆش لە خەنه ئەگرین، با وەستا برایم بێتەوه.

هەر دوو دەستیان به پێکەنین کرد.

ئەو شەوه تا دەرنگانێ پێکەوه دووان. کەریم سینه ساف و ساکاره، ئەوەی لە دڵیدا بوو، بێ پێچوپەنا گێڕایەوه.

حەمه خۆڕاگرانه، هەموو شتێک ناڵێ، زۆرتر پرسیار دەکا، زۆربەی پرسیارەکانی سەبارەت به بله ئێرانییه. کەریم ئەوەی زانیبێتی بۆی باسکردووه.

سێ شەو به شەوگاری پاییز پێکەوه دانیشتن. دۆستایەتی و نێوان خۆشی کەریم و حەمه شەو به شەو خۆشتر دەبێ.

له ماوەی ئەو سێ رۆژەدا، حەمه بێ ئۆقره چاوەڕوانی گەڕانەوەی بله ئێرانییه. ئەمرۆ رۆژی چوارمه و وادەی گەڕانەوەیەتی. حەمه وەک ژان کردوو، لە بەیانییەوه هەر دەچێتە دەرێ و دێتە ژوورێ.

دەمادەمی عەسر، حەمه سەری هێنایه ژوورێ. کەریم به چاو تێی گەیاند و ئاماژەی کرده کابرایەکی ئەستووری ورگن! نێو چاوان چرچولۆچەکەی تاڵێکی قژ پێوه نییه. برۆی به جێی برۆ باریک و جوانەکانی وێنەکە، پان و ئاڵۆز، تاڵ تاڵ بەربوونەتەوه و

بەرچاوە سیسەکانی گرتووە. کەپوو زل و داچۆڕاوەکەی، بە سەر سمێڵە ماش و برنجی و قەڵتە قەڵتەکەیدا شۆڕبۆتەوە. دەمولێو ئەستوور و زرپنەیە. روومەت و چەناگەی لە چاو وێنەکە پان ودرێژن وهیچ پێوەندیکیان بە یەکەوە نییە، تەنیا پێوەندیک کە هەیانبێ، بزەی لێویانە و بەس.

حەمە بە وەڕەزییەوە سەری داخست و چووە قوژبنی سەرەوەی چایخانەکە دانیشت وتەواوی ئاواتەکانی چەندین رۆژەی کە لە دەروونیدا بەدی کردبوون، لە گۆڕستانە کۆنەکەی دڵیدا ناشتنی. لە دڵەوە گوتی:

ـ بلە! بلە ئێرانی! ئەو ناوە پڕ بە پێستە! دەبێ هەر ناوی بلە بێ.

لەو دەمەیڕا حەمە بێ دەنگ لە قوژبنی چایخانەکە دانیشتووە. بلە ئێرانی چاوی لێ زەق بۆتەوە و بە سەرسوڕمانەوە تێی دەڕوانێ. دەڵێی لەوەبەر دیویەتی! بۆی ناچێتەوە سەریەک لە کوێ و کەی! شێوە و دروشمی هێندە ئاشنایە، دەڵێی وێنەگر مێشکی وێنەی کێشاوە و ئاوێتەی خوێن و رەوانی بووە! لە دڵەوە دڵێ: ـ ئەوە کێیە؟! چاو برۆ و دەم و لووتی لە ئاواتی کوڕم دەچێ! دەڵێی سێوێکن کراون بە دوان! ئەگەر ئەم قەوی و قۆڵ و سەوزە و بە تەمەنتر نەبایە، گوتومت خۆی! بڵێی کێ بێ؟ لە غەریبە دەچێ، رەنگە ئێرانی بێ.

ئەو عەسرە تا رۆژئاوا، بلە ئێرانی یەک وچان دوولایی سەرنجی لە حەمەیە و خافڵی ناکات، تا تەماشای دەکا، پتر لە دڵیدا نیشتەجێ دەبێ و خۆشی دەوێ.

ئێوارەیە و تەنگی نوێژی شێوانە. شەقام و بازاڕ وردە وردە چۆڵ دەبێ. چایخانە جگە لە دە دوازدە غەریبە، کەسی لێ نییە. بلە ئێرانی داخڵەی مێزەکەی کێشاوە و دەسکەوتی ئەو چەند رۆژەی کە لە ماڵ نەبوو، یەک جێ و بە دانگۆیی، بێ ژماردن دەریهێنا و لە گیرفانی خست، چاوێکی لە حەمە کرد و بەرەو دەرگای سەر شەقام وەرێکەوت، لەبەر دەرگاوە ئاورێکی لە حەمە داوە.

لەو دەمەدا، کەریم لە سەر پلیکانەکانەوە بانگی کرد:

ـ وەستا برایم! بێ زەحمەت کارم پێتە.

بە توندی رووی تێکرد. بەر لە گەیشتنی کەریم، بلە ئێرانی چووە دەرێ و ئەویش بە دوویدا رۆیشت. لەو دیوی پەنجەرەکەوە، لەبەر شەوقی چراتۆرەکان، بە جووت وەستان.

چاویان بڕیوەتە حەمە و بەزار لەگەڵ یەک دەدوێن. حەمە چاوی لێیانە، زۆرتر سەرنجی داوەتە سێبەرەکانیان، لە بەر شەوقی چراتۆرەکان بوون بە چوار، لە دڵەوە دەڵێ:

ـ باسی من دەکەن! رەنگە کەریم بۆ دامەزراندنی من پێی بڵێ.

بۆ ئەوەی خۆ سووک نەکا و منەتبار نەبێ، خۆی گێل کرد و رووی وەرگێڕا، ئەنەهوو هەر نەیدیون. پاش ماوەیەک، کەریم هاتەوە ژووری و بلە ئێرانی لەبەر شەوقی چرا و چاوی حەمە ونبوو.

لەوای عەسەرەوە، لەو کاتەوە حەمەی دیوە، تاوتییەکی سەیر ناخی گرتووە و مێشکی دەهەژێنێ. خەیالاوی و چەواشە رێی ماڵەوەی گرتۆتە بەر، بە دەم رێوە لەگەڵ خۆی ئەدوێ:

ـ ئەو دەم کە هەلاتم، کەسم لە پاش بە جێ نەمابوو! تازە ژنم هێنا بوو، سالی تێوەر نەگەڕا، بە جێم هێشت! خێزانم هەموو جارێ دەیگوت دووگیانم، بڵێی ئەوە ئەو بێ؟! رەنگە ئەو بێ! ئەگەر ئەو نییە، بۆ لە خۆڕا ئەوەندە لە دڵما جێی گرتووە؟! دەڵێی بەشێکە لە لەشم! ئەو ژنە بەستزمانەم چۆن بێکەس و بێدەر، لەو خانووە چۆلەدا بە جێ هێشت، بڵێی چی بە رۆژ هاتبێ؟ بە خوای خوێڕی بووم! تف لە غیرەتت پیاو! بە تۆش دەڵێن پیاو؟ بۆ بە جێت هێشت؟ بۆ نەچوویتەوە ماڵێ و لەگەڵ خۆت نەتهێنا؟ ئەی غیرەتت سەگ بیخوا پیاو!

هێندێکی دیکە بیری کردەوە:

ـ نا نا، خۆم بە تاوانکار نازانم! بۆ لە خۆڕا خۆت تاوانبار دەکەی؟ خۆ دەسەلاتی هیچت نەبوو، کوا دەرفەتی ئەوت بوو بیر لەوانە بکەیتەوە؟ خودا خودات بوو سەری خۆت دەرکەی، ئەویشت لێوە ببوو بە بار، خۆ ئێستاش ئەوەبیست و چەند سالە، لە کوولەکەی تەڕیشدا نەتوێراوە لە رابردووت بدوێی، ئێستاش لەوە دەترسێی ئاشکرا بی و پیاوی ئاغا بێ و بتکوژێ! نەکەی خۆت ئاشکراکەی، دار و بارەکەت باش کەوتووە، ئاشکرا بوونت هۆی ژانەسەرە، بێ دەنگەی لێ بێنە، بێ دەنگ و باس، تازە هەر چۆنێ بوو بێ، هیچت لەدەست نایە، بێ دەنگ بە، بێ دەنگ.

بێ دەنگ و خەیالاوی شەقام و کۆلانی بڕی. گەیشتە کۆلانی خۆیان. دوو سێ ماڵ لە ماڵەکەی خۆی دوورکەوتەوە، سەری هەڵێنا و لە جێ ئاوڕی داوە، سەرێکی لە خۆی

راوەشاند! تەماشایەکی دەوروپشتی کرد، کەس دیار نییە، سەبری پاشەوپاش گەڕاوە، لەدەرکەیدا. پاش ئیستا، خشپەی پێیەک و دەرگا کراوە:
ـ سلاو باوکەگیان! ئیوارەت باش.
بلە ئیرانی، بێ جواب، دەستێکی بە سەری ئاواتدا هێنا و تێی راما، زۆری سەرنج دایە، بێ قسە و باس چووە حەوشە.
ئاوات کاس و وڕ، بە دەرگاوە ماتبووە! لە بابی راماوە، بە سەرسووڕمانەوە، لە دواوە تێی دەڕوانێ!
بابی لەش قورس و داگیراو، بێ ئاوڕدانەوە، راستەوخۆ لە پلیکانەکان وەسەرکەوت، تەنانەت نەچووە سەر حەوزەکەی حەوشە دەست و دەموچاوی بشوا! ئاوات عەبەساو، چاوی لێیە، بابی دەستی نا لە دەرگای ژوورەکەوە، ئارەزووی خوشکی بە پیری بابییەوە هات، بە پێکەنینەوە سلاوی کرد، بابی بێ جواب چووە ژووری. ئاوات پشتی لە دەرگای حەوشە کردەوە، کاس و گێژ چووە ژووری و لەگەڵ ئارەزوو بەمبەروئەو بەری دەرگاوە وێستان و چاوی پڕ پرسیاریان لە بابیان بڕی!
دایکیان خەریکی شێو و کاسە و کەوڵە. لە نەکاو هاتە ژوورەکە. بە پێکەنینەوە، بەخێر هاتنەوەی لە شووەکەی کردو لە یەکەم چاوپێکەوتن، تێیگەیشت، بزە لە سەر لێوە تەسکەلەکانی تاساوە! نێو چاوانی لە ژێر زوڵفە رەش و سپییەکەیەوە چین چین وەستا و برۆ پەیوەست و باریکەکانی گرژیان خوارد، چاوە رەش و گەشەکانی پڕ بوون لە پرسیار و لە ئاوات و ئارەزووی روانی:
ـ ئەوە چ باسە؟
هەر دوو بێ جواب سەریان بەرداوە. چاوەکانی نەجیبە سووڕانەوە سەر بلە ئیرانی:
ـ ئاڵۆزی! چی روویداوە باوکی ئاوات؟
بلە ئیرانی هیچ جوابێکی بۆ ئەو پرسیارە نەبوو، لە خۆڕا بە زاریدا هات:
ـ هیچ نییە، هێندێ سەرمامە!
مەنقەلییەک پڕ لە رەژی گەشاوە لە نێوەڕاستی هۆدەکەیە، کتری و چادان لە سەری دەکوڵێن، دیوەکەی گەرم کردووە. نەجیبە بەرەو مەنقەڵەکە رۆیشت، ئارەزوو بەر لەدایکی گەیشت. کتری و چادانی داگرت و دەستی دایە هەر دوو قوڵفەکەی وهێنایە بەردەمی بابی و دەستی کرد بە شان و مل شێلانی.

ئاوات کزومات بە لای دەرگاوە وەستاوە، لە ژێـرەوە چـاو لـە بـابی دەکـا و جـار نەجارێ دەڕوانێتە دایکی.

بلە ئێرانی جار نە جارێ چاوێ لـە ئـاوات دەکـا و دەینووقێنـێ و شـێوەی حەمـە دێنێتەوە بەرچاو و لەگەڵ ئاوات بەراوەردی دەکا. ئاوات منداڵـکارە و پـۆلی دووەمـی سالی ئاخر دەخوێنێ. لە دەڵەوە دەڵێ:

ـ ئەگەر ئەو کوڕە خوێندبای، ئێستا لە زانستگا دەیخوێند. ڕەنگە ئەگەر وەک ئاوات سەرپەرەشتی کرابا، ئەویش سپیکەلانە و بە ڕەنگ و بۆ بایە، ڕەنگە تاڵ و سـوێری زۆر چەشتبێ، ئەگەر ئەو بێ، جگە لە دایکی کەس سـەرپـەرشـتی نـەبووە و خـودا دەزانـێ چەندەی بێوەژن کۆشی بۆ کردووە تا کردوویە بەو پیاوە، ئەویش ئەگەر مابێ! دەنـا بـە هەتیوی لە قوون دەرک و دووی مالان گەورە بووە، ئەگەر ئـەو بـێ، مـشکۆلەزمـەیم، باوکێکی خراپ و زالمم.

لە نەکاو بە دەنگی نەجیبە رایەڵە بیر کردنەوەی پسا:

ـ باوکی ئاوات! بۆ نوقمی خەیالی؟ چی ڕوویداوە؟ لێمانی مەشارەوە.

بلە ئێرانی خووی خێزانی دەزانێ، پاش ئەو چەند سالە، ئەگەر هەڵـکەوێ باسـێ لـە رابردووی بکات، نەجیبە ڕەنگی دەگۆڕدرێ، دڕدۆنگانە دەڵێ:

ـ بەخوا سالی بە هەزار چوو بێ و دە منالی وەک ئـاوات و ئارەزوومـان بـێ، تـۆ ئەڕۆیتەوە بۆ ئێران و بەجێمان دێلی.

لە بەر ئەوەی متمانەی پێ بکات، قەت باسی ئەو لایەنەی نـەدەکرد. بـە زۆر بـزەی خستە سەر لێو، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ هیچ نییە دایکی ئارەزوو، باوەر بکە هیچ نەبووە، هێندێ سەرمامە! پێم سەرمام بووە.

روویکردە ئاوات:

ـ وەرە دانیشە، بۆ دانانیشی کوڕم؟

سەری وەرسووڕاند و چاوی لە ئازەزوو کرد.

ئارەزوو پازدە سالانە و پۆلی دوەمی ناوەندی دەخوێنێ. نەکەڵەگەتـە و نـە کورتـە بالایە چاو و برۆ و روخساری لە ئاوات دەچێ، چەناگە خڕ و مل کورتە، چووەتـە سـەر دایکی، وەک ئەو سەوزە و دەم بە بزەیە. بەو ئاوڕدانەوەی بابی گەشـایەوە و لێـوی بـە سەر ددانییەوە پان بۆوە و سەر ڕوومەتەکانی خڕ بوونەوە:

ـ گەرمت هاتەوە باوکەگیان؟

ـ ئەرێ، وەرە دانیشە کچە جوانەکەم.

نەجیبە کەوتە کار. کەوڵی نانی ڕاخست، شێو دەخۆن. بلە ئێرانی بە دەم خەیاڵەوە شێوێ خوارد. حاڵەتێکی سەیری تێدا بەدی هاتووە! هەست بە شادی دەکا و نیگەرانە! تەزوو بە لەشیدا دێ، دەڵێی سەرمایەتی! یاوی هەیە و دڵی بە توندی لێ‌ئەدا! بێ ئۆقرەیە و دوو دڵە! دەڵێی دڵ لەدوایە و تەماداری هەواڵێکی نهێنییە! یان کوڕە جەحێڵەیە و ناردوویەتە خوازبێنی خۆشەویستەکەی و تەماداری گەڕانەوەی ڕاسپاردەکەیەتی هەواڵی بۆ بێنێتەوە، لە دڵەوە سێ و دوو دەکا:

ـ من بە کەریمم گوت بەیانی دێمەوە و ئەو دەم پێت دەڵێم.ئەگەر ئەو کوڕە زوو هەستا و ڕۆیشت چی؟ ئەو بێ و ئەو نەبێ، تازە بۆ من هەر ئەوە، دەبێ بە هەر لەونێ بێ نەهێڵم بڕوا، نانا ناهێڵم، هەر ئێستا دەچم، لە دەستم دەرچێ، تازە نادۆزرێتەوە.

بە تەکان لە جێ ڕاست بۆوە.هەستانەکەی هێندە لە نەکاو و کوتوپڕ بوو، هەموو ڕاپەڕین و هەستانە سەرپێ. نەجیبە ڕاپەڕی و بەرۆکی گرت:

ـ بۆ کوێ باوکی ئاوات؟

ـ دەچمە دەرێ، ئێستا دێمەوە.

دەستی کرد بە گیرفانیدا و پوولەکەی بە دانگوێی دەرهێنا و لە سەر قاڵیەکە هەڵیڕشت.

ـ تا ئەو پارەیە دەژمێری، من دێمەوە. دڵنیابە، ئێستا دەگەڕێمەوە. ئەوەی گوت و لە ماڵ دەرچوو.

شەو لە بانگی خەوتنان لایداوە. کەریم چووەتە دیوە بچووکەی حەمە و باسی ئەوەی بۆ دەکا:

ـ مزگێنیم بدەیە! وەستا برایم دەیگوت بەیانی بێمەوە کاری ئەدەمێ! تازە تۆ لێرە نارۆی و پێکەوە دەبین. لەو قسەو باسەدا بوون لە پڕ دەنگێ کەریمی بانگکرد. کەریم لە جێ ڕاپەڕی، وەک گەشکەدار گوتی:

ـ وەستا برایمە! بەڵێ بەڵێ، ئەوە هاتم.

ڕاپەڕین و دەرپەڕینی کەریم هێند بە حوجەت بوو، بای باڵی و پاتۆلەکەی، دای لە گڕی لامپاکەو وە لەرانەوە و پرتەپرتی خست. حەمە دەستی بەملاو ئەو لای زارکی

شووشەکەیەوە گرت و نەیهێشت بکوژێتەوە، لە دەرگاوە چاوی خستە دوای کەریم، بلـە ئێرانی و کەریم لە نێو دالان و بەردەرکەی میوانخانەکە وێستاون و قسە دەکەن. بلـە ئێرانی لە کەریمی پرسی:

ـ ئەو کوڕە ناوی چییە و خەلکی کوێیە؟ داخو دایک و باب و کەسوکاری هەیە؟

ـ ناوی حەمەیە، دەڵێ خەلکی چۆمی مەجید خانە و باب و کەس وکاری هەیـە، لـە ترسی ئاغا و سەربازی هەلاتووە، زۆر کوڕێکی باشە.

بە دەم قسە کردنەوە، بەرەو دیوەکەی حەمە هاتن. حەمە سەری کردەوە بە ژووردا و لە سەر جێ دانیشت.

بلە ئێرانی لە پێشەوە و کەریم بە دوویدا، چوونە ژووری و حەمە هەستا. بلـە ئێـرانی دایمەزراند:

ـ کوڕم! دەتوانی لێرە کار بکەی؟! کاری ئێرە گران نییە، هەڵبەت کاری گرانت پێ ناسپێرم، ئاگات لە سەماوەرکان بێ، بێ ئاو نەبن و ئیستیکانەکان بـشۆ و ئەوەنـدەی مـن لەوێ نەبووم، کەسێ چای ویست، بۆی تێکە، دەتوانی؟

حەمە تەماشایەکی پەنجەکانی کرد، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ دەتوانم، ئەگەر دەست و پەنجەکانم بیکێلێ! دەستی من بۆ ئـەو کارانـە دروسـت نەکراون، تا رادێن، دەبێ ئاگاتان لێم بێ.

ـ ناوت حەمەیە؟

ـ بەڵێ، حەمەی نۆکەرت.

ـ تۆ چاوی منی. حەمەگیان! لە قەدیمەوە گوتوویانە، دار لە لەلەدا دەشـکێ، بـا دار و لەلەی خۆمان دیاری بکەین، پێت خۆشە چۆن کار بکەی؟

ـ من نازانم، خۆت وەکیل بە.

بلە ئێرانی چاوێکی لە کەریم کرد:

ـ وەک کەریم باشە؟ ئەو رۆژی روبعە دیناریکی هەیە؟ هەڵبەت خواردن و خۆراک و جێ خەو و حەوتەی دووجار چوونە حەمام و جلوبەرگی کار لە سەر منە، ئەوانەش بـە تۆ دەدەم، باشە؟

ـ تۆ چۆنت پێ چاکە، منیش پێم چاکە، بەلام پرسیارێ؟ روبعە دیناری چەندەیە؟ بـە پوولی خۆمان دەبێتە چەندە؟

ـ روبعه دیناریّ دیناریّ دەبیّ به چوار بەشەوە، دەبیّتە روبعـه دینـاریّ. بـه زمـانیّکی دیکه، دیناریّ حەوت یان هەشت تمەنی ئەو دیوە، بە وەخت فەرق دەکـا، جـاری وایـه حەوت، تمەنە، جاری واش هەیە هەشت تمەنە، ئیمە حـەوت تمـەن حیـساب دەکـەین، رۆژیّ حەڤدە قران و پەناباتیّ دەکەویّ، بیّجگە لە خەرج، مانگیّ پەنجا و دووتمەن و نیـو دەکەویّ، پیّت باشە؟

ـ زۆر باشە، ئەگەر تۆ پیّت باش بیّ، من زۆرم پیّ باشە.

ـ دەی باشە، لە بەیانییەوە وەرە سەر کار، وەبزانە کاری خۆتە، رووی لە کەریم کرد:

ـ کەریمگیان! من چام نەخواردووە، برۆ چادانیّ چا بێنە با شـیرینییەکەشـی بخـویّن.

کەریم رۆیشت، بە چادانـیّ چـا و کەشـەفیّک و سـیّ دەسـتە ئیـستیکان و پیالـەیەک شەکرەوە هاتەوە، چا تیّکراوە و لە بەینی هەر سیّ دانـراوە سـارد بیّتـەوە. حەمـە و بلـە ئیّرانی، هەر یەک بە خەیالیّکەوە جار نا جاریّ دەڕواننە یەک

بلە ئیّرانی بەو خەیالەوەیە:

ـ ئەگەر باب و دایکی مردبان و خەلکی چۆمی مەجید خان نەبایە، ئیّـستا دەسـتم لـە ملی دەکرد و دەمگوت خۆیەتی، بەلام حەیف، دیسان قەیناکە، چونکە لە ئاوات دەچـیّ، لە بەر ئەویش بیّ...

حەمە لە بیری ناوەکەی و ویّنەکەی دایە:

ـ حەیف ناوی برایمە و لەگەل ویّنەکەشی زۆر لە یەک دوورن. خۆزگە لە ویّنـەکـە دەچوو ناویشی برایم نەبایە، بەلام چونکە خاوەنی ئەو ویّنەیە بووە، هەر خۆشم دەویّ.

## ٢٤

ترۆپک و بەرزایی، ئاسۆگ و سەرکەل، تـەلان و هـەلـدێری کێـو و شـاخ بـە دەورە بەفر گرتوونی. دەشت و پێدەشت، چالی و نزمی، گونـد و چـۆم کەوتوونـە گەمارۆیــەوە و ئەمڕۆ سبەی هەموو یەکسان دەبن.

پاییزەکێل بوون بە رەپستە، دێمەکار لە دوورەوە لە چاو دەدەن. پاییزەکەی پەلـەی داوە و گاسن کرەی نەکردووە و تا پاشبارە ودەن، گاسن لە ئەرز رۆچووە و قوڕ بـە نووکییــەوە هاتۆتە دەرێ. تەڕی و وشکی لێکدراوە، بەهارەکەی تەڕەسال دەبێ.

وەرزێڕ و دێم کێل، سەپان و شکارتە کێل، شوان و گاوان، مەلا و مجێور بە کەیفن. ئاغـا لە هەموان بە دەماخترە. بە قەدەر گشتیان ئەرز و ئاوی هەیە و باشترین زەوی هی ئەوە، پـاییز بە پیاو و گاو و جووتی رەعیەت دایدەچێنێ و هاوین بەگەلە درووێنەپێیان کۆ دەکاتەوە و لـە بەرەجووتی ئەوانیش دە و دوو و خەرج و پیتاک دەگرێ. تا ئـەوان زۆریـان هـەبـێ، ئـەو زۆرتری پێ دەبڕێ.

هەوا سارد ساردە. تەڕی پەلە و شەختەی پایز ئەرزی شیدار کردووە و شەوانـە دەبـێ بـە شاخ بە رۆژدا، خۆرەتاوان ئارەق دەکا و بە شەو سەر لە نوێ دەیبەستێتەوە. نـساران بـە رۆژ و بەشەو بەستوویە وشک وشکە. رەپستە توێژ توێژ زوقمی لە سـەرە و رەش داگـەڕاوە، هاکـا سەرما بردی. خەلک، خاس و عام دەستە و دۆعای بەفر کەوتنن بەلـکو دەغـل و دان سـەرما نەیبا.

گوندی تازاوا بە چوار دەوردا، تا دەگا بە کێـوەکـان، شـیناوەرد و رەپـستەیـە و شـین دەکاتەوە. داوێنی کێو، تا نێو قەدی، بۆر و رووتەنە. بەرەو لووتکە سەر هەلێنێ، یەکـدەسـت سپییە و بەفر گرتوویە.

چۆمەکەی بەردێ، لە سەردا بەند و بناوانی بە ئاودا دراوە و بەر بەرەللا یە. ئاو بە نێـودار و کزیچار و ئاوەڕۆی چەندین ساڵەی خۆیدا، پێچ پێچ و کەش و تووش هاژە دەکا و پـردەبـاز و بواری داپۆشیوە، لە هێندێ شوێن نەبێ، پـەڕینـەوەی ئاسـتەمە. قـاوەلـتوونێکی درەنگـە. سەرچۆم و لێژی قەڵا پڕە لە حەشیمەت. دەستە دەستە مەڕ و گاران دەبەن بۆ ئاو. لە سـەرووی دەراو و پاڵتەوە، کۆمەڵێ ئافرەت قاپ و کەوچک و پـەڕۆ دەشـۆن. دەسـتەیـەک کـوڕە جەحێڵەی خۆڕێخەر لە چۆم پەڕیونەتەوە، لە سەر ڕێی شار و بەرانبەر بە ئافرەتەکـان، تـەمادار و چاوەڕێ وێستاون.

بنەدیوار و بەر دەروازەی قەڵا ژاوەی دێ لە پیـاوان. کـەیخودا و پیاومـاقووڵا نی تـازاوا کۆڕکۆڕ لە دەوری یەک کۆ بوونەتەوە و چاویان بڕیوەتە ئەوبەری چۆم و ڕێی شار.

دەروازەی قەڵا کراوەتەوە و بەر بەرەللا یە، دەرکەوان بەرگری لە کەس ناکا،

ژنان لە نێو دێوە سەریان هەڵدا. دوو دوو و سێ سێ بەرەو قەڵا دێـن. دەگـەنـە حانـدی پیاوان، بە لوێ دەسماڵ دەموچـاو دادەپۆشـن. خـۆ باریـک دەکـەنـەوە و دەچنـە ژوورێ. حەوشەی قەڵا سیکەنە و سەرخانە! ئەحمەد فەڕاش سـەمـاوەر و ئیـستیکانی هێناوەتـە سـەر حەوزەکە و دەیانشوا.

نازدار کەلوپەلی مدبـەقی خـستۆتە دەرێ و دەیانتـەکێنـێ و وڵات خـاوێن دەکاتـەوە. کەلوپەلی کێشایەوە ژوورێ و تەنووری دەردا و وردە تەپاڵەی هێنا و تەنووری داخست.

حەسەن مەیتەر بە گسکە کۆلەوە دێت و دەچێ، هەر دەچێتـە تـەویلـە و دێتـەوە دەرێ، ئاخوڕی ژوور و دەرێ دەماڵێ، سەری خستۆتە سەر حەو هەشت ژنە نێو دێیی کـە خـەریکن حەوشە دەماڵن.

چوار پێنج پیاو، چوارپەلی جوانەگایەکی فیتەریان بە گوریس بەستووە و لە سەر جۆگـەی حەوزەکە، ڕوو بە قیبلە ڕایانکێشاوە. فەیزە درێژ سۆرانی لە مل گرێداوە و تا پشت ئەنیشکی؛ قۆڵی هەڵماڵیوە و چەقۆی سەرتاشی لە سەر گرێی ملی جوانەگا ڕاگرتـووە، تـەمـادارە مـەلا برایم دۆعا بخوێنێ و نییەتی مەولوودی لێ بێنێ.

دۆعا تەواو بوو، مەلا نییەتی مەولوودی لێ هێنا و بە دەسـت ئامـاژەی کـردێ و فـەیزە چەقۆی داگرت گرێی ملی دابڕی. خوێن بە دەم چەقۆوە فیشقەی بەست و پڕژایە نێو جۆگـە و ئاوی سوور هەڵگێرا و جوانەگا بۆڕاندی. بۆڕە لە جێ چەقوو گەرووی هەڵبڕاویەوە، بـوو بـە لرخە و خوێن هەر دێ و زیاد دەکا.

فەیزە جار لەگەڵ جار دەمی چەقۆ دادەگرێ و ملی جوانەگا دەخا بە پشتدا، و مۆخی دەژەنێ. پاش خۆکوتان و پەلەقاژەیەکی زۆر، جوانەگا شلبۆوە و بوو بە کەلاک.

چوار پیاو، چوارپەلی کەلاکیان گرت و لە جۆگە دووریان خستەوە و کەولیان کرد. ورگ و ریخۆلەیان دەرهێنا و لە سەوەتەیان خست.

مەلا گوتی:

ئێمە بە شەرع موسوڵمانین، شەرع دەفەرمێ: حەیوانێ کە نییەتی مەولوودی، یان قوربانی لێ بێ، ئەو جێیانەی بۆ خواردن نابن، دەبێ لە چاڵ خرێن. ئەو ورگ و ریخۆلە لە چاڵ خەن و داپۆشن.

دوان لە پیاوەکان، یەکیان سەوەتەی دا بە کۆڵدا، ئەوی دی بە پێمەرەوە، لە دەرگای پشتەوە لە حەوشە چوونە دەرێ.

سەگەلی نێو دێ بۆنی کەلاک و گۆشتیان کردووە، دەوری دیوار و دەرگای پشتەوەی قەلایان داوە. بە وەدەرکەوتنی سەوەتە، گشت زیت بوونەوە و بە دەم لستنەوە، وەدووی ورگ و ریخۆلە کەوتن. لە دوورەوە ملاسکە ملاسکیانە و ئاو بە زاریاندا دێتە خوارێ.

لە سەر تەپۆلکی خوار قەلاوە، ئەژنۆیەک ئەرزیان درێ و ورگ و ریخۆلەیان شاردەوە.

دوو کەسەکە گەڕانەوە. سەگەل چوونە سەری، دەستیان بە مشتومڕ و بۆن بە ئەرزەوە کردن کرد.

گۆشت لە سەر پێست پیل پیل کراوە. مەلا برایم بە قەڵەم و دەفتەرەوە، بە پێی بەراتێ کە وەریدەگرێ، سیایی مالانی گرت. بە مالی خۆیانەوە و دەسوپێوەندی قەلا و مجێورەوە، پەنجا و پێنج بەش هاتە حیساب. بە دەنگێکی بەرز بانگی عەدلە خانمی کرد:

ـ خانم!پەنجا و پێنج مالە، بەشی کەین؟

پەنجەرە کراوە، عەدلە خانم هاتە سەرسەرا و جوابی داوە:

ـ جەرگ و دلی و رانێکی دانێن بۆ خۆمان. سێ بەشیش جیاکەنەوە بۆ کانی توو، بەشێکی بۆ پوورەگوڵە و یەکیان بۆ مالی کوێخاکەریم و ئەوی دیکە کافەیزوڵلا بیباتەوە. باقی، بە پێی خێزان، بە دێدا بەشی کەن.

گۆشت شەق شەق لەسەر دەرگا کۆن و چەپەر بەش بەش کرا. جەرگ و دڵ و رانێ بۆ قەلا و سێ بەش بۆ کانیتوو جیا کراوە، نازدار هات و بەشی قەلای بردە ژوورێ. فەیزە هەر

سێ بەشەکەی لەدەسرە دەستەکەی خست و لە لایەکەوە داینا. مەلا برایم بەشێکی قەڵەوی لە دەسرەیەک خست و گوتی:

ـ کاری منی نەماوە، من دەڕۆم، دەچمە مزگەوت و بە ڕەسووڵ مجێور دەڵێم بانگەواز بکا و خەڵک بێن بۆ بەشە گۆشت.

مەلا ڕۆیشت، زۆری نەخایاند، لە سەربانی مزگەوتەوە بانگەواز دەستی پێکرد:

ـ خەڵکی تازاوا! های خەڵکە! ڕەحمەتی خوداتان لێ بێ، بۆ سەلامەتی عەتابەگ و هاتنەوەی لە نەخۆشخانە، ئاغا مەولوودی کردووە، بە دوعای بە خێرەوە بڕۆن بۆ بەشە گۆشت.

پاش چارەکە سەعاتێ، خەڵک لە نێو دێوە بەرەو قەڵا، بە جام و کاسەوە هەڵقوڵین و لە حەوشە و دەوری گۆشت ریزیان بەست.

هەتاو گەڕاوەتەوە چاوی ڕاست. دیوەخانی قەڵا ئاخنراوە لە ژنانی نێو دێی. عەدلە خانم و ناسکێ و تەنکە جوابی چاو و دڵ ڕۆشنی ژنان ئەدەنەوە. جار نە جارێ یەکیان دەچێتە بەر پەنجەرە و چاوێ لە ڕێی شار و کێوی بەفر گرتووی حەوتکانیان دەکەن.

دەستە سوارێ لە ئاسۆگی حەوتکانیانەوە سەریان هەڵدا. ئاخر سوار لە گەڵ هات بەم دیودا، ریز لە نێو بەفردا ڕەش دەکەنەوە، بیست سوارن، یەکیان لە پێشەوە لە سوارەکان جیا بۆوە، هەر دێ و لەوان دووردەکەوێتەوە، لە بەفر دەرچوو و کەوتە بۆرایی و رووتەن، هەر دێ و لە دێ نزیک دەبێتەوە.

کوڕە جەحێلەکانی ئەوبەری چۆم چوون بەرەو پیری و لە نیوەی ڕێ بەیەک گەیشتن. ئیستێ پێکەوە وەستان، سوار ڕوو بە دێ و ئەوان بەرەو سوارەکانی دیکە وەڕێ کەوتن.

تاقە سوار تەنگی بە چارەوێ توند کردووە، یەک غار گەیشتە سەر چۆم، لە ئاو پەڕییەوە. ئەسپە ڕەش یەک ڕکێف لە لێژی قەڵا وەسەرکەوت. کەیخودا و خەڵکی بەر دەروازە لە بەری هەستان و دوور گوتیان:

ـ ماندوو نەبی کا ڕەسووڵ، عەتابەگیتان هێناوە؟

ڕەسووڵی نۆکەر بە دەم ڕێوە جوابی داوە:

ـ ئەرێ ئەرێ، ها ها لە دواوە. ڕەسووڵ بە پڕتاو خۆی کرد بە حەوشەدا، لە ناوەڕاستی حەوشە خۆی لە ئەسپ هاویشتە خوارێ و بە پەلە لە پلیکان وەسەرکەوت.

حەسەن مەیتەر دەستە جڵەوی ئەسپە ڕەشی گرت و کێشایە تەویلە. زین و لە غـاوی لـێ داماڵی، بە نەرمەزینەوە، لە سەر ئاخوڕی خۆی بەستییەوە و هاتەوە دەرێ.

ڕەسووڵ هەناسکە هەناسک خۆی کرد بە نێو ژناندا، بـە دەنگێکـی بـەرز بـانگی عەدلـە خانمی کرد:

ـ خانم! مزگێنیم دەوێ مزگێنی! عەتابەگ ساخ و سەلامەت هاتەوە، بە خـودای لـە مـن ساخترە، بە کوێری دوژمن.

عەدلە خانم لەوەو بەر دەستێ کەواوپتۆڵی هەمزەبەگی بۆ مزگێنی هێنابووە پەنا دەستی. دەستە کەواوپاتۆڵی دەست دایە و کیفەکەی لە گیرفان دەرهێنا و بە بەرچاوی ژنانەوە، پەنجا تمەن پووڵ و دەستە جلەکەی دایە. ناسکێ و تەنکەش، هەر یەک بیست تمەنیان دایە. عەدلـە خانم هەستا. ژنان بە جەماوەر هەستان و وەکـو چێـشتی مجێـور شـێوان بـە سـەر یەکـدا. خانمەکان لە پێشەوە و ئەوانی دی بە دوویاندا، بوو بە شێواوە و کەس لە کەس، هەموو ئەمتـا و ئەو تا کەوشیان لە پێ کرد و ڕژانە حەوشە.

فەیزە درێژ لە مێژە تەمداری هەواڵ لە حەوشە وەستاوە. بە قێژەی ژنان لە سەر حەوزەکـە ڕاپەڕی، خۆی کرد بە ئاغەڵدا و شەک بەرانێ کە لە ئەوەڵ ڕۆژەوە خانم بۆ گەڕانەوەی عـەتا لە نەخۆشخانە دیاریکردووە، بیکا بە سەدەقە، بە پاڵ پێوەنان و ڕاکێش ڕاکێش هێنایە دەرێ و بردییە بەر دەروازە.

نێو دێی تازاوا قووی پێدا کراوە، گەورە و بچـووک، ژن و پیـاو هاتوونـە بـەر قـەڵا و ئەمبەروئەوبەری ڕێی چۆمیان تەنیوە.

نۆزدە سوار و دەستەیەک پیادە لە چۆم پەڕینەوە و سوار و پیـادە بـە لێـژی قـەڵا و نێـو حەشیمەتدا وەسەرکەوتن و گەیینە بەر دەروازە.

فەیزە لۆیەکی پشتوێنەکەی خستە ملی شەک بەران، بە دەستێکی دەسـتە جـڵەوی ماینـە بۆرەی عەتای گرت و لە خەڵک و سواری دوورخستەوە. شەک بەرانی لە دەوری عەتا گێـڕا و لەبەردەمی، ڕوو بە قیبلە لەئەرزی دا و کردی بە سەدەقەی.

سوارە و حەشیمەت ڕژانە حەوشە. حەسەن مەیتەر پەڕییە نێـو سـوارە و دەسـتە جـڵەوی کوێتەی گرت. نۆکەری ئاغاکان خۆیان هاویشتە خـوارێ و هـەر کـەس دەسـتە جـڵەوی چارەوێی ئاغای خۆی گرت. ئاغا تێکڕا دابەزین. حەسەن مەیتەر کوێتەی بەرەو تەویلە کێـشا، نۆکەرەکان بە دووی ئەودا، هەر یەک چارەوێی خۆی و ئاغای کێشایە تەویلە.

عەتا تاقە سوارە لە نێوەڕاستی حەوشە و جەشیمەتدا وەستاوە و دانابەزێ! ڕەنگ زەرد و بزرکاو بە سەر ماینە بۆرەوە کوشک هەڵاتووە و بە شەرمەوە چاو دەگێڕێ، بە سەر بابی بانگ کرد.

هەمزەبەگ چووە پەنایەوە، عەتا خۆی نوشتاندەوە و سرتاندی بە گوێیدا. ئاغا دوورکەوتەوە و ڕووی لە ڕەعیەتەکان کرد:

ـ عەتا ساخ و سەلامەتە، وەختی نەهارە و ئەو ئاغایانە نەهاریان نەخواردووە، هەر کەس بڕواتەوە ماڵی خۆی، دە بڕۆن دەی.

حەوشە ژن و پیاوی ڕەعیەتی لێ نەماوە. عەتا پێی چەپی لەئاوزەنگی توند کرد، لاقی ڕاستی لە ئاوزەنگی دەرهێنا و هەڵیهێناوە و بە لای چەپدا دابەزی. ڕەسووڵ چێو شەقەی لە پاکۆی زین دەرکێشا و دایە ژێر باڵی ڕاستی. هەمزەبەگ وە پێشکەوت، ئاغا و نۆکەر بەدوویدا چونە ژووری.

حەوشە چۆڵ بوو. عەتا لاقی چەپی چەقاند و هێزی دایە سەر چێو شەقە و پێی ڕاستی کێش کرد و ڕەسووڵ بە دوویدا ڕێکەوت.

عەدلە خانم و ناسکێ تەنکە و نازدار لە مدبەقەوە دەرپەڕین. دایکی و خۆشکەکانی بە گریانەوە لە ئامێزیان گرت و نازدار شانی عەتای ماچ کرد.

ئاغاواتی دوورونزیک، دەوڵەمەند و سەر بە دەرەوەی شار و دێ دەستە دەستە بۆ سەر کێشی و چاو و دڵ ڕوونی لە هامووشۆدان، ئەوەی هاتبێ هەمزەبەگ لێی گێڕاوەتەوە بۆ شایی عەتا، وادەی ئەوەڵی زستانی داونەتێ.

حەوتەیەکە عەتا بۆ دەست بە ئاو نەبێ، لە دیوەکەی خۆی خزیوە و نایێتە دەرێ. نزیکانی خۆی نەبێ، کەس نەیدیوە. ئەوندەی ئەوانیش دەچنە لای و دەیدوێنن، هەر ئەوندە دێتە جواب:

ـ لێم گەڕێن! پێم خۆشە تەنیا بم، حەز ناکەم کەس بمدوێنێ، ئاوام پێ خۆشە، وەڕەزم، لە هەموو کەس وەڕەزم، بڕۆنە دەرێ و دەرگام لێ پێوەدەن و کەس نەمدوێنێ! هەمزەبەگ عەبەساوە! لەو ئاکارەی عەتا دەمی بەتاق ماوە! لە دڵەوە سێ و دوویەتێ:

ـ بۆ وای لێ هاتووە؟! جاران ڕێی لە ڕێبوار بەیبوو، هەر کەسی دیبا بەرۆکی دەگرت و ڕایدەسپارد: بە بابم بڵێ ژنم بۆ بێنێ، ئێستا لە کوولەکەی تەڕیشدا لەو بارەوە نادوێ.

بە سەر سوورمانەوە ڕووی لە عەتا کرد:

ـ عەتا! کوڕم! چ باسە؟ بۆ ماتی و هیچ نالێی؟ئەوەی خۆت دەتویست بۆتم مارە کردووە، لە خەڵکم گیراوەتەوە، دەبێ دەست بە کار بین، هێندەمان وەخت نەماوە، دەڵێی چی؟ خۆ ساز کەین؟

عەتا مات سەری بەرداوەتەوە. چاوی هەڵێنا و تەماشایەکی دایکی کرد.

عەدلە خانم بە پێکەنینەوە جوابی هەمزەبەگی داوە:

ـ دەی وەکارکەوە، ئەو بڵێ چی؟ خۆ لای تۆ لە رووی هەڵنایە بڵێ بۆم بگوێزەوە، لە سبەینێ زووتر نییە خەبەر بەماڵی بووک بدە با خۆسازکەن، ئەوانیش خزم و کەسیان هەیە، ئەو جۆرەی تۆ لە خەڵکت گیراوەتەوە، زوو دەست بە کار نەبین، ئابڕوومان دەچێ، شەش حەوت رۆژی ماوە، بەوەندە چمان بۆ دەکرێ؟ بە من دەکەی هەر ئێستا بنێرە لە دووی رەسووڵ با بەیانی زوو بڕوا و هەواڵیان داتێ وەخۆکەون، کاری خێر بۆ لێسە نابێ، شوان تا دانیشێ مەڕ دوور دەکەوێتەوە.

هەمزەبەگ لە ژێرەوە چاوێکی لە عەتا کرد. عەتا ئەو چەشنە سەری داخستبوو، هەڵینە هێناوەتەوە، هەر دەڵێی لەوێش نییە و باسێ لە ژن هێنانی ئەو ناکرێ! ئاغا سەرنجی بەرەو خانم سووڕاند:

ـ بەم شەوە؟! بۆ رۆژ نابێتەوە؟

ـ ئا ئا، هەر ئێستا، رۆژ وەدرەنگ دەکەوین، نازانی هەیتوو هووتی زۆرە؟ ئەوە کاری ژنانە، تۆ نازانی، من دەزانم.

هەمزەبەگ دووپاتی نەکردەوە، رووی لە دەرگا کرد و ئەحمەد فەڕاشی بانگ کردە ژوورێ و ناردی لە دووی رەسووڵ. پاش ماوەیەک نۆکەر هاتە حوزوور. ئەوەی پێویست بوو، ئاغا پێی راگەیاند. بڕیارە بەیانی بەرلەتاوکەوتن، رەسووڵ بگاتە کانیتوو.

ئەو شەوە لە نیوە شەو بەدوا، وردە وردە دایدایە کڕێوە و چاو چاوی نەدەدی، وەک بیکەی بە هێلەگدا، وابوو، کڕێوە بە دەم بایەکی ئەهۆنەوە و دەتگوت پرچە سپییەکەی دایکی مێژووە بە دەم هەناسەی سروشتەوە بە شانەی دەکا و کەشان کەشان و توێژ توێژ دڵی رەشی ئەرز دادەپۆشێ. بەفر دنیای کردووە بە قوڵەی هێلکە. کێو و شاخ، بەرزی و نزمی، دەشت و پێدەشت یەکدەست سپی دەکاتەوە و هەموو یەکسانە.

لەو کاتەوە نێوی عەتایان لە سەر کەوێ داناوە و مارەکراوی ئەوە، وەک کەوێ قەفەس لە ماڵ نەهاتۆتە دەرێ. هەمزەبەگ، زارای خێزانی فەتاحە کوێری تاین کردووە ئاوی کانی

و کاروباری دەرێ لە بری کەوێ بەڕێوە بەرێ و ئەوانەی هامووشۆی دەکەن بیانخاتـە ژێـر چاوەدێری، ئەگەر شتێکی دی و بیـستی، بـە فـەیزەی راگـەیێنـێ. لـەودەمـەوە زارا وەک کەروێشکی بازرە لە سەر کانی و نێو ژنان گوێی کولۆرە و قـسەی ئـەم و ئـەو لـە مێـشک دەگرێ، تا ئەو دیار بێ، ژنان بە چاک و خراپ باسی کەوێ ناکەن.دوو بەرەکییەکـی سـەیر کەوتۆتە نێوانی ژنـانی کـانیتـوو. ئەوانـەی حەمـەیان خـۆش دەوێ، قینیـان لـە کـەوێ هەلگرتووە، کەوێ ئێتر کەوێ نییە! ناز ناویان بۆ داناوە! بە تەوسەوە پێی دەلێن:

ـ خانم! کەر چووەتە بەغدا بووە بە هێستر! قوڕمدا بە چاویدا، بە خودا بە ژنی سالـی نابـێ و تەلاق بە قوونی دەکا، ئەوە من مردوو و ئێوە زیندوو، ئەگەر بە بێـوەژنی نەهاتـەوە، ئێـوە چوار خالی روم بکێشن، پەلە مەکەن، دەیبیننەوە، ئـەوە ئاغاواتـە، سـوێندی خـواردووە بـۆ شەوێکیش بێ، بیهێنێ، لە داخی حەمە دەیهێنێ، دەنـا بـۆ ژن قاتـە خوشـکێ؟ ئـەوە بـاری کونییەت و تۆلەیە، دەیەوێ سووکی کات، ئەگەر وا نەبوو رووی خۆم رەش دەکـەم، ئێـوە راوەستن، سەیرە خۆشەکە لە دواوەیە.

دەستەی ئاغا خوا دەلێن:

ـ قابیلە خانم بێ، ئەو ناوە هەر لە کـەوێ دەکالـێتەوە، بـە خـودای هـیچ خانمـێ لـەو پێکەوتووتر نییە، خۆزگە بە خۆی، لە دەست کاروکوێرەوەری پەز و پاتال و شـیاکە خـۆری رزگار دەبێ و بۆ خۆی دەبێ بە بووکی قەلا و هـی وەک ئێمـە و مانـان دەبنـە کـلفەت و قەرەواشی، بکوژوببڕی ئەم ناوەقە هەر خۆی دەبێ. چاو لە عەدلە خانم کـەن، ئـەویش کچـە رەعیەت نەبوو؟ بابی چی بوو؟ بەنێو بەگ بوو. ئەو دەم کە ئاغا داوایکرد، بەشـی هـەوێـرێ ئارد لە مالیاندا نەبوو. ئێستا تەماشای کەن، هەمە کارە خۆیەتی، کێ هەیە دەست بێنێتە ڕێـی؟ کەوێش وا دەبێ، دەبێتە جێنشینی ئەو . نە کەوێ لە عەدلە خانم دەمێنێتەوە، نە کوێخـاش لـە عێزەتوللا بەگ کەمترە. راوەستن بزانن دەبێتە چ خانمێ، ئەوە عەتابـەگ بـە بـێمـزەرەت هاتۆتەوە و ئاغاش پیاوی ناردووە ئەمڕۆ سبەی دەیگۆزنەوە، ئەو دەم دەیبیننەوە، بـە خـودای خانمی ئەو ناوەقەی پێ دەشکێتەوە، ئێوە راوەستن.

دوو شەو و دوو رۆژە یەک وچان دەبارێ، بەفر، کەل و کونی سامالـا کردووە و رێ و بانی بڕیوە. مالی پیاوێ خەلکی تازاوا بە نامەی ئاغاوە شار و دێ دەگەڕێـن دوو دەسـتە بـە گوێدرێژەوە چوونەتە بژوێ و کانی کەروێـشکە لـە مالـی رەشـیدخان و قادرخـانی زاوای هەمزەبەگ پێخەف و کەلوپەل بێنن.

حەوت هەشت سەرە ژنی کارزان و دەستاو خۆشی نێو دێـی بـە فـەرمانی عەدلـە خـانە هاتوونەتە قەلا یاریدەی نازدار بدەن. فەیزە درێژ سەرپەرشتی گۆشـت و ئەمینـداری مدبـەقی پێ سپێردراوە.

کوڕە جەحێلە و کچە ئازەبی کانی توو و تازاوا و کانییە کوێرە، مالی بـە گـسیکێکەوە هاتوون، لە حەوشەی قەلا رەشبەلەک گیراوە و بە تەقەی دەهۆل و زۆرنا شایی دەگەڕێ.

ئاغاوات بە دێهاتی دوورونزیکەوە تێرژاون. سەروان خودایی بە دەسـتەیەک ئەمنییـەوە و دەولەمەند و سەر بە دەرەوەی شار دیوەخانیان ئاخنیوە، ئاغا و خانمەکانیان لە سەرسەرا و بـەر پەنجەرەوە سەیری شایی دەکەن. چاوەش سەری زوڕنای سەر بەرەوژوور کردووەتەوە و بـە دەم ژەندنەوە لە پەنجەرە دەچێتە پێش، داوای شاباش دەکا. هەرکـەس لـە حانـدی خۆیـەوە ئەسکیناسی دەتمەنی بۆ بەر دەدەنەوە.

نزیکەوی نێوڕۆ ئەحمەد فەڕاش هەلی بۆ ڕێکەوت و چووە گەڕی شایی. کوڕە جەحێـلە لە سەرچۆپی تا گاوانی داوایان لێ کرد گۆرانی بلێ، بە چاوشیان گوت لێ نەدەن. پێک لـە زاری زوڕناژەن هاتە دەرێ و قەفی گۆچان لە سەر دەهۆل وێستا.

کچێکی بالا بەرز و ڕەزاسووک لە پەنای پلیکانـەکان پالـیداوە بـە دیـوارەوە. ئەحمـەد چاوی تێ بڕی و بە هەوای ڕۆینە تێی هەلکرد:

بالات بە بەرزی، قەد بە باریکی
ئەستێرەی ئاسمان کەوتە تاریکی
بالاکەت بەرزە بەقەت منارێ
کێ تەفرەی داوی؟ بەردی لێ بارێ

ئەو کچە بالابەرزە لە بەیانییەوە نەچووەتە گەڕی شایی، کچێ لە کچەکانی کانییە کـوێرە چووە پەنایەوە، بە سرتە گوتی:

ـ کابان!ئەوە بۆ وەستاوی کچەتیوە؟!وەرە بڕۆین هەلپەڕین.

کابانی مەحموود شوان وەک ئەوەی لە ڕێی خولک بەند بێ، لەگەل کچـە ڕێکـەوت و چووە پەنای سەرچۆپی و دەستی ئەحمەد فەڕاشەوە و پەنجەی لە پەنجـەی هـەلـپێکا. شـایی بەدەنگی ئەحمەد ڕێک بوو و لە دوودانی کەوت. ئەوەی لەدەوری شایی وێـستاون، چـوون دەستیان گرت. شایی هەر دێ و گەورەتر دەبێتەوە.

یەکێ لە کوڕەکانی کانییە کوێرە گۆرانی بێژە و لە شاییدا گۆرانی دەڵێ، لە دڵی خۆیـدا سووتاوی کابانە، ئەو جوابی ناداتەوەکە هاودێیەکانی داوایان لێکرد بۆ ئەحمەدی بـسێنێتەوە. قادر لە خودای دەویست، لە قینی ئەحمەد هەوای گۆڕی، بـە تووڕەییـەوە رووی گـۆرانی و مانای لە کابانە:

هاتە دەرکی دەروازە
چەتیوە حیلە بازە
کار لە کاران ترازا
حەزت لێ ناکەم تازە

ئەو رۆژە تا نێوەڕۆ بەو هەوایە شاییان گێڕا. هەر دووکیان لەگەڵ کابانیان بوو، قـادر بـێ فەزیحەتی پێدەکرد، ئەحمەد دەیلاواند. قـادر نـە بەقـەدەر ئەحـمـەد کەلیمـەی دەزانی، نـە ئەوەنەش دەنگی خۆش و پێکەوتوو بوو. رۆژ درەنگە، ئەحمەد دەبێ بڕوا، سەبرێ بە کابـانی گوت:

ـ من دەبێ بڕۆم، پاش نوێژ دێمەوە. کابن لە شـایی چـووە دەرێ، ئەحـمـەد بـە دوویـدا بەرێدا. چاوەش پیکی لە زار ناوە وفووی پێدا کرد. دەهۆڵ کوت هەی کرد لە گۆچان.

دوو رۆژە شایی دەگەڕێ. برا زاوای رەعیەتی شەوانە دەچنە مزگەوت جـۆرابێن دەکـەن. ئەوەی خەوی بێ هەر لەوێ دەنوێ. کچانی غەریبە لەگەڵ کچە تازاوایـەکان، دوان و سـیان دەچنەوە و بەیانی زوو دێنەوە قەڵا. برا زاوای شاری و ئاغاوات لە قەڵا دەمێننـەوە، تـا خـەو دەیانباتەوە، کۆڕی مەجلیسیان گەرمە و ئارەق و شەراب کلاشـە دەکـا، دارودیـوار مەسـت دەبێ.

لە ماوەی ئەو دوو رۆژەدا، ئەوەندەی ئەحمەد فەڕاش سەری پـەرژابـێ، چووەتـە شـایی، ئەوەندەی ئەو دەچوو، کابان دەچووە دەستییەوە، ئەحمەد لەوێ نەبایە، ئەویش هەڵنەدەپەڕی، هەر لە دوورەوە سەیریدەکرد.

هەوا سارد ساردە، تف هەڵاوی دەیبەستێ، کەس ئاگای لە خۆی نییە و وەنـازانێ سـەرما هەیە. سەری سێ رۆژە جلە بووک هاتەوە. دەستەیەک پیاو و ژن کەوتنە تەکی و جلیان بـرد بۆ کانی توو، ناسکێ خانمیش لەگەڵە، ئەوبەر بووکە.

ماڵی بووک چڕنە و پڕنەی تێرژاوە و ژاوەی دێ! قیژ و واژی منداڵ و چریکەی ژنان گوێی گوێدار کەڕ دەکا. ژن و منداڵی کانیتوو، پوورەگوڵە نەبێ، هەموو لەوێن، شەوی خەنەبەندانە.

ناسکێ سەری سندووقی هەڵداوە، پارچە پارچە جلە بووک و زێڕی نیشانندان. ژنان گێژومەنگ تێی دەڕوانن، لە دڵەوە خۆزگە بە کەوێ دەخوازن. دوای نیشاندان، ناسکێ جل و زێری لە سندووق خستەوە و دەرگای قایم کرد و کلیلیدا بە پێخەسوو، پوورامان پێخەسووە.

کەوێ لە نێوەڕاستی ژنان دانیشتووە، کەس نازانێ چ حالەتێکی هەیە! لە خەمبار ناچێ! بەکەیفیش نییە! چۆنی تەماشا کەن، وا دەنوێنێ، دەڵێی ئاوێنەیە! بە پێکەنینەوە چاوی لێکەن، پێدەکەنێ! خەمبار و پەشێو تەماشای کەن، دایکی دەرد و ژانە و خەم و پەژارەی لێ دەبارێ! دەڵێی مەرگ و مان بۆ ئەو یەکسانە. کەس لە دڵی ئاگا مینا نەبێ. لە دوورەوە چاوی لە چاوی بڕیوە، لە دڵەوە دەیدوێنێ:

ـــ دەزانم چت لە دڵدایە، دەتناسم، سەد جار لای من گوتووتە، وا نەکەی کەوێتگیان!ئەگەر وا بکەی هەر ئەمشەوت ماوە، دەزانم وادەکەی، دەتناسم، باوەڕم پێتە، دەروونت دەناسم، ئەک کوێر بم کەوێتگیان.

مینا بێئیختیار فرمێسک دەبارێنێ.

کەوێ چاوی لە مینایە، بە گریان و دەنگێکی لەرزۆکەوە بانگی کرد. مینا بەنێو ژناندا هاتە پەنایەوە، سەریان نا بە یەکەوە و سرتوهۆڕ دەستیان پێکرد.

کەس ئاگای لە کەینوبەینی کەوێ و مینا نییە. ژنان پڕ بە کاسەیەک خەنەیان گرتۆتەوە لە سەر مەجومعەیەک دایانناوە. زارا مەجموعەی لەسەر دەستە، کۆڕ بە کۆڕ بە نێو ژناندا دەیگێڕێ. ژنان قامکێ لە خەنە وەر ئەدەن و پوول و دراو دەخەنە سەر مەجومعە وموبارەکبایی دەڵێن. پوورامان پێخەسووە، جامە خەنەی دەست دایە ودەست و پێی بووکی لە خەنە گرت. کەوێ هەر دەپەنجەکانی بە خەنەوە هەڵێنا و بەرەو روخساری خۆی رایگرتن. وەک ئەوەی چەمۆڵە لە خۆی نێ، وردە وردە لە دەموچاوی نزیکیان دەکاتەوە. مینا زانی کەوێ دەیەوێ چ بکا، دەستی گرت و نەیهێشت خەنە لە روخساری خۆی هەڵسوێ، بێ ئەوەی کەس تێبگا، دەستی کەوێی هێناوە خوارێ.

خەنەبەندان تەواو بووە. ژن و منداڵی نێو دێ ڕۆیشتوون. پێخەسوو، بـەربووک و میــوانی هەندەران نوستوون. کەوێ و مینا نەبێ، کەس نەماوە نەنوێ. ئەوانیش تا خەو بەلایـدا هێنـان، دەردە دڵ و گریان و سکالا یان بوو.

بەیانی سوارێ لە تازاواوە هات، هەواڵی هاتنی بـرا زاوای هێنـاوە. ژنـان سـەر لـە نـوێ هاتنەوە بۆ ماڵی بووک. لە قاوەڵتووندا ناسکێ کلیلی سندووقی لـە پێخـەسـوو وەرگرتـەوە. بووکی بردە سەرەشۆرگە و سەری شوشت و پرچە ڕەش و درێژەکەی بە شانەکرد، بـە دابی ئاغاوات پرچی بەمشان و ئەوشاندا پەریشان کردەوە، پرچی کەوێ ئەوەندە ڕەش و جـوان و درێژە، ناسکێ لە دڵەوە بەخیلی پێ دەبا. پاش سەر شتن، بردیە دیوێک، جلـی بـووکێنی بـە بەردا کرد. کەوێ بۆ چاوپێکەوتنی بابی، ئیزنی لە بەر بووک و پخەسوو خواسـت، بـە جلـی بووکێنییەوە چووە دیوەکەی بابی.

کوێخا کەریم لە سەر جێ خەوی لێ کەوتووە. کەوێ بێ چرپە چـووە پـشت سـەری و تێی ڕاما.

لە نەکاو چاوی بە چەقۆ و تەزبێحەکەی کەوت. سەبرێ داهاتەوە، بە ئەسپایی چەقۆکـەی هەڵگرت و لە لۆی پشتوێنی بووکێنی شاردییەوە و لە تەنیشتەوە چـۆکی دادا، سـەری بـردە پێشێ و ویستی ماچی کا وەخەبەر نەیێ. دەمی هێشتا نەگەیبوو بە ڕوومەتی، کوێخـا ڕاپـەڕی و وەک تامەزرۆیەک کەوێی لە ئامێز گرت و سەری بـە سـینگەوە گوشـی، بـە دڵـپڕیەوە گوتی:

ـ ئەمشەو لە حەیفان نەنووستووم، هەر لە بیری تۆدا بووم، دەزانم نەبەدڵ دەڕۆی، نەبـەدڵ دەردێکی گرانە، بەخودای بە دڵی منیش نییە، دەسەلاتم نـەبوو، وەک بـە زۆر ڕاتکێـشن، وا دەزانم، لەگەڵ زاڵم چ ناکرێ، دەستێ زۆردار بیبڕێ، خوێنی نییە،دەڵێی چی؟ هـیچ نـاکرێ، قەیناکە، جێت خۆش دەبێ، هەر ماوەیەک نامۆیی دەکەی، خووی پێدەگری و پێـی ڕادێـی، ئەو عالەمە تۆ دەیبینی زۆر کەمیان وا بووە بە دڵی خۆیان بـوو بـێ، زۆربـەیان نابـەدڵ و بـە زۆری کوتەک مارە کراون. دایکی تۆ بە زۆر لـە منیـان مـارە کـرد، تـا یـەک دوو سـاڵ دانەدەنیشت، هەر بەملاو ئەو لادا هەڵدەهات، تۆمـان بـوو، داسـرەکا، تـۆش دادەسـرەکێی، ئەوەندەت زەحمەتە تا خوو دەگری، عەتا تۆی خۆش دەوێ. بەختەوەرت دەکـا، بەختـەوەر بی کچم، دڵتەنگی مەکە، خۆم زوو زوو سەرت ئەدەم، دەبڕۆ خودات لەگەڵ بێ.

کەوێ بێ قسە و گریان، وەک ئەوەی هیچی نەبیستبێ، لە دیوەکەی بابی هاتە دەرێ. دەم بە بزەوە چووە نێو ژنان و دانیشت.

سوارە لە ئاسۆگی کێوە بەرداویلە قەرەولیاندا. منالە ورکە لە ماڵ دەرپەڕین، خۆیان بۆ پووڵ هەڵگرتنەوە ساز کرد. هەرا و بریو کەوتە نێو ژنان و مالی بووک وەک چێشتی مجێور شێوا، ژنان دەرپەڕینە دەرێ و دەوری بووک چۆڵ بوو. کێوە بەرداویلە لە دەلاقەوە دیارە، سوار و پیادە بە کێودا ڕێچکەیان بەستووە و دێنە خوارێ. لەبەرچاوی کەوێ وەک مێگەلەکەی حەمە دەچن کە ئێواران بە کارە کاڕ لە کێوەوە خۆیان بەر ئەداوە و دڕژانە نێو دێ.

سوارە و پیادە رژانە نێو دێ و دەرگایان گرت. حەوشە و دەرکوبان پڕ بوو لە برازاوا. ئەحمەد فەڕاش بە هەوای نایێتە دەر و بووک گوێزانەوە دەستی پێکرد. برا زاوا بە تێکڕا، بەوهەوایە چەپلە لێ ئەدەن:

ئەو چاوانەی دەیگرینێ
ڕۆژ نییە مردووم لێ نەمرێنێ
نایێتەدەر نایێتە دەر، بووک یاخییە و نایێتە دەر
بووکمان جوانە، تۆپە گوڵە
نایێتەدەر، نابەدڵە
نایێتەدەر، نایێتەدەر، نابەدڵە
نایێتەدەر، نایێتەدەر، لێم یاخییە و نایێتەدەر
بووکمان وەکو ماینی شێیە
زاوا بێنن، بووکمان پێیە
نایێتەدەر، نایێتەدەر، بووک یاخییە و نایێتەدەر

بووک بە نێو حەشیمەتدا هاتە دەرێ. ڕەحیم و ئەحمەد خالی بووکن، ئەمشان و ئەوشانیان گرتووە. بەربووک لە پێشەوە و پێخەسوو لە دواوەی دەڕۆن. کورسییەک لە نێوەڕاستی حەوشە دانراوە. بووک چووە سەری. برا زاوا هەر یەک لە لایەکەوە مستێ قەرەپوولیان بە سەر دا هەڵاویشت. مندالەورکە تێڕژان و کەوتن بە سەر یەکدا و وەک گۆلی قوڕاو لە قوڕ وەردران. بکێش بکێش و پچڕ پچڕ پووڵ لە قولی یەکتر دەڕفێنن، زۆر دار زۆری پێ برا، کەم زۆر، کەم.

فەیزە دریژ جلەوکێشە. ماینە بۆرەی هێنا و لە بەر کورسی رایگـرت. پێخەسـوو داوێـنـی بووکی کۆکردەوە و پێی گرت و لە ئـاوزەنگی نـا. رەحـیم و ئەحمـەد هـەنگێـزی قۆڵـی بووکیاندا، بووک سوار بوو. فـەیزە جـلەوی بـۆرەی کێـشا و لـە حەوشـە بردیـە دەرێ، بەربووک و پێخەسوویان سوار کردو شانبەشانی بووک وەڕێکەوتن.

کەوێ لە ژێر تاراوە، بە وردی سەرنجی دارودیوار و خەڵکی کانیتوو دەدا. چاو لە خاڵـە حەمەدی و خاڵۆژن مینای دەگێڕێ، هەر دووکیان دەگرین و شانبەشانی دەڕۆن، ماوەیـەکی زۆر لە ژێر تاراوە سەرنجی دانێ. بە چەشنێ تەماشایان دەکا، دەڵێ بەخیلییان پـێ دەبـا! یـان ئاخر تەماشایەتی و دیدار و ئاخر دەکەون! کێ دەزانێ چارەنووس چی بە سەر دێنێ؟

لەو لای دێوە دەستەی ماڵی بووک گەڕانەوە. سوار بە دەورە لە پێش بووکـەوە ئەسـپیان تاو داوە و بە دەوروپشتیدا یەکتر رەپێ دەنێن. بە دەم غارەوە لە کێوە بەر داویلە سـەرکەوتن. تا لە چاو ونبوون. ئەحمەد و مینا لە دوور چاویان لێکرد.

برا زاوا بە رمبازێن و دەوەر و جلیتـێن گەیینـە تـازاوا. بـووک گەیـشتە بـەر دەروازە. زێڕوەشان کرا و بردیانە حەوشە. کورسییان بۆ دانا و دایانبەزاند. دەستەیەک کچە ئـازەب بـە هەوای گۆرانی ئەحمەد فەڕاش چوونە پێشێ و بە سەماوە لەدەوری هەڵدەپەڕن. رەشـیدخان و قادرخان قۆڵیان گرت. دوو کوڕە ئاغا زاوایان بە چێوشـەقەوە هێنـا بـە پـیری بووکـەوە و عەتری لێپرژاند. زاواگەڕاوە و بووکیان بە چەپڵەڕێزان بردە ژووری.

بووک کە دابەزی، ئاو دەکرێ بە ئاوردا.

برا زاوای دوور و نزیک، کوڕوکچی دێ هەر یەک بە لایەکدا بڵاوەیان کـرد. خزمـی نزیکی زاوا نەبێ، قەڵا کەسی لێ نەماوە.

شەو درەنگە. قەڵا کڕوکپە و وزەی باڵی مـێش نایـە. چـرای دیوەکـان کوژاونەتـەوە. شەوقێکی کەم تەوژم لە دیوی بووک بە ئاستەم سۆڵەی دێ. بووک لە پـەردەدا چـاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیارە.

پێخەسوو لە پشتی دەرگای دیوی بووک وەستاوە. بە سەر سـووڕمانەوە چـاوی بڕیوەتـە دەرگای دیوێ، لە وای ئێوارێوە زاوا لەوێ خزیوە و نایێتـە دەرێ! ماوەیـەکی زۆرە ناسـکێ خانم و رەشیدخانی مێردی چوونەتە لای و لەگـەڵ عـەتا چـپ و هۆڕیانـە! پوورامـان لـەو سرتوخورتە دڵ کرمێیە! پاش درەنگانێ، رەشید و ناسکێ، تووڕە و ئالۆز هاتنـە دەرێ و هـەر یەک چوونە دیوێ. پێخەسوو هێندی دیکە کەوتە شکەوە! پاش ئێستا، زاوا رەنگ پـەڕیـو و

هەڵبڕووسکاو، بە چێو شەقەوە هاتە دەرێ، سەری داخست و بە شانی پێخەسودا، دەستی لە دەرگای دیوی بووکەوە نا. کزوماتی و ڕەنگ پەڕیوی زاوا، شکی پوورامانی قایم‌تر کرد.

جیرە لە دەرگاوە هات، کەوێ دەست بە چەقۆ لە سەر جێ ڕاستەوە بوو! لێبڕاوانە چەقۆی لە سەر دڵی خۆی ڕاگرت! ڕاپەڕینی کەوێ هێند چوست و چالاک و نەترسانە بوو، عەتای لە جێ وشک کرد! مات بە چێو شەقەوە تێی ڕاما! چاوی وەک دوو پۆڵووە ئاور لە بەر چاوی زاوا پرشنگیان دەپێکا! پرشنگی چاوی، تەزوو و مچوڕکی خستە لەشی بیماری و دڵی برینداری هەڵقرچاند. نرکەی بووک ئەوندە ڕژد هاتە گوێی زاوا، لەشی وە لەرزین کەوت:

ـ مەیێ پێشێ! لە جێی خۆت مەبزوو! بە خودای جەرگی خۆم هەڵدەدڕم! لە جێی خۆت ڕاوەستە، قسەم زۆرە، دەبێ پێت بڵێم.

عەتا سپی سپی هەڵگەڕاوە! چێو شەقە لە بن باڵیدا بووە بە شەق شەقە و ئارەقە لە روخساری دەباری، لێوی باری ماتەمی گرتووە، ڕەنگ، زەرد زەردە! بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، دڵپڕ گوتی:

ـ منیش قسەم زۆرە!

دوو سێ هەنگاو چووە پێشێ. کەوێ چەقۆی ڕاساندەوە، لە جاری پێشوو توندتر گوتی:

ـ مەیێ پێشێ! دوورکەوە و گوێ بگرە! من حەرامی تۆم! بەر لەوەی مارەکراوی تۆبم، خۆم لە کەسێکی تر مارە کردبوو! خۆم کردووتە نەرزی! حەلالی ئەوم، لە تۆ حەرامم، ئەوە شەرع و ئەوە مەلا، بڕۆ بپرسە، خۆت باش دەزانی ئەو کەسە کێیە، من سوێند خۆرم، سوێندم بۆ حەمە خواردووە، خۆم کردۆتە نەرزی، مێردی من یا ئەوە، یان گۆڕە! مەبە بایسی ڕوحم.

عەتا لە مێژە وێرانە، قەڵای دڵی بنکەنە و هولۆلە، بەو قسانەی کەوێ رووخا و تێک تەپی! لە دەروونەوە رووخاوە. بە هەر لەونێ بوو، خۆی کێشایە بەرپەنجەرە، رووی لە کێوە بەفر گرتووەکان و پشت بە کەوێ وێستا، وا کە روخساری لە کەوێوە دیار نەبێ، لە سەرەخۆ گوتی:

ـ دەزانم! باش دەزانم! ئەو دەم مارەیان کردی، من نەبووم، بابم مارەی کردی، لە ئەوەڵەوە دەمزانی تۆ بۆ من نابی! پێیان کردم! بەزۆر پێیان کردم! زارا پێی کردم، ئەوەی بە سەرم هات، ئەو بە سەری هێناوم، تۆ بە من رازی نیت، منیش تۆم ناوێ! چۆن هاتووی، هەر ئاوا دەتنێرمەوە، سوێندت بۆ دەخۆم دەستم لێت ناکەوێ، باوەڕم پێ بکە، ئەو چەقۆیە لابە،

حەلالیشم بی، تازە لە من حەرامی! لای بە، چەقۆکەت لا بە، لە من مەترسێ، وەبزانە ئافرەتم لات وێستاوم!

دەنگی عەتا جار لەگەڵ جار لەرزۆکتر دەبێ! کەوێ هەستی بە رووخانی دەروونی عەتا کردووە، قسە و دەنگی، بۆنی تێکشکانی لێدێ. تەواوی هەوڵ و تێکۆشانی عەتا ئەوەیە لە بەرانبەری کەوێ خۆڕاگری و غوروری نەشکێ، کەوێ قسەکانی پوورەگوڵەی هاتەوەبیر. رۆژێ بۆ دڵنەوایی کەوێ چووبوو، گوتبووی:

ـ مەترسێ! تۆ بە ژنی عەتا نابی! ئەو جۆرەی حەمە لەوی داوە و من چاوم پێی کەوتووە، من پیاو بم، عەتا پیاو نییە، ئەرخەیان بە پاڵی لێبدەوە. لە من بترسە، لەو مەترسە.

بووک و زاوا بێ دەنگن! کەوێ بۆ ئەوەی ئەرخەیان بێ، بێ دەنگی شکاند:

ـ باوەڕت پێناکەم! تۆ حەلاڵ و حەرام نازانی، تەماحت لە ناموسی خەڵک دەکرد، دەتەوێ خاوم بەستی، تۆ ئێستا من بە حەلالی خۆت دەزانی، چۆنت باوەڕ پێ بکەم؟ نا نا، فریوت ناخۆم.

عەتا لەوە زیاتر خۆی پێ رانەگیرا. رووی وەرگێڕا، چاوە شینەکانی لە بەر شەوقی لامپا خەفەکراوەکە بریقەیان دەدا، دەنگە لەرزۆکەکەی لە جاران زیاتر لەرەی دێ، زیاتر لە دەنگی تەلی تار دەچێ، گوتی:

ـ لە من حەرامی! لێم حەرامی! حەلالی دنیام لێ حەرامە! حالی بووی؟ ئەمجار باوەڕ دەکەی؟

ئەوەی گوت و بە تووڕەییەوە چێو شەقەکەی چەقاند، بە دوو باز گەیشتە بەر دەرگا. پێخەسوو هەستی پێ و تەقەی چێوە شەقەی کرد، لە پشت دەرگا رەوی کرد و خۆی لە دیوێ پەستاوت و لە کونی دەرگاوە عەتای خستە ژێر چاوەدێری، عەتا چووە دیوی نوێن. دەمانچەکەی بابی لە بەر پشتوێن قایمکرد، بە شەلە شەل لە پلیکان چووە خوارێ و رووەو تەویلە رۆیشت. پێخەسوو هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ئەرخەیانی لێی نووست و لە شک دەرچوو.

تەقە لە دەرکی تەویلەوە هات. حەسەن مەیتەر لە میانە راستەوە بوو:

ـ کێیە؟ بەو شەوە چت دەوێ؟

ـ منم حەسەن، هەستە ئەسپەڕەشم بۆ زینکە.

حەسەن دەنگی عەتای ناسیەوە. خەریکبوو بڵێ شەوە بۆ چتە، دەنگی عەتای بە تـووڕەیی بیست، گێڕایەوە و نەیوێرا. بە گورجی ئەسپی لە تەویلە دەرکێشا و بۆی زین کرد. عەتا پێـی لە ئاوزەنگی نا، بە تاو لە دەروازە نزیکبۆوە. مام عەلی دەروازەی بۆکردەوە، تا لە لێـژ چـووە خوارێ، مام عەلی عەبەساو، چاوی لێکرد، یەک دوو جـار سـەری راوەشـاند، لەبەرخۆیـەوە بۆلاندی:

ــ خودا روحم بکا! بەم شەوە بۆ کوێ دەچێ؟! دەروازەی پێوەدا و چل مێـردەی خـست. نازدار لەدەلاقەی مدبەقەوە ئاگای لەدەرباز بوونی عەتاوە بوو. لەودەمەوە بووک هـاتووە، بـە دوای هەلێکدا دەگەڕا کەوێ تەنیا ببینێ! هەلی بۆ رەخسا. بێ چرپـە وەسـەر کـەوت، وەک ئەوەی چەند ساڵ بێ دەستە خوشکی کەوێ بێ، چووە دیوەکەی.

کەوێ راستەوە بوو و دەنگیدا:

ــ کێی؟ ئێرە بۆ هاتووی؟

نازدار دەرگای پێوەدا، دەم بە بزە لێی چووە پێشێ، سەبرێ گوتی:

ــ ناوم نازدارە، کلفەتی قەلام، دەسگیرانی ئەحمەد فەڕاشـم، دۆسـتی حەمـەین، کـەوێ گیان! لە مێژە ئاواتە خواز بووم چاوم پێت بکـەوێ، هێنـدێ ئەمانـەتی حەمـەم لایـە دەبـێ بتدەمەوە! ئەو دەم کە گیرا بوو لە تەویلە لێی کەوتبوو و ئەحمەد دیبوویـەوە و دای بـە مـن بۆت هەلگرم، هەق بە هەقدار دەگا.

دەستی کرد بە گیرفانیدا، ئاوێنە و شووشە عەتر و ئەنگوستیلەی دەرهێنا و خستییە کۆشـی کەوێوە.

کەوێ دیارییەکانی حەمەی وەبیر هاتەوە، مینا پێی گوتبوو: حەمە دیاری بۆ کـڕیبووی و ونیکردوون. دیاری هەلگرت، بە گریانەوە و نازداری لەئامێز گرت. تـا ئەودەمـەی خرمـەی سمی ئەسپە ڕەش هاتە گوێیان، نازدار و کەوێ پێکـەوە دەردە دڵـیان کـرد. رمـمـەی سـم، نازداری دەرپەڕاندە دەرێ، کەوێ دەرگای قایم کرد، چووە سەر جێ، دیارییەکـانی دەرهێنـا و بە کوڵ بە سەریاندا دەگری.

عەتا ئەسپە ڕەشی بە حەسـەن مەیتـەر سـپارد، وردە وردە و شـەلان شـەلان لـە پلیکـان وەسەرکەوت. چووە دیوەکەی خۆی، دەرگای لەو دیوەوە لە سەرخۆی هەلپێکا و ئەرخـەیان خەوت.

## ٢٥

سایەقە و ساواق، سەرما و بەستەڵەک بڕستی لە گیانەوەر بڕیوە و داروبەرد جەڕی داوە، سیرە سیرە، سیخوار و ئاڵشک، کەرەسیسە و خووسار وەک باڵی سووتاوی پەپوولە بە دەم هەناسەی سروشتەوە کەشان کەشان سەما دەکەن و بە سەد نازەوە دێنە خوارێ، جێ پێ و شوێنی شەوێ پڕ دەکەنەوە.

شەو گەلێکی لە نیوەڵاداوە، بەینی شەووڕۆژە، شەوقی تاقە چرایەک لەدەلاقەی مزگەوتی کانیتوو، لە نێو مژەکوێرە و تەمدا، بە ئاستەم سۆڵەی دێ. ئاوایی مردوو مۆدارە و ماتەم ناخی گرتووە، بۆنی مەیت دێ! مەیتێکی کوژراو! بۆنی خوێن دێ! کەیخودا و گەورەی ئاوایی، ماڵی پیاوێک لە مزگەوتن. مەلا کەریم و دوو قورعان خوێن، دەنگیان داوەتە دەنگی یەک و لە سەر تەرمی کوژراوی زارا قورعان دەخوێنن. فەتاحە کوێر بە دیار تەرمی خێزانییەوە ئەژنۆێ گرتۆتە باوش و بە هەوای قورعان خوێنەکان خۆ رادەژێنێ، وەک کردە پەشیمانێ لە دڵەوە لۆمەی خۆی دەکا:

ـ سەد حەیف و هەزار مخابن! بە ئەستۆی شکاوم خۆم بۆ نەچووم دەرگا بکەمەوە؟ ئاخر ناپیاو ئەو ئافرەتە چ تاوانێکی کردبوو سزای کوشتن بێ؟ خۆزگە خۆم چووبام و منی کوشتبا. چ بکەم لەو منداڵانە؟ کێ ئەوانە بۆ من دەحەوێنێتەوە؟

دەنگی سەدقەڵلاهۆلعەزیم و فاتیحایەک، فەتاحی لە گێژاو دەرهێنا. مامۆستا قورعانەکەی وێکهێنا و رووی لە فەتاح کرد:

ـ براله! گریان و دەست هەڵپێکان چ ناکا، شوکرانە بژێر بە، خودا ساردتری لە کنە، بە جێی ماتەم گرتن، لە بیری پاشە رۆژدا بە، بەیانی ئاغا جوابی دەوێ. ئەویش دەوڵەت باس و خواسی لێدەکا، ئەوە قەتڵە! دەوڵەت، ئاغا هەڵدەپێچێ، ئەویش ئێمە دەخاتە

گازوگیر، دەبێ شتێک بڵێین، باوەڕمان پێ بکا. براله! ئاوا نابێ، تــۆ شــتێک دەڵــێی وکـا فەیزە جۆرێکی دیکە باسی دەکا! هیچتان شاهیدتان نیــە. شــەرعەن بــۆ ڕووداوی وا، تاقــە شاهید سوێندی لێ دەکەوێ، دەبێ هەر دووکتان سوێند بخۆن، تۆ سوێند دەخۆێ؟

ـ بەڵێ من له قەولی زاراوە سوێند دەخۆم.

مەلا ڕووی لە فەیزە کرد:

ـ تۆ دەڵێی چی کا فەیزە؟ لێت ڕوونە ئەوەی دیت حەمە بــوو؟ ئەگــەر لــە شــکدای، خۆت لە تینی خودا مەدە، سوێند هەر وا سووک و هاسان نییە، بەیانی دەبێ لە حــوزووری ئاغادا دەست بە سووڕەی بەراتا دەی، سوێند دەخۆێ؟

فەیزە هەستایە سەر چۆک، لێبڕاوانە گوتی:

ـ من لە منداڵییەوە دەیناسم، هەر دوو چاوم ببەستن، بە ڕێدا بڕوا، دەنگی پێــی دەناســم، بە قورعانێ لێت خوێندووە، حەمە بوو. بەر لە کوشتنی باجی زارا، من لە سەر حەوز بووم. بە پەنامدا تێپەڕی، سواری چارەوێ بوو، هــەوەڵ بــە عەتابــەگ، یــان ڕەسووڵــی نۆکــەری تێگەیشتم، بانگم کرد، ئەوەڵ بە ناوی عەتا، پاشان ڕەسووڵ، جوابی نەدامەوە، پــێم دەنگــی ناسیم، ڕکێفی لێدا و خۆی کرد بە کۆڵانــدا. لێــی زەنــین بــووم، دوورونزیــک وە دووی کەوتم. زۆری نەخایاند، ئەوەندەی من عەرزت دەکــەم، ئەوەنــدەی پــێ نــەچوو، لــە پــڕ تەقەیەک کرا، ئەوەندەم نەزانی، سوارە بەرەو دوا، بە غارگــەڕاوە، بــە پــەنای منــدا، کــرژ تێپەڕی و بە جوانی ناسیمەوە و لە شک دەرچوو، حەمە بوو! ئەوەی ڕاستی بــێ، نــەموێرا گورمیشی بم، بە گورجی خۆم گەیاندەماڵی کا فەتاح و خەڵک تێ ڕژان، هــەوەڵ کــەس، من گەیشتمێ، وا نەبوو کا فەتاح؟ وا نەبوو؟

ـ بەڵێ وابوو، ئەشەدوو وا بوو.

مەلا گوتی:

ـ کا فەتاح! تۆ چۆنت دی و بیستت براله؟

ـ مامۆستا! من هیچم نەدیوە، بیستم. لە دەرگایان دا و زارا لە حەوشە بوو، گــوێم لێبــوو، گوتی: ئەوە هاتم، لە پڕ هاواری لە من کرد: فەتاح عەتابەگە! تا من هەستام، تەقە بــەرزەوە بوو، پێ خاوس دەرپەڕیم، تا گەیشتمێ، زارا کەوتبوو و بە دەنگ نــەیگــەیــشتمێ، تــەواو ببوو، لەوە زیاتر نە هیچم دی، نە هیچم بیست، ئەوەڵ کەس کە گەیشتێ، کا فەیزە بوو، لــە ڕێوە گوتی: حەمە شوان بوو. سوێند دەخۆم لەوەندە زیاتر، هیچ نازانم.

تەحەا تەحەا و پچە پچ کەوتە نێو دانیشتووانی مزگەوت:

ـ عەتابەگ؟! نا نا جێی بەقا نییە! ئەوە تازە زاوایە! تازە زاوا چۆن بووکی یەکشەوە بە جێ دێڵێ؟ ئاخر بۆ؟! بۆ دەبێ زارا بکوژێ؟! زارا بە قەت هەموو کەس بۆی هەڵسووڕاوە، ئەو کەوتیی بۆ ساز کرد، بە جێی پیاوەتی دەبێ بیکوژێ؟! نا نا، درۆیە، بە چاوی خۆم ببینم، باوەڕ ناکەم. قسەی فەیزە راستە، هەر چەند ئەو بە لای راستا ناڕوا، ئەمجارە راست دەکا، کاری حەمەیە، دەیزانی زارا لە پێی کەوێ هالاوە، ئەوە کوشتی. بەلام باسی مەکەن! شتیوا، بۆ باس نابێ، چمان لەو گیرەوکێشە داوە؟ بە ئێمە چی؟ بستێ رێ بێ و خۆمان پێیدا بڕۆین، ئەللام دەکرد سەری گایان دەکرد بە قوونی کەرێوە! شتی وا کێشەی بە دواوەیە، ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا! ئەگەر حەمە بێ، هەر وا دەست هەڵناگرێ، وەک گورگی بەچکە خوراو، هەر کەس بە خراپە ناوی بەرێ، شەوێ دێتە سەری. پوورەگوڵەش بیبستێتەوە ناوی حەمەمان هێناوەتە گۆڕێ، دەمانکا بە پەڕۆی بۆ سۆ و ئابڕوومان دەبا، خۆ گێل کەن! دیزە بە دەرخۆنە، سەری بنێنەوە و ئەنەهوو هیچ نازانین.

بەیان ئەنگووتووە. شەبەق لە سەرانی داوە، شەڕە بانگی کەڵەباب، ئەم ماڵ و ئەو ماڵ بۆ یەکی دەستێننەوە. بانگوێژ بۆ تازە کردنەوەی دەسنوێژ لە مزگەوت هاتە دەرێ. بانگی بەیانی جموجوولی خستە ئاوایی. مەلا لە مێحراب وێستا و جەماوەر لە پشتی ریز بوون. دوو رکاعەت نوێژ، پاشان وێرد و دۆعا تەواو بوو. مەلا لە سەر چۆک سووڕا و رووی لە جەماوەر کرد:

ـ برادەرینە! دنیا بۆ بەقا نابێ، دوێنێ لەم دێیە شایی و خۆشی بوو، ئەمڕۆ شین و ماتەمە، پشت بە دنیا مەبەستن. ئەمڕۆ لە کا فەتاحە سبەی لە ئێمەیە، ئەو وشترە لە دەرکی هەموو کەس دەخەوێ، کا فەتاح دڵ بریندارە، مردوو مۆدارە کابرای مردوو مۆدار لەسەرخۆ نییە،ئەرکی سەر شانی هاوماڵەکانە هۆشیان پێوەی بێ، میوانی بۆ بە رێکەن، سێ رۆژ لەگەلی دانیشتن دڵخۆشی بدەنەوە و کاروباری بۆ بەڕێوە بەرن و نەهێڵن زەرەری لێ بکەوێ. ئەوە رۆژە، دوو کەس دوو کەس بڕۆن بۆ شار و تازاوا، خەلاتی بێنن و هەواڵ بە ئاغا بدەن با وەدرەنگ نەکەوین، شەرعەن مەیت نابێ ئەوەندە بمێنێتەوە.

فەیزە درێژ لە سەفی پێشەوە هەستا.

ـ مامۆستا! من دەچم بۆ تازاوا، تەنیا دەچم.

ـ زستان بۆ بەقا نابێ، کەسێ لەگەڵ خۆت بەرە.

ـ کەسم ناوێ، خۆ منداڵ نیم! کەسم بۆ چییە؟ ئەوە ڕۆژە.

لە سەفی پشتەوە، دوو کوڕە جەحێڵەی قۆچاخ هەستان، عەلی حاجی و کەریمی مام ڕەسووڵ بوون.

ـ قوربان! ئێمە دەچین بۆ خەلاتی.

هەر سێ وەڕێکەوتن. فەتاح لە گەڵیان چووە دەرێ، بە عەلی و کەریمی گوت:

ـ بچنە دوکانی حاجی عەزیز، حیسابم لەگەڵ ئەو هەیە، قەند و چا و ڕۆن و برنج بێنن. کەم نەهێنن!

ئەوەیگوت و چووە ژوورێ.

هێندەی نەخایاند، سوارێک و دوو پیادە لەدێ وەدەرکەوتن. عەلی و کەریم بە ڕێی شاردا، فەیزە بە سواری، بەرەو تازاوا، بەڵام بە ڕێی دێ کۆندا، لە دێ دوور کەوتنەوە. ڕێی دێ کۆن دوورتر و پرمەترسی تریشە، بلێی فەیزە بۆ لەوێوە بڕوا؟ ڕەنگە دڵی کالکالەی مەزراکەی کردبێ! نەکا پیلانێکی لە سەردا بێ! خۆی نەبێ کەس نازانێ!

بە پەلە و چەواشە، بەڵام دڵخۆش و بەکەیف، وەک ئەوەی گرێیەک لە گرێ کوێرەی ژیانی کرابێتەوە، ماینە ئەبلەقی وەبەر ڕکێف داوە و هەورازونشێوی پێواوە و گەیووەتە دێی کۆن.

لەو کاتەوە عەبە دێ کۆنی ئاوەدان کردۆتەوە و زەوی لە فەیزە داگیر کردووە، ئەو چاوی بەرایی نەداوە تەماشای ماڵەکەی عەبە بکات، تەنانەت لە دووریشەوە نەیدیوە و لەوێوە نەڕۆیشتووە. گەییوەتە بەرانبەری کاوڵاشەکە، وەک کڕیارێ بە چاوی مشتەری لە سەربان و قوونەبان دەڕوانێ و بە چاو تاقی دەکاتەوە! لەنەکاو گەلاز لە سەربانەوە خۆی هاویشتە خوارێ و ئامبازی بوو. هێرشی گەلاز هێند لە نەکاو و کوتوپڕ بوو. فەیزە و چارەوێ خوودار بوون. ئەگەر هێندێ زووتر خۆی گیر نەکردبا، لە سەر زین دەگلا، بەڵام زوو پێی لەئاوزەنگی توند کرد و دەستی بە لەغاوەوە لە یالی گیر کرد و خۆی گرتەوە. گەلاز هاوشالی بردوەتێ و ماولی لێ بڕیوە و لەوانەیە بپەڕێتە سەر پشتی چارەوێ.

عەبە بە دەنگی گەلاز، شڕ و شێواوە، دەست بە گۆپاڵەوە دەرپەڕی. ئەوەڵ تەماشا، فەیزەی ناسییەوە! ماوەیەک مات تێی ڕوانی! زانی ڕێبوارە و لە ماڵەکەی دوورکەوتۆتەوە، بە فیکەیەک، گەلازی لە کۆڵ کردەوە، ئەگەر نێوانی لەگەڵ فەیزە بایە،

ڕەنگە گوتبای: ئەمە تۆی گێلە! بەلام عەبە هیچی نەگوت، گەلازی بانگ کردەوە و چووە ژووری.

فەیزە بە سوارییەوە ماوەیەک تاسا. پشووی هاتەوە سەرخۆ، ئەگەر ترسی گەلازی نەبایە، لەوانە بوو بۆی بگەڕێتەوە و خەشی دلی پێ بڕێژێ، بەلام لەترسی ئەو نەیوێرا، ڕێی گرتەوە بەر و لەبەرخۆیەوە دوو سێ جار بۆلاندی:

ـ ڕاتوەستابێ! با زەویت لە من داگیر کردبێ! بەخودای مەگەر بۆم نەلوێ، دەنا دەبێ ئەو دروەت لە ژێر پێ دەرهێنم، مابێتمان.

مژێکی کەم تەوژم لە سەر لارەکە و پێچەکەی چۆم بە لەنگەر وەستاوە. توێژێکی ناسکی، وەک پەردەی تۆڕی وەسەر تازاوا کێشاوە، ئاوایی لە دوورەوە بە ئاستەم لە نێو مژوبەفردا بۆر دەکاتەوە. قەلا نەبێ، بانی مالەکان یەکسان بە ئەرزەوە نووساون و هیچیان لە هیچیان بەرزتر نین، لە دوورەوە زۆرتر لە جێ تەپکە و جێ دانگە دەچێ، نەک ئاوەدانی، بەلام قەلا لە دوورخۆ دەنوێنێ و بە کەشم و نەشمەوە پێناسەی ئاوەدانی نیشانی ڕێبواری سەر لێ شێواو دەدا و ئاوایی پێ دەناسێنێ.

فەیزە بە سەر ماینە ئەبلەقەوە کوشک هەلاتووە و نێو چاوانی وێک هێناوە، ئاسەواری ڕق و تووڕەیی لە عەبە لە ڕوخساریدا بەدی دەکرێ، سەرمای بەیانی ئەوەندەی دیکە گرژی کردووە و وەک ژنی کەوان وێکی هێناوەتەوە. هەر دوو دەستی لە گیرفانی بالتەکەی ناوە. کەڕەسیسە و سیخوار بە سەر سمێل و برۆیەوە کەپرۆکەی بەستووە، حاندی کونە لووتی، گرتک گرتک زەنگولە سەهۆل وەک لەرزانە بە سمێلییەوە شۆڕ بوونەتەوە. لەغاوی شل بەڕەللای سەر ملی چارەوێ کردووە. ماینە ئەبلەق، بێ ڕکێف، لەقان لەقان شەقلی بەفر دەشکێنێ و لە تازاوا نزیک دەبێتەوە.

تاوێکی سەرما بردوو بە سەر بەفردا بلاو بۆتەوە. ئالشک وخووسار لەبەر تیشکی خۆر زریوە زریو دێنە خوارێ و لە سەر بەفر دەنیشنەوە و بریقە بریقیان چاو ئازار دەدەن. فەیزە لەگەل گزنگی هەتاو گەیشتە بەر دەروازەی قەلا، هەر بە سوارییەوە لە دەروازەیدا، ئەوەل تەقە هیچ، دوا تەقە، مام عەلی دەرگای کردەوە، بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ یا خوا خێر! چ بووە بەو بەیانییە کا فەیزە؟!

فەیزە دەستێکی بە دەم و سمێلیدا هێنا، مستی پڕ بوو لە ئاو و سەهۆل و هێنای بە تەنیشتی بالتەکەیدا، مات گوتی:

قەوماوە مامە، قەوماوە!! ئەمشەو زارای خێزانی فـەتاحیـان کوشـتووە، خەڵـک پیـاو دەکوژێ، ئەو خوێنرپیە، ژن!

مام عەلی لێوی خۆی گەست! چوونە دەرێی شەوێی عەتای وەبـیر هاتـەوە! لەدڵـسافی خۆی گوتی:

ـ ئەو دەرپەڕینەی ئەو شەوێ دەرپەڕی، زانیم شتێکی بە دەمەوەیە! پێیان زانیوە؟ فەیزە بە تووڕەییەوە بە سەریدا خوڕی:

ـ تۆ کێ دەڵێی؟ حەمە هەتیو کوشتوویە، من ئەو دەڵێم، بـە چـاوی خـۆم دیم، حەیـە حەی! تۆ گێرەت لە هەولێر دەگەڕێ! کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە!!

ڕکێفی لەماین دا و یەک غار چووە دەرکی تەویلە، لـە چـارەوێ دابـەزی، مـاینی لـە دەرکی تەویلە بە حەسەن مەیتەر سپارد، بێ وێستان ڕۆیشتە ژووری. مام عەلی گێژومـەنگ بە دەرگاوە عەبەساوە! بە سەر سووڕمانەوە، تا فەیزە لە پلیکانەکان وەسەرکەوت، تێی رامـا! فەیزە ونبوو، ئەویش دەروازەی پێوەدا.

قەلا چۆڵ و بێ دەنگ، دەڵێی وێرانەیە، خەم و ماتەم لە دارودیواری دەبارێ! ئەحمـەد فەڕاش نەبێ کـەس بـەدیارەوە نییـە، ئـەویش سـەماوەری تـێ خـستووە و بـە لایـەوە خەوەنووچکە دەیباتەوە. لە جیرەی دەرگا ڕاپەڕی:

یا خوا خێر بی! چ ڕووی‌داوە فەیزە؟

فەیزە سلاوی کرد. ئەحمەد هەستا. لە سرتە و خورتەی ئەوان جموجۆڵ کەوتە قـەلا و دەرگاوە جیرەجیر کەوتن. یەک یەک و دوو دوو، ئاغـا و خـانم هاتنـە دەرێ، هـەمـوو ڕووتاڵ و نێوچاو گرژن! فەیزە بە سەرسووڕمانەوە تێیان دەڕوانێ، لە دڵەوە دەڵێ: ـــ ماڵـی زاوا دەبوو هەموو دەم بە بزە بان، ئەوەی دێتە دەرێ، کرێوە لە نێو چاوانی دەبارێ! ئەوە چ باسە؟!

لە پڕ هەمزەبەگ دەرگای دیویکردەوەو فەیزەی دی، تووڕەوتوند تێی خوڕی:

ـ بەو بەیانییە بۆ هاتووی؟چت بەدەمەوەیە؟!

فەیزە لەو قسانەی مام عەلی دەرکەوان، دڵ کرمێ بوو، بۆ ئەوەی ئەحمەدیش تێنـەگا و ڕێسەکەی نەبێتەوە بە خوری، لە ئاغا چووە پێشێ و سرتاندی بە گوێیدا. هەمزەبەگ چـووە ئەو دیو و فەیزە بە دوویدا چووە ژووری و دەرگای پێوەدا:

ـ قوربان! وەفریاکەوە! لە وای ئێوارەوە کەس خەو چاوی نەچووە! حەمە هەتیو هاتۆتەوە! ئەمشەو زارای خێزانی فەتاحی کوشتووە! نێو دێ شێواوە! هەر کەس قسەیەک دەکا، فەتاحیان فێر کردووە بڵێ عەتابەگ کوشتوویە! هەر چەند هاوار دەکەم و دەڵێم بابە! من بە چاوی خۆم حەمەم دیوە، کەس باوەر ناکا! مەلا دەڵێ دەبێ سوێند بخۆن. قەرارە من و فەتاح سوێند بدەن.

قوربان! ئەو هەتیوە زۆر بێ رەزایە! زانیویە کەوێ گوێزراوەتەوە، وەک گورگی بێچوو خوراو، هەر شەوێ پەلاماری کەسێ ئەدا! ئەوەی هاموشۆی قەلا بکا، بە دەستییەوە نەجاتی نایە! لە بیری چارەدا بە، چارەیەکی بکە.

هەمزەبەگ مات بیر دەکاتەوە، وەک ئەوەی باوەڕ بە فەیزە نەکا، دوو شک وتی:

ـ بە راستی دیوتە، یان لە بەر ئەوەی فەتاح گوتوویە عەتایە؟ ئەگەر لە بەر ئەوەوا دەڵێی، ئەوە هیچ نییە، خۆم جێ بە جێی دەکەم. بە راست خۆت ئەوت دیوە؟ دڵنیای ئەو بوو؟

ـ ئەی بێ بەلا بی! سێبەرەکەی ببینم، دەیناسمەوە، لە بیرتە ئەو جارەش عەرزم کردی حەمە و کەوێم پێکەوە لە مێرگە گەورە دیون؟ درۆم کرد؟ درۆ ناکەم، بە پێوە دەچمە سەر قورعان، ئەوەی زارای کوشت، حەمە بوو. قوربان! لە بیری چارەدا بە، تا درەنگ نەبوو، بیر بکەوە!

ـ چ بکەم؟ تۆ دەڵێی من چ بکەم؟

ـ تفەنگچی بگرە! قوربان! تفەنگچی!

ـ لە کوێ؟ بەو زستانە کەسم پێ شک نایە فەیزە.

ـ قوربان! من دوو کەس دەناسم! بۆ سەد کەس ئاوڕ نادەنەوە! بەو شەرتە تێریان کەی، مردوو لە قەبر دەردێنن، ئەوانەت هەبێ، پاڵی لێ بدەوە، بلە سوور و عەلیلە، هەر دوو کار نەکردەن، کۆنە چەتەن، ئەگەر ئیزن بفەرمووی، دەیانهێنمە خزمەتت، هەر دووکیان پیاوی چاکن، سەریان پێ بسپێرە.

ـ جا ئەوانە جێی باوەڕن؟

ـ ئەی بێ قەزا بی! باوەڕ بە من ناکەی؟! هەرچی بوو بە ئەستۆی من، دوای پرسە، دەچم لە دوویان، خودا دەکا لەگەڵم دێن، داوای هەر چی بکەن، دەیاندەمێ و رازییان دەکەم.

هەمزەبەگ ڕووناکی کەوتە ڕوخساری، بە بزەوە گوتی:

ـ خۆزگە هەموو رەعیەتەکانم وەک تۆ دلسۆزبان، زۆر باشە، پاش سێ ڕۆژە، بڕۆ لە دوویان، ئێستا بڕۆ لای ئەحمەد بەرقەنە بخۆ، با رەشید و قادر هەستن، ئەوانەش دەبەین و لەو لاوە بەڕاو دێینەوە.

دەستی کرد بە گیرفانیدا، پەنجا تمەنی دایە:

ـ ئەوەش بۆ خەرجی قاوەخانە، دە بڕۆ دەی.

ئاغایان لە خەو هەستان. بەرقەنە خورا. نۆکەر هاتوونە حوزوور. عەزیز، نۆکەری قادر خانە. مینە بە جێی سەعید، نۆکەری رەشیدخانە. سێ ئاغا بە سێ نۆکەرەوە هاتنە حەوشە. حەسەن مەیتەر، ئەسپی بە زین و لەغاوەوە بۆکێشانە دەرێ. هەر کەس سواری چارەوێی خۆی بوو، فەیزە سواری ماینە ئەبلەق بوو، ئاغا لە پێشەوە نۆکەر لە پشت سەریان، فەیزە لە دوای نۆکەرەوە، وەڕێکەوتن و شەش تاژی، هەر دوانیان بە دەستی نۆکەرێکەوە رستکراون. هەمزەبەگ بە دەم ڕێوە، بانگی ئەحمەد فەراشی کرد:

ـ ئەحمەد! تۆش ئەو پیرێژنە سوارکە و بە دووی ئێمەدا بیهێنەوە بۆ کانیتوو، پێخەسوو دەڵێم.

ئەوەی کوت و سەری کوێتەی وەرسووڕاند. حەوت سوار لە دەروازەوە چوونە دەرێ.

قاوەڵتوونێکی درەنگە. دەستە سوارێ لە ئاسۆگی کێوە بەر داویلە سەریان هەڵدا. لە نێو دێوە خەبەر بە مزگەوت درا. کەیخودا دەرپەڕین و لە بەر مزگەوت چاوەڕێ وێستان. سوارە گەیینە دێ. فەیزە جیا بۆوە و بەرەو ماڵ دەڕوا، چارەوێکە دەباتەوە. ئاغا و نۆکەر چوونە بەر مزگەوت. شەش کوڕە جەحێلە، هەر یەک جڵەوی چارەوێیەکیان گرت. هەمزەبەگ لە پێشەوە. ئاغا و نۆکەر لە پشت سەری و کەیخودا بە دوای ئەواندا، چوونە ژوورێ. مەلا، فاتیحای هەدیە کرد. پاش دەست گرتنەوە، لە هەمزەبەگەوە یەک بە یەک بەخێرهاتنی کردن، گەڕاوە سەر هەمزەبەگ:

ـ قوربان! بۆیە بەو سەرمایە موزاحمت بووین، بە پێویستمان زانی تەشریفتان لێرە بێ، ئاغا گەورەی هەموو لایەکە، هەڵبەت کافەیزە هەموو شتێکی عەرز کردووی، ڕووداوێکی وا بێ گەورە جێ بە جێ نابێ، ئاغا چۆن دەفەرمێ وا دەکەین، شەرعەن جەنازە نابێ زۆر ڕاگیرێ، تەماداری دەستووری ئاغاین.

هەمزەبەگ وەک داخدارێ، بە هەناسەیەک بایسینگی خالی کرد:

ـ وا دیاره ئەو هەتیوه لێمان بووه به خوله پیزه! به سەری بابـام وای نـاخوا، هـەر لـەو ڕۆژانەدا دەبێ کەلاکی لەو جێیەی زارادا ڕاکێشرێ. هەموو و گوێتان لێ بێ. هـەر کـەس مەوتەنی ئەو هەتیوه دەسنیشان کـا، هـەزار تمـەن خـەلات وەردەگـرێ، حالـی بـوون؟ هەتیوێکی بەرەڵلا چۆن دەتوانێ له ملکی مندا یاخی بێ؟! ئەوه خۆێڕیەتی ئێوەیە، له ئێـوه ڕادەبینێ و دێ خەلک دەکوژێ! ئەم دێیە پیاوی تێدا نییه! ئەگـەر ببـێ، هـەر فـەیزەیـە! ئەویش به تەنیا هیچی پێ ناکرێ.

مەلا کەریم هەڵیدایه:

ـ وەڵلا پیاو نازانێ بڵێ چی؟ دوو کەس به دوو جۆر شەهـادەت ئـەدەن! کـا فـەیزه جۆرێکی دیوه، کا فەتاح جۆرێکی دیکەی بیستووه! پیاو نازانـێ بـاوەڕ بـه کامیـان بکـا! قوربان! کا فەیزه دەڵێ من دیومه و ناسیومه حەمه شوان بـوو. کـا فـەتاح دەڵـێ، بـەر لـه کوشتنی خێزانی، گوێی لێبووه، هاواری کردووه، عەتابەگە! به بڕوای من، شەرعەن دەبـێ هەر دووکیان سوێند بخۆن، ئەگەر ئاغا ئیزنی له سەر بێ، دەبێ سوێند بخۆن.

هەمزەبەگ وەک عادلێ ڕووی له فەتاح کرد:

ـ فەتاح! بێ ترس، چت دیوه و چۆنت بیستووه، کوڕم بیڵێ، هیچ مەشارەوه، ئەرخەیان، ئەوەی دەیزانی، له کەس مەترسێ.

فەتاح تەواوی لەشی دەلەرزێ و ڕەنگ له ڕوخساری پەڕیوه! بەدەم تـرس و لـەرزەوه، گوتی:

ـ قوربان! عەرزی مامۆستاشم کردووه، من له زارام بیست، ئەوه دەڵێم، خۆم هیچ نازانم. تازه جێی ڕاخستبوو و بنووین. من له جێدا بووم، زارا له حەوشه بوو، لـه دەرکەیانـدا، ئـەو چوو بیکاتەوه، له پڕ هاواری کرد: فەتاح عەتابەگە! من ڕاپـەڕیم و خـۆم کـۆکردەوه، لـه نەکاو تەقەیەکم بیست! لەگەڵ تەقەکە، زیڕەی زارا هاتە گوێم! پێ خـاوس دەرپـەڕیم، تـا گەیشتمێ، زارا تەواو ببوو. بەدەنگ نەگەیشتمێ، لەوه زیاتر نه هیچم دی، نه هیچم بیـست، له سەر ئەوەی که عەرزم کردی ، سوێند دەخۆم، مـن نالـێم عەتابەگـە، لـه زمـانی زاراوه دەڵێم.

مەلا چاوی به خەلکەکەدا گێڕا و فەیزەی دی، بانگی کرد:

ـ کا فەیزەوڵلا! براله! وه درەنگمان مەخەن، لەگەڵ کا فەتاح بڕۆن دەسنوێژ هەڵـگرن و وەرنەوه، ده بڕۆن دەی.

فەیزە و فەتاح دەست بە دەستنوێژەوە بە بەرانبەری قورعان چۆکیان داداوە.

فەیزە پشتەوسوور و بێ ترس، ڕەنگی نەگۆڕاوە. فەتاح هەموو بەندی لەشی وەک بنی ئاو دەلەرزێ و ددانی وەددان ناگا! ڕوخساری سوورایی لێ بڕاوە و ڕەنگی مردووی لێ نیشتووە! بڵێی لە قورعانەکە ترسابێ، یان ترسی پاشە ڕۆژی ئاغای لە دڵدایە؟ دوو سێ جار تەمای بوو بڵێ سوێند ناخۆم، بەلام چونکە بەلای خەڵکەوە گوتوویە، بە دروزن دەردەچوو پێی لە جەرگی ناو سوێندی خوارد:

ـ بە حەقی ئەو قورعانە بەر لە کوشتنی خێزانم، گوێم لێ بوو زارا گوتی عەتابەگە، لەوەش زیاتر هیچ نازانم. بە گریانەوە هەستا و چووە لای تەرمەکەی زارا و دانیشت. فەیزە لە خۆبایی و پشتە ستوور دەستی لە سەر سوورەی بەرات دانا:

ـ بە حەقی ئەو قورعانە بە چاوی خۆم حەمەی کوڕی مەحموودی حاجی برایم دی، وەک ڕۆژ لێم روونە زارای خێزانی فەتاح ئەو کوشتی.

فەیزە بە فیزێکەوە هەستا و دوورکەوتەوە.

مەلا رووی لەئاغایە:

ـ قوربان! چ دەفەرمووی؟

ـ ئێوە بە خاکی بسپێرن. خۆم بە دەولەت رادەگەیێنم، کارتان بەوەی نەبێ.

ئەوەی گوت و هەستا. جەماوەر هەستان. ئاغا و نۆکەر وەدەرکەوتن، خاس و عام بە دوویاندا هاتنە دەرێ و بەڕێیان کردن. ئەوان بەرەو دەشتی مێرگە گەورە و هەزار ئەشکەوت تاژییان وەدووی خۆیانخست. خەڵکەکەش چوونە مزگەوت.

عەلی و کەریم بۆ نیوەڕۆ لە شار گەڕانەوە. زارا کفن کرا و بردیان بۆ قەبران، لەودەمەدا کە تەرمیان دەبرد، ئەحمەد فەڕاش و پێخەسوو خۆیان کرد بە دێدا. مالی کوێخا خزمەکانیان نەبێ، کەسی نێو دێیی لێ نییە وکەسیش سەری ئەوەی ناپەرژێ هەوالی لە بووک و رووسپییەتی بپرسێ. پێخەسوو ئەوەی دەیزانی، بۆ مالی بووکی گێڕاوە، وەک نهێنییەک هەر لەوێ، لەگەل تەرمی زارا ناشتیان و دیزە بە دەرخۆنە، سەریان ناوە.

سێ ڕۆژە، پرسە تەواو بووە. خەڵکی کانی توو چاوەڕێی ئەوەن. فەیزە، یان فەتاح، یەکیان بدڕێن! ئەوە سێ ڕۆژ تێپەڕی و هەر دووکیان ساخ و سەلامەتن! ئەی بۆ!! ڕەنگە ئەوەی بە درۆ سوێندی خواردووە، ئەوەندە پیس بێ قورعان کاری لێ نەکا! کار لە پیس

ناکا، قورعان کار لە پاک دەکا، داوێتگیری ماڵ و منداڵی دەبێ، درەنگ و زووی هەیە، ئاخری کاری خۆی دەکا.

شەو و ڕۆژێکە کەلوکونی شار نەماوە فەیزە سەری پێدا نەکا. بە هەزار ناری عەلی توانیویە بلە سوور و عەلیلە بدۆزێتەوە. هاتوونەتە چایخانەکەی حاجی رەشید، سەریان ناوە بە یەکەوە و گوێیان بۆ فەیزە شل کردووە:

ـ نانتان لە ڕۆندایە! بەخت جارێ ڕوو لە پیاو دەکا!دلنیا بن هیچ ڕوو نادا، من کردوومە بە هەمهەمە و ئاغام تۆقاندووە، دەنا هیچ لە گۆڕێدا نییە، حەز دەکەم ئێوە بە نوالەیەک بگەن، ساڵێ سێ تەغار گەنم و جلوبەرگ و پێلاو بۆ هەر کامتان دەستێنم. دەبنە پیاو، خەڵک حیسابتان لە سەر دەکەن. دەبنە تفەنگچی ئاغا! بە نێو پیاوی سێ تەغارە، دوو سێ تەغاری دیکەشتان گیر دەکەوێ، دەڵێن چی؟ لە گەڵم دێن؟ من باسی ئێوەم بۆ ئاغا کردووە، دەنا ئەو ئێوە ناناسێ، بە قسەم بکەن، قازانج دەکەن، ڕێوی بە پێرتانەوە هاتووە.

بلە سوور لە خۆشیان هێندەی دیکە سوور هەڵگەڕاوە. چاوە شینەکانی پڕ بوون لە بزە و چین و چروک لە تەوێڵە پانەکەی بڕاوە. بە پەنجە گۆشتنەکانی کولۆیەکی لە قەندانەکە دەرهێنا و لە چایەکەی هەڵکێشا و خۆی ئەمبەرەوئەوبەر کرد. لەش و لاری گۆشتن فیتەری، تەختەکەی وەجیرەجیر خست. دەستی دایە ئیستیکانە چایەکە و لە نێو قولیداون بوو. چاوی پڕ پرسیاری بڕییە عەلیلەی هاوەڵی.

عەلیلە وەک نارازییەک ڕوخسارە تەسک و تەوێڵە پڕ لۆچەکەی وێک هێناوەتەوە. چاوە بچووک و مژ و مۆرەکانی لە بلە زیت کردۆتەوە. جەستە سووک و چالاکەکەی ڕاست کردەوە و وەک نەبانێ لێوی هەڵقرچاند و چاوێکی لە ساعەتە مووچییەکەی کرد، وا کە فەیزە ببینێ، گوتی:

ـ چوو، چوو، جا ئەوەندە چییە؟ شەوێ ماڵبرەکەم هەڵگرم، ئەوەندە دێنمەوە، چم لە ئاغا داوە؟ من تاقەتی خۆ چەماندنەوە و بەڵێ قوربان بەڵێ قوربانم نییە.

بلە ویستی جوابی بداتەوە، فەیزە نۆرەی نەدا:

ـ ئەوە دەڵێی چی کا عەلی؟ خەڵک خودا خودایەتی کارێکی وای گیر کەوێ، دەبی بە پیاو، بە چاوێکی دیکە تەماشات دەکەن، ناڵێن عەلیلە....

ـ دەڵێن عەلیلە دزە؟ قەیناکە با بڵێن، بەس نییە ئاغا و کوێخای خۆمم، پێت وایە ئەو چم پێدەکا؟ یان تالان، یان پیاوکوژی، لەوە زیاتر؟

ـ ئەوەتا! براله! ئاوا له دنيا حاڵييه! من دەڵێم چی و ئەو چم جواب دەداتەوە؟ بابە! وەڵلا، بيلا، تەڵلا ئاغا هيچ كارێكی به ئێوه نييه، من هانمداوه، له بەر ئەوەی ئێوه به نانی بگەن، دەنا هيچ له گۆڕێدا نييه، دەخۆن و دەخەون. سەرەڕای بەرات، چەک و پووشی بە بەريەوە دەكەن، سێ هێندەی بەراتەكەتان گيردەكەوێ و ئەمنييە و ئاژانيش ناوێرێ قەرەتان كەوێ و هەموو رۆژێ بتانگرێ. ئێوه دەزانن كێن؟ لەوسەری دنيا دزييەک بكرێ، ئێوه دەگرن، يان دەبێ بچنه زيندان، يان نيوەتان لێ دەستێنن، بوونەته برا بەش! من له بەر ئێوه دەڵێم، دەنا هی ديكه زۆره، بەوەش كەمتر دێن، نانه زگی دەيكەن، كەيفی خۆتانه، ئەوه دەڕۆم، بەڵام بەر لەوەی بڕۆم، نەقلێكتان بۆ دەگێڕمەوە.

ـ كابرايەک باداری گرتبوو. چاكێک بوو پێيان دەگوت:«پير محەمەد» هەر كەسێ چووبا، دەبوو مريشكی بردبايه ئەويش مريشكی رەش. كابرا به مريشكی رەشەوه چووه سەری، گوتی:ئەوه مريشكی رەشم هێناوه، چاكم دەكەيەوە، باشه، دەنا شەخسەكەی لای مالان به كولێرەيەک دەستم ماچ دەكا.

فەيزه ئەوەی گوت و هەستا، بەڵام دوودڵ بوو.

لەودەمەوه ئەوان هاتوونه چايخانه، كوێخا شەريف لەگەڵ حاجی رەشيد سەريان ناوه بە يەكەوه و سرتەيانه. كوێخا سەری هەڵێنا:

ـ ئەحوالی كا فەيزه! ئەوه لێره چ دەكەی؟ حاجی! ئەمه كا فەيزەيه كه دەڵێن حەمەی ديوه زارای كوشتووه.

حاجی هێندێ تێی راما:

ـ باوەر ناكەم!

ـ به چی؟ به من، يان بەو كه كاری وا بكا؟

ـ به هيچتان! رەنگه تۆ به هەڵه ديبێتت، ئاخر...

خەريک بوو بڵێ حەمه بێ سەروشوێنه، بەڵام گێڕايەوە.

فەيزه زوو هەڵيدايه:

ـ ئاخر چی؟ خۆ ئيشاڵلا به ريشی سپيەوه بوختان ناكەم. حەمه منداڵی بەر دەستی خۆمه، پياو منداڵی خۆی ناناسێتەوە؟ بەرێوەڵلا حاجی گيان! ئەو بوو، له قيامەتيش دەڵێم حەمه، زارای كوشت.

فەیزە لەوە زیاتر نەویستا، پوولی چایەکانی دانا و بەرەو دەرگا ڕێکەوت. بـەر لـەوەی وەدەرکەوێ، بلە و عەلیلە هەستان. لە بەر دەرگا دەستیان خستە سەر شانی.بلە گوتی:

ــ چ تۆر نۆکی! خۆ جاران وانەبووی! ئێمە سازین، بڕۆین؟

فەیزە بزەیەک کەوتە سەر لێوە ئەستوورەکانی و ددانی وەک شووڵ چەپـەر، زەرد و شاش، چەپوچیرِ وەدەرکەوت. فەیزە لە پێشەوە و ئەوان بە دوویـدا، ئـەوان بـەر دەرگـا و مەحموود شوان بەر دەرگا و لووتیان تەقی بە لووتی یەکترەوە، نە فەیزە ئـەوی دوانـد، نـە ئەویش بایەخێکی بۆ فەیزە دانا.

لەو ڕۆژەوە کە قاو بلاو بۆتەوە حەمە زارای کوشـتووە. حـاجی ڕەشـید و مـەحموود شوان و کوێخا شەریف هەڵدەسووڕێن هەواڵێکی بزانن. دوو سێ جاریش مەحموود شوان سەری لە عەبە و پوورەگوڵە داوە، ئەوانیش لێی بـێ هـەواڵـن. هـیچ بەڵـگەیـەک گـیر نەکەوتووە کە حەمە هاتبێتەوە.

دوو مانگە بلە و عەلیلە، بێ ئەوەی ڕەشیان نابێتە سـەر سـپی، ئاغـا لـەدەرەوەی قـەڵا دیوێکی بۆ تەرخان کردوون و سێ ژەمە دەچنەوە قەڵا، لەتەڕ دەخۆن و لە وشک دەخەون و لەگەڵ فەیزە موو بە بەینیاندا ناچێ، بە گەرمە هاموشۆی یەک دەکەن. هـەمزەبـەگـیش بەوە زۆر کەیف سازە، دوو تفەنگی برنووشی داونەتێ و شەووڕۆژ بە شانیانەوەیە.

ئەوەڵی ڕەشەمە و ئاخر مانگی زستانە. بلە و عەلیلە شەوێ میوانی فەیزەن. ئەو شەوە تـا دەرنگانێکی درەنگ، بە دزی ژن و منداڵەوە سرتەیانە، خۆیان نەبێ، کەس نازانێ خـەریکی چ پیلانێکن. ڕایان هێنایە سەر ئەوە بەیانی دوانیوەڕۆ، بلە و عەلیلە بـەرەو تـازاوا بڕۆنـەوە. هەر کە لە کانی توو نەدیو کەوتن. بچنە سەر چۆم و فەیزەش بە مێرگـە گـەورەدا پێـشاو بڕیان بداتەوە و لە سەر کانییە بەردینە یەک بگرنەوە.

دوانیوەڕۆیە. فەیزە و بلە و عەلیلە لە سەر کانییە بەردینە بە یەک گەیشتنەوە وەک سێ گورگی چێ، بەرەو ترۆپکی هەزار ئەشکەوت تێهەڵگەڕان.

هەوا گۆڕاوە. هەر هەنگاوێ کە وەسەردەکەون، هەوار تاریک و تاریکتر دەبێ. تـەم و مژ، کێو و شاخی لە ئامێز گرتووە و چاو چاو نابینێ. کرێوە وەک بە هێـلەگداکـەی، ورد ورد دێتە خوارێ، پێ هەڵێنییەوە، شوێن پـڕ دەکاتـەوە. دەڵـێی سروشـت لەگـەڵ ئـەوان هاوپیلانە! لە سەر دوندی کێو، فەیزە ئاوڕی داوە، وەک سەرکەوتوویەک گوتی:

ـ بەخت یارمانە! هەوا هەلی بۆ رەخساندووین. بە بیانووی سەر لێ شێواوییەوە خۆ دەکەن بە ژووردا، بەلام دەبێ زۆر وریا بن! بەئاستەم هەلە بکەن، تێدەگا! زۆر سەگە! شک بخا، خۆ بە دەستەوە نادا. خۆ بە دەستەوە نەدا، دەبێ بە تفەنگ بیکوژن، ئەو دەم ڕێسەکەمان دەبێتەوە بە خوری و ئاشکرا دەبین، ئەو ئێوە ناناسێ، زۆر لەسەرە خۆ بڵێن شارەزای ئەم ولاتە نین، سەرمان لێ شێواوە و سەرەندەر ناکەین، ئەمشەو میوانی تۆین. هەر کە چوونە ژووری، بە هەر لەونێ کرا، سەگەکەی پێ ببەستنەوە. کوڕە! ئەو کارە نەکەن، گیر دەخوێن، سەگەکەی زۆر بێ‌ڕەزایە! دەنگی ئەو بیستێ، کۆ لە شێر ناکا. سەگی بەستەوە، تەنووری پێ داخەن، دووکەڵ لە سەربان هەستێ من دەگەمێ و کۆتایی پێ دێنم. زۆری رۆژماوە؟

عەلیلە چاوی لە سەعاتەکەی کرد؛ بە وەڕەزییەوە گوتی:

ـ دوو سەعاتی ماوە.

فەیزە وەک پێشەنگێ وەپێش کەوت. بلە پێی نایە جێ پێی. عەلیلە جار لەگەل جار هێزی کەم دەبێتەوە و هەنگاوی ناگاتە جێ پێی ئەوان! وەدوا دەکەوێ، دەلێی ماندووە! یان لەدەروونەوە هەست بە ئازارێ دەکا و کلافەی ویژدان لە لاقی کەوتووە! جار نە جارێ لە بەفرە بە سەری نساری هەزار ئەشکەوت رۆ دەچێ، دەکەوێ و هەلدەستێتەوە. فەیزە و بلە بە توانجەوە ئاوڕ دەدنەوە و ئیستێکی لە سەر دەگرن. عەلیلە نابەدڵ خۆ کێش دەکا و دەیانگرێتەوە.

سێ کەس وەکو گورگی برسی لە تەپی پشت دێ کۆن قەرەولیاندا. فەیزە خۆی کێشایە پەنا بەردی بەرزایی تەپ:

ـ جا بابم بە قوربانتان، بزانم چ دەکەن. من لێرەوە چاوم لێیە، دووکەل هەستێ، من لەوێم. کار تەواو بێ، جوانەگاکان دەبەم بۆتان دەفرۆشم. لەبیرتان نەچێ، سەگەکەی پێ ببەستنەوە! خۆ نابەلەد کەن. نێوی بەزارتاندا نەێ! دەبرۆن بزانم چ دەکەن.

گەلاز لە سەربانەوە وەزمان هاتووە! خۆی هاویشتە خوارێ، بە وەڕینەوە بەرەو تەپی پەچە خرە رۆیشت.

عەبە بە دەنگی گەلازەوە، خوودار و هەلەشە، دەست بە گۆپالەوە هاتە دەرێ و زەینی دایە ئەو شوێنە کە گەلاز پێی دەوەڕێ.

دوو تاپۆ لە نێو مژوکرێوەدا بەئاستەم وەبەرچاو دێـن. گـەلاز لێیـان نزیـک بۆتـەوە. یەکیان بانگی کرد:

ـ کاکە! سەرمان لێ شێواوە و سەرەندەری هیچ کوێ ناکەین، رووومان لە تۆ کـردووە، میوانی تۆین، میوان رادەگرێ؟ وەرە ئەوە سەگەمان لێ دوورخەوە.

عەبە بانگی گەلازی کرد، بە دوای ئەودا جوابی داوە:

ـ میوان حەبیب خواس، ئەر وە من قایل ون، نۆکەریتان ئەکەم. گەلاز، گەلاز، گـەلاز، گەلاز، بێرەو، بێرەو، بێ دواوۆ، مێوانن. ئەی داخ گرانم! خـاس وو لـەو کێفانـە سـەرتان دەرکردییە، بێن بێن، هام لە خمەتانا.

گەلاز واز ناهێنێ! ملاسکە، پەلامار دەبا! عەبە سەری سوڕماوە! قەت وا نەبووە! گـەلاز دەنگی ناپڕمێتەوە! بلێی دەنگی عەبەی نەبیـستبێ؟ نـا نـا، دەیبیـستێ و ئـاوڕ ئـەداتـەوە! ماوەیەک بێ دەنگ دەبێ! هەمیسان تێهەڵدەکاتەوە!!

عەبە بەراکردن خۆی گەیاندێ. گەلازی دوورخستەوە، بە لەبزێکی شـیرین رووی لـە میوان کرد:

ـ سلامەلێ! مانی نەون! وەخێر هاتن بان ئەم چاو وەلمە، فەرموون بڕۆێنەو، ئـەی مـاڵ هەژارم بە خوا کەسیرە کەفتون، لە زووەو هان بەم کێفانەو؟

بلە هەڵیدایە:

ـ ناوت چییە؟

ـ عەودوڵلای نۆکەرت.

ـ چاوی منی. تەنیای؟

ـ وەناشکوری نەوێ، بەڵێ.

ـ میوانی تۆین، میوان رادەگرێ؟

ـ قەیەم شەریفتان وە بان چاوم، چەم لە دەس بێ، دریخ ناکەم، ئەر ئێوە تـەڵـختان لـێ نەچێ، من دەربایس نیم فەرموون.

بلە وە پێش کەوت. عەلیلە چاوێکی لە سەعاتەکەی کرد، سـەعـاتێکی رۆژ مـاوە، بـە دوودڵییەوە بە دوای بلەدا چووە ژووری.

هەر دوو لە بن کورسی خزین، بلە بە زمانێکی خۆڕێخەرانە گوتی:

ـ کاکە عەبە! زۆرمان سەرمایە، تەنوورەکە دانەخەیتەوە، گەرممان نابێتەوە، بەلام بەر لەوە، ئەو سەگە بەستەوە، برالە ئەوە سەگ نییە! بەلا یە ئێمە دەچینە دەرێ، خۆ ناکرێ تۆ هەستینین رەوانەمان کەی، پیاوەتی بکە بیبەستەوە، بە خودا نەیبەستییەوە دلم دەتۆقێ! ئەمشەو ئێمە لێرەین، تا لێرە بین، لە هیچ مەترسێ، دەستی دا بە قۆنداخی تفەنگەکەیدا:

ـ تا تفەنگ بێ، سەگت بۆ چییە؟ ئێمە چەکدارین، پیاوی چەکدار شەوانە خەوی نییە، دەبێ دایمە یەکمان لە دەرێ بین، پێیەکمان لە دەرێ و یەکمان لە ژوورێ دەبێ، سەگەکەشت سەگ نییە برالە! پیاو دەخوا! تا ئێستا من شتی وام نەدیوە!

بەو تاریفانەی کە بلە لە سەگەکەی دەکرد، عەبە گەز گەز بالا دەکا و لە خۆبایی دەبێ، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ لە بەرا گەمالەکە بوەسمەو یا تەنوورەکە بکەمەو؟

ـ سەگەکە ببەستەوە.

عەبە بێ قسە چووە دەرێ. عەلیلە سەری لە بلە بردە پێشێ و سەبرێ گوتی:

ـ برایم! وەرە وەک مەردان واز لەو کارە بێنە! ئەوە زۆر بەستزمانە، ئاخر چی هەیە؟ ماری رەش هێقی بۆ دەکاتەوە! ئەوە بۆ دەبێ زولم بکا! بە قسەی فەیزە مەکە، خودا دەزانێ چ قینێکی لەو داماوەیە، بە قسەم بکە، تا شەو بە سەر دا نەهاتووە، هەستە با بڕۆین، حاشا لەو قازانجە و لە دۆستایەتی فەیزەش.

بلە چاوە شینەکانی لێ دەرپەڕاند، بێ ئەوەی دەنگ هەلێنێ، بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەوە شێت بووی؟! سێ جوانەگای هەیە! دەزانی سێ جوانەگا یانی چی؟ یانی بەراتەکەی هەمزەبەگ! بە شەوێ، بە قەت سالێ! دەترسێی؟ ئەگەر حالت وایە، بۆ لەگەل منی؟ جاران باشتر بووی! بۆیە دەلێن پیاو کە پیر بێ، ترسەنۆک دەبێ!

ـ بە ترسەنۆکم دەزانی؟ چەند سالە دیوتە ترسابێتم؟ ئەوە ترسان نییە، بە زەییم پێیدا دێ، نازانم بۆ لە خۆڕا خۆشم دەوێ؟! کەسم ئەوەندە رەزاسووک نەهاتۆتە بەرچاو! بابە! مالەکەی بەرە، کارت بە خۆی نەدابێ، ئەگەر هیچ لە خۆی نەکەی، بەشەکەی منیش بۆ تۆ، بە گۆڕی بابی فەیزەوە، چ دەکا با بیکا.

دەستی لە ئەستۆی بلە کرد، بە پاڕانەوە، ماچی دەکا. خووی بەلەدە، دەزانێ کە بەلێن بدا، لە سەر بەلێن سوورەو نایشکێنێ. لەوە دەچێ رازی بێ، ویستی قسە بکا عەبە هاتەوە و بێ دەنگی لێ هێنا. عەبە دەم بە بزەوە گوتی:

ـ ئەویشە گەماڵ، ئەرخەیان بچنە دەشتەو، ئیسە تەنوورەکەشتان بو ئەکەمەو، چۆن تێلم سەرماتان وێ، بوچە عەبە مردیە؟

ئەوەی گوت و ڕۆیشتەوە دەرێ.

عەلیلە دیسان بە پاڕانەوە بلەی هەڵپێچا:

ـ کوڕە! مەحز بۆ خودا! لە ئـاهی پـەڕوپـۆ دەردەکـەین! برالـە! بـە شـاهێدی خـودا بەراتەکەشم بۆ تۆ، وازی لێ بێنە، باشە؟

بلە دیسان چاوی لێ دەرپەڕاندەوە:

ـ بۆ شەل و کوێری ئیمام حسێنم؟ بەراتی تۆم بۆ چییە؟ پەلەم لێ مەکە! با بزانم.

عەلیلە دەزانێ کە تووڕە بێ، نە بەزۆر چەنە بەری دەکا، نە بە تفەنـگ پێـی دەوێـرێ، خۆی ماتکرد و بێ دەنگەی لێ هێنا.

عەبە بە کەلارەیەک وردە و تەپالە هاتە ژووری. وەک ئـەوەی هـەسـتی بـە شـتێک کردبێ، دڕدۆنگ دیارە! دوو شک چاو لە میوانەکانی دەکا! لە دلەوە سێ و دوویەتی:

ـ بێژی چکارەون؟ دزوچەتەن، یا پیاو خاسن؟ بێژی تاهیر بشناسێ؟ ناشێ! ئەر واوایـە، دەس وەجێ ئەیانوت. ڕاس ئێژن ئەم ناوەقە نەهاتین، غەریون و کـەس ناشناسـن، وە مـن چە؟ هەر کەس ون، خاسن، خوا خاسیان بۆ بکا، خراون، خوا خراویان بۆ بکـا، هـەرچـی هەن میوانن، حەوەجێیان کەفیتە سەر من، ئەوەی لە دەسم بێ، دریخ ناکـەم، خاسـە ناویـان بزانم:

ـ برا! عەیب نەوێ! ناو شەریفتان؟

عەلیلە زاری کردەوە و ویستی بڵێ. بلە زووتر هاتە جواب:

ـ جارێ تەنوورەکە داخە، گەرممان هاتەوە، پێت دەڵێم، زۆرم سەرمایە!

عەبە بە دوو دلیەوە کورسی لە سەر تەنوور لابـرد و دایـسخت. عـەلیلـە بـێ ئـوقرە ئەمبەرەوئەوبەر دەجوولێتەوە! چاوێ لە عەبە دەکا، سەرنجێکی بلە دەدا. بێ ئیختیار چـاوی دێتەوە سەر عەبە:

ڕوخسارە کزولاوازەکەی عەبە لە بەر شەوقی تەنوور زەرد زەرد دەنوێنێ و لێوی بـاری گرتووە. چاوە بچووک و زیتەکانی لە جاران زیتتر، زوو زوو دەیانترووکێنێ و هەر جارێ تەماشای یەکیان دەکا، دەڵێی بە چاو دەیاندوێنێ! وەک سەر لێشێواو، پەستا پەستا وردە لە تەنوور دەخا، دەڵێی ئەویش لە سوور کردنەوەی تەنوورەکە بە پەلەیـە! تـەنوور بـووە بـە

دەنووکی کەو. تین و بلێسەی، بلە و عەلیلە دوورخستەوە. عەبە هەر لە گوێی تەنووره و تێی دەماڵی. گڕ، شالاو بۆ روخساری دەبا، وا کە بیترسێنێ، بەڵام ئەو وەک ئەوە دەچێ هەست بە هانای ئاور نەکا! بێ تەکان چاوی لە نێو کڵی ئاور بڕیوە، وەک هۆگری بووبێ، چاو ناتروووکێنێ. عەلیلە چاوی لە سەر عەبە گوێزاوە و تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد، نیو سەعاتی رۆژ ماوە.

دووکەڵ لە کولاوکەوە وەسەرکەوت. فەیزە لە پەنا بەردەوە دەرپەڕی و بە دوو لۆق خۆی گەیاندە بەر ماڵەکەی عەبە، یەکەم دەرگاکە سەری بردە ژوور، گەلاز لە کادێن لێی راستەوە بوو. هێرشی گەلاز هێند لە ناکاو و بە حوجەت بوو، فەیزە سەرەنگرێی بەست و کەوت. گەلازیش پەت لە ملی توند بوو و بە سەروە گلاوگولۆلە بوو. فەیزە لە سەر چۆک و چنگ خۆی دا بە دەرکی تەویلەدا. لە تەقەی دەرگا عەبە راپەڕی، بە چاوپێکەوتنی فەیزە، دڵی داخورپا!! بە تەکان هەستاو ئامبازی بوو. هێشتا عەبە نەگەیبووە فەیزە، بلە لە دواوە پەلاماری‌دا و عەبەی بابۆلە کرد و بەرەو تەنووری سوورەوە بووی هێنا.

عەلیلە دەستی گرت بە چاویەوە و دەرپەرییە دەرێ، گەیشتە کادێن، زیڕە و هاواری عەبە، عەلیلەی وێستاند و چاوی بڕییە کەلاک و زمانی درکشاوی گەلاز کە لە نێوەڕاستی کادێن بێ مرە و پاس کەوتووە و ئیتر گوێی لە هاواری عەبەوە نییە، چاوی کراونەتەوە و زەق زەق دەڕواننە عەلیلە، دەڵێی پرسیاری لێ دەکا! عەلیلە بە شەرمەوە چاوی لە سەر کەلاک گواستەوە، تەماشای سەعاتەکەی کرد، رۆژ لە ئاوا بوونە. دەرگای کردەوە وکێوی گرتە بەر. هێشتا لە کاولاشەکە دوور نەکەوتبووەوە، بۆنی گۆشتی برژاو و بۆ چروکی ئێسکە سووتاو تەز و مچوڕکی خستە لەشی عەلیلەوە، چەواشە و کێو بڕ دەشتی گرتە بەر. لە تەپی پەچە خڕە ئاوڕی داوە. بلە و فەیزە بە سێ جوانەگاوە لە کاولاشەکە وەدەرکەوتن. بلە لە پێشەوە و فەیزە لە دواوە بەرەو شار وەڕێکەوتن.

## ٢٦

سێ مانگی سەرما و سەخڵەت دەرەتانی نەداوە مام حەسەن لە دێ وەدەرکەوێ، ڕێی دووری مزگەوت بووە. لەوەتا خۆرەتاوان ڕەش بوونەتەوە و بەر بەرۆچکان تینیان تێگەڕاوە، دڵی بۆ کەژوکێو دەکورکێنێ.

شەوێ بەر لە نووستن، بە مینای بووکی ڕاگەیاندبوو نان و پێخۆر و نەوتی بۆ ساز کا، بەیانی دەیەوێ سەرێکی عەبە بدا، بێ تاقەتی خۆی بەسەربەرێ و خاوی ئەسپەکەشی دەشکێنێ.

گزنگ لە مێژە لە سەردانی داوە. مام حەسەن لە دەرکی حەوشە قەنەی داگیرساندووە و لەسەرەخۆ مژی لێ دەدا، تەماداره ئەحمەد چارەوێی بۆ بێنێ.

ئەحمەد لە حەوشە چارەوێ زین دەکا. مینا بە هەگبەیێ نان و پێخۆر و دوو بتری نەوتەوە، وەک هەرەتی کچێنی، بە حەسرەتەوە، ورد لە مێردەکەی دەڕوانێ.

چارەوێ زین و لەغاو کرا. ئەحمەد بە بزەوە هەگبەی لە مینا وەرگرت و لە پاشکۆ دایبەست. بترییە نەوتی بەم لاوئەو لای زیندا هەڵاواسی. دەستە جڵەوی چارەوێی گرت و کێشایە دەرکی حەوشە. مام حەسەن پێی لە ئاوزەنگی نا و سوار بوو و بە ئاستەم رکێفی لێدا.

جاران، هەرکەس لە یاڵ سەری دەرکەوتبا، گەلاز دەوەڕی و عەبە بە دەنگییەوە دەردەپەڕی، دوور بە چڕە و گورە ڕێبواری وەقسە دەهێنا. زانیبای میوانی ئەوە، گەلازی بێ دەنگ دەکرد، بە گاڵتە و قسەی خۆشەوە دەچوو بە پیریەوە.

ئەمڕۆ چ قەوماوە؟!! نە حەپەی گەلاز، نە چڕەی عەبە و نەبۆڕەی جوانەگاکانی دێ و نە دووکەڵی کاولاشەکەی دیارە!! چۆڵی دەستی ناوەتە ناخی ئاوەدانی و لەگەڵ

گۆڕستانە کۆنەکەی دێ کۆن یەکسانە! دەڵێی هەرگیز بوونەوەرێ لەو شوێنەوارەدا نەژیاوە! یان هیچ دەستێ بە خوێنی کەسێ سوور نەبووە و پەنجەی زۆرداری ناخی هەژارێکی نەگوشیوە! یان، قەت گورگ دڵی نەهاتووە زگی مەڕێ هەڵدڕێ، هیچ تاژییەک لە لاندا کەروێشکی بە تەماڵ هەڵنەهێناوە و پەنجە و نینۆکی تیژی لە تووکی نەرمیدا ون نەکردووە، هەرگیز بزنی شاخدار ئەوەندە بێ بەزە نەبووە شاخ لە کۆڵە بکوتێ.

دەڵێی ئیتر ململانێ و دووبەرەکی زۆردار و بێ زۆر لە گۆڕێدا نەماوە و هێمنایەتی و برایەتی فەرمانڕەوایە! ئەرێ، ئەرێ، ئەمڕۆکە هیچ بوونەوەرێ لە دێ کۆندا نەماوە، ڕۆژی یەکسانییە، تەنانەت سروشتیش ڕەنگدانەوەی یەکسانی تێدا بەدیدەکرێ.

هەوای ئاخر مانگی زستان هێمن و لەسەرخۆیە و چرنووک لە ڕوخساری مام حەسەن ناگرێ، بێ ڕکێف، بەلام دوو دڵ و چەواشە و بە پەناگۆڕستانە کۆنەکەدا تێپەڕی و لە بەر کاولاشەکە دابەزی. دەسکەوساری چارەوێکەی کرد بە دوولکی گرێژەنەی دەرگادا و دووشک سەری بردە ژووری، بە چاوپێکەوتنی کەلاکی گەلاز لە جێ وشکبوو!

گەلاز بە پەتەوە، لە ناوەڕاستی کادێن چوار چەقڵەی بەستووە و بە قەت ڕەشکەیێک ماسیوە! پێ پێ و عەبەساو چووە تەویلە، پەت و مێخی بێ جوانەگا لە سەر ئاخوڕە! گێژومەنگ، بە دلەکوتێوە پێی نایە نێو ژوورەکە. دووتا کەوشی قولاخ هەڵپچڕاو و کلاوە تەپە دڕاوەکەی عەبە لەم بەروئەوبەری تەنوورەکە کەوتوون!! ماوەیەکی زۆر بەسەر سوڕمانەوە لە ئاسەواری بە جێماوی دەفکرێ. بۆ چرووکی ئێسکە سووتاو بەرەو تەنوورەکەی کێشا و داهاتەوە و سەری کێشایە نێو تەنوورەکە، تاریکی بوو بە لەمپەر و هیچی نەدی. چەرخە نەوتینەکەی دەرهێنا و هەڵیکرد. لە بەرا باوەڕی نەکرد! چاوی هەڵگلۆفی! دیسان سەرنجی داوە، تەز و مچۆڕک کەوتە لەشی! تاسا و واقی وڕما! وەهم و خۆف بەندی دڵی وەلەرزە خست، ماوەیەک خۆی لێ ونبوو، ترسا، زۆر ترسا! دوو سێ هەنگاو بەرەو دەرگا کشاوە، ویستی هەڵێ! ڕاچەنی، خۆی دۆزییەوە، ورەیدا بە خۆی، لە جێ چەقی، بە سەر ترسا زاڵبوو. گەڕاوە، لە سەر تەنوور وێستا، داهاتەوە و ئەژنۆی دادا. چەرخی لێداوە و چاوی کردەوە. جەستەی عەبەی وەک باغە و لایلۆنە

سووتاوێ هاته بەر چاو، یان نانی گەرمە تەنوورە و لە دەستی کابانی شپرێو بەر بۆتەوە و لە سەر کلّی ئاور، لەگەڵ خۆڵەمێشەکەی دامرکاوەتەوە و بووە بە کۆلە.

مام حەسەن لە پڕ هەستا و دەرپەڕی. چوست و چالاک، وەک هەرەتی لاوی پەڕییە سەر زین و ئەسپی تاودا.

یەکەم جار کە بانگەواز مەرگی کەسێ رادەگەیێنێ، مێشک وەرناگرێ. بوو بە دوو جار، دەکەوینە گومانەوە، سەری سێ جار رادەچەنین و دەکەوینە بیری مەرگی خۆمان. کە مام حەسەن گەیشتە دێ، لە سەربانی مزگەوتەوە بانگەواز، مەرگی عەبەی راگەیاند. خەڵک گوێ قوڵاخ وەستان! کە دووپات بۆوە. چپە کەوتە نێویان. بوو بە سێ جار، کانی توو هەژا و رژانە مزگەوت و جەماوەرێ ویستیان وەڕێکەون بۆ دێ کۆن. مەلا کەریم لە بەر مێحرابەوە هەستا:

ـ برادەرینە؟ لە سەرەخۆ بن، دنیا بێ خاوەن نییە، سبەی رۆژێ باس و خواسی دەبێ، ئەوە ئێمەش چووین، خۆ دەبێ ئاغا بزانێ بێ دەستووری ئەو نابێ دەستی لێ دەرێ، ئەوە مەسەلەی قەتلە، بە من دەکەن سوارێ بچێ و خەبەر بە ئاغا بدا، بزانین دەستوور چ دەبێ.

فەیزە هەستا:

ـ مامۆستا! من دەچم هەر لە تازاواوە، لە خزمەت ئاغادا دەچینە دێ کۆن. تازە ئێرە نابینینەوە، تا ئێوە دەگەن، ئێمە لەوێین.

ئەودەمەی بانگەواز کرا، ئەحمەدی مام حەسەن خۆی گەیاندبووە ماڵی پوورەگوڵە. رایان هێنابووە سەر ئەوە ئەحمەد بچێ ماینەکەی باپیری بخوازێ و ئەوی سوارکا و وەڕێکەون.

فەیزە کە لە دێ وەدەرکەوت، ئەحمەد و پوورەگوڵەش وەدەرکەوتن. فەیزە بە ڕێی کێوە بەرداوێلەدا، بەرەو تازاوا و ئەوان بە ڕێی مێرگە گەورەدا، بەرەو دێ کۆن.

بە گەیشتنی فەیزە، قەلا لە بارودۆخ کەوت! هەمزەبەگ هەستاوەتە سەر پێ و یەک بە خۆی دەگوڕێنێ:

ـ کەس لە کەسە!! ملک بووە بە ئاشی بێ خاوەن و هەر کەس بۆ خۆیەتی! هەر رۆژێ کەسێ دەکوژرێ!! ئیشەڵلام بە خودا کردبێ، نۆرەی منیش دێ!

رووی کردە فەیزە:

ـ درێژی قورمساخ! زارا، حەمە کوشتی، عەبە چی؟ نالێی ئەو، ها؟ دەبڵێ دەی، بۆ نالێی.

فەیزە سەری بەرداوەتەوە و کڕەی لە خۆی بڕیوە. هەمزەبەگ بانگی ئەحمەد فەڕاشی کرد:

ـ بڕۆ بە ڕەسووڵ و ئەو دوو چەکدارە حیزبابە بڵێ بێنە ژووری، بە حەسەنیش ڕاگەیێنە چارەویکان زین کا.

پیاوانی کانی‌توو، پیر و جوان لە دێ کۆن، تەماداری فەرمانن. پێنج سوار تەنگەتاو رکێف بە رکێفی یەکەوە. کەندولەندی ڕێی تازاوایان بڕیوە و کرژ لە یالەوە هاتنە خوارێ، گەیشتنە نێو کەلاوەکان، حەشیمەت چوونە پێشواز. هەمزەبەگ لە پێشەوە، ڕەسووڵ و فەیزە و بلە و عەلیلە بە دوویەوەن. سوارە و خەڵک لەبەر کاولاشەکە کۆ بوونەوە. ئاغا دابەزی و کرژ چووە ژووری، دەستەیەک کەیخودا بە دوویدا رۆیین. پاش ماوەیەک هاتنەوە دەرێ. هەمزەبەگ بە دەنگی بەرز و تووڕە، گوتی:

ـ زۆر کەسم دیوە کوژراوە، هیچیان بەقەت ئەمجارە کاری تێ نەکردووم، هەر کەس ئەو کارەی کردووە، ئاشکرا بێ، بە قەبری بابمی تێچووە، وەک ئەو لە ئاوردا دەیبرژێنم ئاشکراش دەبێ، رۆژ لە ژێر هەور دا نامێنێتەوە.

عەلیلە چاوێکی لە فەیزە و بلە کرد. بلە لێوە لە فەیزە دەکورۆژێ. فەیزە لووتی هەڵێنا، ئەنەهوو هەر نایاناسێ. هەمزەبەگ پێی نایە ئاوزەنگی، دەستی لە سەر یالی کوێتە و قەلبۆزی زینە و رووی لە مەلا، گوتی:

ـ بە خاکی بسپێرن، خۆم بە دەوڵەت رادەگەیێنم.

پێی لە ئاوزەنگی و دەستی لە یاڵ و زین توند کرد و پەڕییە سەر زین، رکێفی لە کوێتەدا و ڕەسووڵ و بلە و عەلیلە، بە ریز وەدووی کەوتن. فەیزە دوور کەوتەوە و دابەزی، چارەویکەی بەستەوە و هاتەوە نێو خەڵکەکە.

دوا بە دوای رۆیینی هەمزەبەگ، پوورەگوڵە خۆی کرد بە ژووردا، لە سەر تەنوور چۆکی دادا، ئێسکی سووتاوی عەبەی لە نێو خۆڵەمێشی تەنوور بە لەت و کوتی دەرهێنا و لە توورەگەی کرد. هەر لە پشتی کاولاشەکە بە خاکیان سپارد. پاش تەڵقین و فاتحا، پوورەگوڵە چاوی پڕ قینی بڕییە نێو چاوانی فەیزە، بەرز گوتی:

ـ ئەمجارە چی؟! بلێی حەمە نەهاتبێتەوە؟! ڕەنگە کاری ئەو بێ!! سوێند ناخۆی؟!

فەیزە، بێ جواب رووی وەرگێڕا و دوورکەوتەوە، وەک ئەوەی دڵپڕ بێ و بگری، دەسرە دەستەکەی گرت بە دەموچاویەوە، سواری ماینە ئەبڵەق بوو و تاقە سوارە ڕێی گرتە بەر.

حەشیمەت بە جەماوەر دێ کۆنیان چۆڵکرد. پوورەگوڵە لە ژوور سەری عەبە ئەژنۆی لە باوەش گرتووە، ئەحمەد بێ قسە لە پشتییەوە وەستاوە، نە پوورەگوڵە دەبزوێ، نە ئەو دەوێرێ هیچ بڵێ. ئاخر کەس لە نساری بەفرە بە سەری هەزار ئەشکەوت وەسەرکەوت و ئاوا بوو. ئەحمەد ماینە بۆرەی هێنا پێشێ، بێ قسە، قۆڵی پوورەگوڵەی گرت و هەڵیساند و سواری کرد.

مردووی بێ سەرەخۆشی و خەمخۆری زۆر.

ئەوەی عەبەی دیبێ، بۆی بە خەمە. لە هەمووان داخدارتر پوورەگوڵەیە. لەوەتی حەمە ڕۆییوە، بۆنی ئەوی نابوو بە عەبەوە، خووی پێ گرتبوو. لە پوورەگوڵە بە دوا، ئەحمەد و مینا بۆی بە کوڵن. شەوێ لە تاوان هانایان بردە بەر پوورەگوڵە. لە سەرەخۆ، وەک بیرەوەری قسەکانی عەبە دەگێڕنەوە. پوورە گوڵە بە دەم بیرەوەرییەوە، وڕێنەی پێوە دەکا:

ئاشکرا دەبێ! خۆم دەزانم، وەک ڕۆژ لێم روونە، خوێن ون نابێ، ئەویش خوێنی بێ تاوان، ئەگەر گوڵە ئەقلی بێ، بەشک دیومەتەوە! دەزانم کاری کێیە؟ ئەگەر کاری ئەو بێ، بە ددان لەتی دەکەم، دڵم دەڵێ کاری ئەوە، سێ چوار جار خۆی ئاشکرا دەیگوت:

ـ میمکە! ئەو براگەماڵە فرەی قین لێمە، بە زات خوا ساڵی وەهەزار چووێ ئەمکوژێ، هەر دەمایەکی کوژرام، ئەو کوشتمیە، خوێنم گوم مەکە میمکەگیان.

ئەحمەد باشی بۆ چووە، لە دڵەوە دەزانێ مەبەستی پوورەگوڵە کێیە.

ـ بە هەڵە چووی، ئەوەی تۆ دەڵێی، لە دووریش نەیدەوێرا چاو لە چاوی عەبە بکات، ئەگەر وێرابا، هەر ئەو ساڵە کە عەبە دێ کۆنی ئاوەدان کردەوە، دەیکوشت، نا نا، ئەو زۆر ترسەنۆکە، چاو لەوە مەکە لە نێو دێ بێ حەیایە، زۆر دێڵ و خوێڕییە پوورێ گیان!

ـ ئەسقەزا هەر لە بەر ئەوە شکم لێیەتی، پیاوی پیاو کاری وا ناکا، ئەوە کاری خوێڕییە پیاوە، دەستی ئەوی تێدایە، دەسکیس بووە، هی دیکەی لە گەڵ بووە، خۆ ئاشکرا دیارە، ئەوە نییە سەگەکەیان پێ بەستۆتەوە! هەر کەس بووە، خاوی بەستووە، بەڵەدی گەلاز بووە، زانیویە دەستی بۆ بەرن، گەلاز لەتیان دەکا، لە بەر ئەویان پێ

بەستۆتەوە، کە هاواری کردووە، گەلاز تەکانی داوە و پەت لە ملی توند بووە خنکاوە.
ئەرێ، هەر وا بووە، دەبێ هەر وا بووبێ.

مینا واقیوڕە! لەو وتووێژە حالی نییە، بە سەر سوورمانەوە گوتی:

ـ باسی کێ دەکەن؟! وەک باس دەکەن، شکور ئاشکرایە.

پوورە گولە لەوەی گوتوویەتی، پەشیمانە، زوو بای داوە:

ـــ چووزانم! پیاو ئیمانیشی دەچێ، نازانم بە کێ بڵێم؟ عەبە کێ کوشتی؟دەبێ هەر لە خۆمان پرسیار بکەین: ئەرێ عەبە کێ کوشتی؟!! تۆ بڵێی کوڕانی مەنسوور خان لە تۆڵەی خوێنی بابیان نەیانکوشتبێ؟! بڵێی ئەودەمەی کە لە نێو گڕەگڕی ئاوردا هەڵقرچاوە و هێشتا گیانی تێدا ماوە، لە بیری چیدا بووبێ؟! بڵێی لە بیری ژنە کوژراوەکەی و کوڕ و کچە ناز لێ شێواوەکەیدا، یان لە بیری دەربەدەری و چولپەرستییەکەی خۆیدا بوو بێ؟ رەنگە ئەوانەی هیچ لە بیر نەبووبێ، ئەگەر لە بیریشی بوو بێ، وەک هەورە برووسکەیەک بە مێشکیدا تێپەڕیون و لە بەر ئێش و ئۆف هیچیان لە مێشکدا نیشتەجێ نەبوون، تەنیا لە بیری گیانیدا بووە، بڵێی چەندە پەلەقاژێ و هەوڵی دابێ و هاواری کردبێ؟!

پوورەگولە چاوی بڕیوەتە گڕی لامپاکە، ئەودەمەی هێناوەتە بەرچاو کە پەپولەکان خۆیان دەکرد بە نێو شووشەکەیدا و لە نێو گڕدا باڵیان هەڵدەپڕووزا و سەرەنجام خۆشیان تا گیانیان تێدا دەما، هەڵدەبەزینەوە، پاشان لە خۆ گوتان و هەڵبەزین دەکەوتن.

لەودەمەوە پوورەگولە چاوی بڕیوەتە گڕ، ئەحمەد و مینا بە چاو یەکتر دەدوێنن:

ـ یانی عەبە ئەو پیاوە بووە؟!! ئەی چۆن کەس نەیزانیوە؟! لانی کەم چۆن ئێمە نەماناسیوە؟! ئەی داخی بە جەرگم بۆ زوو نەمانزانی؟

پوورەگولە لە چاویان حالییە، لەدڵەوە جوابی دانەوە:

ـ ئەرێ ئەرێ، عەبە ئەو پیاوە بوو، لە ترسی زوردار ناوی خۆی نابوو عەبە! ناوی خۆی شا محەمەد بوو، خەڵک پێیان دەگوت عەبە شێت.

ئەو شەوە تا درەنگانێ، ئەوەی سەبارەت بە عەبە دەیزانی، وەک چیرۆکی بۆ ئەحمەد و مینای گێڕاوە و ەک داغێک دەیچزاند و بە دڵیانەوە. مانگێ لە مەرگی عەبە تێپەڕیوە و لە بیران نەچۆتەوە. پتر لە هەموو کەس، بیری عەلیلەی ئالۆز کردووە و بۆ ساتێکیش

لەبەر چاوی لاناچێ. لەودەمەوە بۆک و نابۆک لەگەڵ بلە دەدوێ، ئەوەندی دەشێدوێنێ، هەولی ئەوەیە لە فەیزەی هاندا:

ـ دۆستی وەک فەیزەت هەیە، دوژمنت بۆ چییە؟! پیاو دۆستی وای بێ،دەبێ شێوی لە بری ناشتای بێ! پیاوی پێ کوشتی، پوولی جوانەگای نایە باخەڵی و قسەشت لەگەڵ ناکا! ئەوە گۆڕت بێ، چەندەم گوت کورە ئەو بەستزمانە مەکوژە؟ جوابت نەدامەوە، پێت وا بوو خولە پیزەم بۆ دەکوژی. ئەو دەمیش گوتم، ئێستاش دەڵێم، من هیچم ناوێ، بە خێر و شەڕەوە بۆ تۆ، حاشا، نە گۆشتی کەروێشک دەخۆم. نە... کەیفی خۆتە، لەگەڵ فەیزە چۆن پێکدێن، پێک وەرن. خوداش دەزانێ لەو کارەدا لەگەڵت نەبووم، لەو بابەتەوە دلنیام، هەر نەبێ ویژدانم ئازار نادا.

لەو دەمەیڕا عەلیلە دایمەزراندووە، هەر دوو کەوتوون بە لادا و پشتیان کردۆتە یەک، بلە راستەوە بوو:

ـ کەسێ نابەڵەد بێ، دەڵێ ئەم کابرایە عابدە و بەرمالی بە سەر ئاوەوە دەگەڕێ و لە ترسی خودا شەوانە خەوی نییە! ئاخر تۆ کێی؟ عەلیلە دز نیت؟ کەمت مل بڕیوە؟ لەوەتا دەتناسم دز و تالانچی بووی. لای کەسێ خۆت هەڵکێشە پڕ بە کراسێ کە نەتناسێ! ئێمە ماری کونێکین، لانی کەم بیست سالە بە هەموو خلێنە و بلێنەیەکی یەک دەزانین.

عەلیلەش راست بۆوە:

ـ نالێم دز نیم، پیاوکوژ نیم، لە کوشتنی ئەو بەستزمانەدا دەستم نەبووە، ئەویش بۆ کێ؟! بۆ فەیزە درێژ!! تۆ پیاوت کوشتووە، ئەو بوو بە خاوەن پوول! داخی هیچ نەیکوشتووم، بە گەوجت دەزانێ! کێ باوەڕ دەکا جوانەگای دابێ بە سێسەد تمەن؟! ئەویش ئەو جوانەگایانە! بە خودا برا بە برای نادا بە هەزار و پێنسەدیش، تۆ باوەڕ دەکەی؟ ئەگەر باوەڕ بکەی، دیارە گەوجی، باوەڕ دەکەی، ها؟

بلە، مات تەماشای بەردەمی دەکا، عەلیلە درێژەی دایە:

ـ ئەگەر لە بیرت بێ، لە چایخانەکەی حاجی گوتم: کورە داوم مەخە داوی ئاغاواتەوە! نەمگوت قەزای مالبڕەکەی خۆم دەخەم لە هەزار بەراتی ئاغا؟ نەمگوت؟ من رۆحم لە رۆحی فەیزە تۆقیبوو، دەمزانی ئێمە چەندە بەری قەلە و دەلەی فەیزە ناکەین، بە قسەت نەکردم. دەفەرموو، تۆ ئێستا چت لە دەست دێ؟ بە حال هەر بە حال قسەی لەگەڵ بکەی ئەوەی لە دیزە دایە، بە کەوچک دەریدێنێ و لە پێشی ئاغای دادەنێ، خۆ

قسەی تۆ قسەی ئەو نابڕێ، دەیبڕێ؟ نەوەڵلا، گوێت لێ بوو لە دێ کوێن ئاغا چی دەگوت؟ چاوت لە فەیزە نەبوو چۆن بەو قسانە خۆی گێڤ دەکرد؟ بە حاڵ، هەر بە حاڵ پێ لە پشکۆوە بنێی، سەر و مالیە، ئەوە فەیزەیە! بۆ قرانێ سەد پیاو دەکوژێ! تۆ لات وایە بۆ عەبەی بە تۆ بە کوشتدا؟ لە بەر بستێ زەوی، کە هی ئەویش نەبوو، ئەوە من لە خۆڕا نالێم، خەلک دەلێن. زیرەکە، زۆر زیرەکە!! پیاوی پێ کوشتی، بە زەوی گەیشت و پوولی جوانەگای نایە تەنکەی باخەل، ئێستا پێدەکەنێ.

ـ بە چی پێدەکەنێ؟

ـ بە تۆ، بە من، بە گەوجی ئێمە، بە زیرەکی خۆی، ئێستا دەلێ ئەو سێسەد تمەنەی دەدەمێ، دەیەوێ هەر ئەوەیە، نایەوێ هەر ئەوەیە، کورت و کرمانجی، دەلێ: ئەوەم شەمامەیە، بۆنی دەکەی بیکە، نایکەی، هەر ئەوەیە، دەلێی چی؟ چت پێ دەکرێ؟

ـ چم پێ دەکرێ؟ لە چاوی دەردێنم، بە خەوی شەوان پێی دەگێڕمەوە، خەیالی خاویکردووە، ئەوە بلە سوورە، خراپ حالی بووە.

عەلیلە قاقای کێشا، چاوێکی لە سەعاتە مووچییەکەی کرد، کەوت بە لادا، پشت لە بلە گوتی:

ـ ئەی مەگەر... بگری.

بلە بە تووڕەییەوە رووی وەرگێڕا و پشت بە عەلیلە راکشا، بە رقەوە گوتی:

ـ دەیبینی، یان دەیگرم، یان نایگرم.

لە مێژە بێ دەنگن. عەلیلە سەری ناوەتە سەر باسکی راستی و پرخەی دێ. بلە باسکی چەپی کردووە بە کۆلەکەی سەرەقورسە پڕ خەیالەکەی و لە گێژاوی زولمی فەیزەدا پەلە قاژێ، پەل دەکوتی. لە پڕ راستەوە بوو. سەرنجی دەلاقەکەیدا. رۆژ ئاوا بووە. هەستا، لە کەلێنی دەرگاوە تەماشایەکی لێژی قەلا و دەراوی چۆمی کرد، کەس دیار نییە. گەڕاوە، بێ چرپە چووە سەر عەلیلە. یەک دوو جار، سەبرکۆخی. عەلیلە ئاگای نەکرد. بەرەو تفەنگەکەی رۆیشت. فیشەکدانی لە خۆی بەست. بڕنووی لە شان کرد و بێ خشپە وەدەرکەوت. هێشتا بلە لە لێژ نەترازابوو، عەلیلە لە درزی دەرگاوە خستییە ژێر چاوەدێری، تا لە چۆم کردییە ئەو بەر، چاوی لێبوو.

تەنگی نوێژی شێوان و جەنگەی شێوە. بێ دەنگی و تاریکی پەنجەی بە سەر کانی‌توو کێشاوە، بەشدار لە سەر بەشەنان مشتومڕیانە و ئاگایان لە دێ نییە. دوو کونە

ئەمبەروئەوبەر جار نەجار بۆ یەکی دەسێننەوە. لە پڕ هاڕەی بڕنوو کوندەکانی بێ دەنگ کرد. ئاوایی بە سەر یەکدا شلەژا، خەلک پێ خاوس و بە پێلاوی ئەم پێ و ئەو پێوە ڕژانە دەرێ:

ــ چ بووە دیسان!! ئەو تەقەیە لە کوێوە هات؟!

قیژەی ژن و منداڵ حەشیمەتی بەرەو ماڵی فەیزە کێشا. دەرک و بان پڕ بوو لە خەلک. کەیخودا و مەلا چوونە ژوورێ.

ماڵ پڕ لە قورم و بۆنی باڕووت. لامپا لە نێو تۆزدا بە ئاستەم سۆلەی دێ. فەیزە لە نێوەڕاستی دیودا درێژ ڕاکشاوە و شەلتانی خوێنە! گوللەی بڕنوو لە کولاوکەوە تەوقی سەری سمیوە و شەویلکەی لەگەڵ خۆی هەلتەکاندووە، کەس بە دەنگ نەیگەیشتوەتێ.

ژن و منداڵ خۆ دەڕنن. ژنان دەورەی فاتمی خێزانی فەیزەیان داوە و لە پەستا دنەی دەدەن زیاتر لە خۆ کوتان و خۆڕنین شێلگیر بێ.

مەلا کەریم هەستا:

ــ ژنان! بۆ وا دەکەن؟ بە جێی دلنەوایی، ئاور لە جەرگی بەر دەدەن؟ ئەو کارە خەلافی شەرعە. لە رۆژی وادا، شەرعەن وەزیفەی دراوسێکان ژن و منداڵی ئەو مەرحوومە بەرنە ماڵێ و دلخۆشییان بدەنەوە، شەرعی ئیسلام وا دەفەرمێ: خۆڕنین و لە خۆدان، تیغ هەلگرتنە بۆ شەڕ لەگەڵ خودا. باجی فاتم! شەڕ لەگەڵ خودا دەکەی؟ ئەستەخفیرللا، نەعووزوبیللا!! بە بەشی خودا رازی بە خوشکی دنیا و ئاخرەتم.

بە قسەی مەلا، ژنان، ژن و منداڵیان بردە مالان و دەنگی گریان نەما. مەلا رووی کردە پیاوان:

ــ براینە! دەست هەلپێکان و ماتەم گرتن هیچ ناکا. تا شەو درەنگ نەبووە، هەواڵ بە ئاغا بدەین، بزانین ئەو چ قوڵێ دەکێشێ، خۆ ناکرێ بێ دەستووری ئەو دەستی لێ دەین، بە من، هەر ئێستا کەسێ سوار بێ و خەبەر بەرێ.

فەتاحە کوێر گوتی:

ــ مامۆستا! چارەوێیەکم بدەنێ، ئێستا دەڕۆم.

ــ تەنیا دەچی؟

ــ بەڵێ، خۆ چلەی زستان نییە، بەهارە و ولات رەشە، مەڕ دەڕوا.

مەلا چاوی لە مام حەسەنە. مام حەسەن چاوێکی بە نێو خەڵکەکەدا گێـڕا، ئەحمـەدی کوڕی دیت:

ـ ئەحمەد رۆڵە لەگەڵ کا فەتاح برۆ ئەسپەکەی بۆ زینکە و بیدەیە

هەورێکی مات چوار نکاڵی ئاسمان گرتۆتە بەر و تاقە ئەستێرەیەک بـەدی نـاکرێ. تاریکە شەوێکی ئەنگوستە چاوە. هەوا هێمن و لە سەرەخۆیە. فەتاح کۆنـە راوچییـە، لـە شەو و تەنیایی و تاریکی و چۆڵی بێ باکە. چـەنـد سـاڵ لەمەوبـەر، لـە راودا تفـەنگی رەشۆکی لوولەی تۆقیوەتەوە چاوی راستی قەلپـووچ کـردووە. چـارەوێ هێـور هێـور کوێرە رێی دۆڵی دزان دەبڕێ. سوار پەلەی لێ ناکا. لەغاوی شل هاوێشتۆتە سەر یالـی، بێ ئەوەی خۆی ئاگا بکا، بە دەنگ لەگەڵ خۆی دەدوێ:

ـ هەی گۆڕبەگۆڕ! سوێندی ناحەق ئاوات لێدەکا! ئـاخر وەڵـڵاهی ژنی مـن عـەتا کوشتی کەچی دەستەدا بە قورعاندا و ئاوقای حەمە شوانی دەکـا! ئـەوە گـۆڕت بـێ، قورعان ئاوات لێدەکا، خودا بۆ منی گەیاند! دەڵێن دەعبای کوێر خودا هێلانەی بۆ دەکا، ئەوە منم، ئەو کوژرا و فاتم بێوەژن کەوت، ئەو بێوەژن و من بێ ژن.

لە نەکاو سمی چارەوێ شڵپەی لە ئاوی چۆم هەستان و بارودۆخی خەیاڵـی فـەتاحی گۆڕی، گەییوەتە نزیک تازاوا، لە چۆم پەڕییەوە و سەرو ژوورەی لێژی قەڵا دەبڕێ، لـە پڕ خرمەی چەخماخ و دەنگێ لە جێ وشکی کرد:

ـ کێیی کوڕە بەو شەوە؟

دەنگی بلە هێند کوتوپڕ هات، ماوەیەک فەتاح بە سەر چارەوێوە تاسا. دیسان دەنگی داوە:

ـ کێیی کوڕە کوژرای!

ـ فەتاحم، خەڵکی کانی تووم.

ـ بۆ کوێ بەم شەوە؟

ـ کارم بە قەڵایە، خەبەرم بۆ ئاغا هێناوە، پیاوکوژراوە، فەیزەیان کوشتووە.

ـ کێ کوشتوویە؟ قاتڵ گیراوە؟

ـ نەوەڵڵا، کەس نازانێ کێ کوشتوویە.

ـ باشە، دابەزە و دەست بنێ سەرسەرت، وردە وردە وەرە پێشێ، چەکت پێیە؟

چەکی چی؟ نەوەڵڵا.

فه‌تاح دابه‌زی. له‌غاوی کرد به قوڵدا و هه‌ر دوو ده‌ستی نایه سه‌ر سه‌ری و هاته پێشێ. بله به وردی فه‌تاحی پشکنی. به جوت چوونه به‌ر ده‌روازه و لێیان‌دا.

ـ کێیه! راوه‌ستێ ئه‌وه هاتم.

ـ بیکه‌وه مامه، خۆمانین.

مام عه‌لی ده‌نگی بله‌ی ناسی و چل مێرده‌ی لابرد و ده‌روازه کراوه. بله رۆیشته ژووری. فه‌تاح باسی کوشتنی فه‌یزه‌ی بۆ مام عه‌لی ده‌گێڕاوه، بله هاته‌وه و فه‌تاحی نارده ژووری.

فه‌تاح جڵه‌وی چاره‌وێی کێشا و بردییه سه‌ر ئاخوڕی حه‌وشه و به‌ستییه‌وه، به په‌له وه‌سه‌رکه‌وت. ئه‌حمه‌د فه‌ڕاش له پێشخانه‌وه دیوی ئاغای پێشاندا. سه‌برێ له ده‌رکه‌ی‌دا چووه ژووری، له‌به‌ر ده‌رگا، ده‌سته‌ونه‌زه‌ر وێستا. هه‌مزه‌به‌گ دوگمه‌ی رادیۆ ئه‌نده‌لیاکه‌ی بادا و بێ ده‌نگی کرد:

ـ فه‌تاح! به‌و شه‌وه بۆ هاتووی؟

ـ قوربان! مامۆستا ناردوومی، کا فه‌یزه عومری داوه به ئاغا.

ـ چی؟! که‌ی؟

ـ ئه‌م ئێوارێیه، مامۆستا فه‌رمووی با ئاغا سه‌ر حیسابی بێ.

ـ ده‌ی به‌و شه‌وه‌بۆ؟ رۆژ نه‌ده‌بۆوه؟

ـ ئاخر فه‌تاح گه‌یه‌کی گرت و گنجاندی!

ـ ئاخر چی؟ مردووه، مردووه، هه‌موو ده‌مرین، رۆژ ده‌بۆوه.

فه‌تاح پێی له جه‌رگی نا:

ـ ئاخر به ده‌ردی خۆی نه‌مردووه، کوژراوه، کوشتوویانه قوربان!

هه‌مزه‌به‌گ وه‌ک ئه‌وه‌ی له ناوی کوشتن بێزار بێ، به تۆیی کراس و ده‌رپێوه راست بۆوه.

ـ کوژراوه؟!! کێ کوشتوویه؟!

ـ نازانم، که‌س نازانێ، له سه‌ربانه‌وه لێیانداوه قوربان، که‌س به‌ده‌نگ نه‌گه‌یوه‌تێ. هه‌مزه‌به‌گ به نێو دیوه‌که‌دا دێت و ده‌چێ هه‌ر دوو ده‌ستی راده‌وه‌شێنێ و له‌گه‌ڵ خۆی ده‌دوێ:

ـ ئاخوران و بخورانە! هەر ئەوەمان کەم بوو! جوابی ئەو هەموو کوشت و کوشتارە چۆن بدەمەوە؟ بۆ زارا گوتم ئەو هەتیوە شوانە یاغی بووە، کونە قینی لەو ماڵە بووە، بۆ عەبە گوتم ڕەشە دز لەبەر جوانەگاکانی کوشتوویانە. بۆ فەیزە بڵێم چی؟

فەتاح لانزەلیانە بە لای دەرگاوە وەستاوە و بە تاقە چاوێ دەڕوانێتە ڕاوشکاری ئاغا و تەماداری وەلامە.

هەمزەبەگ لە نەکاو سەری وەرسووڕاندێ:

ـ تۆ چت دەوێ کوێری سەگ؟! بە تەمای بەو شەوە بمبەی و بە کوشتنم دەی؟

ـ من بۆ ئاغا؟! کەیخوداکان منیان ناردووە، دەفەرمووی بڕۆم، چ بکەم؟ لە خزمەت مەرەخەس بم؟ بچمەوە بڵێم ئاغا چی دەفەرموو؟

ـ قوڕوەسەرکەن! چ دەکەن! هەر پوولی منە و بۆ ئەمنییە دەبێ، بڕۆن بینێژن، لەوە زیاتر چ دەکرێ؟ دەبڕۆ لەبەر چاوم بڕۆ.

فەتاح پشتی لە دەرگا کردەوە بڕوا، ئەحمەد فەڕاش گوێی لە قەڵەشی دەرگا کردەوە و بە پەلە ڕۆیشتەوە سەر سەماوەر و ئیستیکانەکانی. دەرگا کراوە فەتاح پشتاوپشت هاتە دەرێ. هێشتا دەرگاکەی پێوە نەداوە، ئاغا لە سەرەخۆ، وا کە فەتاح ئاشت کاتەوە، بانگی کرد:

ـ بە مەلا بڵێ، ئاغا دەیفەرموو زۆری گەورە نەکاتەوە، بەیانی خۆشم دێم. ئەگەر هاتم، وەبیرمی بخەوە کارم پێتە! لە بیرت نەچێ، لە بیرت بچێ، خۆت زەرەر دەکەی، بڕۆ.

فەتاح لە پلیکان هاتە خوارێ و ئەحمەد فەڕاش بە دوویدا. فەتاح گەیشتە حەوشە، ئەو خۆی کرد بە مدبەقدا و لەگەڵ نازدار دەستی کرد بە چپ و هۆڕ.

فەتاح سوار بوو و لە دەروازە چووە دەرێ. دەرکەوان چل مێردەی دەروازەی خست. لەو دیوی دەروازەوە، بلە هاتەوە سەر ڕێ:

ـ چ بوو؟ ئاغا چی فەرموو؟

ـ فەرمووی بە خاکی بسپێرن. بەیانی خۆشی دێ.

بلە سەر ڕێی بەردا. فەتاح بە وێلغار لە لێژی قەلاوە ڕۆیشتە خوارێ. بلە بە دڵنیایی چووە ژوورێ و لای عەلیلە دانیشت.

ئەودەمەی فەتاح لە کانی‌توو وەدەرکەوتبوو. قەبرکەن چووبوونە سەر قەبران، بە گەڕانەوەی ئەو و بیستنی پەیامی ئاغا. مەلا دەستووری شتنی تەرمی فەیزەی‌دا. پاش شتن، بردیانە مزگەوت. ئەو شەوە تا رۆژ کەس خەو چاوی نەچوو. لە مالان و مزگەوت، ئاشکرا و نهێنی باس باسی فەیزەیە:

ـ قورعان خواردن شۆخی نییە، خۆ لە تیغدانی خودایە، دیتان چۆن کاری خۆی کرد، ئەوەی بە درۆ خۆی لێدا ئاخری گیرۆدە دەبێ، ئەو تیری غەیب بوو، لە غەیبەوە بۆی نازلبوو، دەنا فەیزەکێ دەیکوژێ؟!

بەلام رای پوورەگولە وا نییە! ئەو دەلێ:

ـ کوشتنی فەیزە بێ سر نییە! دەبێ پێوەندی بە کوشتنی عەبەوە بێ، ئەو کەسەی لەکوشتنی عەبەدا دەستی بووە. فەیزە ئەو کوشتوویە، بۆیە ئەو کاری کردووە، کوشتنی عەبەی لێ ئاشکرا نەبێ، هەرکەس هەیە، فەیزەی باش ناسیوە، زانیویە قسە لە زاریدا بەند نابێ، لەبەر ئەوە، ئەویشی کوشت. من وای تێدەگەم، ئەگەر وا نەبوو. هەلبەت گولە ئەقلی نییە.

پوورەگولە ئەو قسانەی هەر بە لای ئەحمەد و میناوە گوتووە.

بەیانی تەرمی فەیزەیان بە خاک سپارد و گەڕانەوە و مزگەوت. پاش فاتحا، ئاغا و نۆکەر و دوو تفەنگچییەکەی سوار بوون. فەتاح لەو لای دێوە جلەوی کوێتەیگرت:

ـ قوربان! شەوێ فەرمووت بەیانی وەبیرمی بخەوە کارم پێتە، لە خزمەتام.

هەمزەبەگ بە بزەوە گوتی:

ـ با چلەی فەیزە بچێ فاتمت لێ مارە دەکەم، پێت چۆنە؟

فەتاح تاقە چاوەکەی بەرداوە، بە شەرمەوە گوتی:

ـ خودا لە گەورەییت کەم نەکا و سایەت لە سەرمان بمێنێ.

دەستە جلەوی بەردا و پاشەوپاش رێی چۆل کرد. هەمزەبەگ رکێفی لە کوێتەدا. رەسوول و بلە و عەلیلە بە دوویدا، لە کێوە بەرداویلە وەسەرکەوتن.

## ٢٧

ئەودەم کە لە نەخۆشخانە هێنابوویانەوە، کەس نەیدەوێرا خۆ لە قـەرەیدا. مـڕومۆچ، نێـو چاوان گرژ و تاڵ، قەڵس و جنگزی، نەحەواوە و بە بیانوو، شەڕانی و جنێـوفرۆش، تـووڕە و دەمشڕ، لەگەڵ جیرەی دەرگا بە شەڕ دەهات.

کێ دەیوێرا دەرکەی لێ بقەڵەشێنێتەوە؟! نۆکەر بایە، یـان فـەڕاش، کـلفەت بایـە، یـان قەرەواش، پڕ جنێوی دەکردن و وەدەری دەنان. تەنانەت دایک و بابیـشی نەیانـدەوێرا سـەر بخەنە سەری. شەووروژ، بیست و چوار سەعاتە، دەرکەی لە خۆی گاڵە دابوو و رق و کینـەی دەخواردەوە. لێوی دەبرد بە دەمدا و تاڵ تاڵ سمێڵە خورماییەکـەی بـە ددان دەقرتانـد و بـە نووکی زمان دەیهاویشتەوە دەرێ، یان، نینۆکی پەنجەکانی دەجوینەوە تا دەیگەیاندنـە سـەر زیندوو خوێنیان لێ دەردەپەڕی.

کە بووکیان بۆ گواستەوە ئەو خوووخدانەی لـە سـەر لاچـوو. ئێـستا مـات و مەلوولـە، جنێوفرۆش و دەمشڕ نییە، لاشەڕ و بێ بیـانووە، ئاسـەواری تـووڕەیی تێـدا بـەدی نـاکرێ، ساویلکە و بێ فڕ و فێڵە، گێرەی لە سـەر زگ بکـەی، قەڵـس نابـێ، لەگـەڵ دەسـتوپێوەند رووخۆش و بە بەزەییە، هەر دەڵێی عەتا هەڵەشە و سەرچڵەکەی جارانیش نییە!

گۆشەگیر و لانیشنە، حەز بە تەنیایی دەکا، تا نەیدوێنن، کەس نادوێنـێ، دەڵـێی لەگـەڵ دەروونی بەربەرەکانێیەتی! ماوەیەکە هۆگری دیوانە شیعرەکانی حافز و خەییام بووە، ئەویان دادەنێ و ئەوی دی هەڵدەگرێ، دایمە سەری لە سەریانە.

دوو مانگە چێوشەقی وەلاناوە و وردە وردە دەرودەشت دەکا. لەو دەمەوە زۆربەی شـەو وەدەردەکەوێ و تا شەو شەق دەبێ، نایێتەوە. دوو سێ چەل، هەمزەبەگ، ئەحمەد فەڕاشی بـە دزییەوە وەدووخستووە. ئەحمەد، دوورونزیک وەدووی کەوتبوو، بێ ئەوەی عەتا بزانـێ، تـا

گردەکەی پشت مالان لەگەڵی ببوو. پاشـان دەچـووە سـەر بـەردێ، ئەحمـەد بـێ خـشپە چووبووە پشت بەردەکە، هێندە لێی نزیکببۆوە. دەنگی هەناسەی عەتای دەبیست. هەر یەکەم شەو ئەحمەد زانیبووی عەتا هۆگری بادەبووە، بەڵام ئەوەی بە هەمزە بەگ نەگوتبوو، هەر بۆ نازداری گێڕابۆوە. نازداریش بۆ کەوێی باس کردبوو.

زۆر لە مێژە تەماداری دەرفەتێکە ئەوەی لە دڵیدایە بۆ کەوێی هەڵڕێژێ، بـەڵام تـا ئێـستا ئەو هەڵەی بۆ نەڕەخساوە و کەمتر یەک دەدوێن. شـەش مـانگی ڕەبەقـە بـە یەکـەوە لـە دیوێکدا دەنوون، بەڵام نەک وەک ژن و مێرد، بەڵکو وەک دوو دەستە خوشک، یـان، دوو دەستە برا، تەریک لە یەک، هەرکەس لە سەر جێی خۆی. تا ئێـستا، کـەوێ وەک پاڕانـەوە داوای جیابوونەوەی لێ کـردووە، بـەڵام عـەتا گـوێی لـێ خەوانـدووە و هـیچ جـوابێکی نەداوەتەوە. ڕەنگە بە تەمای ئیشاڵڵای دوکتۆر بێ، ئاخر دوکتۆر شـەش مانـگ مـاوەی بـۆ داناوە بچێتەوە، عەتا زۆری شایی بەوەیە، بڕیارە بەیانی بڕوا بۆ شار.

لەو ڕۆژەوەی کەوێ هاتۆتە قەڵا، مەگەر چووبێتە حەوشـە تـاو لـە سـەری دابـێ، دەنـا دەرەوەی نەدیوە، وەک دەست بە سەر، دایمە لە ژووری، لە ژێر چاوەدێری دایە، ئەودەم کـە تازە هاتبوو، زۆر دەترسا، دایمە و دەرهەم وەک کەروێشکی بازرە هەزارەی بوو. قـەت تێـر خەو نەدەبوو. لە شیرینی خەودا با، عەتا بە دەم خەوەوە جووڵا با، ئەو چەقۆی دەنووشـتاندەوە. پاش دوو سێ مانگ بە تەواوی بۆی دەرکەوت، عەتا هیچی لە جانتادا نییـە، بـەڵام هـەر دوو دڵ بوو. ئەمجار بە ڕاوێژی نازدار، کەوتە تاقیکاری.

وردە وردە کەوتە دواندنی عەتا. خۆی نزیک دەکردەوە، بزەی بـۆ دەخـستە سـەر لێـو، دەهاتەوە، لە بەری هەڵدەستا. هەتا ئەو لێی نزیک دەبۆوە. ئـەو دوورەپـەرێـز دەوەسـتا. بـە تەواوی لە لایەنی عەتاوە دڵنیا بوو و سەرینی ئەرخەیانی نایە ژێر سەر. چەند ڕۆژێکە دیـسان ترس هێرشی بۆ هێناوەتەوە نەک لە عەتا!!

ئەو شەوانەی کە تەنیا دەبوو، کەسێ دەهاتە پشت دەرکی دیوەکەی! سەبرێ دەسـتی لـە دەرگاوە دەنا، دەیزانی پشتی خراوە، دەگەڕاوە. تا ئێستا سێ شەو بـەو دەسـتوورە دەهـات و دەگەڕاوە. هەرچەند کەوێ لە کونی دەرگاوە سەرنجی دابووبێ، بۆی نەدەناسرا. نەشـیدەوێرا دەنگی بدا، یان بێتە دەرێ و بیگرێ. نەشیوێراوە بـە لای عـەتاوە بیـدرکێنێ، تـەنیا بـە لای نازدارەوە باسی کردووە. هەر شەوێک کە عەتا لە ماڵ نابێ، ترس ئۆقرەی لێ هەڵدەگرێ. بـە تایبەت ئێستا کە بڕیارە عەتا بڕوا بۆ شار.

خۆی شکی لە کەسێکە کە ناوێرێ لە لای خۆشی بیدرکێنێ!! تەنانەت بە نازداریشی نەگوتووە!

ولات کرو کپە و قەلا وەک دڵی کەوێ و عەتا وێرانە. شەو لە نیوە لایداوە، کەوێ و عەتا هەر کام لە سەر جێ، تەریک، راکشاون خەیالاوی چاویان بڕیوەتە بن میچ:

ـ عەتابەگ! سبەینێ دەڕۆی؟

عەتا بە وەرەزییەوە جوابی داوە:

ـ ئەرێ.

ـ کەنگێ دێیەوە؟

ـ نازانم، بۆ؟

ـ هەر وا پرسیم، حەز دەکەم بزانم کەنگێ دەگەڕێیەوە؟

ـ نازانم، دوکتۆر دەزانێ، چوون بە منە، هاتنەوەم بەوە، رەنگە سێ چوار شەوم پێ بچێ.

کەوێ راستەوە بوو لە سەر جێ دانیشت، هێندێ توند گوتی:

ـ سێ چوار شەو!! دە بە خودای لێرە نابم! یان دەبێ بمبەیەوە مالی بابم، یان لەگەڵت دێم، دەنا بە هەر لەونێ بێ، دەرفەت دێنم و هەڵدێم.

عەتا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ هەڵدێی؟!

ـ ئا، ئەرێوەڵلا، ئابرووی خۆم خۆش دەوێ!

ـ با بێمەوە، دەتبەمەوە.

ـ حەی حەی!! کابرا گوتی تا سەرە چەرمەکە ئاو نەیبردووە، من چ دەڵێم، تۆ چم جواب دەدەیەوە! راوەستێ کورت و کرمانجی پێت بڵێم، من بە تەنیا لێرە نابم! ئابرووم لە خەتەر دایە! هەرچەند تا بە رۆح زیندوو بم و رەگی تەڕ لە لەشمدا بمێنێ، کەس ناتوانێ دەستم بۆ بێنێ، بەلام هەر بە ئاستەم شتێک روو بدا، ئابرووم دەچرژێ، ئابروو وەک شووشەیە، بچرژێ، دەشکێ، شووشە گوتوویە: بشکێم، نەچرژێم. هەرچی بێ، من مارەکراوی تۆم، ئابرووی تۆش دەچێ، ئابرووومان بپارێزە، تکات لێدەکەم بە تەنیا جێم مەهێڵە.

عەتا لە سەر جێ راستەوە بوو:

ـ چ باسە؟! دەتەوێ چ بڵێی؟

کەوێ بزەیەکی ژەهراوی هاتێ، بەینی گریان و پێکەنین، گوتی:

ـ تۆ زۆر ساویلکەی! هەر کە لە ماڵ نەبی، دەرگام پێ دەگرن!! تا ئێستا سێ جـار هاتۆتـە پشت دەرگا، دەستی تێوەدەنێ، دەزانێ داخراوە، سەبرێ دەگەڕێتەوە، زۆرم حەولداوە بیناسـم، بۆم نەناسراوە، من نازانم بۆ منت لێرە داناوە؟ بە هیوای چیت؟ من هەر شەوی ئەوەڵ بـە تـۆم گوت، بۆ دەبییە بایسی جوانیم؟ رزگارم کە رزگار.

کەویێ دای لە پرمەی گریان.

عەتا وەک داخ بە دڵیدا چزابێ، یەک تەکان هەستایە سەر پێ، بە دەنگی بەرز، گوتی:

ـ کێ دەرگات پێ دەگرێ؟!

کەویێ بە دەم گریانەوە گوتی:

ـ دەنگ هەڵمەهێنە، ئابڕووم مەبە، لەسەرە خۆ.

عەتا خاو بۆوە، لە سەر جێ دانیشتەوە، بێ دەنگ، بیر دەکاتەوە، لە نەکاو بـە پێکەنینـەوە گوتی:

ـ رەنگە بابم بوو بێ! ئەوە خووی لە مێژینەیەتی، شەوانە بە دەم خەوەوە دەڕوا، هـەمـوو دیوەکان دەگەڕێ، هیچ نییە، تۆ لە خۆڕا دڵتەنگی دەکەی.

کەویێ شکەکەی قایم بوو، ئـەوەی لێـی دەترسـا، بەڕاسـت گـەڕا. بەوەیـڕا شـکی لـە هەمزەبەگ بوو، کە دەیدی بە چەشنێ چاوێ دەبڕییە چاوی، ناچار دەبوو سـەر داخـا و خـۆ بشارێتەوە. کەویێ لە سەر جێ هەستا و لە عەتا نزیکبۆوە. سەبرێ گوتی:

ـ ئەی بۆ ئەو شەوانەی تۆ لە ماڵی، ئەو بە دەم خەوەوە ناڕوا! هەر دەبێ تۆ لە مـاڵ نـەبی؟ من بڕوا ناکەم، تۆش کەیفی خۆتە، گوتم، تا رەگی تەڕم تێدا بێ، کەس ناتوانێ زۆرم لێبکـا، کە مردم، بە توون، چ دەکا با بیکـا. عەتابـەگ! وەرە وەک مـەردان رزگـارم کـە، کـوڕە ئەمجارە رزگارم کەی، تا مردن هەر قەرەواشتم، کوڕە هەر نەبێ بـە بـاوە خـوێنی بمبـەوە، بووکی خەڵکی مانگێ لە ماڵە مێرد نابێ، باوە خوێنی دەکەنەوە، من ئـەوە شـەش مانگـە بـۆ هێندە بێئینسافن؟ دوو سێ جار بابم، خاڵمی لە دوو ناردووم، هەر ئەمڕۆ سبەینێم پێ دەکـەن، بە گەوجم دەزانن؟ بۆ هیچ ناڵێی؟ ئابڕووی منت بە لاوە بێ بایەخە؟ بۆیە دەڵێن ئاغاوات بێـی بە پرد، بە سەریدا مەڕۆن، هەر بۆیە لە هەوەڵەوە دەمگوت مێردت پێ ناکەم، دەنا تۆ لە چـت کەمە؟ رەعیەت بە بەشەر نازانن، لاتان وایە حەیوانین، دەشتێک بڵێ؟ ئاخر دڵم تۆقی.

لەودەمەوە کەویێ بە تانە و لۆمە دەدوێ، ئاورێ لەدەروونی عەتادا هـەلا یـساوە هـەر بـە ئاستەم دوو لێوەی ببزوێ، کوڵی دەرونی بە قوڵپە کـەلا و دەکـا و دەڕژێتـە دەر، دەروونی

سووره‌کوانی گه‌یوه، به ئاسته‌م، هه‌ر به ئاسته‌م نووکه ده‌رزی وێ که‌وێ، ده‌رگای ده‌بێ، بـۆ ئه‌وه‌ی هێنده‌ی دی لای که‌وێ غورووی نه‌شکێ، ددانی به خۆیدا گرتووه و لێو نابزوێنێ.

که‌وێ هێندێکی دیکه لێی چووه پێشێ:

ـ بۆ جوابم ناده‌یه‌وه؟ قسه‌کانم رقه؟ هه‌قه بۆیه ره‌قه!

عه‌تا چی دی پێشی کولی ده‌روونی پێ ناوه‌ستێ، کوان ده‌رگای بوو و تۆقییه‌وه، کوڕه‌ی گریان ئه‌وکی به‌ردا، که‌وێش وێڕای ئه‌و. گریان، گریان، هه‌ر دوو بۆ چاره‌ره‌شی، بۆ مـرادی دلیان، به‌لام هه‌ر یه‌ک به لایه‌کدا. کولی دل رژا و دامرکایـه‌وه. عـه‌تا ئـه‌هـۆن، ده‌یهـه‌وێ پریسکه‌ی دلی بکاته‌وه.

ـ که‌وێگیان! ده‌مه‌وێ ئه‌وه‌ی له دلمدایه بۆت هه‌لڕێژم و بێ پێچوپه‌نـا بـدوێم. چـی دی نامهه‌وێ عه‌تابه‌گ بم، عه‌تایه‌کی بێ غه‌لوغه‌شم. ئه‌و قسانه‌ی ئه‌وه‌ل شه‌وت بوون به هه‌لـقه و چوون له گوێمه‌وه. ئالوگۆڕی تێدا به‌دی هێناوم. من لام وابوو ئه‌و کـاره‌ش وه‌ک هـه‌مـوو کاره‌کانی دیم، ده‌توانم به زۆر دایسه‌پێنم، له‌و شه‌وه‌وه من بیر ده‌که‌مه‌وه، بـه‌وه گه‌یـشتووم، هه‌موو کارێ به زۆر بکرێ، خۆشه‌ویستی به زۆر ناکرێ، تـاوانی منـه، مـن تاوانکـارم، بـۆ ئه‌وه‌ی پێت بسه‌لمێنم که درۆ ناکه‌م، به‌لێنت ده‌ده‌مێ هاتمه‌وه، ده‌تبه‌مه‌وه، به هه‌ر لـه‌وێ تـۆ حه‌ز ده‌که‌ی. ئه‌وه‌ش بزانه، ئه‌وه‌نده‌ی تۆ گوتووته بمبه‌وه، من به بابم گوتووه. ئه‌و ملی پێـدا ناکا، نایێته‌وه، نه‌یێته‌وه، ماره‌یی ده‌که‌وێ. پرسی مه‌لای کردووه. مـه‌لا گوتوویـه، شـه‌رعه‌ن، نه‌یێته‌وه، ماره‌یی ده‌که‌وێ، چون خه‌تا له‌وه‌وه نییه، کوڕی تۆ عه‌یبداره. جا له به‌ر ئـه‌وه، بـابم به ڕۆینه‌وه‌ت رازی نییه، ماره‌یه‌که‌شت کانی تووه.

که‌وێ له روخساری عه‌تادا جگه له راستی، هیچی دی نابینێ، له سه‌ره‌خۆ، وا که عـه‌تا دل شکاو نه‌کا، گوتی:

ـ کانی‌توو پێشکه‌ش به تۆ، من ماره‌ییم ناوێ، گه‌ردنی حه‌وت پشتت ئازا بێ.

ـ ده‌ی باشه، به هه‌ر له‌وێ بێ، ئه‌و دوو سێ رۆژه خۆ راگره، بێمه‌وه، لایه‌کت ده‌خه‌م بـه لایه‌کدا.

ئیتر هه‌ر دوو بێ ده‌نگ بوون، هیچیان ئاگایان له یه‌ک نییه، کامیان زووتـر خـه‌وی لـێ که‌وت؟ ره‌نگه هیچ کامیان.

دوو سێ روژه ده‌وستێ ئه‌و شه‌وه‌ی تاهیر و ده‌سته‌که‌ی چووبوونه مالی کوێخا شـه‌ریف، هاتبۆوه و سه‌روان خودایی، کوێخای له هه‌مزه‌به‌گ خواستبوو. ئه‌و دوانیوه‌ڕۆیه که بڕیار بـوو

عەتا بڕوا بۆ شار، هەمزەبەگ پیاوی لە دووی ناردبوو بۆ ئێوارە بێتە قەڵا و بەیانی زوو لەگەڵ عەتا بڕوا و خۆی بە پاسگا بناسێنێ.

بەیانی زوو، بەر لەتاو کەوتن، کوێخا شەریف هەستا، چووە حەوشە و هاتەوە، لە پێشخانە، لەگەڵ ئەحمەد دانیشت و دەستیان کرد بە قسە کردن و چاخواردنەوە. پاش ماوەیەک، هەمزەبەگ لە دیوەکەی خۆیەوە بانگی کوێخای کرد و چووە حوزوور:

ــ دەزانی بۆ ناردوومە لە دووت؟

ــ ئەمر، ئەمری ئاغایە

ــ لە پاسگاوە خوازراوی! ئەو کارە جوانە تۆ دەیکەی، دەبێ کەسێ هەر بۆت پاسا و بدا. ئەو ڕۆژە دوو سەعات لەگەڵ جەناب سەروان شەڕە چەلەحانێم کردووە، بە هەزار ناری عەلی، قایلم کردووە ئەم جارە جەبەت کا، ئەوەش بە مەرجێ هەرچی بڵێ، بە قسەی بکەی. یا ورمێ و روکنی دوو! دەزانی یانی چی؟! یانی تا دەمری، لە بەندا هەر سیر بخۆ و زورنا بژەنە، ئەگەر بە قسەی بکەی، نانت لە ڕۆندایە، دەبی بە پیاو! من بەڵێنم داوە کە لە قسەی دەرناچی، حالی بووی؟

ــ بەڵێ قوربان، هەرچی ئاغا بفەرمێ، وا دەکەم.

ــ دەبڕۆ ئەحمەدم بۆ بنێرە. عەتاش دێ بۆ شار، بەرقەنەتان خوارد، وەڕێکەون. کوێخا پشتاوپشت هاتە دەرێ و ئەحمەدی نارد. هەمزەبەگ گوتی:

ــ بڕۆ بەو دوو تفەنگچییە بڵێ، ئاغا دەیفەرموو خۆ ساز کەن لەگەڵ عەتا تا نزیکی شار بچن، بەڵام نەچنە نێو شار. لەوێوە بە حەسەن مەیتەریش بڵێ ئەسپە ڕەش تێر کا و زینی بکا. گەڕایەوە، عەتاش حالی کە بێتە لای من، کارم پێیەتی، دە بڕۆ دەی.

بەر لە عەتا، کەوێ هاتە دەرێ. چووە حەوشە و هاتەوە. عەتاش هەستا. هەر لە پێشخانە، ئەحمەد ڕاسپاردەی پێگەیاند. پاش بەرقەنە، عەتا چووە دیوەکەی بابی.

هەمزەبەگ هێندێ سەرنجی دایە:

ــ عەتا! پوول بە دایکتە، چەندەت پێویستە، لەوی وەربگرە.

عەتا بێ قسە هاتەوە دەرێ و چووەوە دیوەکەی خۆی، هێندێ لە کەوێ ڕاما و هاتەوە دەرێ، چووە لای دایکی.

دوو سوار لە دەروازەوە وەدەرکەوتن. دوو پیادەی چەکدار کەوتنە تەکیان و ڕێی شاریان گرتە بەر. ڕێ دوورە و ئەوانیش خەیالاوی. عەلیلە نەبێ. عەتا و کوێخا و بلە لە نێو

خەیاڵدا دەخولانەوە. عەتا لە بیری چووەنە دوکتۆر و رابردوو و داهاتوویدایە. کوێخاش لە بیری پاسگا و ئەمنییە دایە. بلە سوور چ خەیاڵێ لە سەریدایە؟!

لە غاو لە سەر یاڵ وێلە و چارەوێ بە کەیفی خۆی رێ دەبڕن. کەس کەس نادوێنێ. عەلیلە چاوە بچووکەکانی زیت کردوونەوە و هەر جارێ دەڕوانێتە یەکیان، زۆرتر عەتا سەرنجی راکێشاوە! بە چەشنێ نوقمی خەیاڵە، جار جار، بێ ئەوەی خۆی هەست بکا، ورتەیەکی لێوە دێ:

ـ بڵێی کەوێ درۆ نەکا؟! ئەگەر وابێ چی؟! دەبێ سەری خۆم هەڵگرم و تەرکە ولات بم. چاک بوومە بایسی ئەو و ئەو هەتیوە شوانە، خودای ئەوان بوو وام بە سەر هات، جا هەر ئەوە؟! لەوەتی راست و چەپی خۆم ناسیوە، جگە لە کاری بیلعەت، بە لای کاری باشا نەڕۆییوم! جا چم نەکردووە؟! زوڵم دەڵێی، تەماح لە ناموسی خەڵک دەڵێی، لە خەڵکدان، داتروسکانی ئەم و ئەو، مندالی مەمکە خۆرە هەتیوکردن! پەلاماری ئەم و ئەو، لە هەموو خراپتر ئەو زارا بەستزمانەم کوشت! ئاخر چی کردبوو؟ بە خەیاڵ پیاوەتی لەگەڵ منی ناپیاو کردبوو، سەرەڕای چاکە، بشتکوژن! تۆ خودا بەوە دەڵێن کار؟ ئینسان وایە؟ مەگەر ئەو عالەمە عەبدی تۆن؟ باشە، ئاغای ئاغا بە، مەگەر تۆ ئەو ملک و ماشەت لە کوێ بوو؟ کارت کردووە؟ شەونخوونیت کێشاوە؟ شوانی و سەپانی و دروێنە و دەسکەنەت کردووە؟ ئاخر لە کوێت بوو، رەنگە تاقانە کوڕی ئادەم و حەوا بی! نەوەڵلا، نە بیلا، هەمووی بە زوڵم و زۆر داگیرکراوە، زالم زالمی دەبێ، گیا لە سەر ریشەی خۆی شین دەبێ، پشتاوپشت هاتووە، لە بنەچەکەوە هاتووە و گەییوە بە من، منیش ئەگەر تووم لێ بکەوێتەوە، ئەویش‌وا دەبێ، جارێ بە سایەی خوداوە من تووم نییە، ئەگەریش بمبێ، خوێڕی دنیا بم، ئەگەر بهێڵم عەولادم لە سەر ئەو ریشەیە بگوروێ. ئاخر تۆ چیت؟ بنیادەمی؟ دەتوانی مانگێ لە سەر پێی خۆت راوەستێی؟ نەوەڵلا، تۆی دەست و پێ سپیلکە، ژەمێ نانت نەدەنێ، دەمری، ئەوان کەرەستەن، یان تۆ سەرباری؟ بە خودای تۆ، تف لە غیرەتت، نەمێنی پیاو، تۆش پیاوی؟ ئەگەر پیاو بای بە زۆر ئافرەتێکی بەستزمان کە تۆی خۆش ناوێ، بە لای خۆتەوە نەتدەبەستەوە. دەڵێی خۆشم دەوێ؟ ئەوە نییە ئەو یەکی دیکەی خۆشدەوێ، بۆ بوویە بایسیان؟ تف، نەعلەت لە غورووور و غیرەتت.

لە پڕ ئەسپە رەش سەر سمێکی داو پڕماندی، هەودای خەیاڵی عەتا ئاڵۆزاو بە سیلەی چاو روانییە کوێخا، زوو تێگەیشت ئەویش لە گۆمی خەیاڵدا پەل دەکوتێ!

کوێخا شەریف لە بیری راستە و پاستە کردنی جواب دایە بۆ سەروان:

ـ ئەگەر هەڵیشم واسێ باسێ لە مەحموود شوان و کاوەی کوڕی ناکەم! ئەو بێتە گـۆڕێ و بیخوازن، بە تایبەت بزانێ من ناوم بردووە، ئەوەی لە دیزەدا بێ، بـە کـەوچک دەریـدێنێ، ئەویش قەتڵ، حەی حەی! قەتلی کێ؟ پیاوی دەوڵەت!! دوو ئەمنییەم کوشتووە! گاڵتەی پـێ ناکرێ! جا وەرە ئەو دەم داری تەڕ و سەڵای سەگ، بە خودای لەت لەتم کـا، نـاوی ئـەوان نابەم، هەرچی بڵێ بە قسەی دەکەم، بەو مەرجە باسێ لەوان نەبێ، خودا دەکا نامدا بـە ورمـێ. بڵێی چی لێم بوێ؟ ئاغا دەیگوت نانت لە رۆندا دەبێ و دەبی بە پیاو! رەنگـە پوولـم بـداتێ، یان، دەمکا بە مواجب بگێری دەوڵەت! ئەگەر وابێ، هەرچـی بـڵێ، دەیکـەم، ئـەی ئەگـەر هاتوو باسی کاوەی کرد؟ ئەودەم چی؟ ئەها، دەڵێم نایناسم، دەڵێم ئەو شەوە کە هـاتن هـەر شەش کەس بوون، سوێندی بۆ دەخۆم، خۆ سوێندم لێ ناکەوێ و درۆشـم نـەکردووە، ئـەو ماڵی من نەهاتووە.

لەنەکاو، عەلیلە وە قسە هات:

ـ ئەرێ برا! ئەوە قوڕوقەپە؟! وەڵڵا دەڵێی مەلا مەلایان کردووە! ئەوە گەیشتینە شار.

عەلیلە رووی لە بلەیە:

ـ تۆ لە چ خەیاڵێکدای؟ تەمات نییە بگەڕێیەوە؟! ئاغا فـەرمووبووی نەچینـە شـار، ئـەوە گەیشتین!

بلە بە دزییەوە چاوێکی لێ مۆڕ کردەوە، سەر زارەکی، بە زمانێکی شیرین گوتی:

ـ با، بەڕێوەڵلا، تەماداری دەستووری عەتابەگم.

عەتا بێ ئەوەی روو وەرسووڕێنێ و چاو لە بلە بکا، لە سەرەخۆ گوتی:

ـ کارم بە ئێوە نییە، دەبوو زووتر گەڕابانەوە، خواتان لەگەڵ.

لەودەمەوە عەبە و فەیزە کوژراون، عەلیلە وەک مار لە سەر چوزە و دایمە بە دهـۆوە بلـە دەدوێنێ، بلە لە ترسی ئەو ناوێرێ قامک لە ئاو رۆکات. بلە زۆر لـە مێـژە داغ لـە دڵـە و لـە دووی دەرفەتەوەیە، ئەمڕۆ هەلیەتی، لەودەمەوە لە قەڵا وەدەرکەوتون، بلە لە بیری پیلاندایـە. عەتا و کوێخا بەرەو شار و ئەوان بەرەو دوا لێک هەڵبڕان.

لە دەرکی کاروانسەرا، عەتا و کوێخا دابەزین. عەلی شامی کاروانسەراچی بـە پیریانـەوە هات. کوێخا شەریف بەر لە عەتا گوتی:

ـ کا عەلی! کاو جۆیان بدەیە. من بەیانی دەگەڕێمەوە، ڕەنگە عەتابەگ دو سێ ڕۆژی پێ بچێ، نەهێڵی ئەسپەکەی برسی و تینوو بێ.

ـ بەسەرچاو، مانگێ لێرە بێ، پاڵی لێ بدەنەوە، خاترجەم.

لەغاوی چارەوێی گرت و کێشانییە ژووری. عەتا بەرەو نەخۆشخانە، کوێخا بەرەو پاسگا ڕۆیشتن.

کوێخا دوو شک و دڵ پڕ ترس و خورپە، گەیشتە بەر پاسگا. قەرەوڵی بەر دەرگا پشکنی و ڕەوانەی دیوی سەروانی کرد. کوێخا چووە ژووری و سڵاوی کرد، بەڵام جوابی نەبیست. پاش ماوەیەک سەروان سەری هەڵێنا و بە ئاماژەی سەر پرسی. کوێخا دوو سێ هەنگاو چووە پێشێ و بە ترسەوە گوتی:

ـ جەناب سەروان! من کوێخا شەریفم، هەمزەبەگ ناردوومیە خزمەتت.

سەروان خودایی بە وردی تێی ڕوانی:

ـ لە کوێ تۆم دیوە؟ شێوەت دەکەم!

کوێخا سنووری کەوتە دڵی، یەک دوو هەنگاوی دیکە چووە پێشێ:

ـ شەووڕۆژێ لە خزمەتتدا بووم، لەگەڵ ڕەسووڵی نۆکەری هەمزەبەگ ڕێنوێنتان بووین.

ـ لە کوێ؟!

ـ لە هەزار ئەشکەوت، ئەو دەمەیکە وەدووی چەتەکان کەوتبوون، سواری ئەسپە شێکە بووم.

سەروان بۆ ئەوەی کوێخا چاوەڕووی نەکرێتەوە، خۆی گێف کرد و نێو چاوانی وێکهێناوە و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ تۆ لە نالیش دەدەی لە بزماریش! هاوکاری ئەوانی و ڕێنوێنی ئێمەش.

کوێخا بەو قسەیە وێک هاتەوە و بزەی سەر لێوی مرد:

ـ من؟!

ـ بەڵێ تۆ، مەگەر نەهاتوونەماڵت؟

ـ بەڵێ هاتوون، ماڵی هەمووکەس دەچن، ئەوە هاوکارییە؟ ئەوان چەکدارن، هەر کوێ مەیلیان بێنێ، دەچن، دەستی کەس دەستی ئەوانی پێ بانادرێ.

ـ یانی ئەوان بە زۆر هاتوونە ماڵت؟

ـ بەڵێ، ئەی خۆ لە دووم نە ناردوون.

سەروان راساوە و بە کەیفی خۆی زللەیەکی سرەواندە پەنا گوێی و سووری هەڵگەڕاند، تا ماوەیەک، کوێخا هەر زرینگە لە گوێیەوە دەهات. سەروان گوڕاندی:

ـ درۆمەکە، قینم لە درۆیە، بە زۆر هاتوونە ماڵت هیچ، ئەی بە زۆریش تا ئەو لای دێوە بردتیان؟ بە زۆر پوولیان بۆ کۆوە دەکەی؟ بە زۆر هەواڵیان دەدەیتێ؟ ها؟ دە بڵێ دەی؟

کوێخا هێشتا دەستی بە لارووەتییەوەیە، ڕەنگ گۆڕاو و ئاڵۆز، کەوتە پاڕانەوە:

ـ ئەمجارە جەبەم کە جەناب سەروان.

ـ جەبەت کەم؟! ئەو تاوانە بۆ ئەوە دەبێ؟

ـ خۆت بە هەمزەبەگت فەرمووبوو، هەرچی دەفەرمووی دەیکەم.

سەروان چۆوە پشت مێزەکە و دانیشت. جگەرەیەکی دەرهێنا ودایگیرساند، دوو مژی لێدا، هێندێ بە کوێخادا ڕوانی، لە سەرەخۆ گوتی:

ـ هاوکاریم دەکەی؟

کوێخا بە پەلە و چەواشە گوتی:

ـ بەڵێ، بە گیان و دڵ.

سەروان بۆ ئاشت کردنەوەی، پاکەتە جگەرەکەی بەرەو کوێخا درێژ کرد. کوێخا بۆ ئەوەی دەستی سەروان ڕەت نەکاتەوە، جگەرەیەکی دەرهێنا، سەروان بۆی ئاور دا و گوتی:

ـ چۆن باوەڕ بکەم؟

ـ سوێند دەخۆم، بەلام بەو مەرجە گیانی خۆم و ماڵ و منداڵم بپارێزێ، هەر چی بفەرمووی دەیکەم، چم لە دەست دێ؟

سەروان بە بزەوە گوتی:

ـ زۆر کار! ئەگەر بیکەی، ئەوەی تۆ دەتوانی، بە سەد کەس ناکرێ، ئەوەی من دەمەوێ، بیکەی، ئەوی دڵت بیخوازێ، دەتدەمێ، جگە لە جایزەی دەوڵەت، مانگانە مواجبت دەبێ! ماڵ و منداڵت دەحەسێنەوە، خانووت لە شار دەدەمێ! بۆ خۆت دەبی بە پیاو! پیاوی دەوڵەت! بەو مەرجە من چ دەڵێم، بەڕێوەی بەری، دەزانم لە دەستت دێ، ئەوە کاری تۆیە، هەڵبەت لە خۆڕا ناڵێم، ئاغا تاریفی کردووی! زۆر لە مێژ بوو لە دووی کەسێکی وەک تۆ دەگەڕام.

کوێخا شەریف جار لەگەڵ جار لە خۆی دەردەچوو و بەرخەبەبەی شۆڕ دەبۆوە، لە خۆباییانە گوتی:

ـ نازانم چت دەوێ، بەڵێنم بە ئاغا داوە هەرچیت لە من بوێ، بیکەم، هەرچی دەفەرمووی بەسەرچاو، من لە خزمەتام.

سەروان هەستا و دەستی خستە سەر شانی، بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ تۆ لە ئێستاوە پیاوی دەوڵەتی! بۆ ئەوەی دڵنیابم، بڕۆ دەستنوێژ بگرە و سوێندم بۆ بخۆ لە قسەی من دەرناچی و ئەوەی بیڵێم، بەڕێوەی دەبەی.

سەروان بانگی ئەمنییەیەکی کرد، کوێخا شەریف کەوتە تەکی. پاش هێندێ، بە دەستی دەستنوێژەوە هاتەوە و دەستی بۆ دا بە قورعاندا، سەروان بە دڵنیاییەوە گوتی:

ـ بڕۆوە ماڵی خۆت، هەر دەمایەکی کارم پێت بوو، دەنێرم لە دووت، بەڵام ئەوە لە بەینی خۆماندا بێ، من و تۆ و هەمزەبەگ بزانین، تەنانەت خێزانیشت نەزانی.

کوێخا بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

ـ ئەی کارەکەم پێ ناسپێری؟!

ـ جارێ نا، با وەختی بێ، بە وەختی خۆی پێت دەڵێم، دەستی درێژ کرد و نایە نێو دەستی.

کوێخا شەریف گێژومەنگ لە پاسگا هاتە دەرێ و وەک ماخولیا، کەوتە شەقام. دەمادەی عەسر و ئێوارێ، دڵ کرمێ و چەواشە بەرەو کاروانسەرا گەڕاوە و داوای لە عەلی شامی کرد ئەسپەکەی بۆ دەرکێشێ. عەلی شامی بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

ـ بڕیار بوو عەتابەگ دوو سێ شەو چارەوێکەی لێرە بێ و تۆش بەیانی بێیەوە، ئەو نێو سەعات دەبێ رۆیشتووە، تۆش دەڕۆی؟!

ـ ئەو رۆیشت؟! قەرار بوو نەڕوا، هیچی نەگوت؟

ـ نە وەڵلا، بێ قسە و باس سوار بوو و رۆیشت. کوێخا دەستی کرد بە گیرفانیدا و دوو تمەنییەکی ئەسکیناسی دەرهێنا و دای بە عەلی شامی. پاش ماوەیەک سواری ئەسپەشێ بوو و خەیالاوی لە شار دەرچوو.عەتا کە چووبووە دوکتۆر، پاش تاقیکارییەکی زۆر، دوکتۆر هیچی بۆ دەرنەکەوتبوو، بۆی نووسیبوو بڕواتە دوکتۆرێ لە ورمێ. عەتا لە شاربەندی هەڵنەگرتبوو. هەرچەند قسەکانی کەوێی دەکەوتەوە بیر، تەزوو بە لەشیدا دەهات و مێشکی دەهەژاند. هەر بۆیە رای گۆڕابوو و بەرە و تازاوا گەڕابۆوە.

شەو ئاوایی خەوتن، ئەسپەڕەش هێور هێور، رەوانی شێواو و لەشی ماندوو و وەڕەزی عەتای گەیاندە ئاوایی. لە لێژی قەڵا کە وەسەر دەکەوت، تەمادار بوو چەکدارەکانی بەر

قەلا دەنگی بدەن بەلام لە دیوەکەیان رەتبوو و هەوالی نەبوو! گەیشتە بەر دەروازە، هـەر بـە سواریـەوە لێیدا. مام عەلی وەک ئەوەی تەمادار بێ، لە پشت دەرگاوە گوتی:

ـ کێیە؟

عەتا لە سەرەخۆ جوابی داوە:

ـ بیکەوە مامە، عەتام، مام عەلی دەروازەی کردەوە، گوتی:

ـ هەر تەنیای؟ ئەی بلە و عەلیلە؟

ـ ئەوان هەر نیوەڕۆ گەڕانەوە، نەهاتوونەوە؟

ـ نەوەڵلا، مەپرسە ئاغا چ دەکا! دە کەڕەت پیاوی ناردۆتە ئێرە.

عەتا ڕکێفی لێدا، ئەسپە ڕەش بەرەو تەویلە وەڕێکەوت. حەسەن مەیتەر لە دەلاقـەی سـەر میانەوە ملی کێشا و عەتای ناسیـەوە. جووت پێ خۆی هاویشتە خوارێ و پێ خاوس پـەڕیـە دەرێ و لەغاوی لەدەستی عەتا وەرگرت. عەتا بە سرتە گوتی:

ـ مەیکێشە ژوورێ، ڕەفتەنیم، بە زینەوە، لە حەوشە بیبەستەوە.

هەر ئێوارە، کەوێ نازداری تێگەیاندبوو شەوێ هۆشی پێیەوە بێ. جیرە جیر لـە دەرگـای پێشخانەوە هات، نازدارو کەوێ، هەر کام لە دیوی خۆیەوە، چاویان نـا بـە کـونی دەرگـاوە. عەتا هاتە پێشخانە و گڕی خەفەکراوی لامپاکەی هەلکێشا و سەبرێ چووە دیوی نوێنەکـان. کەوێ دەستبەجێ عەتای ناسیەوە. شەوژنی لە پشت دەرگا لابرد و ئەرخەیان چووە سـەرجێ و خۆی کردە خەو.

ماوەیەکی زۆر عەتا لە کونی دەرگاوە دیوەکەی کەوێی خستە ژێـر چـاوەدێری. پـاش درنگانێ، جیرەی دەرگایەک عەتای هاروورژاند و دلی وە قرت و فـرت کـەوت. سـەرتا پـا سپیەک لە سەر پەنجە بەرەو دیوەکەی کەوێ وەڕێ کەوت! گەیشتە بەر دەرکـە و ئێـستێ وێستا، دەستی تێوەنا، دەرکە قایم نەبوو، کراوە و پێی نایە نێو دیوەکـە و وێـستا و لـە جێـدا ڕوانییە کەوێ. زۆر وێستا، هەر وا تێیراماوە. لە نەکاو دەستێ چووە سەر شانی و سەرتاپا سپی داترووسکا! ئالۆز و شێواو، توند گوتی:

ـ عەتا! کەی هاتوویەوە؟!

بە دەنگی هەمزەبەگەوە، کەوێ وەک لە خەو ڕاپەڕیوێک زریکاندی! لە زریکـەی ئـەو، نووستوانی قەلا لە خەو ڕاپەڕین. عەدلە خانم بە سەری ڕووت و بێ پشتوێن هاتە پێـشخانە و لە پەیکەرەی کوڕ و مێردی، کە لە نێو ژوورەکەی کەوێ وشـک دەڕوانینـە یـەک، رامـا!!

هەمزە یەک چاوی کەوتە عەدلە خانم، سەری داخست و بەرەو دیوەکەی خۆی گەڕاوە.
عەدلە ئیتر لەو شوێنە کە وێستابوو، توانای جووڵانەوەی نەبوو، دانیشت، عەتا لە سەرەخۆ بە کەویی گوت:

ـ خۆ سازکە دەتبەمەوە! چت هەیە جل و زێڕ، کۆوەی کە.

کەوێ وەخۆکەوت. پاش ئیستێ، هاتە پێشخانە، عەدلە خانم هەر دانیشتبوو. کەوێ رووی تێکرد و ئەویش هەستا و ئامێزی بۆ کردەوە و کەوێ خۆی لە باوەشی هاویشت. گریان. نازدار هاتە دەرێ، لە ئامێزی عەدلە هاتە دەرێ و باوشی بە نازداردا کرد و بە سەر یەکدا گریان، بەڵام گریانی شادی، عەتا دەستیانی لە ئەستۆی یەک کردەوە و پیلی کەویی گرت و رۆیشتنە خوارێ. عەتا و کەوێ، دوو پشتەکی سوار بوون و لە دەروازەوە چوونە دەرێ.

ئەسپەڕەش یەک رکێف، دوو پشتەکی عەتا و کەویی گەیاندەکانی توو. لە نێو دێ، عەتا سەری چارەوێی لە ماڵی کوێخا کەریم وەرسووڕاند.

کەوێ دەنگیدا:

ـ هەڵەت کرد، ماڵی بابم ئەوەتا.

ـ دەزانم، دەتبەمە ماڵی مەلا!

ـ بەو نیوەشەوە؟!

ـ ئەرێ، هەر ئەمشەو رزگارت دەکەم.

لە دەرکی ماڵی مەلا دابەزین. عەتا لە دەرکیدا.

مەلا کەریم دەنگی دان:

ـ کێیە؟ ئەوە هاتم.

دەرگای کردەوە، عەتا و کەوێ چوونە ژوورێ. پاش ئەوەی کە مەلا تێگەیشت ئەوانە دەیانەوێ جوێ بینەوە، گوتی:

ـ وەک دەزانن مارە کردن بێ شاهید نایێ، تەلاقدانیش نایێ، راوەستن بەیانی.

عەتا گوتی:

ـ مامۆستا! هەرچی دەیکەی، ئێستا بیکە، بەیانی درەنگە.

مەلا ماتبوو. بێ دەنگ هەستا و ودەرکەوت. پاش ماوەیەک بە کەیخوداوە هاتەوە.

مام رەسوول و حاجی قادر و سۆفی مینە و مام حەسەن و ئەحمەدی کوڕی وەژوورکەوتن. مەلا گوتی:

ـ ئێوه شاهیدن که کەوێی مام کوێخا لە سەر مارەیی کانی‌توو لە عەتای کوڕی هەمزەبەگ مارەمان کرد؟ وابوو؟

هەموو گوتیان:

ـ ئەشهەدوو وا بوو.

مەلا رووی لە کەوێ کرد:ـ تۆ دەڵێی چی کچم؟ مارەیست دەکەوێ، دەتەوێ یان ناتەوێ؟

کەوێ لەگەڵ مەلاژن لە پشتەوە دانیشتبوون، جوابی داوە:

ـ نەخێر مامۆستا، بە شاهیدی ئەو شاهیدانە، گەردنی ئازا بێ.

مەلا، قەڵەم و کاغەزی هێنا، کاغەزی تەلاقنامەی نووسی، یەکە یەکە، کەیخودا مۆریان کرد. مەلا کاغەزی‌دا بە مام حەسەن باپیری کەوێ، عەتا هەستا، مالاوایی لێکردن و وەدەرکەوت.

ئاوایی کانی‌توو پڕ بووە لە چپەی ژنان! باس باسی کەوێیە و یەک دەڵێ و یەک دەیسێنێتەوە، ئەوانەی کە ئەوەڵ دەیانگوت کەوێ بە ژنی ساڵێکی عەتا نابێ و تەلاق بە قوونی دەکا، ئێستا دەڵێن کەوێ لای دانەنیشتووە، لە ئەوەڵیشەوە بە زۆر مارەیان کرد، دەنا مێردی پێ نەدەکرد. ئەوانەی کە ئاواتیان بە کەوێ دەخواست و دەیانگوت دەبێ بە خانم، ئێستا دەڵێن عەتا ئەوی ناوێ، دەنا کەوێ دەست رادەگرێ و ئەوی بە سەردا بڕوا. لەودەمەوە کەوێ هاتۆتەوە، ژنان ماڵەوماڵ دەگەڕێن، بەلام پوورامان دەڵێ:

ـ ئەوانە هەموو درۆیە، ژنان بوختان ساز دەکەن، من دەزانم بۆ وای لێهات، من پێخەسوو بووم، عەتا پیاو نەبوو، خۆمان ژنین، کوڕ بۆ ژن دێنێ؟ کچ بۆ شوو دەکا؟ لە سەری مەڕۆن ژنان، لە سەر رۆینی باش نییە.

پوورەگوڵە دەڵێ:

ـ قسەی پوورامانە، ئەوەڵ خۆم بە کەوێم گوت لە عەتا مەترسێ، من پیاو بم، ئەو پیاو نییە. باسەکە جار لەگەڵ جار پەرە دەگرێ تا لە پڕ هەواڵێکی تازە هات و باسی کەوێ لە بیر چۆوە، دەڵێن تەرمی کوژراوی عەلیلەیان لە هەزار ئەشکەوت دیوەتەوە و بلە سووریش بێ سەروشوێنە!!

## ٢٨

قەلا ئالۆز و جەنجالە. ئاغاوات؛ بێ نۆکەر، دەستەیەک دەڕوا و دەستەیەک دێ! خۆ بە خۆ سەر دەکەن بە یەکدا و گوێ لە رادیۆ ناکەنەوە، سرت و هۆڕ پیلان دەڕێژن، شەووڕۆژ لە هاموشۆدان!!

فەڕاش و کلفەت، نۆکەر و مەیتەر لە بەر میوان بەڕێکردن نایانپەرژێ سەری خۆیان بخورێنن، کەس دەرفەتی چوونە دەرێی نییە.

لەودەمەوە بلە و عەلیلە نەماون، رەسوولی نۆکەر بە رۆژ خزمەتی میوان دەکا، شەو برنوو بە شان، کێشکچی قەلایە، وەڕەزی و ماندووبوون نازانێ، مێش بێتە ژووری و بڕواتە دەرێ، لە ژێر چاوەدێری ئەودایە.

ئەحمەد و نازدار سووسەیان کردووە چ باسە، رایان لە سەر ئەوەیە، دەرفەت بێ، راکەن، بەلام رەسوول بووە بە ملۆزم و وەک دڕووەکەی مەم و زین لە سەر رێیان سەوز بووە، لە ترسی ئەو ناوێرن پەل ببزێون، چاوەدێری هەلێکن.

لەودەمەوە عەتا، کەوێیی بردۆتەوە و تەلاقی داوە، رەبەن و هەلوەدای شارە. دەلێن لە چایخانەکەی حاجی رەشید دیتوویانە، گوایا لەگەل حاجی نێوانی خۆش کردووە. عەدلە خانم شەووڕۆژ چاوی وشک نەبۆتەوە، ماولی لە هەمزەبەگ بڕیوە و دوولایی لە سەر هەلناگرێ، هەر دەلێ کوڕەکەم. هەمزەبەگ دوو سێ جار پیاوی ناردووە، هەر دێنەوە و دەلێن نەماندیوە. هەمزەبەگ خۆشی چووە، بەلام تووشی نەهاتووە. بە خزم و نزیکانی راگەیاندووە، ئەگەر دیتان، یان بیهێننەوە، یان هەوالی بدەنێ. تا ئێستا هیچ هەوالێ لە عەتا نەبووە. وەدیارە عەتا خۆی لە قەرەی ناسیاو نادا.

خەڵکی دێ وەک لە گوێی گادا نووستبێتن، ئاگایان لەو کۆبوونەوەی ئاغاوات نییە، سەریان پێوە ناوە و خەریکی کاری خۆیانن، ئاگایان لە مەحموودی بێزەواد نییە.

تاهیر و هاورێکانی وەک داشە هارە هەڵدەسووڕێن، پێیەکان لەم دیوە و پێیەکیان لەو دیوە و ئاگاداری هەموو رووداوێکن. ئێستا هاتوونەوە، بەر لە هەموو کەس تاهیر پوورەگوڵەی دیوە، ئەویش ئەوەی زانیبێتی و دیتبێتی بۆی گێڕاوەتەوە. هەر لە گواستنەوەی کەوێ و کوشتنی زارا و عەبە و فەیزە و عەلیلە تا تەلاقدانی کەوێ، بە وردی بۆی باسکردووە، تەنانەت باسی ئەوەشی کردووە کە فاتمی خێزانی فەیزەیان داوە بە فەتاحەکوێر لەبریخوێنی ژنەکەی. ئەوانە هەمووی بۆ تاهیر سەرنج بوو، بەڵام کوشتنی عەبە بە چەشنێ کاری تێکردبوو، ئەوانەی دیکەی لە بیر بردبۆوە. بە دەنگێکی بەرز لای پوورەگوڵە بانگی هەڵدابوو، سوێندی خواردبوو قاتلەکەی پەیدا کات، بە دەستی خۆی بیکوژێ.

شەو دەرنگانێ تاهیر و مەحموود شوان و کوێخا شەریف لە بەر هەیوانەکەی ماڵی مەحموود شوان سەریان ناوە بە سەری یەکەوە، تاهیر هێور هێور رووداوەکانی ناوخۆ و دەرەوەیان بۆ دەگێڕێتەوە:

ـ دنیا خەریکی ئاڵوگۆڕبوونە، دەبێ وەخۆکەوین، ئێران شڵەژاوە! خەڵک هەژیون! ئەو بزووتنەوە، بزووتنەوەیەکی گەورەیە، ئاڵوگۆڕێکی سەیر بەدی دێ، ئاغا نامێنێ، خەڵک دەبنە خاوەنی خۆیان! ژن و منداڵیان هی خۆیان دەبێ! بێگاری و دەودوو نادەن، دەبنە خاوەن ئاووزەوی، سەربەخۆ دەبن، خۆیان ئاغا و کوێخای خۆیان دەبن، دەبێ وەخۆکەوین، ئەوەی توانامان هەیە، دەبێ بە کاری بەرین، هەلی چاکە، دەبێ لە دەستی نەدەین، ئەوەش بە تەنیا بە ئێمە ناکرێ، دەبێ خەڵکمان لە پشت بێ، بێ ئەوان هیچمان پێ ناکرێ، دەبێ هانیان دەین بێنە مەیدان، هەر ئەوەندە بجووڵێنەوە، وەک لافاو و بوومە لەرزە وان. هیچ هێزێ چەنەبەر و باشاریان ناکا و کۆشک و قەڵای ئاغاوات دادەماڵن. تا ئەو هەلە رەخساوە و دەوڵەت زەبوونە، وەخۆکەون، دەرفەتە، شا لە هەڵاتنە، شا هەڵێ، دەور دەگۆردرێ، موسەدیق دێتە سەرکار، ئەو پشتیوانی وەرزێرە، بە خەڵک راگەیێنن، ئەو کەسانەی تێیان رادەبینن، ئەوانەی سەربزێو و دڕوودارن، پێیان بڵێن، ئاگاداریان کەن؛ ئاگادار بن، خۆیان دێنە مەیدان، هەر ئەوەندە بجووڵێنەوە، خاس و عام خۆ ناگرن

و وەک لافاو هەڵدەستن، کاری ئێمەش ئەوەیە، خەڵک وەخەبەر بێنن، ئەوە کاری ئێوەیە، خۆشم زوو زوو سەرتان دەدەم، پێتان لێ نابڕم.

کوێخا بە تاڵووکە هەڵیدایە:

ـ من ناتوانم بمێنمەوە، خالە ئاگادارە، هەموو ڕۆژێ دەمکێشنە پاسگا، خەریکن دیلم دەکەن، ئاشکرا بووم، داوای هاوکاریم لێدەکەن، کار لەوەیدا نەماوە بمێنمەوە، یان دەبێ لەگەڵ ئێوە بم، یان لەگەڵ ئەوان بم. چا بوو هاتییەوە. دەنا بە تەما بووم وەدووتان کەوم، مەڕوماڵاتەکەم هەرزان فرۆش کردووە و خانووم لە شارکرێوە، ژن و منداڵ دەبەمە شار و لەگەڵتان ڕێدەکەوم، دەرتانم نەماوە.

تاهیر ماتە. پاشان گوتی:

ـ پێت لەسەرچاو، بەڵام مانەوەت بە کەڵکترە، ئەوەی تۆ دەتوانی لە نێو خەڵک بیکەی، لە دەرەوە ناتوانی، مانەوت باشترە، بریا من توانیبام.

ـ منیش ناتوانم، باوەڕ بکە ناتوانم.

تا شەو شەق بوو، لەو بارەوە دوان، تاهیر نەیتوانی کوێخا شەریف قایل کات بمێنێتەوە. لە ئاکامدا ڕایان هێنایە سەر ئەوەی شەوێ ماڵی کوێخا هەڵێنن و بیبەنە شار و لەگەڵیان ڕێکەوێ.

ئەو کارە کرا، کوێخا کەوتە تەکیان و بەرەو سنوور وەڕێکەوتن.

ئەو کەسانەی سەربزێو و دڕوودار بوون. مەحموود شوان، بە دزییەوە، یەکە یەکە دەچووە لایان و دەیدواندن.و بەرە بەرە شەوانە کۆ دەبوونەوە و ڕاوێژیان دەکرد. هێندەی نەخایاند، کۆڕوکۆ بوونەوە پەرەی سەند و دێهاتەکانی دەوروبەری گرتە بەر. لە هەر دێیەک چەند پیاوێکی بوێر و نەترس، بە شێوەی نهێنی بوونە کەلا و گەورەی ئاوای و سوێندخۆری خەڵک، خەڵکیان سوێند دەدا تا سەر لەگەڵ بن.

ئەو بزووتنەوە وردە وردە بووە جەماوەری و پیر و لاو بوونە بەشدار. ئەحمەد فەراشیش یەکێک بوو لەوان، تەنانەت حەسەن مەیتەریشی دەهێنا و ئەوەی لە قەلا بیستبایان، دەیانگێڕاوە و خەڵکیان ئاگادار دەکرد. هەبوون کەسانێ ترسەنۆک و پاش کولۆش، لە ترسی پاشەڕۆژ شەوانە بە دزی خەڵکەوە بۆ جامە لۆسکێ دەچوونە قەلا وخۆیان دەخستە ماڵی ئاغا، ئەحمەد بۆ خەڵکی دەگێڕاوە و ئیتر لە نێو کۆڕوکۆبوونەوە ڕێیان نەدەدان.

هێزی خەڵک ڕۆژ بە ڕۆژ بە هێزتر و پتەوتر دەبوو، ئاغـاوات کـز و لاوازتـر. لـەو کات و سەردەمەدا ئاغاکان کۆڕێکی گەورەیان لە ماڵی هەمزەبەگ پێکهێنـا و تـەواوی ئاغاواتی ناوچە بەشدار بوون. هەموو ڕایان هێنایە سەر ئەوە کـە بـە خۆیـان و نۆکـەر و ئەوانەی وا شەوانە خۆ دەخەنە لایان و خۆیان بە ڕەعیەت و لایەنگری ئـەوان دەناسـێنن، چەکدار کەن و ئەوەی لامجوومی و سەربزێوی دەکا، لە دێ وەدەریان نـێن و شـڕەیان بخەنە دەرەوەی دێ و بەزەییان بە ماڵ و منداڵیاندا نـەیێ. ئەحمـەد فـەڕاش لـە پـشت دەرگاوە گوێ بیسی ئەو حەیس و بەیسە بووە. بە بیانووی ئاو لە سەماوەرکردنەوە هاتـە خوارێ وحەسەن مەیتەری تێگەیاند و ناردی بۆ نێو دێ و خەبەری بلاوکردەوە.

مەحموود شوان وەک نوێنەرێکی تاهیر لە نێو خەڵکدا بوو، نوێنەری خەڵکەکەشە و هەموو چاویان لە زاری ئەوە و هەموو فەرمانێکی بەڕێوە دەچێ:

ـ خەڵکینە! ئەوەی لەگەڵ ئێمەیە، بە گەورە و بچووک، ژن و پیاو، ئەوەی دەستیدار دەگرێ، هەرچی هاتە بەردەست، چەکی گەرم و سارد، داس و شەنە، گۆپاڵ و کوڵەوەژ، دەستی دەنێ و کوچە و کوڵان و سەربان و گوێیان بگرن، ئەوەی لە قـەڵا هاتـە دەرێ، بەزەییتان پێیدا نەیە و دایپاچن. دوو کەسی نەترس هەر ئێستا بڕۆنە بـەر دەروازە، بـڵێن ئەو خەڵکە دەڵێن پێ لە پشکۆوە بنێن، قەڵەمی پێیان دەشکێنین. دەبێ هەر ئێـستا، هـەر ئەمشەو ئەو کۆڕوکۆبوونەوە کۆوەکەن، ئەگینا، ئەوەی بە سەریان بێ، تاوانەکەی لە پێی خۆیانە، بڵێن مەحموود شوان دەیگوت زوو بار و بنەیان وەپێچن، بەری قینی ئەو خەڵکە بە کەس ناگیرێ، زۆر داخ لە دڵن، هەر ئەمشەو قەڵا میوانی لێ نەمێنێ، وەنـەزانن هـەر تازواین، خەڵکی چەند دێ لێرەن، پێویست بێ، ئەوەندە دێنین قەڵا بگرن بە شانەوە.

دوو کوڕە جەحێڵە لە نێو حەشیمەتی مزگەوت هەستان و بە کـرژی وەدەرکـەوتن. ژن و پیاو، گەورە بچووک، ئەوەی دەستی داری گرتبا، بـە خـەنجـەر و قەمـە، داس و شەنە، گۆپاڵ و کوڵەوەژ، تەور و تەشوێوە هاتنە مەیدان و چاویان لە زاری گەورەکانـە، بە حاڵ، هەر بە ئاستەم ئاماژەی هێرش بۆ قەڵا بکەن.

ئەودەمەی مام عەلی دەرکەوان ڕاسپاردەی خەڵکی گەیاند، شەو لە نیوە لای دابوو.

بـە بیـستنی ئـەو پەیامـە، دەسـتە دەسـتە سـوارە لـە دەروازەوە دەربـاز بـوون و هەمزەبەگیشیان لەگەڵ خۆیان برد. ئەودەم کە هەمزەبەگ سوار بوو، قەڵای بە ڕەسـووڵ

سپارد. ڕەسووڵ بەڵێنیدا تا خوێن لە دەمارەکانیدا بمێنێ، نەهێڵێ ڕەعیەت بێنە حەوشـەی قەڵا. ئەو کەینوبەینە هەر خۆبەخۆ لە نێوانی ئاغا و نۆکەر دا بوو، کەس بەوەی نەزانی.

ئەحمەد زانی قەڵا چۆڵە، هەلی بە دەرفەت زانی، نازداری تێگـەیانـد خۆسـازکا بـۆ ڕاکردن، خۆی هاتە دەرێ وڵات بە تاقی کاتەوە. چووە بەر دەرگا بچووکەکـەی چـۆم، شەوژەنی لابرد و سەرێکی کێشا، کەس نییە، بێ ئەوەی پشتی دەرگا بخاتـەوە، سـەبرێ پێوەیدا و بێ چرپە وەسەرکەوتەوە. چووە پشت دەرگای دیوەکەی نازدار.

نازدار هەستی خشپەی پێی ئەحمەدی کرد، گورج ڕاپەڕی و هاتە دەرێ. ئەحمەد لـە پێشەوە و ئەو بە دوویدا لە پلیکان هاتنە خوارێ، بە بن دیـوار و دیـواردا گەیـشتنە بـەر دەرکە و چوونە دەرێ. لە دەرەوەی حەوشەی قەڵا ماوەیەک ڕوانینە یەک، لـە تاریکـدا بزەی شادی ڕوخساریانی گرتبووە بەر، ئامێزیان بۆ یەک کردەوە و یەکیان گوشـی بـە خۆوە. وەک جووتێ پەلەوەرێ لە ڕکە هەڵاتوو بای باڵیان دا و ئامادەی فڕین بوون. لە نەکاو شریخەی بڕنوو بای باڵی نازداری شکاند و لە دوای ئەحمەدەوە ڕهێڵ بوو! ئەحمەد لە جێ وشک و تاسا!!

نازدار دەنگی دا:

ـ من پێکرام تۆ هەڵێ.

ڕەسووڵ لە سەربانەوە گوڕاندی:

ـ ڕاوەستە حیزباب، لە جێی خۆت نەبزووی.

نازدار لە ئەحمەد خوڕێ:

ـ هەڵێ ئەحمەد هەڵێ، تۆش دەکوژرێی، ڕەسوولە، هەڵێ، لە من گەڕێ.

ئەحمەد وەخۆهاتەوە پڕی دایە نازدار و خستییە سەر شانی، بە بن دیواری حەسـاردا ئەحمەد پەنجەی نایە نێو پەنجەی و چاوی بڕییە پەنجەی پێکانی. سەر پێـی سـپی سـپی بوونەتەوە و سوورایی لێبڕاوە، بە پەلە پەلاماری دایە، سارد سارد وەک لە سـەهۆڵ گـیرا بێ، بانگی هەڵدا و خۆی وەسەرکێشا.

ژنان تێکڕا دەرپەڕینە دەرێ، کەس خۆی پێ نەگیرا. لە پشت دەرگاوە گوێیـان لـە دەنگی بە سۆزی ئەحمەدەوەیە کە بە کوڵ لە دەروونییەوە دەهاتە دەرێ:

نازدار و نازدار، نازداری بابی

کۆترە باریکەی باڵ بە خوێنابی

هەر خۆم زووم زانی تۆ بۆ من نابی
تۆ لە پەنجەرەوە و من لە دوودەری
بۆ تۆم پۆشابوو بەرگی نۆکەری
شەرتە لە دوای تۆ مەولا و مەولاکەم
هەڵگرم کەشکۆڵ روو لە سەحراکەم

لەو ماوەدا، نازدار بێژان و ئۆف، بزە لە سەر لێو گوێی راگرتبوو. ئەحمەد دای لە کۆڕەی گریان. نازدار لە سەرەخۆ، دوو دڵۆپ فرمێسک لە گۆشەی چاوەکانی رژانە خوارێ و لە سەر گۆنا هەڵپرووکاوەکانی قەتیس بوون، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

سەفەریم سەفەر دوو دڵ رەزاکە
دەم بنێ نێو دەمم، گەردنم ئازاکە

ئەحمەد بە هێمنی دەمی نایە نێو دەمی. لێوەکانی نازدار وردە وردە تەڕرایی لێبڕا و بوون بە سەهۆڵ. دەست و پێی ئەحمەد گرێکیان تێدا نەما، شل کەوت بە لادا.

ژنان بە خۆڕنین و گریانەوە هەواڵیان دا بە مزگەوت. یەکەم کەس کە گەیشتە سەر تەرمی نازدار و ئەحمەد، مەحموود شوان بوو، بەندی دەستی ئەحمەدی گرت، هاواری کرد:

ـ لە هۆش چووە، وەرن لەو خوێنەی دوورخەنەوە.

بە چوار دەستان، ئەحمەدیان لابرد و لە سەرجێ رایانکێشا. بریوبریو لە حەوشە ساز بوو. پوورەگوڵە بوو. هاتە سەر تەرمی نازداری بێناز کەوتوو، لە حەوسالان راستەوە ببوو. بێ قسە و باس چووە لای ئەحمەد و لە ژوور سەری دانیشت تا هاتەوە هۆش. ئەحمەد چاوی هەڵێنا و روانییە پوورەگوڵە، لە سەرەخۆ گوتی:

پوورێگیان! درەنگ هاتی؛ زۆر چاوڕوانت بوو.

پوورەگوڵە شووشەیەکی دەرهێنا و چێوپەمەی لە زارکی دەرکێشا، نای بە زاری ئەحمەدەوە، یەک دوو قومی خواردەوە دەمی کێشاوە. پوورەگوڵە دیسان بە زۆر نایەوە بە زاریەوە:

ـ بیخۆ، ئاوی میوەیە، با هێز بێتەوە بەرت و پیاوانە هەستە و لە بیری تۆڵەدا بە، بە گریان هیچ ناکرێ، گریان کردەوەی بێدەسەلاتە، تۆ پیاوی، دەتوانی تۆڵەی بستێنی.

ئەحمەد دوو سێ قومی دیکەی لێدا. بە ئاو میوە گرێک کەوتە دڵی و قسەکانی پوورەگوڵە ورەی دایە و هەستایە سەر پێ.
لە تاو کەوتندا، قەبرکەن، قەبری نازداریان تەواو کرد. پوورەگوڵە تەرمی نازداری شۆرد و خەلاتی بە بالای بڕی، هەواڵی بە پیاواندا تەرمی سازە و بیبەن بۆ مزگەوت.
بەر لە هاتنی پیاوان، عەدلە خانم، حەسەن مەیتەری نارد ئیزن بدەن دوا چاوپێکەوتن لەگەڵ نازدار بکات، مەحموود شوان زۆر بە ڕێزەوە ئیزنی دایە. ڕووی لە جەماوەر کرد:
ـ کەس هەقی نییە بێ حورمەتی بەو ئافرەتە بکات، بە ژنان بڵێن زۆر بە حورمەت بن لەگەڵی. دوو سێ کەسیش بڕۆن ئەحمەد فەڕاش بێننە مزگەوت، با لەوێ نەبێ.
عەدلە خانم لە دەرگای حەوشە، بە نێو کۆڕی پیاواندا خۆی کرد بە حەوشەدا. ژنان چوون بە پیرییەوە. لە ناوەڕاستی حەوشەدا چارشێوی فڕێدا و بانگی هەڵدا و خۆی وەسەر تەرمی نازداری بێنازدا کێشا. گریا، گریا، بوو بە حەوجۆش. شیوەنێکی گێڕا دایک مەگەر بۆ ڕۆڵەی گێڕابێ. ژنان وێڕای ئەو، تێکڕا دەگرین و کەس ناپەرژێتە سەر کەس.
پوورەگوڵە وەخۆکەوت، چووە سەر تەرم، عەدلە خانم لە بەری هەستا. پوورەگوڵە دەستی دایە قۆڵی و لە تەرمەکەی دوورخستەوە، بە خوێندنی فاتیحایەک ژنانی بێ دەنگ کرد. پیاوان دارە تەرمیان هێنا و تەرمیان لە سەر دانا و بردیانە مزگەوت. مەلا نوێژی مردووی لە سەر خوێند. لە قاوەڵتووندا نازداریان بە خاک سپارد.
چەند ڕۆژ لە کوشتنی نازدار تێپەڕیوە. مەحموود شوان بیستوویەتەوە، ئەحمەد دەیهەوێ خۆ بکا بە ماڵی ڕەسووڵی نۆکەر دا بە تۆڵەی نازدار، ژن و منداڵەکانی بکوژێ. لە بەر ئەوە چاوی لێ خافڵ ناکا و شەو و ڕۆژ لەگەڵ خۆی دەیگێڕێ. تەنانەت بشچێتەوە بۆ کانییە کوێرە، ئەحمەد لەگەڵ خۆی دەباتەوە. یەکەم جار کە چووە ماڵی مەحموود شوان، ئەحمەد چاوی بە کابان کەوت، لێوی خۆی گەست:
ـ ئەوە کچە بالا بەرزەکەیە وا لە حەوشەی قەلا دەهاتە دەستمەوە! یانی کچی خالەیە؟!!

## ٢٩

ساڵه وەختێکه حەمه له شاری سلێمانی نیشتەجێیه و لە چایخانەکەی بلە ئێرانی گیرساوەتەوە. سەرودڵخۆش، بە کارەوە جەنجاڵه و هەست بە غەریبی ناکات.

لە هەوەڵەوە زۆر وەڕەزی دەکرد، بە تایبەت دڵتەنگی کەوێ و پوورەگوڵه و عەبه بوو. وەک نامۆ، شەوانە خەوی لێ نەدەکەوت، ئێواران دڵی قوفڵ دەبوو، وەک ئەوەی شەوە دڵی ڕێک بگوشێ، زەرد زەرد هەڵدەگەڕا حەجمینی لێ دەبڕا و چی پێ نەدەخورا، ڕۆژ بە ڕۆژ لاواز دەبوو. دایمە لە بیری گەڕانەوەدا بوو، بەڵام کە چاکە و پیاوەتی بلە ئێرانی وەبیر دەهاتەوە پەشیمان دەبۆوە.

ئێستا هەوای گەڕانەوەی لە سەردا نەماوە، وردە وردە، هەموو شتێکی لە بیر بردۆتەوە و سای خستوون.

لەودەمەوە پێڵاوی غەریبی لەوێ کردۆتەوە، بلە ئێرانی وەک بابێکی دڵسۆز ئاگای لێیەتی، ئەویش وەک بابی خۆی ڕێز و حورمەتی دەگرێ و دڵسۆزانە کار دەکا. حەمە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەسم و یاسای دەوروبەری فێر دەبێ و دابونەریتی شاری ڕەچاو دەکات. نە وەک هەر خووخدەی گۆڕاوە، شێوە و قەڵافەتیشی وەک جاران نەماوە.

جاران داڵبون بوو، هێندێ درێژ لە چاوی دەدا. سەوزەیەکی ڕەشتاڵە بوو، ئێستا سەوزەی گەنم ڕەنگە، قەڵافەتی قەوی قۆڵتر لە جارانە و لەگەڵ باڵای لە یەک دەکاڵێنەوە، لە جاران کورتەباڵاتر دێتە بەرچاو.

بە سایەی ڕاپەرینەکەی عەبدولکەریم قاسمەوە چەک ئاشکرا بەدەستی خەڵکەوەیە و چایخانە ژاوەی دێ لە حەشیمەت. لە بەر سمڕسمڕی چەک فرۆش و کڕیار کەس ئاگای لە کەس نییە.

بله ئێرانی لە پشتی مێزەکەی دانیشتووە. کەریمی چاپەز چا دەگێڕێ. کوڕە مێرمنداڵەکە خەریکی قلیاناوی ساز کردنە. حەمە بە سەتڵە شەکرەوە دەگەڕێ و جێ شەکرەکان پڕ دەکاتەوە. لە نەکاو سەتڵە شەکری فڕێدا و پڕ بە زاری هاواری کرد:

ـ کاک تاهیر! کاک تاهیر! بەدەم هاوارەوە دەرپەڕی.

بلە ئێرانی بە سەرسوورمانەوە وەدووی کەوت. دانیشتووانی چایخانە بەرەو پەنجەرە وەرسووڕان، هێندێکیان چوونە دەرێ.

بەدەنگی حەمە، تاهیر و دوو هاوڕێکەی ئاوڕیان داوە. تاهیر، پەشۆکا و هاواری کرد:

ـ کوڕە خۆ ئەوە حەمەیە! حەمەگیان، ئەوە لە کوێی ماڵتە خۆ دنیات لێ گەڕام.

تاهیر بە کرژی گەڕاوە، هاوڕێکانی پێ‌پێ بە دوویدا. تاهیر و حەمە تامەزرۆ، یەکیان لە ئامێز گرت. بلە ئێرانی نزیک بۆتەوە، ئەوەندە نزیک کە هەموو وتەکانیان حاڵی دەبێ، پاش چەند جار یەک هەڵمژین، تاهیر گوتی:

ـ شوێن نەماوە دوو جار و سێ جار سەری لێ نەدەم، هەر ئەو شەوەی ڕۆیشتبووی، چومە کانییەکوێرە، مەحموود شوان گوتی دوێشەو لێرە بوو، دواشەو چوومە دێ کۆن، عەبە گوتی ڕۆییوە. چوومە کانی توو، دەجار چوومە هەزار ئەشکەوت، ئەشکەوت نەماوە سەری پێدا نەکەم.

ـ پوورەگوڵە چی؟

ـ پوورەگوڵەی چی بێ؟ هەر مەپرسە چ دەکا! ڕێی لە ڕێبوار بڕیوە، ئەوەی بیناسێ و نەیناسێ، هەواڵی تۆی لێ دەپرسێ.

ـ هەواڵی دیکە چی؟

ـ دەزانم لە چی دەپرسی، ئەوەی تۆ لێی دەپرسی، ساخ و سەلامەت، لە ماڵی بابیەتی و چاوەڕوانیگەڕانەوەی تۆیە، تۆ ئەوەت دەوێ، نییە؟

حەمە سوور هەڵگەڕا، بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ، ڕووی کردە هاوڕێکانی تاهیر: — ئەو برادەرانە کێن؟

ـ ئەمەیان سارۆیە و ئەوەشیان مینەیە.

حەمە یەکەیەکە ماچی کردن. قۆڵی تاهیری گرت، ڕووی لە سارۆ و مینە، گوتی:

ـ من لەو چایخانە کار دەکەم، لەودەمەوە لەوێم؛ خاوەنەکەی لە باب چاکترە بۆ من، فەرموون، لەوێ تێر قسە دەکەین.

لەودەمەوە بلە ئێرانی گوێ بیس بووە. بیرەوەری بیست و دوو ساڵ لەمەو بەری زیندوو بوونەتەوە، لە دەروونەوە سێ و دوویەتی:

ـ کانییە کوێرە! دێ کۆن! کانی توو! هەزار ئەشکەوت! ئەوانە دەڵێن چی؟! دەستی نایە سەر شانی حەمە، حەمە ئاوڕی داوە:

ـ کاک تاهیر! ئەوە خاڵە برایمە، لای ئەو کار دەکەم.

بلە ئێرانی قسەکەی بە حەمە بڕییەوە:

ـ ئەی بۆ دەتگوت خەڵکی چۆمی مەجیدخانم کوڕی باش؟!

بە پەلە رووی لە تاهیر کرد:

ـ ئەو شوێنانەی باست کردن، ملکی هەمزەبەگن؟

ـ بەڵێ، بەڵەدی؟

بلە، جوابی تاهیری نەداوە، زەق زەق چاوی بڕییە حەمە. چاوەکانی وردە وردە زەلین و بوون بە گۆمیلکە. لێوەکانی لە سەر یەک کەوتنە لەرین. وەک ئەوەی بیهەوێ بدوێ و لەرەی لێو ماوڵی نەدا.

حەمە لەو سەرنج و تێڕامانەی بلە دوودڵە! تاوێ دەڕوانێتە بلە و تاوێ تەماشای تاهیر دەکا، پاشان چاوی بڕییە بەر پێی خۆی و سەری شەرمەزاری بەردایەوە.

تاهیر، تێبینانە رازی دەروونی بلە لە چاوەکانیدا دەخوێنێتەوە، لە پڕ، وا کە بلە بپەشۆکێ، پرسیارەکەی لێ دووپات کردەوە:

ـ خاڵە! جوابی منت نەداوە؟ گوتم ئەو مەڵبەندە بەڵەدی؟

بلە بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

ـ ئەرێ بەڵەدم، چاک بەڵەدم.

ـ کێ دەناسی؟

ـ هەر کەس بڵێی.

ـ ماڵی حاجی برایم دەناسی؟ کوڕەکەی ناوی مەحموودە!

ـ کام حاجی برایم؟ بلە جەوال؟

حەمە لە جێ ڕاپەڕی.

تاهیر بە ئاماژەی چاو دایمرکاندەوە. زوو جوابی بلەی داوە:

ـ دەم خۆش، ئەرێ ئەرێ خۆیەتی.

باوەشی کرد بە حەمەدا، بە دڵپڕی و بزەوە گوتی:

ـ حەمەگیان چاو و دڵت روون، ئەوە بابتە، بابت، خۆیەتی، خۆیەتی، خاڵە مەحموودە، خاڵە مەحموود! ئەوە کوڕی خۆتە! حەمە کوڕی تۆیە، کوڕی سەڵمەی خێزانتە.

باب و کوڕی یەکتر نەدیو ماوەیەک روانینە یەک.

تاساو و عەبەساو، گێژ گێژ دەڕوانێنە یەک!! دەم تاقی چرایە و چاو پڕوڕگ، بێ تەکانن. مەحموود بیر لەودەمە دەکاتەوە کە هێشتا حەمە لە دایک نەببوو، سەڵمەی خێزانی و تافی لاوییانی هاتەوە یاد و شێوەی هاتەوە بەر چاو، تەز و مچوڕک وەک هەورە برووسکە بە لەشیدا تێپەڕی، شەرمەزار و لە خۆی بێزار سەری بەرداوە و چاوی لە حەمە خافڵاند.

حەمە بیر لە سەردەمی منداڵی خۆی و چاوەڕوانی دایکی دەکاتەوە، ئەو وڕێنانە کە دایکی لە کاتی سەرەمەرگ دەیڕەواند، هاتە مێشکی:

ـ هاتییەوە مەحموود؟! تەماشای کە! هەر لە خۆت دەچێ، چاووبرۆی کوتومت خۆت. حەمە رووی گرژ بوو وەک ژێ وێک هاتەوە وەک رق هەستاوان لە بەر پێی مۆڕ بۆوە. راکردن و ناچار بوونی خۆی وەبیر هاتەوە.

لە پڕ بانگی هەڵدا و باوەشی بە بابیدا کرد. باب و کوڕ بە دەنگێکی بەرز، لە ئامێزی یەکدا دەگرین، تاهیریش وێرای ئەوان.

دانیشتووانی چایخانە بە چاپەزەوە هاتوونە دەرێ، دوکاندار و رێبواری بازار و شەقام دەورەیان داون، باب و کوڕ دەگرین و ئەوان پێدەکەنن، چەپڵەڕێزان و هەرایە،

ـ چاو و دڵتان رۆشن، پیرۆز بێ پیرۆز.

حەشیمەت هەر دێ و زۆر دەبن. تاهیر وەخۆهاتەوە، گورجێ قۆڵی گرتن و بردنییە ژوورێ و حەشیمەت بە دوویاندا خێزەرەیان کردە ژوورێ. دەستە دەستە دۆست و ناسیاو دێن و پیرۆزباییان لێ دەکەن. باب چاو لە کوڕ ناترووکێنێ، کوڕ تاوێ چاو لە بابی دەکا و ماوەیەک دەڕوانێتە وێنەکەی قەد دیوارەکە و جار جارێ بە بزەوە دەڕوانێتە تاهیر، دەیهەوێ بڵێ بابی من ئەو وێنەیە بووە. تاهیر لێی حاڵییە، بە تەکانی سەر بۆی دەسەلمێنێ.

بلە ئێرانی بە لای تاهیر و دوو هاوڕێکەیەوە ناوی مەحموودە، بە لای خەڵکی سلێمانییەوە بلەیە، تاهیر هەستا گوتی:

خاڵە مەحموود! ئیزن بدە ئێمە بڕۆین، رفیقمان لەگەڵە، چاوەڕێمانن.

ـ حەیە حەی!! دەڕۆن؟! بە خوا تا لە سلێمانی بن، میوانی منن، بنێرە ئەوانیش بێن.

رووی وەرسووڕاند، چاوی لە نێو حەشامەتەکەدا گێڕا، کەریمی چایچی وەبەر چاوی کەوت:

ـ کەریم! هۆی کەریم! گورج پا هەڵخە و هەواڵ بە نەجیبە بدە، ئەوەی دەزانی و بیستوتە، بۆی بگێڕەوە، بڵێ دێنەوە بۆ ماڵێ، لە سەر ڕێ، لادە دوکانی عەزیزی قەساب، چی گۆشتی بوو لەگەڵ خۆت بیبەوە، زووکە راکە، ها بابم.

ئەو دەم کەریم گەیشتە ماڵێ، نەجیبە پڕ بە تەشتێ قاپ و کەوچکی بە دەستەوە بوو و لە پلیکانەکان دەهاتە خوارێ. بە بیستنی ئەو هەواڵە، نەجیبە تەشتەکەی لە دەست بەر بۆوە، تاسا و پەشۆکا، ئەو پەشۆکانەی نەجیبە، کەریمی دووشک کرد، لە دڵەوە لە خۆی پرسی:

ـ بڵێی لە خۆشییا بێ؟ یان....؟

ئەو کاتە هاتنەوە، کەریمیشی لەگەڵ بوو. نەجیبە دەستی ئاوات و ئارەزووی بە دەستەوە بوو تەمادار وێستا بوو. هەر لە دوورەوە، وەک ئەو حەمە لە داوێنی خۆی بەربووبێتەوە، بە پیرییەوە هات و لە ئامێزی گرت، نەک هەر ئەو، تاهیر و و هاوڕێکانیشی یەکە یەکە ماچ کردن. زوو زوو بە ئاوات و ئارەزووی دەگوت:

ـ ئەوە برا گەورەکەتانە، بڕۆن دەستی ماچ کەن، بڕۆن دەستی کاکتان ماچکەن. هەموو ئەسرینی شادی لە چاویان گەڕاوە، بە چاو دەگرین، بە زار پێدەکەنن. ئاوات و ئارەزوو خۆیان لە باوەشی حەمە هاویشت. نەجیبە ئەسپەندەری ئاوردا و لە دەوری گێڕان.

ئەودەم کە هێشتا لە چایخانە وەدەرنەکەوتبوون، تاهیر، سارۆی ناردبوو لە دووی هاوڕێکانی دیکەیان. کە هاتنە چایخانە، ئەوان رۆیبوونەوە، بەڵام بە شاگردەکەیان سپارد بووکە هاتنەوە ڕێنوێنییان بکا بێنەوە ماڵێ.

هێشتا تاهیر و ئەوان لە حەوشە بوون، شاگردەکە دەرگای حەوشەی کردەوە و بانگی کرد:

ـ خاڵە برایم! میوانەکانم هێنا.
مەحموود ئێرانی گورگە لۆق بە پیریانەوە چوو:
ـ فەرموون فەرموون.
یەکەیەکە هاتنە ژووری و ماچی کردن. یەکیان توند توند باوشی پێدا کرد و زوو زوو دەستی کرد بە ماچ کردن.
ـ کاک مەحموود! من ناناسی؟ من شەریفی رەحمانی خانێم، خەڵکی کانییە کوێرەم. ئەو دەم تۆ هەڵاتی، من تازە خەتم دابوو.
دەستی بەرەو کاوە راهێلا:
ـ ئەوەش کوڕی مەحموودی نادرە، ناوی کاوەیە.
بە گوڕە و هەرای کوێخاوە، حەمە ئاوڕی داوە، دەستی لە ئەستۆی ئاوات و ئارەزوودا شل بۆوە! هەستایە سەر پێ:
ـ کاک تاهیر! ئەوە لێرە چ دەکا! گورگت لە کۆزی خۆت هاویشتووە!
تاهیر چووە پێشێ، دەستی خستە سەر شانی حەمە و بە پێکەنینەوە، سەبرێ گوتی:
ـ چۆن چ دەکا؟! ئێمە چ دەکەین، ئەویش ئەوە دەکا.
ـ سەیرە! چۆن باوەڕ بەوە دەکەی؟ ئەوە من دەیناسم، گورگە و لە پێستی مەڕدایە، باشە! زۆر باشە، تا ئێستا قوڵە چۆماخ و کوتەک بە دەستی ئەو ناوەقە بوو، ئێستا هەق ئەستێنی خەڵکە!! بە خودا شێرم بۆ بە گوێ بگرێ، دڵم لەوە ئاو ناخواتەوە، تۆش کەیفی خۆتە.
تاهیر نێو چاوانی وێکهێناوە، بە تووڕەییەوە گوتی:
ـ بۆ بیری خراپ دەکەیەوە؟ تۆ دەیبوغزێنی دەنا ئەو وا نییە، ئەگەر وابوو با دەستی لە ماڵ و منداڵ هەڵنەدەگرت و کێواوکێومان لەگەڵ بکات، خۆ بە زۆر نەمانهێناوە.
ئەوەش هیچ، مەگەر ئێمە نامانەوێ خراپ چاک بکەین؟ گریمان ئەو خراپ بووە، ئەوە نییە دەیهەوێ باش بێ؟ ئەوانە لە مێشکت دەرکە، کوێخا زۆر چاکە، ئەوە بەرەو تۆ هات، رووت خۆش بێ.
کوێخا بە باوەشی ئاواڵەوە بەرەو حەمە هات. تاهیر لە پشتەوە لە حەمەی گوتا و هانیدا، حەمە دوو سێ هەنگاو چووە پێشێ و یەکیان لە ئامێز گرت. ئەوانی دیکەش، یەکە یەکە حەمەیان ماچ کرد و خۆیان پێ ناساند:

من مینەم. سارۆم. نامیقم. رەشۆم. قادرم. کاوە دواکەسیان بوو. حەمە تا ئێستا کـاوەی نەدیبوو، هەر لە دوورەوە ناوی بیـستبوو، گـەرموگوڕ لەگەڵـیدوا و تێـر تێرتێیـڕوانی، چاوەکانی هەر لە کابانی خوشکی دەچوو.

ئەو رۆژە تا شەو داهات، شەوێ تا شەو شەق بوو، باب و کوڕ چیرۆکـی رابـردووی خۆیان گێڕاوە. ئەودەمەی حەمە باسی چۆنییەتی مەرگی دایکی دەکرد، بابی خـوڕ خـوڕ فرمێسکی دەباراند وەختی نووستن، تاهیر و حەمە چوونە دیوێک. ئەوەی کـە لـە پـاش هەلاتنی حەمە روویداوە و تاهیر لە پوورەگوڵە و ئەم و ئەوی بیستووە، بـە وردی بـۆی گێڕاوە. حەمە جارێ گریا و جارێ پێکەنی. بەوەی کـە کـەوێ بـە کچییـەتی تـەلاق دراوە، پێکەنی. بۆ کوشتنی عەبە زۆر گریا، هەموو بە سەرهاتەکەی عەبـەی بـۆ تـاهیر گێڕاوە، سوێندی خوارد قاتڵی عەبە بدۆزێتەوە، بە دەستی خۆی تۆڵەی بستێنێ.

سێ شەو و سێ رۆژ تاهیر و حەمە لە ماڵ وەدەرنەکەوتن. رایان هێنایـە سـەر ئـەوە تاهیر لەگەڵ بابی بدوێ و کارەساتی پێڕاگەیێنـێ. شـەوی چـوارم، تـاهیر، مـەحمود ئێرانی بردە دیوێک، ئەوەی سەبارەت بە حەمە و کەوێ دەیزانی، بە وردی بـۆی بـاس کرد. پاش هێندێ بیرکردنەوە، مەحموود گوتی:

ـ حەمە ئێتر هەتیو نییە، ناهێڵم بە چاوی سووک تەماشای کەن. ئەو چەشنە تـۆ بـاس دەکەی، خۆم دەتوانم بێمەوە ئەو دیو، خۆم دێم و خوازبێنی بۆ دەکەم، ئەوەی لە توانامـا بێ، دەیکەم، بەیانی مۆڵەتم بدەن، دووسبەی وەڕێ دەکەوین.

شار و دێ، کێو و رێ لە ژێر دەسەلات و سایەی هێمنایەتیدایە. نە دەولەت و ئەمنییە لە گۆڕێدایە، نە ئاغا و نۆکەر و رێگرەکانیان. بێ تـرس و خـۆف نـۆ پیـادە و هێـستر سوارێ، هەشتیان چەکدارن، هێور هێور سنووریان بڕی. سێ رۆژە، بـە رۆژ رێ دەبـڕن، شەوێ لە هەر لایێک رۆژئاوا بێ، لا دەدەنـە دێیـەک وچـان دەگـرن و خەڵـک کـۆ دەکەنەوە و قسەیان بۆ دەکەن و لە رووداوی تازە ئاگاداریان دەکەن.

مەحموودی حاجی برایم تا لە زێدەکەی نزیکتر دەبێتەوە، زیاتر رابـردووی دێتـەوە بیر. دیمەنی کەژ وکێو، چۆم و رووبار، مووچە و مەزرا، شێوەی ژن و پیـاو، گـەورە و بچووکی خەڵکی دێی دێتەوە زەین. لە دەروونەوە وڕێنە دەکا:

ـ بیست و دوو ساڵە! کێ وەک خۆی ماوە؟ کەسانێ پیر بوون ئێستا حەوت کفنیان رزاندووە. هاوتەمەنی من پیر بوون و وەک من شـێوەیان گـۆڕاوە، هـەر نایانناسمـەوە.

ئەوانەی منداڵ بوون، کوڕ خاوەنی ژن و ماڵە، کچ لە ماڵە مێردە. زۆریش دوای مــن لــە دایک بوون، من هەر نازانم کێن و ناویان چییە!! بڵێی کێ بناسمەوە؟ کێ بمناسێتەوە؟ ئەی کێو و کەژ؟ مووچە ومەزرا؟ چۆمەکەی بەر دێ چی؟ بڵێی وەک خۆیان مابن؟ دار بییەکەی سەرکانی چی؟ ئەو دەم تازە یەختە کرابوو، پژ و باڵ و چرۆکانی نەرم و شلک بە دەم باوە سەمایان دەکرد، لە گەرمای نیوەڕۆدا وەک چەتر دەچووینە ژێــری، ڕەنگــە ئێستا پیر و کولۆر بووبێ و منداڵان لە چاو شارۆکێدا خۆ لە کولۆرەکەیدا وەشارنەوە.

بزەیەکی هاتێ، دیسانەوە جوابی خۆی داوە:

ـ ئەوانە هیچ نین، چی وەک خۆی دەمێنێ؟ ئەوانە بە جێی خۆی، بڵێی ســەبارەت بــە خۆم چۆن بیر بکەنەوە؟ ڕەنگە خەڵک زانیبێتیان لەبەرچی هەڵاتووم، بڵێی بە بــێتــاوانم بزانن، یان بە شەرواڵپیس؟ خۆ خودا دەزانێ لەو دەمەوە هەمــزەبــەگ ئــەو ئــافرەتــەی هێناوە، چاوم بە چاوی نەکەوتووە، وەی خودام کرد بە گژتدا هەمزەبەگ، جا ئــەو بــۆ؟ فەیزە، فەیزەی گۆڕبەگۆڕ.

لە نەکاو، تاهیر پێشی هێسترەکەی گرت:

ـ گەیشتین، لەو تەپە وەسەرکەوین، کانی تووە؛ کەســێ نــەنێرین هــەواڵ بــدا؟ بــا سەربەخۆ نەچینە نێو دێ.

مەحموود بە چەشنێ نوقمی خەیاڵ بوو، وەی نەدەزانی ســواری هێــسترە و هــەشــت چەکدار و حەمەی کوڕی لەگەڵە. شپرێو پەشۆکاو گوتی:

ـ ها؟! گەیشتین؟! باشە باشە، وا بکە.

تاهیر بانگی کرد:

ـ کاوە! دادەی پێ هەڵخە و لە پێشەوە خۆ بگەیێنە نێو دێ بە پوورەگوڵە بڵێ حەمــە هاتەوە و بابیشی لەگەڵە، دە هەڵێ دەی.

کاوە، گورجێ وەپێشکەوت، کرژ لە گرد ئاوا بوو. تا ئەوان لــە لێــژ وەســەرکەوتن، کاوە گەیشتە نێو دێ. ئەوان گەیینە دەوری دێ، بریو بریو بەرز بۆوە.

ـ وەدەرکەون! خەڵکینە! وەدەکەون! حەمە هاتەوە!! بابیــشی لەگەڵــە!! مــەحموود!! مەحموود! مەحموودی حاجی بــرایم! بلــە جــەواڵ هاتــەوە!! وەدەرکــەون، وەرن وەرن. دەنگی پوورەگوڵە دەگاتە گوێی تاهیر و حەمە، هەر دوو دەڕواننە یەک و پێــدەکــەنن. حەمە تەماشای بابی کرد، بە بزەوە گوتی:

ـ دەزانی دەنگی کێیە؟
ـ نەوەڵلا، پێم وا نییە کەس بناسمەوە.
ـ دەنگی پوورەگوڵەیە، گوڵەی مام کەریم، تەماشاکە! تۆ چاوکە! ئەو عالەمەی وەدووی خۆی داوە! تەواو خەڵکی دێ وەدوویکەوتوون! کێ دەوێرێ وەدووی نەکەوێ؟! تەماشای کە! دەڵێی شەماڵە!
پوورە گوڵە لە پێش خەڵکەکەوە گەیشتێ. حەمە بەرەو پیری هەڵات و خۆی لە باوەشی خست، تاهیر بە دووی حەمەدا. مەحموود خۆی لە هێستر هاویشتە خوارێ. پوورەگوڵە یەکەیەکەماچی کردن و خەڵک بە جەماوەری هوورژمیان هێنا و باب و کوڕ لە نێو حەشیمەتا ونبوون.
تاهیر، مینەی بانگ کرد:
ـ بەو کوڕانە بڵێ جۆیبنەوە، دوور لە خەڵک بڕۆن و ئاگاداری دەوروبەر بن، دۆست و دوژمن تێکەڵە، کەس لە کەسە.
چەکدار جویبوونەوە، دوور لە خەڵک، شانبەشانیان دەڕۆن.
سرتە و چپە کەوتە نێو خەڵک! قوشقی و کورەگوێ، چاویان بڕییە چەکدار!! بە دزییەوە لە یەک دەگوتن:
ـ ئەوانە کێن؟! پوورەگوڵە دەیانناسێ!! ئەوە نییە دەستی یەکیان گرتووە، دەبێ ئەوە گەورەیان بێ، رەنگە. ئەو لە کوێوە ئەوانە دەناسێ؟ کێ؟ پوورەگوڵە؟! جا کێ ناناسێ؟! بە ناو دەیانناسێ،یەکە یەکە ماچی کردن! ئەوەی لە گەڵیەتی ناوی تاهیرە، خۆم گوێم لێبوو ناوی برد، رەنگە هەر ئەو کەسە بێ هەمزەبەگ دەیگوت چەتەیەک بە برینداری ونبووە! ئەرێ ئەرێ خۆیەتی، ئەوە ئەو دەم پوورەگوڵە شاردوویەتەوە و دەرمانی کردووە، لەودەمەوە دەیناسێ، ئەو ژنە زۆر سەیرە! سڕی وەک سڕی هەنگە! کەس لە سڕی ناگا!! بڵێی کێ بن؟ هەر کەس بن، هەر بێوەی بن و ئازاریان بۆ ئێمە نەبێ، بەڕێی خۆیان.
پوورەگوڵە گوێی داونێ و لە چپەیان حالییە، لە تاهیری کوتا:
ـ گوێت لێیە؟! باسی تۆ دەکەن! وات دەناسن، من وات ناناسم!! لەوانەیە بزانن کوڕی کێی!! چاو! تۆ چاویان لێکە! تەماشا چۆن گوێیان قوت کردۆتەوە! دەڵێی کەری جووتیارن و گورگیان دیوە!! ئەوە ناتانناسن، نازانن لایەنی ئەوانن، بە حاڵ، هەر بە حاڵ

سووسە بکەن ئێوە کێن و دەڵێن چی، ریش دێننە پێشێ و هەژدە هەژدە قسە وەبەر کەس ناخەن. باوەڕیان پێ مەکە، قسەیان تا چەنەیان بڕ ناکا، گوێ بە هەیت و هووتیان مەدە، چاو لە ئێستا مەکە، ئێستا ترسی ئاغا و ئەمنییەیان نییە، بە ئاستەم، هەر بە ئاستەم بزانن ئەوان لە سەرێن، سەدی وەک تۆ بە پوولێ، تۆ نایانناسی، من دەزانم ئەوانە چن، ئەوانە ڕێوین ڕێوی، هەر کوێ پێ دانەدا خۆی لێ نادەن، کورتوکرمانجی، هەر کەس کەر بێ، ئەوان کورتانن، ئەوانە بۆ ئەوە نابن وەک ئێوە خۆیان بۆ بدەن بە کوشت، حەیف و خەسار.

ـ دەڵێی چی پوورێگیان؟ هەر ئەو خەڵکەمان هەیە، دەبێ لە سەرەخۆ بین و سەبرمان هەبێ، چاک دەبن، وردە وردە و هەنگاو هەنگاو.

وردە وردە و هەنگاو هەنگاو بە جەماوەری چوونە نێو دێ و گەیینە دەرکی ماڵی کوێخا کەریم.

ئەودەمەی پوورەگوڵە جاڕیدا، مینا خۆی گەیاندە کەوێ و بە جووت چوونە سەربان، کەوێ بێ ئۆقرەیە، ئەم پێ و ئەو پێیەتی، دڵی بە تەکان لێدەدا و پەنجە هەڵدەگولۆفێ. لەرز و نۆبەتێ دایگرتووە و چەقوچۆ هەڵیدەچۆقێنێ و ددانی بۆ لە سەر یەک بەند نابێ. بە چاو دەگری، بە زار پێدەکەنی. سەرکولمی سوور سوور هەڵگەڕاون، چاوی پڕ بوون لە ئاو و شەپۆل دەدەن و لە کەلاون، کەلاویان کرد، ریز ریز فرمێسک وەک دەنکە مرواری بە سەر روومەتیدا خولۆر بوونەوە و ئاوێتەی بزەی بوون. مینا بە سەر سوورمانەوە تێی روانی:

ـ کەوێ! ئەیەڕۆ!! ئەوە دەگریت؟! وەختی گریانە کچەتیو؟!

ـ چ بکەم؟ بە خۆم نییە خالۆژنگیان، وەختە لە خۆشیان بفڕم کە بیر لە خۆم دەکەمەوە، پێم خۆشە ئەرز قوتمدا، خۆم بە شەرمەزار دەزانم، شەرمەزاریم مینا گیان، دەترسێم، زۆر دەترسێم لێم زیز بوو بێ.

ـ بۆ دەبێ زیز بێ؟ خۆ بە دڵخوازی خۆت ئەو کارەت نەکردووە، بە زۆر مارەیانکردی، خۆی ئەوە دەزانێ؛ وا نییە، درۆ دەکەی، لە خۆشییان لەرزت لێ هاتووە، بە کێ دەڵێی؟ لە تازە راوچی وایە کۆنە راوچی کوێرە، بە شێتم دەزانی؟

مینا، دەستی هەڵێنا چەپۆک بدا بە سەر کەوێدا، لە حەوا پەنجەی وشک وێستا:

ـ ئەوەتا!! ئەوەتا!! ئەوە حەمە! هاها لەگەڵ خالتە.

حەشیمەت وەدەرکەوتن، کەویێ و مینا خۆیان دایە پەنای زیادە دیواری سەربـان، وا کە هەموو کەس نەیانبینێ.

مام حەسەن و مەحموودی حاجی شانبەشان لـە پێـشەوەن. ئەحمـەدی مـام حەسـەن دەستی بە دەستی حەمەوەیە و خەلک بە دوویانەوەن. لە بەر مالی کوێخا کەریم، حەمـە گۆشەی چاوی دایە دەرەک و بان، لـە نـەکاو، وەک ئـەوەی هـەورە برووسـکەی وێ کەویێ، تەز و مچوڕکە بە لەشیدا هات و لە ناخەوە دلی دەلەرزی! زوو وەخۆهاتەوە و بـە سیلەی چاو روانییە ئـەحمـەد. بـەر لـەوەی حەمـە چـاوی لـێ کـا، ئـەحمـەد رووی وەرسووڕاندبوو، ئەنەهۆو هیچ نازانێ، دیسان چاو بوو بە ئەسپی سەرکێش بەرەو سـەربان و کەویێ هەلیگرتەوە، لە دلەوە دواندی:

ـ کەوێگیان! توورە و زیزی؟ مەتۆرێ، تۆ خودا لێم زیز مەبە، بە خـودا بـێتـاوانم، دەزانم، لەوە توورەی بە جێم هێشتی، شەرمەزارم، تۆ چاوە جوانەکانت لێم مەتۆرێ، مـن هەر شوانەکەی جارانم.

لە پڕ بریو بریو کەوتە نێو خەلک، هەر یەک لە لایەکەوە دەیانگوت میـوانی مـنن. پوورەگولە دەستی تاهیری بەردا و پەڕییە نێو پیاوان.

ـ کەس قڕە نەکات! میوانی منن.

مام حەسەن لە سەرە خۆ گوتی:

ـ پوورێگیان! مالی ئێمەش هەر هی تۆیە، ئەو عالەمە لەوێ جێیان نابێتەوە.

ـ کامە عالەم؟! ئەوان دە کەسن، عالـەم دەچنـەوە مالـی خۆیـان، دوای شـێو بێنـە مزگەوت، تاهیر دەیهەوێ قسەیان بۆ بکات، ئێستا بلاوەی کـەن. مـام حەسـەن! تـۆش وەرە.

دەنگی پوورەگولە هێندێ لە توورە دەچوو، کەس نەیوێرا قسە لە قسەیدا بکات.

شەوێ دوای شێو هاتنەوە مزگەوت. خەلکی کانیتـوو، خـاس و عـام، پیـاوان لـە ژووری، ژنان لە بەر پەنجەرە ودەرکی مزگـەوت کـۆ بوونـەوە. تـاهیر تـا دەرنگانـێ سەبارەت بە رووداوی دەرەوە و ناوخۆ بۆیان دوا. هەر ئـەو شـەوە تاقمێـک لـە کـوڕە جەحێلەی کانیتوو بۆ هاوکاری لەگەل تاهیر خۆیان نیشاندا.

بەیانی زوو، تاهیر هەواڵی هاتنەوەی حەمە و بابی نارد بۆ مەحموود شوان. لە قاوەڵتووندا مەحموود شوان و دەستەیەک خەڵکی تازاوا گەیشتە کانیتوو، ئەحمەد فەراشیش لەگەڵە.

ڕەنگ زەرد و لێو بە بار، هەڵپرووکاو و لاواز، تاسەبار و بێزار، ریش هاتوو و داتەپاو، وەڕەز و دڵپڕ خۆی لە ئامێزی حەمە هاویشت.

حەمە گێژومەنگ، بێ هەواڵ لە هەموو شتێک، گوتی:

ـ پڕ بە دڵ تاسەتم کردبوو، نازدار چۆنە؟

ئەحمەد لە بەر هەنیسکدان جوابی پێ نەدراوە. مەحموود شوان حەمەی دوورخستەوە:

ـ باسی نازدار مەکە!

ـ بۆ؟!

ـ نەتزانیوە؟! نازدار نەماوە!

ـ وا نەڵێی!! بۆ نەماوە؟

ـ کوژرا!! ڕەسووڵ کوشتی، دوایی بۆت دەگێڕمەوە. بزانە دەتوانی کارێ بکەی لە مێشکی دەرکەی؟ لەو ڕۆژەوە نەموێراوە چاوی لێ خافڵ کەم، دەترسێم، زۆر دەترسێم، دەترسێم بەلایەک بە سەر خۆێ بێنێ.

حەمە خۆی دەردەدارە ودەردی ئەحمەد هەست دەکا، لەدڵەوە گوتی:

ـ پێویستی بە دڵسۆزێک هەیە دەردی دڵی لای هەڵڕێژێ.

دەستی ئەحمەدی گرت و بردیە دەرێ.

حەمە ئەحمەدی بە دەم پرسیاری چۆنییەتی کوشتنی نازدارەوە لە کێوەبەرداویلە برد بەو دیودا. لەودەمەوە نازدارکوژراوە، کەس ئەو پرسیارەی لێ نەکردووە. تا گەیشتنە تازاوا و چوونە سەر گلکۆی نازدار. ئەحمەد کۆڵ و کۆی دەروونی ڕشت و تاوێک چاوی وشک نەبۆوە. لەوماوەدا تاقە جارێ حەمە نەیگوت مەگری، ئەویش وێڕای ئەحمەد دەگریا و زۆرتر هانی دەدا بگری. وردە وردە گریانی تەواو بوو، کەوتە بیری تۆڵە.

ـ دەستم بە ڕەسووڵ ناگا، خاڵە مەحموود ناهێڵێ تۆڵەی نازدار بستێنم.

ـ تۆڵەی لە کێ دەستێنی؟

ـ بیهێشتبا، میزکەرم لێ دەبڕین، ژن و منداڵم نەدەهێشت.

ـ پیاو ژن و منداڵ دەکوژێ؟!

ـ ئەی چ بکەم؟ خۆی وەک دیل لە قەلا خزاندووە و کـەس ناتوانـێ زەفـەری پـێ بەرێ، چەکی پێیە، ئەوەی نزیکی قەلا بکەوێ، دەیداتە بەر گوللە.

ـ پەلە مەکە، ڕوژی خۆی گۆڕ دێنێتە گۆڕخانە.

ـ ئێستا ڕۆژیەتی، دەرفەت بێنێ هەلدێ و لە کیس دەچێ، هەر بینا هەلات.

ـ هەلدێ؟ بۆ کوێ دەچێ؟ ئەو قاتلە، هـەر نـازداری تـۆی نەکوشـتووە. سـەعیدی نۆکەریش ئەو کوشتی. بزانە، بە هەر لەونێ دەتوانی ژن و منداڵـەکـەی تێنـاگـەیـێنی، دەیگرین، لەم ڕۆژانەدا دەیگرین و مەحکەمەی دەکەین، با ئەوانیش لێرە بن.

ـ چۆن دەگیرێ؟ ئەو چەکی پێیە!

ـ دەی ئێمەش چەکمان هەیە، ئەو چەکدارانەت نەدیوە؟

ـ ئەوانە کێن؟

ـ دۆست و دلسۆزی من و تۆن، ئەوانەن کە هەمزەبەگ دەیگوت چەتەن.

ـ بلێی ڕەسووڵ بگرن و بیدەنە دەستی من؟

ـ ئائا، کاری ئەوان ئەوەیە، تۆلەی بێ زۆر لە زوردار دەستێنن، ئەرخەیان بە، دەیدەنە دەستی خۆت، چی لێ دەکەی بیکە.

ئەحمەد بەو بەلێنە ڕەنگی گۆڕا و گوڕوتین گەڕایە لەشـی. هـەر ئـەو ڕۆژە بـەرەو بژوێ وەڕێکەوت.

حەوتەیێکە، هەر شەوێک لە مالی بانگهێشتنیان دەکەن. ڕۆژی هەشتەم، مـەحموودی حاجی، تاهیر و پوورەگوڵەی برد و چوونە مالی مام حەسـەن. تـاهیر وەک دەراو تـاقی کاتەوە، خوازبێنی کەوێی درکاند. مام حەسەن بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ کەوابێ، دەبێ خۆ سازکەم قەرزەکەی حەمە بدەمەوە! ئاخر شەست تەغار گـەنم و دوو سەد و پەنجا تمەنی لای منە.

پوورەگوڵە هەلیدایە:

ـ ئەی ناکا بلێی چونکە باپیری کەوێم، دەیخۆم! بەر لە کەوێ، دەبێ خۆ بخورێنی.

ئەوەی بۆ پێکەنین گوت. هەموو قاقایان کێشا، مام حەسـەن گاڵـتەی وەلا نـا و لـە سەرخۆ گوتی:

ـ بەش بە حالی خۆم، حەمەم بەقـەت ئەحمـەد خـۆش دەوێ، و پوورەگوڵـە و کـا مەحموود ئیختیاری سەرومالیان هەیە، تۆش ئیختیاری سەرم، بە من بێ، بە کراسـەکـەی بەریەوە پێشکەشە. ئیزن بدە! بچمە لای کوێخا و پرسێکی پێ بکەم، ئاخر بابەتی، دەبـێ قایل بێ، دەزانم قایلە، بەو بوایە کار نەدەگەیشتە ئەو جێگایە بەڵام چـاری ناچـار بـوو، دەستێ زۆر بیبڕی، خوێنی نییە، تامڵ بگرن، بەیانی جوابتان دەدەمەوە.

هەر ئەو ڕۆژە مام حەسەن چووە مالی کوێخـا و باسـەکـەی درکانـد. کوێخـا ماوەیەک ماتبوو. پاشان گوتی:

ـ تۆ دەڵێی چی؟ پێت خۆشە؟

ـ ئەی بۆ؟ کوڕ لە حەمە و خزم لە مەحموود باشتر؟ ئەرێ وەڵلا، زۆرم پێ خۆشە.

ـ دەی باشە، تۆ پێـت خـۆش بـێ، دەیـدەمێ، بـەڵام بـە مـەرجێ لـە دێ نەیباتـە دەرێ،مەحموود بیانوو نەگرێ بیبا بۆ ئەودیو، خۆت دەزانی من زەلیلم، کەس شک نابەم، هەر کەوێنم هەیە، ئەوە ماڵ و مووچە و مەزرا، بە زاوابەنـدی بێتـە سـەر مـاڵ، وا نـەبێ، نایدەم.

مام حەسەن خۆی گیف کرد و توند گوتی:

ـ من تێدا نیم! کچ وا بە مێرد نادەم، ئەوە قسە نییە، کابرا کـاری وا ناکـا، نابێتـە زاوا ڕێوی، ئەویش بیکات، من نایکەم، کوڕ ژنی هێنا و کچ مێردی کرد، کوێیان پێ خـۆش بێ، لەوێ دەبن.

ـ ئاخر.

ـ ئاخری ناوێ، ئەی لێرە بێ بۆ قسەی ئەم و ئەو؟ جوان بیر بکەوە، چـاو لـە ئێـستا مەکە، سبەی ڕۆژێ هەمزەبەگ دەسەلات بکەوێتەوە دەستی، پشیلە لە دەرپێمان دەخا و قالۆنچە لە چاومان دەبەستێ، بە زۆر لە حەمەی رادەکێشێ، مەگـەر ئـەو جـارە بـە زۆر نەبوو؟ بە من بێ دەیدەمێ، نەشڕوا، دەبێ بڕوا، بڕوا باشترە، ئاو دەکرێ بە ئاوردا.

لەودەمەوە ئەوان قسە دەکەن، کەوێ لە پشت دەرکەوە گـوێی لێیـە، دوو گـۆزەی دەست دایە و کرژ لە حەوشە چووە دەرێ، بە بیانووی کانییەوە، بە بـەر دەرگـای مالـی باپیریدا ڕۆیشت و مینای تێگەیاند بێ بۆ کانی:

ـ میناگیان! بزانە حەمە نابینی، بلێ کار تەواوە، بابیشم رازییە، بەڵێنی بـە بـاپیرم داوە بمدا، مزگێنی لێ بستێنی.

ـ ئەی خۆت؟ مزگێنی خۆت چییە؟
ـ تۆ چت دا بە من، منیش دەتدەمێ.
هەر دوو بە پێکەنین گەڕانەوە. دەمەو نیوەڕۆ. مینا مزگێنی بە حەمەدا، حەمە بەڵێنی دایە بە سەر جلی بووکەوە کراسێکی بۆ بکڕێ. لە دواییدا بە مینای گوت ئەگەر چاوت بە کەوێ کەوت، بڵێ، ئەگەر شەوێ کەیخودا هات، دێمە سەربان. کەیخودا بە مەلاوە لە ماڵی کوێخان، دیوە خان پڕە، کوێخا لە سەر جێ پاڵی داوە بە سەرینەوە، چرەوگورەیە لە سەر مارەیی و گوڵ و گوارە و جیازی، مەحموودی حاجی بە قسەیەک هەموویانی بێ دەنگ کرد:
ـ باشە، بە چاوان، ئەوەی مام حەسەن و کوێخا بڵێن، لە سەر سەرم، لە سەر چاوم، بەیانی شیرنی دەخۆین و مارەی دەکەین.
تێکرا بە دەنگی بەرز گوتیان:
ـ مەبارەک بێ، پیر و غەڕە بن.
دەنگی مەبارەکبایی هێندە بەرز بوو، حەمە لە سەربان و کەوێ لە بەر کولاوکەی نێو ماڵەوە گوێیان لێبوو و پیرۆزباییان لە یەک کرد و بە دڵ بەدەم یەکەوە تریقانەوە.
بەیانی زوو، مەحموودی حاجی، پیاوی بە پوولەوە نارد بۆ شار کەلوپەلی پێداویست بێنێ. لە قاوەڵتووندا، مام حەسەن هاتە ماڵی پوورەگوڵە و لەگەڵ مەحموودی حاجی دانیشت؛ دەستی کرد بە باخەڵدا:
ـ کاک مەحموود! ئەوە دووسەد و پەنجا تمەنی حەمەیە لە پوورەگوڵەم قەرزکردبوو. شەست تەغار گەنمیشە، ئەویش لە چاڵدایە، بە کوڕەکانم گوتووە دەریهێنن، ئەویش بکە بە پووڵ، بە کەروبار و پیاوی خۆم بۆت دەنێرم لە شار بیفرۆشن.
مەحموود بە پێکەنینەوە، دەستی نا بە پوولەکەوە و نایەوە بەردەمی، دەستی کرد بە پشت جێوبانەکەی پشتەوە و خورجینێکی دەرهێنا، دەرگای ئاواڵە کرد و نایە بەر دەمی مام حەسەن:
ـ مامەگیان! ئەوە هەمووی پوولی تۆیە، دەمەوێ بە ماڵی خۆم بووک بگوێزمەوە، ئەوە پوولی حەمەیە، کەیفی خۆیەتی، چی لێدەکا، بیکا ئەوە با لە لای تۆ بێ.
ـ نا، نەوەڵلا، خۆم مواخیزەی کەس ناکەم، دەست دەست دەناسێ، لە کێم وەرگرتووە، دەیدەم بەو.

پووله‌که‌ی داوه به پووره‌گوله.

دوانیوه‌ڕۆ ژن و پیاو له ماڵی کوێخا کۆوه‌بوون، شیرینی خواردنه. شه‌وێ له ماڵی پووره‌گوله نانی که‌یخودا ساز کرا. دوای شێو، چوونه‌وه ماڵی کوێخا. مام حه‌سه‌ن بوو به وه‌کیلی کوێخاکه‌ریم، مه‌حموود وه‌کیلی حه‌مه‌یه، که‌وێ له سه‌ر دوو ده‌ست جل و گوڵ و گواره و کرمه‌ک و چوار تا بازنه‌ی زێڕ و حه‌وسه‌د تمه‌ن پووڵ له حه‌مه ماره کرا. به‌ر له‌وه‌ی ماره‌ی که‌ن، بابی زاوا گوتی:

ـ که‌یخوداکان! مام حه‌سه‌ن! کوێخاکه‌ریم! من ماڵم له‌و دیوه، کوڕ و کچم، ژن و ماڵم له‌وێیه، بووکی خۆم ده‌به‌مه ئه‌وێ، پاشه ڕۆژ پیاو خراپم نه‌که‌ن.

مام حه‌سه‌ن هه‌ڵیدایه:

ـ بووکی خۆته، بۆ کوێی ده‌به‌ی، بیبه، مه‌باره‌کت بێ، که‌س ده‌س ناهێنێته ڕێت.

دیسانه‌وه دوو به‌ره‌کی و مشتومڕ له نێو ژناندا ژیایه‌وه:

ـ که‌وێ بێوه ژنه! بێوه‌ژن هه‌یبت و هووتی ناوێ، هه‌ر شه‌وێ به دزییه‌وه ده‌یگوێزنه‌وه.

ـ که‌وێ کچه، به کچیه‌تی هاتۆته‌وه، بێ عه‌یبه، له ئاوی شه‌وێ پاکتره، عه‌تا پیاو نه‌بوو، پیاویش بوو بێ، ئه‌و خۆی به ده‌سته‌وه نه‌داوه، ده‌بێ به قه‌در و حورمه‌ته‌وه، به‌زمی بۆ ساز که‌ن.

ئه‌و به‌ر به‌ره‌کانێیه دڵی ژنانی کرمێ کردووه. نازه‌نین دایکی که‌وێ، ڕوو له هه‌ر ژنێ ده‌نێ ببێته پێخه‌سوو، خۆ له قه‌ره‌ی ناده‌ن، ده‌ترسن کچ نه‌بێ، پووره‌مان جاری پێشوو پێخه‌سوو بوو، ده‌یزانی چ باسه، چووه لای نازه‌نین و به‌ڵێنی دایه پێخه‌سووی که‌وێ ده‌بێ.

پازدەی دووهەم مانگی پاییز جلی بووکێنی کرایە بەر کەوێ. ئەحمەد فەڕاش ئەو حەیس و بەیسەی ژنانی بیستبوو. لەودەمەیدا بووک هاتە دەرێ بە هەوای بووک گواستنەوە نەرم و حەزین، بە دڵی بریندارەوە دەستی پێکرد:

خەمی خۆمە و دەردی شۆڕێ
ترسی زاڵم لێم ناگەڕێ
لە سەر باڵات بیکەم شەڕێ
پایزە لە من، درەنگە لە تۆ
سوور دەبێ نارنج، زەرد بێ لیمۆ
خەمی خۆمە و دەردم دوان
ڕەنگە زەردەی تۆ وەک مردوان
بۆ چۆڵت کرد لێم جێژوان
پاییزە لە من، درەنگە لە تۆ
سوور دەبێ نارنج، زەدە دەبێ لیمو

بووک بەو هەوایە نەرم نەرم لە ژێر تاراوە دەگری. ئەحمەد فەڕاش لەگەڵ هەر بەندێ، دڵۆپی فرمێسک لە چاوی خولۆر دەبنەوە. ئەوەی گوێی لە دەنگییەوە و دەردی دەزانێ، بە هەوای گۆرانی چەپڵە لێ دەدەن و دەگرین. بێ ماندوو بوون و پشوودان تا دەرکی ماڵەکەی پوورەگوڵە، یەکبین نەیبڕییەوە.

بووک چووە ژوورێ و خەڵک بڵاوەیان کرد. شەو ڕۆیشت، ڕۆژ هاتەوە. بەر لە تاوکەوتن، پوورامان بە پرێسکەوە، سەر بەرز گەڕایەوە ماڵی کوێخا کەریم.

## ٣٠

ئەودەم کە تازە قەڵای جێ هێشتبوو، سێ جەمە و جێ خەوی چایخانەکەی حاجی رەشید بوو. کە حاجی چووە بنجوبناوانی و لە مەبەستی گەیشت، زانی کار لە کار ترازاوە و چوونەوەی ئەستەمە، بەرە بەرە خۆی لێ نزیک کردەوە و نێوانی لەگەڵ خۆش کرد. دواندی، دواندی تا لە مەرامی گەیشت.ئەمجار نەیهێشت لە چایخانە بنوێ. بردیەوەماڵێ. شەووڕۆژ، بیست و چوار سەعاتە، دەستی بە دەستییەوە و ئاو بێ یەک ناخۆنەوە؛ بە هەموو سڕو نهێنییەکی یەک دەزانن.

لە هەوەڵەوە، حاجی بە پارێزەوە دەیدواند، هەموو قسەیەکی بە لاوە نەدەکرد. عەتا وەک ساویلکەیەک، ئەوەی دەیزانی، پاک و بارەئاشی، چی لە دڵیدا بوو و دەیزانی، بۆی هەڵڕشت. باسی خۆی و کەوێ، کوشتنی زارا، ناجسنی رابردووی، چوونە سەر جێی ژنی خەڵک و بێحورمەتی بە ناموسی ئەم و ئەو، لەودەمەوە چەپ و راستی خۆی ناسییەوە، ئەوەی کردوویە، وەک تاوانباری خاچ پەرست کە لای قەشە، دان بە تاوانەکانی خۆیدا دەنێ، بێ کەم و زیاد بە لای حاجییەوە باسی کردوون، وەک کردە پەشیمانێ، خۆی بە نفرە دەزانێ. ئەوەی کە زۆرتر رەوانی جەزرەبە دەدا، لە یەککردنی کەوێ و حەمەیە. هێندێ بەوەی دڵخۆشە کەویی بە کچێتی تەڵاق داوە. شەوێ دە جار لای حاجی گوتوویە: کەوێ بووە هۆێ نەجاتم، ئەو قسانەی ئەو بووە هۆی ئەوەی رێ بە کاری خۆم

بەرم. ئەو رێی ژیانی راستەقینەی نیشاندام. دەڵێن گیا لە سەر ڕەگی خۆی دەڕوێ، من ئەو ڕەگە دەبڕم وشکی دەکەم و پەیوەندی مرۆڤایەتی لێ دەدەم، پەیوەندی خۆشەویستی و خۆشویستن، پەیوەندی دڵ پێوە بوون. لە خەمی ئینساندا بوون، هەستی پێکردنی دەرد و ژان، وێڕای خەڵک شادی، وێڕای ئەوان خەم خواردن و سووتان. ئەرێ ئەرێ، دیومەتەوە، پێشانیداوم، کەوێ ڕێنوێنی کردووم، رێی ژیانی پێ گوتووم، رێی ئینسان، وەک ئینسان ژیان و وەک ئەوان مردن.

هەرچی لە دڵەوە بێ، بە دڵەوە دەنووسێ. حاجی، وتەکانی عەتای بە دڵەوە نووساوە، بە دڵ باوەڕی پێیەتی. هێور هێور، هەر شەوێ مەبەستێ، هەر مەبەستێ چەند وشە، هەر وشەیەک ئاماژەیەک، بڕبڕ و کوت کوت، هەر بڕ و کوتێ لە قۆناخێکەوە تا گەیاندییە تاهیر و هەڵوێست و ڕێباز و ویستی ئەو. چی لەو بارەوە دەزانی، یەکە یەکە بۆی شیکردۆتەوە. عەتا وەک لایەنگرێ تامەزرۆی چاو پێکەوتنی تاهیرە. بڕیارە بەیانی بۆ چاوپێکەوتنی بەرەو کانی توو وەڕێکەون. بەڵام نەک ئاشکرا، بە دزییەوە چاوپێکەوتنێ لەگەڵ تاهیر و بەس.

نیوە شەو کە حاجی وەخەبەر هات، عەتا لە جێدا نەمابوو! خۆی کۆکردەوە، کرژ پەڕییە دەرێ. لە سەر یەکەم پلیکانەوە ڕوانییە تاریکانی حەوشە، هیچی وەبەر چاو نەهات. لە جێوە سەبرێ بانگی کرد:

عەتابەگ! عەتاگیان!

لەوسەری حەوشەوە، عەتا جوابیداوە. حاجی بەرەو شوێنی دەنگی، پێ‌پێ، وەڕێکەوت، لە سەرەخۆ چووە پشت سەری و وێستا.

عەتا، خەیاڵاوی لە سەرکۆتەدارێ دانیشتووە و ئەژنۆ لە باوەش، چاوی بڕیوەتە ئەوپەڕی تاریکە شەو. حاجی، بە ئەسپایی، وا کە دانەچڵەکێ، دەستی نایە سەر شانی، بە لەبزێکی شیرین دواندنی:

ـ گەمییەکەت نوقم نەبێ!! بیر لە چی دەکەیەوە؟ عەتا بێ ئەوەی چاو لەو شوێنە نادیارە بگوازێتەوە، هەناسەیەکی هەڵکێشا:

ـ دەزانی ئەو حیز بابە عەلیلەی کوشتووە؟! بلە سوور دەڵێم.

ـ چووزانی؟

ـ چاک دەزانم، بە سەعاتەکەیرا! ئێوارە لە چایخانە دیتم، سەعاتەکەی عەلیلە بوو لە دەستیدا، ناسیمەوە. حاجی بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ عەجەب بەڵگەیەک!! خۆ هەر ئەو سەعاتە نییە، سەد کەس سەعاتی هەیە.

ـ نا، من دەزانم، ئەو سەعاتە باش دەناسمەوە. سەد جارم دیوە، ناونیشانی هەیە، دیارە، دەستە کۆکەکەی دیارییە، خۆم دەیناسمەوە، ناسیمەوە، وەک شتی خۆم دەیناسم. سالە وەختێ، ئەوەندەی عەلیلەم دیبا، بۆ گاڵتە سەرم دەخستە سەری و داوای ئەو سەعاتەم لێدەکرد، ببوومە کڕیاری، دەمگوت کەس سەعاتی هێندە جوانی لە دەستا نییە. ئەویش زۆر بەوە لە خۆبایی دەبوو. خۆی گیف دەکرد، چاوەکانی زیت دەبوونەوە، سوور هەڵدەگەڕا، بە شەرمەوە دەیگوت:

ـ ئاغا گیان! قابیلی ئێوەی نییە، هەر وا پێشکێشە، بە فرۆشتن نایفرۆشم. چەندەی شایی بەو سەعاتەی بوو!! هەر کەسی دیبا، چەشنێ دەستی رادەگرت، چاوی بە سەعاتەکەی کەوتبا، خۆی پێوە دەنواند، وەی دەزانی دنیای هەیە. دەزانم ئەوە سەعاتەکەی ئەوە. ئەو رۆژە کە لەگەڵ مِن هاتن بۆ شار، بەیانی عەلیلە کوژرا و بلە ونبوو! دوو برنۆی قەڵاشی رفاندووە، هەر کاری ئەو سەگەیە، چۆن بزانین؟ خۆزگە دەمزانی و لێم ئاشکرا دەبوو.

ـ جا ئەوە چییە، بە کۆڵی شێرەوە نییە، پاش دوو سێ رۆژ بۆت ئاشکرا دەکەم، با تاهیر ببینین، وەبیرم بخەوە، بەوی راگەیێنین، خۆی چاری دەکا. رەنگە بیگرێ، زۆر کاری دیکەش ئاشکرا بێ، رەشە دز و پیاوکوژی ئەم ناوە هەر ئەوانەن. هەستە، بەیانی وەخەبەر نایێین، هەستە بڕۆین بنوین.

رۆژێ پێشتر، حاجی بە مەحموود شواندا هەواڵی چوونی خۆی و عەتای بۆ تاهیر ناردووە. شوێنی چاوپێکەوتن هەزار ئەشکەوت، دۆڵی بەردە دەنگدارەیە و کات قاوەڵتون تا نیوەڕۆ.

هەر ئێوارە، حاجی دوو چارەوێی لە کاروانچی بە سۆغرە گرتووە. بەیانی، بەر لەتاوکەوتن، عەتا و حاجی چوونە کاروانسەرا و چارەوێیان دەرکێشا، جووتە سوارە لە شار وەدەرکەوتن.

بێ ئەوەی خۆ لە قەرەی خەڵک و ئاوەدانی دەن، کێو بڕ، کەندوڵەند، بەرزی و نزمی دەبڕن. حاجی لە پێشەوە ئاوڕیداوە، ویستی هاوسەفەرەکەی بدوێنێ. کە

زانی عەتا نوقمی خەیالە، بۆ ئەوەی هەودای رایەڵەی خەیاڵی ئاڵۆز نەکا، وازی لێ هێنا و نەیدواند، بەڵام هەروا تێی راما و سەرنجی دایە روخسار و بزووتنەوەی شان و مل و سەروچاوی. جار جار، وەک ئەوەی بدوێ، لێو دەبزوێنێ، بزەی دێتێ!! برۆکانی قیل و قاچ دەکا و نێو چاوانی پڕ دەبێ لە گنج! سەر تەکان دەدا و رایدەوەشێنێ! مل کەچ دەنێ بە لارەوە و شەرمەزار، چاو دادەخا، دەڵێی جار جار تاوانبارە و قازی مەحکەمەی دەکا! جار جاریش قازییە و تاوانبار مەحکەمە دەکا! جەنجاڵ و ئاڵۆزە، لەگەڵ دەروونی تێوە چووە، ویژدانی مەحکەمەی دەکا!

جوابی دەداتەوە، دەیهەوێ رازی بکات و رازی نابێ:

ـ بۆ کوێ دەچی! بەو رابردووە جوانەتەوە دەتەوێ وە خۆت گرن؟!! ئەوانیش وەخۆت گرن، بە تەمای حەمە چاوپۆشیت لێ بکات؟! ئەی ئەو هەموو زوڵمە؟! دەربەدەرت کرد، دەسگیرانیت داگیرکرد،ماڵیت تالان و سووتاند، چا چت نەکرد؟ بە تەمای چاوپۆشیت؟ باوەڕ ناکەم!! من بووبام، نەمدەکرد.

ـ بۆ باوەڕ ناکەی؟ ئەوە نییە کەوێت بە کچی داوەتەوە! لەوە زیاتر؟ ئەوچی دەوێ؟ جگە لەوەش، ئەویش لەتۆی داوە، ئەویش ئەو لێدانە!! دەردێکی نەداویەتێ دەرمانی بێ. ئەوەت پێ کەمە؟

ـ دەی خۆ ئەوە تاوانی ئەو نەبوو، من شەرم بەو فرۆشت، دەبوو بیکوشتبام، من بووبام، ئەوم دەکوشت، بۆم نەکرا، دەنا دەمکوشت و وەک بەفرەکەی پار دەچوو.

ـ کای کۆن بە با مەکە، هەرچی بوو، چوو و رابرد، هەموو کەس هەڵە دەکا، باوەڕ ناکەم وا بیر بکەنەوە، هەر نەبێ، تاهیر وا بیر ناکاتەوە، هەر ئەو حەسابە.

ـ ئەگەر تاهیر وەخۆی نەگرتی چی؟

ـ دەی سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم.

ـ وەڵڵا پیاوێکی دووبادی!! تۆی دەست و پێ سپیلکە چت لە دەست دێ؟ بە کامە هونەر و تواناوە؟ لە برسان بمری، نانێکت پێ پەیدا دەکرێ؟ هەر لە برسان دەمری. خودا بتکا بە قوربانی ئەو حاجییە، ئەگەر ئەو نەدەبوو، دەمزانی چت بە سەر دەهات! دەبوو هەڵوەدا بی، یان چووبایەوە لای بابت و داوای لێبوردنت کردبا!! دەزانم ئەوکارەت نەدەکرد، کێ لەو تاوانە خۆش دەبێ؟! ئەگەر وابێ،

تاوانێکیگەورەیە، ڕەنگە واش نەبێ، هەر تۆ وکەوێ دڵ کرمــێ بــووبێتن، ئەگــەر وابێ، بۆ چاوپۆشی نابێ، نا نا، هەرگیز، هەرگیــز، ئەگــەر ڕاســت بــێ لــە دڵــت دەردەچێ؟

ـ باسی مەکە، وە بیرمی مەخەوە، برینی دڵم مەکولێنەوە، بۆ خــستتەوە بــیرم؟ برینم هاتەوە سۆ.

ـ زۆر ناخۆشە؟! ئەی چۆن بە سەر نامووسی کەسەوە نەدەچووی؟ یانی ئــەوان نامووسیان نەبوو؟! یان ئەودەم خۆت نامووست نەبوو؟ با با دەســەلاتیــان نــەبوو، ئێستا بۆیان هەلکەوێ بە سەرتەوە ناچن. بە قسەم دەکەی خۆ لە قەرەیــان مــەدە، خۆ لە داڵدەی کەس مەدە، خۆ بخە داڵدەی تاهیر، ڕەنگە بە تکای ئەو لێت خــۆش بن، ئەگینا، دەبێ هۆشیار بی، هۆشیار بە، تۆڵەت لێ دەستێنن!! دەســتی تۆڵــە بــە هێزە. ـ عەتابەگ! نەکەوی! هۆشیار بە.

دەنگی حاجی، عەتای وەهۆش هێناوە، ئەگین ئەو نەبایە، ئەو ســەرەنگرێیــەی چارەوێ بەستی، عەتا لە چڕ و هەڵەمووتی هەزار ئەشکەوت هەڵدەدێرا، خۆی بــە مل و یالی چارەوێدا هەلواسی. بەر لە زەویکەوتن. حــاجی گەیــشتێ و لەنگــەری گرت. عەتا، ڕەنگ پەڕیو و چەواشە چۆوە سەر ماڵی زیــن و شانبەشــانی حــاجی چوون بە رووکاری بەردە دەنگدارەدا.

حاجی لە دوورەوە تــاهیر و دوو هاوڕێکــەی دی. وەک ئامۆژگــار ڕووی لــە عەتا کرد:

ـ تاهیر و ئــەوان هــاتوون. خۆکۆکــەوە، بــۆ هێنــدە مــاتی؟! ئــەوان پیــاوی ڕووخۆش و دەم بە بزە و زیرەکیان خۆش دەوێ، قوت و وریا بە. هێنــدێ ســەرو پۆتراکت ڕێکوپێک کە، تەماشا! لێوت باری لێ نیشتووە! دەلــێی کۆســتکەوتەی! گنجی نێو چاوانت شەڕی لێدەبارێ! هێندێ ڕوو خۆش ودەم بە بزە بــە، وەبزانــە ناسیاون و سەد جارت دیون. تاهیر کوڕی چاکە، زوو لێت حاڵی دەبێ، کاری بــە ڕابردووی تۆ نییە. حەز بە خوێندەوار دەکا، پێی خۆشە خوێنــدەواری زۆر لەگــەڵ بێ، خۆت بنوێنە، با وەربەر چاوکەوی، باش بچییە بەر چاو، دەچییە دڵیەوە، هــەر هەوەڵ بە دڵی بی، لە سەر سەرت دادەنێ. مەترسێ! وره بە خــۆت بــدە، خــۆت لا کەم نەبێ! کوڕی وەک تۆ کوا؟

عەتا وەخۆکەوت. خۆی ریکوپێک کرد. باری لێوی بە زمانی خووساند. دەسرۆکەی بەر پشتوێنی دەرهێنا و لێوی سڕی. ورەی بە خۆیدا و قیتوقۆز لە سەر زین قیتبۆوە و وەک و دودەکەوتە زیتە زیت. لێوی لە ژێر سمێلە خورماییەکەیەوە وەبزەکەوت. گەیینە بەردەکە، چوست و چالاک خۆی هاویشتە خوارێ، دلێرانە گوتی:

ـ من عەتام! کوڕی هەمزەبەگی تازاوا، ئیزنم هەیە کاک تاهیر زیارەت کەم؟!

تاهیر بەرەو پیری هات، باوەشی گرتەوە:

ـ مادام ویستی تۆ ئەوەیە، پێت لە سەر چاوی تاهیرە.

یەکیان لە ئامێز گرت. سارۆ و رەشۆ، نۆرە نۆرە ماچیان کرد، حاجیش وەک ئەو. تاهیر، دەستی عەتای گرت و بەرەو بەردەکە گەڕانەوە:

ـ رەنگە کاک حاجی بۆی باس کردبێتی؟ رێگایەکمان لە پێشە دژوار و پڕ لە هەڵسوکەوت. ئەمڕۆ لێرە و سبەی لە لایەکی دی. حەسانەوەمان نییە. هەوڵ و تێکۆشان دەرەتانی سەرخواران نادا. ئەوانە هەمووی لە پێناوی بیروباوەڕماندایە و خۆمان لە پێناوی رێبازماندایـن. هەموو ئینسانێکی باش خۆشەویستی ئێمەیە، هەموو خراپێ دوژمنمانە، جا هەر کەس بێ، شەڕمان لەگەڵ خراپە، بابی من، یان بابی تۆ، هەر کەس بێ، خراپ خراپە، مەبەستم زاڵمە؛ زاڵم، زاڵمە، فەرقیان نییە، ئامانج لە ناو چوونی زۆردارە، بۆ لە ناو چوونی زۆردار و بەرەو پێش بردنی ئەو ئامانجە، هەر کەس هەنگاو هەڵێنێ، دۆست و خۆشەویستی ئێمەیە، هاوڕێمانە، لە خەم و شادیمان شەریکە جا هەر کەسێ هەیە، هەژار، یان دەوڵەمەند، ئاغا، یان رەعیەت. ئەمڕۆ ئێمە لە سەرێین، رەنگە بەیانی وەژێرکەوینەوە، لەوانەیە نان نەبێ بیخۆین. زۆر جار، شەوێ لە بنە بەردان، بێ پێخۆر و پێخەف رۆژ دەکەینەوە. دەکەوینە گەمارۆی دوژمنەوە، تەنانەت دەکوژرێین، بۆ ئامانجی خۆمان، بۆ بیروبڕوای خۆمان دەکوژرێین، فیز بە سەر کەسدا لێنادەین، مووچە خۆری کەس نین، چاوەڕێی نین سبەی رۆژ خەڵک قەرەبووی کاتەوە، نا، ویستی خۆمانە، کەس لە دووی نەناردووین خۆ بە کوشت بدەین. کورتوکرمانجی،

نۆکەری بێ خەڵات و بەراتین، زۆر جار نانیشمان نادەنێ، راپۆرتیشمان لێدەدەن. ئەوەیە رێبازی ئێمە.

جا نازانم، کاک عەتا ئەو بارە قورس و گرانە دەگرێ بە کۆڵەوە؟ یان رقی هەستاوە و لەماڵێ زیز بووە؟

عەتا چاوەشینەکانی پڕ بوون لە ئاو، بە دەنگێکی لەرزۆک و دڵی پڕەوە گوتی:

ـ چ پیرۆزە ئەو رێبازە! گیان لە پێناوی ئامانجا!! منیش دەتوانم بەختی کەم؟

در ره او چو قلم گەر بی سەرم بایدرفت

با دل زخم کیش و دیده گریان من روم

تاهیر دیسانەوە عەتای گرتەوە ئامێز:

ـ پیرۆز بێ رێبازی نوێت. هەر دەمایەک پێویست بێ هەواڵت دەدەمێ و لەگەڵمان کەوە.

عەتا بەو وتەیە رەنگی گۆڕا و ماتبوو. لە دڵەوە گوتی:

ـ نەمگوت! وەخۆم ناگرن! باوەڕم پێ ناکەن.

تاهیر لە رواڵەتی عەتای روانی، لە دەروونەوە گوتی:

ـ ناوێرم! پوورەگوڵە و حەمەم لێ دەتۆرێن، با بیاندوێنم.

دەستی خستە سەر شانی عەتا، بە پێکەنینەوە گوتی:

چییە! دڵمەن بووی؟ دڵمەن مەبە، رەنگە بەیانی، یان چەند رۆژێکی دی هەواڵ بنێرم، لە ئێستاوە لە ریزی ئێمەدای، لەوبارەوە ئەرخەیان بە، ئاواتە خوازین هی وەک تۆمان زۆر بێ، شانازی دەکەین. عەتا رەنگی هاتەوە سەرخۆ و بزە وەلێوی گەڕا. لەودەمەدا عەلیلەی هاتەوە بیر و باسی هێنایە گۆڕێ.

حاجی بڕیە بەر خۆی:

ـ بلە سوور لەو رەشە دزانەیە کە رێگری و پیاوکوژی دەکا، عەتادبەگ شکی لێیەتی کە ئەو عەلیلەی کوشتووە. لەوماوەدا کە ئەو و عەلیلە لەو ناوقەدا بوون، زۆر کەس کوژراون، من گومان و باوەڕم وایە لە کوشتنی عەبەشدا دەستی هەیە، دەستیشی نەبێ، هەواڵی هەیە، رام وایە بیگرن و مەحکەمەی کەین، رەنگبێ بێ دەسکەوت نەبین.

تاهیر، وەک ئەوەی هەواڵێکی خۆشی پێ درابێ، لە جێ ڕاپەڕی:

ـ خۆش مزگێن بن! لە مێژ بوو تەماداری ئەوە بوم، بەڵگەی چاکە، پوورەگوڵەش هەر ڕای وایە کوشتنی عەبە و فەیزە و عەلیلە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، ڕای منیش هەر ئەوەیە، ئەو بلە سوورە مەوتەنی کوێیە؟

حاجی جوابی داوە:

ـ ژن وماڵی نییە، شەوانە لە ماڵی خوشکی دەبێ، من ماڵەکەیان دەزانم.

ـ کە وابێ هەر ئەمشەو دەنێرم بیگرن، ئێوە کە چوونەوە بیخەنە ژێر چاوەدێری، وەبزانن شەوێ گیراوە، ئەگەر قسە و باس نەماوە، با بڵاوەی کەین.

تاهیر و هاوڕێکانی بەرەو کانی توو، حاجی و عەتا بەرەو شار سوار بوون و لە یەک جیا بوونەوە.

هەر کە تاهیر گەیشتەوە کانی توو، چووە ماڵی پوورەگوڵە، حەمە و کەوێی تێگەیاند و بە وردی باسی بلە سووری بۆ گێڕانەوە. پوورەگوڵە وەک ئەوەی خۆی لەگەڵ بوو بێ، نووسا بە سوێندا کوشتنی عەبە کاری بلەیە. هەر ئەو دوانیوەڕۆیە، تاهیر، ڕەشۆ و کاوە و نامیقی نارد بۆ شار بلە سوور بگرن، بەڵام سەبارەت بە عەتا، تاهیر بە لای پوورەگوڵەوە هیچی نەگوت، هەر بە لای حەمە و هاورێکانی دیکەیەوە درکاندی. حەمە بە بیستنی ئەو هەواڵە لە سەر ڕاوەشانێ پتر، هیچی نەگوت. کوێخا شەریف لە خۆشییان شاگەشکە بوو و زیادە لە هەموویان پیرۆزبایی بە تاهیر گوت.

شار وەک دێ دو بەرەکی و ئاڵۆزی تێدا نییە. ئاغاوات دێیان جێ هێشتووە و خۆیان لە شار و ماڵە خزمی شاری خزاندووە. ئەمنییە و ئاژان کەمتر دێنە شەقام و نێو شار، ئەگەر بشێن، وەک بێ لایەنێ کەرەستەی خۆیان دەکرن، ئیتر خۆ لە کاری خەڵک هەڵناقورتێنن و کەیخودایی ناکەن، کەسیش خۆ لەوان ناگەیەنێ و نایانحەبێنن.

بەینی عەسر و ڕۆژئاوا، حاجی و عەتا گەیینەوە چایخانە، بلە سوور لەوێ بوو. عەتا تەماشایەکی ماناداری حاجی کرد! حاجی بە ئاماژەی چاو عەتای تێگەیاند نەیهاروژێنێ. ناچار ملی نا بە لارەوە و چووە قوژبنێ دانیشت.

ڕۆژئاوا بوو، بلە وەدەرکەوت. دوا بە دوای ئەو. حاجی ونبوو، کە گەڕاوە، سێرە هەڵگیرا بوو. هەر لە دەرگاوە، بە ئاماژەی دەست عەتای بانگ کرد و بە جووت ڕۆیشتن. کە چوونەوە ماڵێ، ڕەشۆ و نامیق و کاوە لەوێ بوون. پاش شێو، حاجی گوتی:

ـ بە تەماڵم خستووە! تا چۆوە ماڵێ، بە دوویەوە بووم. کوڕە! بلە زۆر بێ ڕەزایە! دەبێ کارێ بکەن دەست نەکاتەوە، دەستی بە چەک بگا، سەگی نووستوە وەخەبەر دێنێ، ئەمنییە و ئاژان لە بیانوون، ڕیشەکەمان لێ دەکەنەوە بە خوری، زۆر بە پارێز بن.

نامیق گوتی:

ـ کاک حاجی! لە پێشدا، دوو بە دوو دەچین، چاوێ لە دەر و دیوار دەکەین و وڵات تاقی دەکەینەوە.

حاجی و نامیق وەدەرکەوتن. پاش ماوەیەک گەڕانەوە. نامیق پیلانی ڕشت:

ـ کوڕینە! کەلێنێ لە دیواری حەوشەدایە، لەوێوە یەکمان دەچین و دەرگا دەکەینەوە دوانمان دەچینە بەر دەرکی ژوورەکە، ئەوەی لە دەرێیە، لە دەرگا بدا، بێ گومان ئەو بازرەیە و لە خۆی دەترسێ، هەر ئەو دێتە دەرێ، هەر کە سەری وەدەرنا، لە ملا و ئەو لاوە لوولەی تفەنگی لە سەر ڕاگرن و بیهێننە دەرێ، ئەوە باشترین پیلانە.

سێ چەکدار بە کۆڵانی شارداگەیشتنە دەرگای ماڵی خوشکی بلە سوور. ڕەشۆ بە کەلێندا چووە حەوشە و دەرگای کردەوە. کاوە چووە ژوورێ، بە جووت چوونە بەر دەرکی ژوورەکەو ئەمبەر و ئەوبەری دەرکەیان گرت. نامیق بە توندی لە دەرگەی دا. بلە، دەست بە بڕنۆ، کرژ هاتە دەرێ. سەری وەدەرکەوت، دوو لوولەی بڕنۆ لەم لا و ئەو لاوە نووسان بە ملیەوە:

ـ نەبزووی! چەکەکەت دانێ. بلە، گێژ و وڕ چەکی لە دەست کەوتە خوارێ و ڕەشۆ هەڵیگرتەوە. کاوە، بلەی وەپێش‌دا. نامیق بەرەو ڕەشۆ هات و بە جووت چوونە ژوورێ.

ماڵێکی ڕەش و ڕووت. دوو کیژۆڵەی حەوت هەشت ساڵە لای ژووورووی ماڵ، لەبەر دوودەست نوێندا، هێندێ ئاڵا و چیلکەیەکیان بە دەستەوە، خەریکی بووک دروست کردنن.

پیاوێکی نەخۆش، کز و لاواز لە سەر جێیە، هەر چاوی زیندووە. ئافرەتێک لەو لای نەخۆشەکەوە خەریکی پینە و پەڕۆی پاتۆڵە کۆنێکە، بە سام و هەیبەتێکی شێرە ژنانە نێو چاوانی وێکهێناوە، وەک مێشێکی میوان نەبێ، لە جێ نەبزوا، چاوی بڕییە نامیق و ڕەشۆ، دلێرانە گوتی:

ـ ئەوەی دەتانویست، گرتتان، چتان دەوێ؟ ئەوەش ماڵەکە، ڕەش و ڕووتە! نامیق لە شەرمان سوور هەڵگەڕا. ڕەشۆ شەرمێونانە گوتی:

ـ بلە دوو بڕنۆی هەیە، ئەوی دیکەیان کوا؟

ـ بە هیوای هەستم بیدەمە دەستت؟! خۆتان بگەڕێن. کیژۆڵەکان لە بەر ئەوەی کایەیان نەشێوێ، یەکیان گوتی:

ـ لێرەیە، لە پشت ئەم نۆێنەیە، خۆت وەرە دەریهێنە.

ڕەشۆ نوێنی لابرد، دوو ڕیز فیشەکدان و بڕنۆیەک وەدەرکەوت. نامیق هەر وا وەستاوە و چاو لەو ئافرەتە بە سامە دەکا، ئەویش ورد ورد پینەی پاتۆڵەکۆنی وەبەرتەقەڵ داوە و سەر هەڵناهێنێ. ڕەشۆ بڕنوو وفیشەکدانی کرد بە شاندا و قۆڵی نامیقی گرت و هاتنە دەرێ.

ئەودەمەی بلەیان هێنایە دەرێ، حاجی و عەتا لە پەنا دیواری ئەو بەری کۆلانەوە بەرەو ماڵ گەڕانەوە.

لەدەم بەیاندا بلەیان قۆڵبەستە گەیاندە کانی توو و لە دیوی بزنەکانی پوورەگوڵەیان خست. پاش تاوکەوتن، لە قاوەڵتووندا، تاهیر کەیخودا و مەلای لە مزگەوت کۆ کردەوە، سارۆ و قادر، بلەیان هێنایە حوزووری خەڵک. بلە لە بەرانبەری تاهیرەوە چۆکی دادا و لێوە کورۆژی، بە قینەوە چاوی لێدەکا:

ـ منت بۆ هێناوە؟! کەسێ نابەلەدبێ پیاوم کوشتووە!! من بە بەرات لای هەمزەبەگ بووم، هەر کەس بەراتم داتێ، پیاوی ئەوم، ئەوە تاوانە؟ تاوانیش بێ، هێندە گەورە نییە ئاوا بێ حورمەتم کەن.

تاهیر لە سەرەخۆ ڕووی لە جەماوەر کرد:

ـ برادەریتە! ئەم پیاوە بە تاوانی کوشتنی دۆست و هاوڕێی خۆی، عەلیلە، کە هەر دووکیان چەکداری هەمزەبەگ بوون، مەحکەمە دەکرێ، هەر لە حوزووری ئێوە باس وخواسی لێدەکەم، ئەگەر تاوانبار بێ، بە سزا دەگا، بێ تاوانیش بێ، هیچ. هەموو دەزانن ئەم پیاوە لەگەڵ عەلیلە چەکداری هەمزەبەگ بوون؟ دەشزانن عەلیلە کوژراوە؟

بە جەماوەری گوتیان:

ـ بەڵێ، خۆمان تەرمەکەمان هێناوە و لە گۆڕستانی کانیتوو بە خاک سپێردراوە.

ـ خۆ دەشزانن لەودەمەوە ئەم پیاوە ونە؟

ـ بەڵێ، ئاگادارین، نەک هەر ئێمە، خەڵکی دێیەکانی دیش دەزانن.

بلە لە سەر چۆک سووڕاو رووی کردە خەڵک:

ـ دەی ئەوە بەڵگەی ئەوەیە من عەلیلەم کوشتبێ؟

تاهیر جوابی داوە:

ـ نا، بەڵگەی دیکەمان هەیە، ئەو سەعاتەی دەستت بەڵگەیە.

بلە بە چەشنێ راچەنی و چاوی لە سەعاتەکەی کرد، هەموو دانیشتووانی مزگەوت پێیانزانی:

ـ سەعات بۆ بەڵگەیە؟ سەعاتی خۆمە، هەقم نییە بمبێ؟

ـ با، بەڵام ئەوە سەعاتەکەی عەلیلەیە، ئەو رۆژەی ئەو کوژراوە، لە دەستی ئەودا بووە، ئەو کەسەی ئەو سەعاتە دەناسێ، ئەو رۆژە لەگەڵتان بووە و لە دەستی عەلیلەدا دیویە و هەر ئەو رۆژە ئەو کوژراوە و تۆش لەودەمەوە ونی، جگە لەوەش، ئەو کەسە نێو نیشانی ئەو سەعاتەی هەیە، بەڵگە لەوە باشترە؟ دادەی سەعاتەکەت! بلە دەستی بە دەسبەندی سەعاتەکەوە کەوتە لەرزین:

ـ من لە بازاڕ، بە دەستی دەستفرۆشەوە کڕیومە.

ـ ناوی چییە، دەیناسی؟ دەنێرم بیهێنن.

ـ ناوی نازانم، بیبینم دەیناسمەوە.

ـ درۆیە! یەکەم کەس کە تەرمی عەلیلەی دۆزییەوە، کێیە؟ شوانەکەی کانیتوو هەستایە سەر پێ:

ـ من بووم کاک تاهیر، تەنیا نەبووم، عەلی حاجیم لەگەڵ بوو.
عەلی حاجی هەستا:
ـ بەڵێ، منیش بووم. ئەو ڕۆژە من نۆرەدار بووم. کە دیمانەوە، نەمانوێرا دەستی لێ دەین، زوو بە خەڵکی ئاواییمان ڕاگەیاند، ئەوە مامۆستا و کەیخوداکان دەزانن چی پێ بوو بێ و پێی نەبوو بێ.
مەلا کەریم گوتی:
ـ وەڵلاهی جگە لە بەرگی بەری، هیچی پێ نەبوو، کەس سەعاتی نەدیوە، وا نەبوو؟ دانیشتووانی مزگەوت یەک دەنگ وەجواب هاتن:
ـ بەڕێوەڵلا.
تاهیر بە تووڕەییەوە ڕووی لە بلە کرد:
ـ ئەمجار دەڵێی چی؟
ـ من نەمکوشتووە، بۆ دەبێ کوشتبێتم؟! بۆ سەعاتێ؟!
تاهیر ئەهوند و لە سەرە خۆ ڕوو بە خەڵک گوتی:
ـ بە زۆری نابێ،دەنێرم لە دووی ئەو کەسەی کە نێو نیشانی ئەو سەعاتە بە تەواوی دەزانێ، سەعاتەکە دەدەمە دەستی مامۆستا، ئەگەر هات و ناوونیشانەکانی ڕاست بوو، دیارە ئەو کوشتوویە، ئەگەر نا، هیچ. ئەگەر بڵێم ئەو کەسە کێیە. باوەڕ ناکەن! با بێ، دەزانن. کۆ بوونەوەی ئەمڕۆ تەواو بوو، بەیانی ئەم دەمانە لێرە کۆ دەبینەوە.
تاهیر، سەعاتەکەی دایە دەستی مەلا کەریم. هەر ئەو ڕۆژە، دوانیوەڕۆ. تاهیر، کاوە و ڕەشۆی نارد بۆ شار.
بەیانی، لە قاوەڵتووندا بلەیان هێنایەوە مزگەوت. لەودەمەداکە مزگەوت پڕ بوو لە حەشیمەت، عەتا هاتە ژوورێ. بە چاو پێکەوتنی عەتا، هەموو واقیان بردەوە! تاهیر هەستا:
ـ خەڵکینە! سەیر نییە، عەتا باوەڕپێکراوی منە، دەیهەوێ لە پێناوی ئێوەدا گیان بەخت کات. وەرە ئێرە عەتاگیان! وەرە ئێرە.
عەتا چووە لای تاهیر و مامۆستاوە دانیشت. خەڵک بە گەرمی پێشوازیان لێکرد و بە خێریان هێنا. تاهیر گوتی:

ـ عەتاگیان! سوێند دەخۆی ئەوەی سەبارەت بە بلـە و عەلیلـە و سـەعاتەکەی دەیزانی، بێ بوختان و درۆ، ڕاست بدوێی؟

عەتا دەستی بەرەو قورعانەکان درێژ کرد و سوێندی خوارد جگـە لـە ڕاسـتی، درۆ بە زاریدا نەیێ.

تاهیر گوتی:

ـ دوا چاوپێکەوتنی تۆ لەگەڵ بلە و عەلیلە کەی بوو؟

ـ ئەو ڕۆژە کە بۆ بەیانی گوتیان عەلیلە کوژراوە، کوێخا شەریفم لەگەڵ بوو، تا نزیک شار هاتن، لەوێ گەڕانەوە.

کوێخا شەریف هەستا و گوتی:

ـ ڕاستە، وابوو.

ـ ئەو ڕۆژە عەلیلە سەعاتەکەی لە دەستا بوو؟

عەتا و کێوخا بە جووت گوتیان:

ـ بەڵێ، ئەو دەم کە ویـستیان بگـەڕێنـەوە، عەلیلـە تەماشـای کـرد، گـوتی نێوەڕۆیە.

ـ تۆ سەعاتەکەی دەناسییەوە؟

عەتا گوتی:

ـ بەڵێ، سەد جار چاوم لێ کردووە. نێو نیشانی هەیە.

ـ چییە؟

ـ سێ نێو نیشانی ئاشکرای هەیە، سەری دەستە کۆکەکەی لایـەکی پـەڕیـوە، دەرزیلەی دەستە بەندەکەی لەتی دەرزی سـنجاقی تێخـراوە، سـەفحە ڕەشـەکەی شوێنێکی رووشاوی تێدایە.

لەودەمەوە عەتا نێو نیشان دەڵێ، مەلا کەریم چاو لە سەعاتەکە دەکا:

ـ بەێن و بەێنەڵلا وایە.

سەعات دەست بەدەست بە نێو کەیخودادا گەڕا و لە ئەستۆیاندا. بلە هـەسـتایە سەر پێ و پڕ بە زاری گوڕاندی:

ـ ئەرێ ئەرێ من کوشتم، من عەلیلەم کوشت، هەر ئەوم نەکوشـتووە. عەبـە و فەیزەش من کوشتوومن، فەیزە، عەبەی پێ دام بە کوشت و پوولی جوانەگاکـانی

لێ خواردم، ئەویشم کوشت. عەلیلە خۆی دەستی نەبوو. هەموو رۆژێ هـەڕەشـەی دەکرد راپۆرتم لێبدا، ئەویشم کوشت، ئەرێ ئەرێ، هەر سێکیان من کوشتوومن.

دانیشتووانی مزگەوت وەک شێر هەڵچوون، وێکـڕا هـەسـتان و هورۆژمیـان کردە سەر بلە. تاهیر گوڕاندی و دوو گوللەی حەوایی تەقاند، خەڵک چلەکانـەوە و دامرکان:

ـ دامرکێن، لە سەرە خۆ بن. سزای پیاوکوژ، کوشتنەوەیە. هەر ئێـستا خەبـەر بە دێهاتی دەوروبەربدەن بەیانی لە دێ کۆن لە سەر گلکۆی عەبە کـۆ دەبینـەوە، هەر لەوێ بە سزای خۆی دەگەیێنین.

گورجێ مینە و سارۆی بانگ کرد، ئـەملا و ئـەو لایـان لـە بلـە گـرت و لـە حەشامیان شاردەوە.

حەمە هەلی بەدەرفەت زانی. ئەحمـەد فەڕاشـی نـارد لـە دووی ژن و منداڵـی سەعید لە بژوێ. فێری کرد، بەیانی داوای تۆڵەی نـازدار و سـەعیدی نۆکـەر لـە تاهیر بکەن. ئەو هەلە لە دەست بدەن، وەک بەفرەکەی پار دەڕوا.

دێ کۆن پڕە لە حەشیمەت. تاهیر، بلەی بردە سـەر گـلکۆی عەبـە. خەلـکی چوار دێ لە چوار لاوە هەلقەیان داوە. بە دەنگێکی بەرز تاوانەکانی بلـە سـووری خوێندەوە، داوای لێکرد، ئەگەر شتێکی بۆ گوتن هەیە، بیلێ. بلـە داوای کوشـتنی خۆی کرد. سێ کـەس، تـاهیر و حەمـە و عـەتا بلـەیان جیـا کـردەوە. تـاهیر، چەکەکەی خۆی دایە دەستی عەتا، چەکی مینەی دا بە حەمە، خۆشـی برنووکـەی کاوەی وەرگرت. لەودەمەدا حەمە و عەتا چاویان بڕییە یەک، بێ غـەل و غـەش بۆ یەک شنینەوە. بۆ ئـەوەی لـە پـێش چـاوی خەلـک خـوێن نـەرژێ، بلـەیان وەپێش دا، لە تەپی پەچە خڕە چوون بەو دیودا. پاش ماوەیەک سێ تەقە گەیـشتە گوێ و جم و جووڵ کەوتە نێو خەڵک و بەرەو شوێنی تەقە رۆیشتن.

مەلێعای خێزانی سەعید و ئەحمەد فەڕاش کەوتنە دواوە و بـە پێـنج منداڵـەوە هێور هێور وەسەرکەوتن. هێشتا لە نێو قەدی تەپ بوون، تـاهیر و حەمـە و عـەتا سەریان وەدەرکەوت. حەمە لە دوور گوتی:

ـ ژن و منداڵـی سـەعیدی نۆکـەرن. ئـەوەش ئەحمـەد فـەڕاش، دەسـگیرانی نازدارە، دەردیان یەکە بۆیە یەک کەوتوون.

تاهیر له جێ وێستا. ژن و منداڵ وەسەرکەوتن. مەلێعا بە منداڵەوە خۆی خستە بەر پێی تاهیر:

ـ کاک تاهیر! یارمەتیم بدە، پێنج منداڵم هەتیو کەوتوون. ڕەسوڵی نۆکەر هەتیوی خستوون.

تاهیر دەستی دایە باڵی و هەڵیساندەوە، یەکە یەکە منداڵەکانی ماچکرد. حەمە بە چاو ئاماژەی کردە ئەحمەد، دەی تۆش ئەحمەد ڕووی هەڵماڵی:

ـ نازدار دەسگیرانی من بوو، ڕەسووڵ لە باوەشی خۆمدا کوشتی، کاک تاهیر! چاوەڕوانی تۆڵە سەندنین.

تاهیر تەماشای حەمە و عەتای کرد. حەمە گوتی:

ـ وەک دەڵێن لە قەلایە، پاریزگاری ئەویی گرتۆتە ئەستۆ، مێش بەوێدا بفڕێ، وەبەرگوللەی دەدا.

تاهیر گوتی:

ـ کێی لێیە؟

ئەحمەد فەڕاش زوو جوابی داوە:

ـ چەند ڕۆژ لەمەوبەر، حەسەن مەیتەر عەدلە خانمی دایکی عەتابەگی برد بۆ شار، ئێستا هەر مام عەلی دەرکەوان و حەسەن مەیتەر و ڕەسووڵ لەوێن، مام عەلی و حەسەن مەیتەر لەئەستۆی من، ئەوان هیچ ناڵێن.

عەتا هەڵیدایە:

ـ کاک تاهیر! ئیزن بدە من دەچم دەیگرم.

ـ نا، تۆ بە تەنیا نا، دوو چەکدار بەرە، هەر ئەمشەو بڕۆن، هەر ڕێیان نیشاندە، کارت نەبێ. دەتوانی؟

ـ وەک ئاوخواردنەوە وایە، شارەزای هەموو کەلێن و قوژبنێکی قەلام، پەروەردەی ئەوێم.

ـ باشە، بەو مەرجە خوێن لە لووتی نەیێ، ساخ و سەلامەت دەمەوێ.

ـ بەسەرچاو.

ـ ئەمشەو لەگەڵ ڕەشۆ و سارۆ بڕۆن. کەس تێمەگەیێنن.

سێ تاپۆ، دوانیان چەکدارە، بێ هەست و خوست گەیینە بەر دەروازە و سەبرێ لێیان دا. مام عەلی وەک ئەوەی هاوڕازیان بێ، هاتە پشتی دەرگا، سەبرێ گوتی:

ـ کێیە؟

منم مامە، عەتا بیکەوە.

ـ تۆی باوانەکەم؟! ئەوە لە کوێی؟

شەو ژنی پشتی دەرگا بچووکەکەی لابرد و کردییەوە، عەتا هاتە حەوشە و رەشۆ و سارۆ بە دوویدا:

ـ یا غەوس! ئەوانە کێن؟!

ـ سەبر مامە، سەبر، ئاونە دۆستی منن، با کەس تێنەگا، رەسووڵ لە کوێیە؟

ـ لە سەر بانە، بە مەرقەدی کاکە حەمە دەمکوژێ. رەشۆ گوتی:

ـ مەترسێ مامە، بەر لەوەی تۆ بکوژێ، خۆی کوژراوە، تۆ خۆ گێل کە، دەرگا دامەخە، برۆ ژوورەکەی خۆت.

مام عەلی: گێژ و مەنگ دەرگای پێوەدا و چووە ژوورەکەی و دەرگای لە سەر خۆی گاڵەدا. عەتا لە پێشەوە، سارۆ و رەشۆ بە دوویدا، بن دیوار دیوار خۆیان گەیاندە پلیکانەکان و وەسەرکەوتن. عەتا رێی هەورەبانی نیشاندان. رەشۆ گوتی:

ـ ئێوە لێرە بن، خۆم ئێستا دەیهێنمە خوارێ.

رەشۆ بە پلیکاندا وەسەرکەوت.

زەینی دایە سەربان. تاپۆی رەسووڵ لە گوێسوانەوە وەک دێوەزمەیەک هاتە بەر چاو. رەشۆ لە نەکاو خرپەی لە چەخماخی برنووەوە هەستان، بە نرکەیەکی شێرانەوە گوڕاندی:

ـ چەک بەردە، مەوتت گەیشتێ!

نرکەی هێند گورچوو بڕ و لە نەکاو بوو، تا ماوەیەک رەسووڵ تاسا! دیسانەوە تێی خوڕی:

ـ چەک دانێ و دەستت بنێ سەر سەرت.

ڕەسووڵ چەکی لە دەستی پەڕی و زرمەی لە سەربان هەستان. هەر دوو دەستی نایە سەر سەری و بێڕۆح بەرەو دەرکەی هەورەبان هات. ڕەشۆ، کرژ لە نێو دەرگا هاتە دەرێ، لوولەی تفەنگی گرتە ڕەسووڵ و بەرەو چەکی کەوتوو ڕۆیشت. پەنجەی پێی خستە ژێر لوولەی برنۆ، لە چاوترووکانێکدا هەڵیهاویشت و بە دەستی چەپ قۆزییەوە. برنۆ لە شان کرد و ڕەسووڵی دایە پێش و هێنایە خوارێ. لە تاریکی نێو دالان و سەر پلیکان، بێ ئەوەی بزانێ کێن، قوڵبەست کرا. بێ قسە و باس، بەر لە ئاوایی نووستن گەیاندییانە کانیتوو.

بە گەیشتنیان، خەڵک لە ماڵ دەرپەڕین و دێ هەژی و ڕەسووڵ کەوتە نێو گێژەوی حەشیمەت. لەو گێژ و خولەدا، لە نەکاو، ڕەسووڵ بۆڕەی لێ هەستا و کەوت! خەڵک دڕیان‌دا و دووره پەرێز وێستان. تاهیر رایکردە سەری. پەیکەری بێ گیانی ڕەسووڵ شەلالی خوێنە! دوو دەبان لە کۆڵەی سینگ و کۆڵنجییەوە ئەم دیو و ئەو دیو نووکیان دوو قامک هاتوونە دەرێ. تاهیر خەنجەری لە برین راکێشا و گوڕاندی:

ـ کێ کوشتی؟! کێ بوو؟! کەس جوابی نەداوە و خۆی نەکردە خاوەنی. هەموو لە خۆ دەترسێن! یەک دوو شک دەڕواننە یەکترا! تاهیر هەر دوو خەنجەرەکەی بەدەستەوە، بێقسە و ئاوڕدانەوە ڕۆیشت. خەڵک تەرمی ڕەسوولیان برد بۆ حەوزی پیاوان. تەرم شۆرا و بردیانە مزگەوت. لەو هەل و دەرفەتەدا کە ولات چۆڵ بوو، تاهیر عەتای ناردەوە بۆ شار و خۆی گەڕاوە و چووە ماڵی پوورەگوڵە.

شەو درەنگانێ، ئەحمەد فەڕاش و مەلێعا، بێ ئەوەی کەس بزانێ، خۆیان کرد بە ماڵی پوورە گوڵەدا، بە نهێنی رازی کوشتنی ڕەسوولیان بە لای تاهیر و حەمە و پوورەگوڵەوە درکاند، گوتیان:

پێشەکی، بەر لەوەی بیهێنن، ئێمە راوێژمان کردبوو خۆمان تۆڵە بستێنین.

تاهیر ئەو کارەی بە تاوان زانی، پوورەگوڵە و حەمە گوتیان:

ـ دەستان خۆش بێ، هەقی خۆتان بوو، هەق دەبێ بە دەستی خۆت بیستێنی، بەلام لای کەس دەنگ مەکەن، دیزە بە دەرخۆنەی کەن.

بەیانی، تاهیر و هاوڕێکانی چوونە قەڵا. دەرکی ئەمباری گەنمیان کردەوە و لە بەینی هەژار و بێ نان هەر سێ دیکە دابەشیان کرد و قەڵا بوو بە بنکە و کاروباری خەڵک لەوێ بەڕێوە دەبرێ.

لەوەتا ڕەسووڵ کوژراوە، ئەحمەد وەک جاران چاپەزە. کەسەری وەلا ناوە و وردە وردە ویزەی گۆرانی دێ. ماوەی حەوتەیەکە تاهیر لە قەڵا نیشتەجێیە و ئەحمەد چاپەزە.

لە سەر جێی جاران، ئەحمەد خەریکی چا تێکردنە، لە نەکاو، حەمە هاتە ژووری. ئەحمەد بەتوانجەوە گوتی:

ـ دیمانەت بەخێرگوڵە پاییزە! کەڵەبابی خۆت بە لەپەوە لێناوە و لە کەس ناپرسی! ئاوڕێ لە منی هەژار بدەوە، لای خۆی ڕۆژێ هاودەرد بووین.

ـ من هەر کوڕەکەی جارانم، چم پێ دەکرێ، لە خزمەتام، ئەگەر کارت بە من دەکرێ، پێم بڵێ.

ـ ئەوەی من دەمەوێ، هەر بە تۆ دەکرێ، سێ چوار ڕۆژە بە تەمام بێی و پێت بڵێم، دەمەوێ خوازبێنیم بۆ بکەی!

ـ خوازبێنی؟! دەی بە چاوان، هی کێ؟

ـ کابان!! کابانی مەحموود شوان، زۆرم بە کەیفە.

ـ ئەویشکەیفی لێیە؟

ـ ئا، زۆری پێ خۆشە. ئەگەر باب و براکەی بیدەن.

ـ بۆ نایدەن؟ کوڕ لە تۆ باشتر؟ با دەرفەت ببێ، بە کاک تاهیر دەڵێم بۆت داواکا. ئەو بۆت دەستێنێ.

لە پڕ تاهیر لە دوو هاتە دەرێ:

ـ حەمەگیان! هاتی؟ وەرە ژووری.

حەمە چووە ژووری. تاهیر گوتی:

ـ دەزانی بۆ ناردوومە لە دووت؟ وردە وردە خۆ سازکەن. تا ئێستا بابت دوو سێ جار داویە بە گوێمدا بڕۆنەوە، کەوێ سازکە، با ڕووزەردی لای بابت نەبین. بەڵێنم داوە تا چەند ڕۆژی دیکە وەڕێتان خەم. تا زوو بڕۆن، درەنگە، دنیا هەر وا نابێ، لەوانەیە دەوڵەت پێ بگرێتەوە. پێ بگرێتەوە بەو گەز و مەنە نامانەدەنێ،

ئەگەر کرا و رازی بوو، پوورەگولەش سازکە. ئەوانەی سەر بە دەرەوەن، وەک خالە مەحموود و ئەوان، دەبێ راگوێزرێن، خۆم قسەیان لەگەڵ دەکەم، ئێوە ساز بن با راپەڕێن.

ـ باشە، بەسەرچاو. بەلام بەر لەوەی ئێمە وەڕێ خەی، کاری ئەحمەد وەڕێ خە.

ـ ئەو بۆ؟

ـ دەیهەوێ خوازبێنی بۆ بکەی.

ـ هی کێ؟

ـ کابانی خالە مەحموود.

ـ ئەگەر بە یەک قایل بن، بە سەر چاو، خۆم بە خالە دەڵێم، تۆ بڕۆ و لە بیری خۆسازکردندا بە، هەر ئەمڕۆ خالە دەبینم.

حەمە وەدەرکەوت. هەر لە پێشخانە مزگێنی بە ئەحمەددا.

هەر ئەو رۆژە، تاهیر مەحموود شوانی دواند و خوازبێنی کابانی بۆ ئەحمەد کرد. مەحموود شوان کابانی بە کراسەکەی بەریەوە کردە پێشکەشی.

بەیانی، تاهیر و ئەحمەد چوونە کانیتوو و مالی پوورەگولە. دوانیوەڕۆ. تاهیر و پوورەگولە و حەمە و بابی و ئەحمەد، مەلا کەریمیان هەلگرت و چوونە کانییە کوێرە. پاش مارەکردنی کابان لە ئەحمەد، پوورەگولە گوتی:

ـ یا خودا مەبارەک بێ، بەلام هەر خۆمانین، ئەحمەدی رەبەنی بێ ماڵ و حاڵ، بووک بەرێتە کوێ؟! دەبێ لە بیری ئەوەدا بین.

مەحمووی حاجی گوتی:

ـ ئەگەر خالە مەحموود ئیزنی لە سەر بێ و ئەحمەد کەیفی لێبێ، ئێمە دەڕۆینەوە. لەگەلمان بێن، وەک کوڕە چکۆلەی شا بەڕێ دەچن.

مەحموود شوان سەرێکی راوەشاند:

ـ حەیە حەی! چۆن کچی خۆم دەنێرمە غەریبایەتی!! سواڵ بکەم، بە خێویان دەکەم. هەر لێرە، لە پەنای خۆم چاوەدێرییان لێ دەکەم، کوڕ کوڕی خۆمە و کچ کچی خۆم، بە هەموو کەموکوورییەکەوە دەحاوێنمەوە.

پوورەگولە هەلیدایە:

ـ ئێمەش سەر داناخەین، من پووڵ و گەنمی حەمەم بەلاوەیە، نە من کارم پێیە تی نە ئەو، هەر دەمایەکی بووت، بماندەوە، دوو سەدوپەنجاتمەنە و شەست تەغارگەنم، پووڵەکەی لایخۆمە، گەنمەکە لە چاڵی ماڵی مام حەسەندایە، چوومەوە، بە کوڕەکانی دەڵێم بۆت دەرهێنن.

حەمە هەر ئەو پێ و ئەو پێی بوو، تەماداری ئەوە بوو قسەی پوورەگوڵە تەواو بێ، بە پەلە گوتی:

ـ هەر بەیانی بۆی دەردێنین، هێندێ زوو، با زوو ساز بێ، تا لێرەین پلاوەکە بخۆین. مەلا کەریم گوتی:

ـ خودا کاری خێر زوو رێ دەخا، حەزرەتی عەلی زامنی کاری خێرە، مەبارەکە ئینشائەللا سەرەو خێر بێ.

بەیانی، ئەحمەد و حەمە چوونە ماڵی مام حەسەن. کوڕانی مام حەسەن چاڵیان دەرهێنا. شەست تەغار گەنمیان، بە کەروباری خۆیان بار کرد، ئەحمەدی مام حەسەن لەگەڵ ئەحمەد فەڕاش بردیانە شار. پاش حەوتەیەک، کەلوپەل و جلکی بووک سازکرا و بووکیان بۆ ئەحمەد گواستەوە. ئەحمەد و کابان هەر لەکانییە کوێرە نیشتەجێ بوون.

بڕیارە بەیانی زوو مەحموودی حاجی بە خۆی و کوڕ و بووکییەوە بڕۆنەوە بۆ ئەو دیو. ئەو ڕۆژە، کەوێ چۆوە ماڵی بابی، شەوێ ماڵی پورەگوڵە پڕ بوو لە دۆستانی نزیک، تاهیر و مەحموود شوان، مام حەسەن و ئەحمەدی کوڕی، کابان و ئەحمەد فەڕاش، حەمە و بابی، بە هەموویان شل و کول بوون پوورەگوڵە ساز کەن لەگەڵیان بڕوا، بەڵام قایل نەبوو. بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ عەجایەب سەریکتان هەیە! بە خودا دنیا خراپ بێ، لەم ماڵە ناچمە دەرێ، لێرە هاتوومە دنیا، هەر دەبێ لەم ماڵەدا بمرم.

سبەینێ، لە تاوکەوتندا سێ چارەوێ بە زین و لەغاوەوە لە دەرکی ماڵی پوورەگوڵە ڕاگیرا، تەماداری حەمە و بابی و کەوێن لە ماڵی کوێخا کەریم بێنە دەرێ. پاش ئێستا هاتنە دەرێ. خات نازەنینی دایکی کەوێ بە چاوی فرمێسکاوییەوە کەوێی لە ئامێز گرت. کوێخاکەریم لەرزە لەرز دەست و گوێی مەحموودی حاجی ماچ کرد و ئەمانەتی کەوێی پێ سپارد.

بەر دەرکی مالی پوورەگولە پڕە لە حەشـام. تـاهیر و کـاوە و قـادر لـەوێن. حەمە و بابی و کەوێ هاتنەوە. یەکە یەکە مالاواییان لە خەلک کـرد، هـەر سـێ سوار بوون، دوو چەکدار، قادر و کاوە، بە فەرمانی تـاهیر لـەگـەلـیان کـەوتن، بڕیارە تا سەر سنوور رەوانەیان کەن. چەکـدار لـە پێـشەوە و سـوارە لـەدواوە و حەشام بە دووی سوارەوە تا تەپی مالان چوون.

یەک یەک و دوو دوو، خەلک گەڕانەوە. تاهیر و پوورەگولە، هەتا سـوارە و پیادە لە چاو ونبوون، چاویان لێ خافل نەکردن. کە لە چاو ونبـوون، پوورەگولـە لەبەرخۆیەوە گوتی:

ـ گوێرەکەی خەلک هەر گوێرەوساری بە دەستەوە دەمێنێ!

# ٣١

شەوە، ولات کرو کپە، شەوە، خوڕەی نەرمونیانی ئاوی چۆمە کەی بەر قەلا و حەوزە کـەی حەوشە لە هەموو کات و ساتێ باشتر دە گاتە گوێ.

شەوە، ترپەی دلی ئەویندار لە گشت کاتێ پتر هەست پێدە کرێ. شـەوە، خـەو لـە چـاوی تاهیر تاراوە، ڕەوانی پڕە لە ترپەی ئەوین، ئارا و قارای لێ براوە و لە دەروونـەوە دەیـسووتێنێ. هاوارێ لە ناخەوە دەیدوێنێ:

ـ من برووسکەم! گڕم! تاوتینی دلم؛ بەلام تەنیام، تەنیا لە نێو شـەوقی خۆمـا خنکـاوم! بریـا تاریکی بووبام، دەمم دەنا بە مەمکی خۆرەوە وتێر تێرم دەمژی، بەلام لە ڕووناکیـدا دەژیم، تـین و هانای خۆم دەمژم. ئاخ! ئەی مردن! زۆر کەس هەن درەنـگ دەمـرن، بـەلام بـێ کەلـکن. هێندێ زوو دەمرن، ئەوانە بە کەلکن. من چی؟ کەی دەمرم؟ کەی دەتوانم بمرم؟ خۆزگـە لـە دایک نەبووبام، کە بووم، دەبێ بزانم بۆ دەمرم، مردن و مەرگم لا گرینگە، دەبێ بژیم تـا بـزانم بۆ دەمرم. ژیان خۆشە، سەر چاوگەی خۆشییە، بەلام هەزار مخابن ئەو سەر چاوگەیـە هـەر بـۆ زۆردارە و هەر ئەوان ئاوی لێ دەخۆنەوە. ئاو بۆ ئێمە لە بیرێکـی قوولـدایە، ئـەویش دیوەزمـە سەری پێدا گرتووە و وێنەی بزەی ژەهراوی ئەو، ئاوە کەمان لێـدە کا بـە زەلکـاوێکی بۆگـەن. دەبێ هەر بمێنم هەتا سەر چاوگەیە کی ڕوونتر دەدۆزمـەوە، ئەگـەر پێویـست بـێ، بالـی بـۆ دە گرمەوە و تا دە گەمە سەر چاوگەیە کی ڕوون، بۆی دەفـڕم. ئۆخـەی! نـەمردم مـاوەیـە کـی کورت سەربەخۆییم دی، هەر چەند کورت و کەم تەمەن بوو، هەر بە قـەدەر تەمـەنی گولـێ، بگرە کەمتر لەوەش، بە قەدەر خەونێکی شیرینی درێژ لە چەن چر کە پتر نەبوو، بەلام بە قـەدەر سەدەیەک بە کەلک، خەلک فێر بوون، ئەزموونێک بوو بـۆ ئـەوان، خۆیـان تـاقی کـردەوە. تێگەیین دەتوانن دژی زۆردار بەربەرە کانی بکـەن، هـەر نـەبێ تێگـەیشتن. ئـەوەی کوللـە هەلدەستێ بە هەوای سەهەندە. قەیدی نییە، با ئاغا هەر ئاغا بێ، خەلک لێیـان حالـییە. ئـەمجارە

هەر بە ئاستەم بزووتنەوەیەک بێ، دژی دەوڵەت ڕێدەکەوێ. قەڵای ئاغا دەوڵەتـە، دەبـێ ئـەو قەڵا یە بڕووخێ، ئەگەر ئەو قەڵا یە بڕووخێ، ئەودەمەیە مـن بەسـەر چاوگـەی ئاواتمدەگـەم، ئەودەمەیە مەرگ و ژین بۆ من یەکسانە. لە جێ هەستا و گشت هاوڕێکانی هەستان:

ـ کوڕینە لە بەیانییەوە وەخۆکەون ئەو کەسانەی لە دەورمان بوون، کۆیانکەنـەوە، ئەوانـەی خۆیان داخوازن، بەڕێیان کەین. دەوڵەت پێی گرتۆتەوە، شا بێتەوە، ئاغاوات زیندوو دەبنـەوە و تالان و بڕۆ، کوشتوکوشتار ڕێدەکەوێ. ئەوانەی پێشڕەو بـوون، دەستنیـشان دەکـرێن، دەبـێ بیانپارێزین. کوێخا شەریف گوتی:

یانی دەبێ بڕۆین؟

ـ بەڵێ دەبێ بڕۆین. لەوانەیە لەشـکر بێتـە سـەرمان. دەوڵـەت چاوپۆشـی ناکـا، لەوانەیـە تاقمێک لە خەڵک بەربەلا بن، دەبێ ئێمە بیانپارێزین. بەیانی کۆیان دەکـەینـەوە، ئـەوەی لـە خۆی دەترسێ، ڕەوانەیان دەکەین. کوێخا چاوێکی پێدا گێڕان:

ـ بەو زووانە دەڕۆین؟

ـ ڕەنگە تا سێ شەوی دی وەڕێکەوین.

ـ ئەگەر وایە من دەچمەوە ماڵێ، دەبێ چاوم بە ژن و منداڵ بکەوێ، ئیزن دەدەی؟

ـ باوەڕ ناکەم بتوانی بچیەوە شار. تازە تۆ ناسراوی، دەتگرن. بە من نەچیـەوە باشـە، هـەواڵ بنێرە ئەوان بێنە ئێرە.

کوێخا بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ ئەی بێ بەلا بی! چەند جار چوومەتەوە کەس نەیزانیوە؟ ماڵەکەمان پەڕە، شەوێ دەچـم و شەوێ دێمەوە.

تاهیر وەک ئەوەی پێی خۆش نەبێ، لەوبارەوە نەدوا، ڕووی کردە ئەوانی دیکە:

ـ قادر و کاوە لەگەڵ حەمە ڕۆیـون، ڕەنگە بەیانی، دوو بەیانی بێنەوە. سارۆ! تـۆ و مینـە و نامیق بچنە ئەو دێهاتەی دەروبـەر. مـن و ڕەشـۆ دەچینـە لای پوورەگوڵـە، کوێخـاش ئـەوە دەڕواتەوە. دەبێ تا ئێوارە لێرە کۆ بینەوە.

کوێخا گوتی:

ـ ئێستا بڕۆم؟

ـ کەیفی خۆتە، دەڕۆی بڕۆ. کوێخا هەستا. فیشەکدانی لە خۆی دا، بـڕنۆ لـە شـان کـرد و کرژ وەدەرکەوت. ئەو ڕۆیشت، تاهیر چەکی کردەشان و چووە سەربان، نۆرەکێشکی بوو.

شەوەکی، تاهیر لە خەو هەستا و هەموویانی وەخەبەر هێنا. رەشۆ لە سەر بان بوو، لە حەوشەوە رەشۆی بانگکرد و بەرەو کانیتوو وەڕێکەوتن. لە کێوە بەرداویلە سەریان وەدەرکەوت منداڵەورکە چوونە پیریانەوە. تاهیر، یەکە یەکە ماچی کردن، بە قسەی خۆش و کایەوە هاتنە خوارێ. گەیینە دەوری دێ و پیاوان بەرەو لای هاتن. هەر یەک لە لایەکەوە قۆڵی دەکێشن بیبەنە ماڵێ، تاهیر گوتی:

ـ کارمان بە پوورەگوڵەیە، دەبێ زوو بگەڕێینەوە، ئەگەر ماین، بۆ جارێکی دیکە.

پیاوان کەوتنە تەکیان، بە قسە کردن گەیینە دەرکی ماڵەکەی پوورەگوڵە. خۆدێیەکان گەڕانەوە، تاهیر و رەشۆ چوونە ژوورێ. پوورەگوڵە گوتی:

ـ چییە؟ دەڵێی هەواڵێکت پێیە!

ـ چوزانی؟!

ـ رواڵەتت دەڵێ، چ بووە؟ یا خوا خێر بێ!!

ـ هاتووین ماڵاواییت لێ بکەین.

ـ ماڵاوایی؟! بۆ دەچن بۆ کوێ؟ تاهیر حاڵاتی روخساری گۆڕی و بزەی لە سەر لێو لابرد، لە سەرەخۆ گوتی:

ـ پوورێگیان! دەوڵەت ژیاوەتەوە، شا دێتەوە، ئاغا زیندوو دەبنەوە، ئێمەش دەبێ بڕۆین. بڕیارە دەستەیەک لەو کەسانەی کە پێویستە لێرە نەمێنن، رایانپەڕێنین، ئەگەر لە خۆت دووشکی، خۆ سازکە لە گەڵ ئەوان بتنێرین. پوورەگوڵە وەک لە سەربانەوە بەربێتەوە، تاسا! رەنگێکی هێنا و برد. ماوەیەک وشکبوو. پاشان گوتی:

ـ کێ دەڵێ؟

ـ رادیۆ گوتی، موسەدیق شکا، ئەرتەش لە سەر کارە، ئەمڕۆ سبەی شا دێتەوە، خۆ سازکە، لە گەڵ خاڵە مەحموود و ئەوان راتانگوێزین.

ـ من لە جێی خۆم نابزووم، لەم ماڵە لە دایک بووم، دەبێ هەر لێرەدا بمرم.

ـ ئاخر نەک بێ حورمەتیت پێ بکەن.

ـ ئەوەی بێ حورمەتی بە من دەکا، هێشتا لە دایک نەبووە، کەی دەڕۆن؟ چاوم پێت دەکەوێتەوە؟

ـ دەمزانی نایێی! رەنگە ئەمشەو، سبەی شەو. پێم وا نییە بتبینمەوە، پووری گیان! ئەگەر نەکرا بتبینمەوە، گەردنم ئازا کە.

ـ تۆ ئەو خودایە ئاگات لە خۆت بێ، ئەگەر کرا دێمە تازاوا، با جارێکی دیش بتبینم.
ـ نا پوورێگیان، مەیێ، رەنگبێ زووتر بڕۆین.
ـ دە باشە، لە هەر کوێ بووی، بێ هەواڵم مەکە، لە هەر شوێنێ بی، خۆم دێم، ئەگەر مام.
ـ دەمێنی پوورێگیان، ئیشاڵلا سەد سالی دیکە دەمێنی. پوورەگوڵە بـە دڵـپڕییەوە دەسـتی خستە ئەستۆی و ماچیکرد، رەشۆشـی مـاچ کـرد. ئـەو رۆژە تـا عەسـر لـەوێ مانـەوە. کـە وەدەرکەوتن، پوورەگوڵەش هاتە دەرێ. تا ئەو لای دێ رەوانەیکردن، دیسانەوە دەستە ملانیـان بۆوە و ماڵاوایی یەکجاریان کرد.
شەوێ لە قەڵا کۆبوونەوەیەکی بچووک پێکهات. ئەوەی هاتبوون هەر مـەحموود شـوان و ئەحمەد فەڕاش بوون. بڕیارە بەیانی قادر و کاوە بێنەوە، کە هاتنەوە، خۆیان و بنەماڵەیان بەرنـە سنوور. قادر و کاوەش هەر لەوێ بن تا ئەمان دەچن، شوێنی دیاریکراو شێننی ئێراقە، دێیـەکـی ئەو دیوی سنوورە، شەوی دواتر، کوێخا شەریف هاتەوە. شەش چەکـدار، بـێ ئـەوەی کـەس بزانێ، لە دەروازەی قەڵا دەربـاز بـوون، کەوتنـە گـوێی چـۆم و بـەرەو هـەزار ئەشـکەوت وەرێکەوتن.
هێشتا شەوی ماوە. پوورەگوڵە لە شیرینی خەو دایە. ئەودەم کە چوو بـووە نێـو جـێ، بـە خەیالی تاهیرەوە خەو بردبوویەوە. بە دەنگی تەقەی دەرگاوە وەخەبەر هات و راپەڕی! گـورج لە جێ راستەوە بوو، هەر لە دەرکی ژوورەکەوە بانگی کرد:
ـ تاهیر گیان! تۆی؟
ـ پوورێگیان! تاهیر نییە، عەتام، عەتابەگ! بیکەوە. پوورەگوڵە بە سەر سـووڕمانەوە خـۆی کۆ کردەوە، دوو دڵ هاتە دەرێ و دەرگای هەڵگرت:
ـ بەو شەوە بۆ هاتووی؟!
ـ هەواڵم پێیە! زوو نەکەی، کاک تاهیر تێدا دەچێ!! وەفریاکـەوە پـووری، لـە تـۆ زیـاتر کەسم شک نەبرد. پوورەگوڵە سەرێک بە حەوشەدا هەڵات! دیسان بەرەو عەتا گەڕاوە. چنگـی لە بەرۆکی عەتا گیر کرد و توند رایوەشاند.
ـ تۆ چووزانی؟
ـ ئەمڕۆ لە نێو شار کوێخا شەریفم دی، پێم سەیر بوو، چۆنە هاتۆتە نێو شار؟! لێـی دو شـک بووم و وەدووی کەوتم، بەرەو پاسگا رۆیشت و چووە ژوورێ. درەنگانێ هاتە دەرێ. لە هاتنـە دەرێدا، سەروان خودایی زۆر بە رێزەوە رەوانەی کرد، بۆم دەرکەوت شتێکی لە ژێـر سـەردایە،

بێ‌وەستان چوومە لای حاجی ڕەشید، ئەو ناردمی هەواڵێ بزانم، کە چوومە قەڵا، چۆڵ و هـۆڵ بوو، ئەقڵم بە هیچ نەشکا و بـڕی نـەکرد، هـەر تـۆم وەبـیر هاتـەوە، چ بکـەین پوریگیـان؟ پوورەگوڵە خوڵ هەڵبوو و لە پێش عەتاوە وەڕێکەوت. گەیینـە دەرکـی ماڵـی مـام حەسـەن، پوورەگوڵە غالیە بە دڵیدا هات:

ـ ئەم هەتیوە تا دوێنێ دوژمن بوو! کوێرا بوو بە دڵسۆز؟! وا باشە تەنیا لەگەڵی ڕێ نەکـەوم. لایدا و لە دەرکێ‌دا. ئەحمەدی هەستان و خـستیە تـەک خـۆی و ڕووە و هـەزار ئەشـکەوت ڕێکەوتن.

ئەودەم کە تاهیر و ئەوان گەییبوونە هەزار ئەشکەوت و دۆڵی بـەردەدەنگـدارە، کێـشکیان دامەزراندبوو. نۆرە لە تاهیرەوە دەستی پێ کردبوو، ئاخر کەس کوێخـا شـەریفە. بـەری بەیانـە. دەروونی کوێخا پڕ لە خورپە و دڵی بە توندی لێ دەدا!! دەستی بە تفەنگەکەیەوە دەلەرزێ، بـێ ئۆقرە دێت و دەچێ و چاو لە ئاسمانی ڕۆژهەڵات دەکا. ئەستێرەی بەیان تازە سەری لـە کـەل وەدەرناوە. چاو لە ئاسمانی وەک برێشکەی سەر ساج هەڵدەچۆقێ. لە دەروونی خۆیدا:

ـ ئەی جەرگت خرا بێ! لە چی دەترسێی! مەترسێ، دەبی بـە پیـاو! خـەڵات وەردەگـری، هەموو مانگێ جیرەو مواجیبت دەدەنێ، دەحەسێیەوە، ماڵ و منداڵت دەحەسێنەوە، دەبیتە پیـاوی دەوڵەت! مەترسێ، ئەوە لە بەر دەستت نووستووە. لوولەی تفەنگ بنێ سەر دڵی و قامک بێنە بـە پەلەپیتکەکەیدا، مەترسێ، لەشکرێ لەو لاتەوە وەستاوە، چاوەڕێی تەقەی تۆن، لێـدە و هـەڵـێ، ئەوانە هەموویان نووستوون. تا وەخۆ دەکەون، تۆ گەییوی بە لەشکر. دەی، زوو بە دەی.

هاڕەی بڕنۆ دڵی کێوی بەئەشکەوتەکانەوە داخوڕپاند و لە داوێنی هەزار ئەشکەوت چـۆکی بە پوورەگوڵە دادا. کەوی ئەو دۆڵە، ئەمبەروئەو بەر شەوپەڕیان کرد و ناوەخت گوڕەکەو سـاز بوو. مێنە و سـارۆ و ڕەشـۆ و نـامیق خەواڵـو و چەواشـە دەسـتیان دایـە چـەک و ئـاکۆیی دەستڕێژێکیان نا بە کێو و شاخەوە و هەڵاتنە سەر تاهیر. چاوەکانی گـەش گـەش دەڕوانێتـە گرشە گرشی ئەستێرەی بەیان و بزەی لە سەر لێوە، دەڵـێی ڕاز و نیـازی لەگـەڵ دەکـا!! یـان تەماداری هاتنی هەتاوە دەم بنێ بە مەمکییەوە تێر تێر بیمژێ، ڕەنگە هەتـاو ئـەو سـەرچاوگـە ڕوون و زوڵاڵە بێ کە بڕیار بوو بەرەو لای بفڕێ و بە ئاواتەکانی بگا؟ کێ دەزانێ؟ یان خـۆی پێی وایە ئەستێرەکەی بەیان چاوەکانی کاڵێیە وا بـە حەسـرەتەوە تێـی ڕامـاوە و چـاوی لـێ ناترووکێنێ؟ کەس نازانێ ڕەنگە گشت ئەوانە بێ؟

مینه، به پەلە پەلاماری دایێ و رایوەشاند. وەک ئەوەی دەستی چووبێ بە ئاوی شیلە و گەرما، دەستی کێشاوە و لە پەنجەی خۆی روانی، خوێن لە بوومەلێلدا رەشی نواند. تەقەی داوێنی کێو، مینە و هاورێکانی راپەڕاند، چوار برا کوژراو، چوار گورگی پێچووە خوراو لە بەرانبەر لەشکرێکەوە کە وەک مێگەل بەرەو لایان وەسەردەکەوتن، وەکارکەوتن. چوار گوللە، چواری لە دۆڵدا رەهێڵ کرد. دەست چووەوە سەر چەخماخ، چواری دی گلاند. لە ماوەیەکی کورتا، چوار چواری گلان. مینە پشوویەکی هێناوە بەر خۆی و چاوێکی بە دەور و بەردا گێڕا. لە سێ لاوە بە کێودا دێنە سەرێ:

ــ دەیانەوێ دەورمان بگرن، پاشەکشێ دەکەین.

یەکە یەکە چوونە سەر تەرمی تاهیر، نێو چاوانیان ماچ کرد، هەر چواریان گەڕانەوە و دەسرێژێکی دیکە و چواری دی بە جێ مان. بە دەم تەقەوە یەکە یەکە وەسەرکەوتن و ئاوای ئەودیو بوون. لە تاوکەوتندا، تەقە لە چۆم کردییە ئەوبەر و دۆڵی دزانی گرتە بەر. پوورەگولە و عەتا و ئەحمەدی مام حەسەن، چەواشە و دوو دڵ گەیینە دۆڵی بەردە دەنگدارە. لە پێچی ئاخری دۆڵ، کەوتن بە سەر کەلاکی ئەمنییەدا، پێنج چواریان ژمارد. گەیینە سەر کانی بەر سێ کونەکە. دوور پوورەگولە وەک باڵدار باڵی گرتەوە، بەر لە عەتا و ئەحمەد گەیشتە سەر تەرمی تاهیر. بێ گریان چاوی بڕییە چاوە گەشەکانی و تێی راما. عەتا، نێو چاوانی تاهیری رامووسی. هێدی هێدی فیشەکدانی لە قەدی تاهیر کردەوە و دوو ریز لە خۆی بەست. چەکی کەوتووی لە شان کرد، بێ قسە و باس بەرەو ترۆپکی هەزار ئەشکەوت وەسەرکەوت.

هاوارێ لە ناخەوە دەیدوێنێ: ــ من برووسکەم! گڕم! تاوتێنی دڵم، بەڵام تەنیام. تەنیا لە نێو شەوقی خۆما خنکاوم! بریا تاریکی بوویام. دەمم دەنا بە مەمکی خۆرەوە و تیر تیر دەمژی، بەڵام لە رووناکیدا دەژیم. تین و هانای خۆم دەمژم. ئاخ! ئەی مردن! زۆر کەس هەن درەنگ دەمرن، بەڵام بێ کەلکن. هێندێ زوو دەمرن. ئەوانە بەکەلکن. من چی؟ کەی دەمرم؟ کەی دەتوانم بمرم؟ خۆزگە لە دایک نەبوویام. کە بووم. دەبێ بزانم بۆ دەمرم.مردن و مەرگم لا گرینگە. دەبێ بژیم تا بزانم بۆ دەمرم. ژیان خۆشە. سەر چاوگەی خۆشییە، بەڵام هەزار مخابن ئەو سەر چاوگەیە هەر بۆ زۆردارە و هەر ئەوان ئاوی لێ دەخۆنەوە. ئاو بۆ ئێمە لە بیرێکی قووڵدایە. ئەویش دێوەزمە سەری پێدا گرتووە و وێنەی بزەی ژەهراوی ئەو ئاوەکەمان لێدەکا بە زەلکاوێکی بۆگەن.